


# شەرحی
# اللؤلؤ والمرجان

## فيما اتفق عليه الشيخان
## البخاري ومسلم

وضعه
محمد فؤاد عبد الباقي

بەپێنووسی
نوری فارس حەمەخان

سەرپەرشتی چاپ
محمود أحمد محمد

(بەرگی سێیەم)

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# شەرحی

# اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَان

# فِيما اتَّفَقَ عليه الشَّيْخَان

## البخاري ومسلم

وضَعَهُ

محمد فؤاد عبدالباقی

بەپێنووسی

نوری فارس حەمە خان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد

﴿بەرگی سێیەم﴾



*********************************************


📖 ناوی کتێب: شەرحی اللؤلؤ والمرجان فيما أتفق عليه الشيخان البخاری ومسلم.

📖 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان

📖 تیراژ : ١٠٠٠ دان

📖 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردن ( ١٢٧٨ )ی ساڵی ( ٢٠١٥ز )ی پێدراوە.

📖 کۆمپیوتەرو دیزاین: ( سامان محمد أمين )

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپکراوە، مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.




## ١٥- كتاب الحج
## نامەی حەج

### (١) باب: ما يباح للمحرم بحج أو عمرة، وما لايباح، وبيان تحريم الطيب عليه
### کەسێ لە ئیحرامی حەج، یا عەمرەدا بێ، چی بۆ دروستەو چی بۆ دروست نییە، بۆنی خۆش بۆ ئیحرامدار دروست نییە

٧٣١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ، إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ وَلاَ الْوَرْسُ ». {الحديث: ٢٧٨٣ = ٢٧٦٧. ف.م. تجريد/٢، رقم: ١٠٨ = ٣٦٦، ١٥٤٢، ١٨٤٢، ٥٧٩٤. بخاری. حج: ١٥٤٢، ٥٨٠٣. أبو داود. حج: ١٨٢٤. نسائی. حج: ٢٦٧٣. ابن ماجة. حج: ٢٩٢٩ تحفة الأشراف: ٨٣٢٥}: [٧٣١]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرگی ئیحرام چییە بۆ کەسێ لە ئیحرامدا بێ؟ فەرمووی: کراس و مێزەرو دەرپێ و کڵاوو خوف لەبەرنەکا، ئەگەر کەسێ جووتێ سۆڵی دەست نەکەوت ئەوا با جووتێ خوف، لەخوار قاپەڕە قەڵەوە ببڕێتەوە، ئەوجا لەپێیان بکا، وە هەربەرگێ زەعفەران و وەرسی پێوەبێ لەبەری مەکەن. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ١٥٠٠}.

---

[٧٣١] تجريد/٢، ذمارة: ١٠٨ = ٣٦٦، مختصر صحيح البخاری المسمّى ب (التجريد الصريح) مختصر صحيح مسلم/٢، ذمارة: ٦٧٨ = ٢٧٨٣ شيحا.

٧٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يَخْطُبُ يَقُولُ: « السَّرَاوِيلُ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الإِزَارَ، وَالْخُفَّانِ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ ». يَعْنِي الْمُحْرِمَ. {الحديث: ٢٧٨٦ = ٢٧٧٠ ف.م. بخاري. حج: ١٥٤٢} : [٧٣٢]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی عەرەفەدا، لەکێوی عەرەفە، لە حەجی مالآوایيدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی دا، تیادا فەرمووی: (کەسێ لە ئیحرامدا بێو پەشتە مالٚ (إزار -بەرکۆش)ی، دەست نەکەوێ کە بیپێچێ بەلای خوارووی لەشیەوە، با دەرپێ لەپێ بکا، وە هەروەها ئەگەر سۆل (نەعل)ی دەست نەکەوت، با جووتێ پێلآو لەپێ بکا).

٧٣٣- عَنْ يَعْلى بْنِ أُمَيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ لِعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَرِنِي النَبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ يُوحى إِلَيْهِ، قَالَ: فَبَيْنَمَا النبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالجِعْرانَةِ، وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحابِهِ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يارَسُولَ اللهِ، كَيْفَ تَرى فِي رَجُلٍ أَحْرِمِ بِعُمْرَةٍ، وَهُوَ مُتَضَمِخٌ بِطيبٍ؟ فَسَكَتَ النبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاعَةً، فَجَاءَهُ الوَحيُ، فَاشارَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إلى يَعْلى، فَجَاءَ يَعْلى وَعلى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثوْبٌ قَدْ أُظِلَّ بِهِ، فَأَدْخَلَ رَأْسَهُ، فإذا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْمَرُّ الْوَجْهِ، وَهُوَ يَغِطُّ، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ: (أَيْنَ الَّذى سَأَلَ عَنْ العُمْرَةِ). فَأُتيَ بِرَجُلٍ، فَقَالَ: (إِغْسِلَ الطِّيبَ الَّذي بِكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، وانزَعْ عَنْكَ الجُبَّةَ، واصْنَعْ في

---

[٧٣٢] بخاری. حج: ١٥٤٢، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٧٩ - ٢٧٨٦، ترقیم مسلم/ خلیل مأمون شیحا.

عُمْرَتِكَ كَمَا تَصْنعُ فِي حَجتِكَ). (الحـديث ١٥٣٦ – أطرافـهُ في: ١٧٨٩، ١٨٤٧، ٤٣٢٩، ٤٩٨٥): [٧٣٣]

یەعلای کوڕی ئومەییە (ڕەزای خوای لێ بێ) بەئیمامی عومـەری فـەرموو: لەکاتێ هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر، پێغەمبـەرم نیـشان بـدە، پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- لەجیعرانـە بـوو، کـە یەکێکە لەجێگـەی دابەسـتنی ئیحـرام، دەکەوێتە خاکی حیللەوە، لەنێوانی طائیـف و مەککەدایـە، لەمەککـەوە نـزیکترە، لەوێ لە جیعرانە، کاتێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەناو کۆمـەڵێ، لـە هاوڕێیانیـدا بـوو، پیـاوێ ڕیـش‌و قـژی خـۆی لـەبۆنی خۆشـا زەرد کردبـوو، وە جبەیـەکی لەبـەردا بـوو، هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- عـەرزی کـرد: ئـەی ڕەوانـەکراوی خـودا ئیحرامـی عـەمرەم دابەسـتووەو بـەم شێوەیەشم کە دەمبیی ؟ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسـەر بـێ- تاوێـك بـێدەنگ بـوو، ئـەوجا سـروش (وحـی)ی بۆهـات، عومـەریش -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- ئاماژەی بۆ یەعلا کرد، جا یەعلا هات، ڕوانی پۆشاکێ وەك چـەترو پـەردە دراوە بە پێغەمبەرا، یەعلا دەفەرموێ: سەرم کرد بەژێر ئەو پەردەیەدا، تەماشام کرد: وا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسـەر بـێ- لەبـەر قورسـی بـاری هـاتنی سرووشـی، ڕووی سوور سوور هەڵگەڕاوەو وەك خـەوتووی هەناسـە سواربوو، پرخـە پرخـی دێ. پاشـان بەرەبـەرە فەرامۆشـی بـۆ هـات‌و ئـەو حاڵەتـە بـەری داو بـاری لەشـی سووك بوو، وەهاتەوە سەرباری ئاسـایی، ئـەوجا فـەرمووی: (ئـەوەی کـە لـەبارەی عەمرەوە پرسـیاری هـەبوو کـوا لەکوێیـە؟( جـا پیاوەکـەیان هێنـا بـۆ خزمـەتی، فەرمووی: (سێ جار ئەم بۆنە خۆشـە بـشۆرە کـە داوتـە لـەخۆت، وە جبەکەشـت

---

[٧٣٣] تجرید/٢، ژمـارە: ٧٣٨ = ١٥٣٦، البخاری. مـسلم: ١١٨٠ - مختـصر صحیح مـسلم/٤، ژمـارە: ٦٧٧ = ٢٧٩٠ شیحا.

لەبـەرت داكەنـە، عـەمرەیش لـەم لایەنانـەوە وەك حـەج وایـە، لەبەرئـەوە لـە حەجەكەتا چی دەكەی لە عەمرەكەشتا هەمان شت بكە).

**ڕوونكردنەوە:**

بڕوانە: تاج/٢/١٦٢/٢ز- ٨٣.

ئەم داستانە ئەوكاتە ڕوویداوە، كە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەغەزای حونەین گەڕاوەتەوە، لەساڵی هەشتی كۆچیدا بوو. ئەم جۆرە بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- مـوفتی لـە وەڵامدانـەوەدا پەلـە نـەكا، هـەتا زانـستی تـەواو لـەبارەی پرسیارەكەوە مسۆگەر نەكا وەڵام نەداتەوە.

٢- كەهەندێ شت لە عەمرەو لە حەجا یەك بڕیاریان هەیە.

٣- هەنـدێ حـوكم هەیـە، بـە وەحـی چەسپاوە، كـە ئـەو وەحیـە غـەیری قورئانە، كەواتە مەرج نییە هەموو وەحیێ قورئانی دەورەوە كراوبێ.

**(٢) باب: مواقيت الحج والعمرة**

**باسی نیشانەی كاتو وادەو شوێنی دابەستنی ئیحرامی حەجو عەمرە**

٧٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهما) قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ وَلأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ: قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ: يَلَمْلَمَ، قَالَ: « فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ، مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَا فَكَذَلِكَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا ». {الحديث: ٢٧٩٥ = ٢٧٧٩ فم. تجريد/٢/١٦٠، رقم: ٧٣٣ = ١٥٢٤، ١٥٢٦،



١٥٢٩، ١٥٣٠، ١٨٤٥. أبو داود. حج: ١٧٣٨. نسائي. حج: ٢٦٥٧ تحفة الأشراف: ٥٧٣٨}:[٧٣٤]

ئيبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زولحولەيفە، کە ئێستا ناوداره بە بيری عەلی، ئەو شوێنەی دیاری کردووه بۆ جێگەی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە، وه بۆ خەڵکی شامیش جوحفە، وه بۆ خەڵکی نەجدیش قەرنولمەنازیل، وه بۆ خەڵکی يەمەنيش يەلەملەم، وه فەرمووی: (ئەم شوێنانە جێگەی ئیحرام دابەستنن بۆ ئەو کەسانەی کە دێن بۆ حەج و عەمرە، لە خەڵکی ئەم وڵاتانەو لە خەڵکی ئەو وڵاتانەی تريش کە بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەج و عەمرە، وه کەسێ لەم شوێنانەی کە ناومان هێنان نزیکتر بوو، ئەوه جێگەی ئیحرام دابەستنی لەو شوێنەوەیە کە خەڵکی ئەوێیەو لەو شوێنەوەیە کە لێیەوە دەکەوێتە ڕێ! ئیتر هەروا بەم پێو دانە، هەتا نزیکتر بێ جێگە ئیحرام دابەستنەکەشی نزیکترە، تەنانەت خەڵکی مەککە، لەناو مەککەوە ئیحرام دادەبەستن). {تاج/٢، زنجیره: ٨٢، ژماره: ١٤٩٦}.

٧٣٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِى الْحُلَيْفَةِ ، وَأَهْلُ الشَّأْمِ مِنَ الْجُحْفَةِ ، وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ » . قَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَبَلَغَنِى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ»:[٧٣٥]

واتاو مەبەست لێی لەژمارە (٧٣٤)دا رابورد.

[٧٣٤] تجريد/٢، ژماره: ٧٣٣ - ١٥٢٤، بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٦٥١ = ٢٧٩٥ شيحا.

[٧٣٥] بخاری. حج: ١٥٢٥، مسلم: ٢٧٩٧ شيحا.




## (٣) باب: التلبية وصفتها ووقتها
## كاتى تەلبييە كردنو چۆنيێتى تەلبيە

٧٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً عِنْدَ مَسْجِدِ ذِى الْحُلَيْفَةِ أَهَلَّ فَقَالَ: « لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ ». قَالُوا: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَقُولُ: هَذِهِ تَلْبِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَ: قَالَ نَافِعٌ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ، يَزِيدُ مَعَ هَذَا: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ. {الحديث: ٢٨٠٣ = ٢٧٨٧ فم. تجريد/٢، ژمارە: ٧٤٤ = ١٥٤٩ فتح البارى} : [٧٣٦]

ئيبنو عومەر (رەزاى خودايان لىٚ بىٚ) فەرمووى: پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بىٚ) جاران كە ولاٚخەكەى سەرى دەخستە سەركێوى بەيدا، لەلاى مزگەوتەكەى زولحولەيفە رادەوەستا، ئەنجا ئيحرامى دادەبەست، واتە: نييەتى چوونە ناو حەجى دەهێنا بەگوتنى ئەم گوتەيە، دەيفەرموو:

{لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ} واتە:

پەروەردگارا! هەميشە كەمەرى بەندەگيم بەستوە بۆ جىٚبەجىٚ كردنى فەرمانى تۆ، تۆ بىٚ چوونو بىٚ هاوەڵى، سوپاسو ستايش هەر بۆ تۆيە، وە بەخششو نازو بەهرەو نيعمەتو داراييو پاشاييو خاوەنيى، هەر لەخۆت دىٚو هەر لە خۆت جوانە، بىٚ چوونيو بىٚ هاوەڵى تۆ ئاشكراو نمايانە).

دەفەرموون: جاران عەبدوڵلاى كوڕى عومەر دەيفەرموو: ئەمە شێوەى تەلبييە كردنى پێغەمبەر خۆى بوو. فەرمووى: نافيع فەرمووى: عەبدوڵلا

---

[٧٣٦] تجريد/٢، ژمارە: ٧٤٤ = ١٥٤٩، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٦١ = ٢٨٠٣ شيحا.



ئەمەی دواوەیشی لەم تەلبییە پتر دەکرد، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم وشانەی پێشەوە ئیحرامی دەبەستو ئەمەیشی لێ پتر دەکرد: {لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ}. واتە: پەروەردگارا! ئەی خودای من! من هەمیشە ملکەچم بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی تۆ، تا خۆ شنوودیی و ڕەزامەندیی تۆ دەردەست بکەم، چاکە بەدەستی تۆیە، ئومێدی هەرە گەورەم بە لوتفو کەرەمی تۆیە، هەرکردەوەیێ کە تۆ پەسەندی نەکەی مایە پووچو فیڕۆیە). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ١٥٢٠، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## (٤) باب: أمر أهل المدينة بالإحرام من عند مسجد ذي الحليفة
## فەرمانکردن بە خەڵکی مەدینە، کە لەلای مزگەوتەکەی زول حولەیفە ئیحرام دابەستن

٧٣٧- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُولُ: بَيْدَاؤُكُمْ هَذِهِ الَّتِى تَكْذِبُونَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِيهَا! مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلاَّ مِنْ عِنْدِ الْمَسْجِدِ، يَعْنِى ذَا الْحُلَيْفَةِ. {الحديث: ٢٨٠٩ = ٢٧٩٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٤١ = ١٥٤١. نسائي: حج: ٢٥٥٨. أبو داود. حج: ١٧٧١. ترمذي. حج: ٨١٨}: [٧٣٧]

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: بیستم لەباوکم دەیفەرموو: ئەم بەیدایەی کە ئێوە بەدرۆ دەڵێن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ئیحرامی دابەست، شتی وانییە، چونکە بەبێ

[٧٣٧] تجريد/٢، ژمارە: ٧٤١ = ١٥٤١، بخاری. مسلم: ١١٨٦، محمد فؤاد عبدالباقی = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٥٨ = ٢٨٠٩ شيحا.

گومــان کــه پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) لــەلای مزگەوتەکــەی زولحولەیفەدا ئیحرامی دابەستو بەرگی ئیحرامی پۆشی).

## (٥) باب: الإهلال من حيث تنبعث الراحلة
## کاتی ئیحرام دابەستن ئەو کاتەیە کە وڵاخەکەی ڕێك هەڵدەستێتە سەر پێ

٧٣٨- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا. قَالَ: مَا هُنَّ يَا ابْنَ جُرَيْجٍ؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ لاَ تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَانِ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ. وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِلاَلَ، وَلَمْ تُهْلِلْ أَنْتَ حَتَّى يَكُونَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَمَّا الأَرْكَانُ فَإِنِّى لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَمَسُّ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِى لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ، وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا. وَأَمَّا الصُّفْرَةُ فَإِنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصْبُغُ بِهَا فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا، وَأَمَّا الإِهْلاَلُ، فَإِنِّى لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ. {الحديث: ٢٨١٠ = ٢٧٩٤ فم. تجريد/١، رقم: ١٢٨ = ١٦٦، ١٥١٤، ١٥٥٢، ١٦٠٩، ٢٨٦٥، ٥٨٥١. أبــو داود. حــج: ١٧٧٢. نــسائی. طهــارة: ١١٧}: [٧٣٨]

عوبەیدی کوڕی جورەیج، بــە عەبـدوڵڵای کــوڕی عومــەری فــەرمووی: ئــەی بــاوکی عەبـدورەحمان! دەبیــنم کــەتۆ چوارشــت دەکــەی نــابینم کــە زۆرینــەی هــاوەڵانی پێغەمبــەر، لــە برادەرانــی تــۆ، کــە ئــەو چــوار شــتە بکــەن، هــۆی ئەمــە چییە؟ فەرمووی: ئەی کــوڕی جــورەیج! مەبەســتت کــام چــوار شــتەیە؟ عــەرزیم

[٧٣٨] تجريد/١، ژمارە: ١٢٨ = بخاری: ١٦٦، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٥٩ = ٢٨١٠ شيحا.

کرد: دەتبینم لەکاتی تەوافی کابەدا، لەچوار گۆشەکەی کابە، تەنیا ئەو دوو گۆشەیە دەست پیادەهێنیو ماچیان دەکەی کە ناودارن بەدوو گۆشە یەمانییەکان، کە بریتین لە گۆشەی حەجەرولئەسوەدو گۆشەی یەمانی، دوو گۆشەکەی تر کە پێیان دەگوترێ: دوو گۆشە شامییەکان نەماچیان دەکەیتو نەدەستیان پیادا دەهێنی، دەیشت بینم سۆڵی سەبتیش لەپێ دەکەی، کە بەسۆڵی چەرمی خۆشەکراوی بێ کوڵكو موو دەگوترێ، هەروا دەیشت بینم کە مووی خۆتو پۆشاکی خۆت بەڕەنگی زەرد ڕەنگ دەکەی، مەردومیش لە مەککە، کە مانگی نوێی قوربانیان دی، ئیتر ئیحرامی حەج یا عەمرە دادەبەستنو بەرگی ئیحرام لەبەردەکەن، کەچی تۆ کاتێ لە مەککە دەبی، هەتا ڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربان، کە ناودارە بە ڕۆژی تەروییە، ئیحرام دانابەستیو، کە ڕۆژی تەروییە هات ئەوجا ئیحرام دادەبەستی، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فەرمووی: دەبا بۆت روون بکەمەوە کە بۆ وا دەکەم: من بۆیە بەس دەست دەهێنم بە دوو گۆشە یەمانییەکانی کابەداو تەنیا ئەو دوو گۆشەیە ماچ دەکەم، چونکە نەمدیوە کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەم دوو گۆشەیە گۆشەکانی تری کابە ماچ بکا، یا دەستیان پیادا بهێنێ، وە پێغەمبەریشم بەچاوی خۆم دیوە کە سۆڵی سەبتی لەپێ دەکرد وە دەستنوێژی پێیەوە دەگرت، بۆیە منیش حەزدەکەم کە ئەو جۆرە سۆڵە لەپێ بکەم، چونکە بتپەرستەکان زۆرتر سۆڵی چەرمی خاویان لەپێ دەکرد، بەکارهێنانی ڕەنگی زەردیش لەبەرئەوەیە، کەمن خۆم دیومە کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕەنگی زەردی بەکاردەهێنا، لەبەرئەوە منیش حەزدەکم ئەو ڕەنگە بەکاربهێنمو لەوەدا پێغەمبەر بکەم بەسەر مەشق بۆ خۆم، مەسەلەی ئیحرام دابەستنیش ئەوەی من دیومە، ئەمەیە: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کاتێ

ئیحرامی دادەبەست، کەولاخەکەی لەژێریدا هەڵدەستایە سەرپێو بەرەو مینا دەکەوتە ڕێ، بۆیە منیش وادەکەمو لەو کاتەدا ئیحرام دادەبەستمو حەج لەخۆم فەرز دەکەمو ئیتر دەست دەکەم بە لەبەیکە کردن!).

## (٧) باب: الطيب للمحرم عند الإحرام
## کاتێ حاجی یان عەمرەکار ئیحرام دادەبەستێ سوننەتە لەوکاتەدا خۆی بۆنخۆش بکات

٧٣٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِى لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ، وَلِحِلِّهِ حِينَ أَحَلَّ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ. {الحديث: ٢٨١٨ = ٢٨٠٢ ف.م. تجريد/٢/١٦٤، رقم: ٧٣٩ = ١٥٣٩، ١٧٥٤، ٥٩٢٢، ٥٩٢٨، ٥٩٣٠. أبو داود. مناسك: ١٧٤٥. نسائى. حج: ٢٦٨٤. تحفة الأشْرَاف: ١٧٥١٨} : [٧٣٩]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هاوسەرە پاکیزەکانی) فەرمووی: بۆخۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام بەستندا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کە ئیحرام ببەستێو بەرگی ئیحرام لەبەر بکا، وە هەروەها بۆ ئیحرام شکاندنیش، لەپاش ڕەجمی شەیتانو سەرتاشین، لەپێش ئەوەدا، کە تەوافی بەیت بکا، بۆنی خۆشم لە پێغەمبەر دەدا). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٥}.

٧٤٠- عَنْ عَائِشَةُ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الْمِسْكِ فِى مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ مُحْرِمٌ. {الحديث: ٢٨٢٤ = ٢٨٠٨ ف.م.

---

[٧٣٩] تجرید/٢، ژمارە: ٧٣٩ = ١٥٣٩، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٥٣ = ٢٨١٨ ترقيم شيحا لصحيح مسلم.

تجريـد/١/٢٠٣، رقـم: ١٨٩ = ٢٧١، ١٥٣٨، ٥٩١٨، ٥٩٢٣. نـسائي. مناسـك: ٢٦٩٤، أبو داود. مناسك: ١٧٤٦} : [٧٤٠]

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێستاش هەر لەبەر چاومە کە چۆن شوێنی جیاکردنەوەی مووی سەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لە ناوەڕاستا مووەکەی سەری دەکرد بەدوو بەشەوە، بریسکەی میسکەکەی پێوە بوو، کە لەپێشی ئیحرام بەستندا لێی دابوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٥}.

٧٤١– حديث عائيشة عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَذَكَرْتُ لَهَا قَوْلَ ابْنِ عُمَرَ مَا أُحِبُّ أَنْ أُصْبِحَ مُحْرِمًا أَنْضَخُ طِيبًا . فَقَالَتْ عَائِشَةُ أَنَا طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ طَافَ فِي نِسَائِهِ ثُمَّ أَصْبَحَ مُحْرِمًا): [٧٤١]

موحەممەدی کوڕی مونتەشیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو گوتەی ئیبنو عومەر گێڕایەوە بۆ عائیشە، کە دەفەرموێ: حەزناکەم لەوکاتەدا کە ئیحرام دادەبەستم بۆنی خۆشم لێ هەڵسێ.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆخۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام بەستن دا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کەئیحرام ببەستێ، جا هەر لەوشەوەدا دەچوووە لای ژنەکانیو، بۆ بەیانیش هێشتا بۆنی گوڵاوەکە دەمار دەمار دەڕۆیی کەئیحرامی دادەبەست (ت/٢/١٦٧/٢ ز-٨٧ ژ-١٥١٥).

---

[٧٤٠] تجريد/١، ژمارە: ١٨٩ - ٢٧١، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٥٤ = ٢٨٢٤.

[٧٤١] تجريد/١، ژمارە: ١٨٧ - ٢٦٧ بخاری. مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا: ٢٨٣٤.

## (٨) باب: تحريم الصيد للمحرم
## راوكردن بۆ ئیحرامدار نادروسته

٧٤٢- عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ (رضى الله عنه): أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِمَارًا وَحْشِيًّا، وَهُوَ بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَ: فَلَمَّا أَنْ رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَا فِى وَجْهِى، قَالَ: « إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنَّا حُرُمٌ ». {الحديث: ٢٨٣٧ = ٢٨٢١ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ٢٤٠، رقم: ٨٣٩ = ١٨٢٥، ٢٥٧٣، ٢٥٩٦ فتح البارى. ترمذى. حج: ٨٤٩. نسائى. حج: ٢٨١٨. تحفة الأشراف: ٤٩٤٠} : [٧٤٢]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئیحرامدا بوو، صەعبی کوڕی جەثثامە (ڕەزای خودای لێ بێ) کەرە کێوییەکی سەربڕاوی بۆهێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایەوە بەسەریداو وەری نەگرت لێی، ئەوکاتە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئەبواء بوو، کەناوی کێوێکە، یا لەوەددان بوو کەناوی شوێنێکە وا لەنزیکی جەحفەوە، ئەبواء لەوەددان لە جەحفەوە نزیکترە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە سەیری کرد، صەعب ئەم وەرنەگرتنەی پێ ناخۆش بوو، وە بەم بۆنەیەوە رووی گرژبوو، دڵی دایەوەو پۆزشی بۆ هێنایەوەو عوزرخوایی بۆ کردو پێی فەرموو: (لەبەرئەوەی کەواین لە ئیحرامدا بۆیە ئەم نێچیرەت لێ وەرناگرین، دەنا لێمان وەردەگرتی).

[٧٤٢] تجريد/٢، ژمارە: ٨٣٩ = ١٨٢٥، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٨٠ = ٢٨٣٧ شيحا.

**ڕوونکردنەوە:**

صەعبی کوڕی جەثثامە (ڕەزای خودای لێ بێ) لەوەددان نیشتەجێ بوو، کەوا لە وڵاتی حیجاز، کە لەم فەرموودەیەدا ناوبراوە، دایکی ناوی فاخیتەی خوشکی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربە، لە (فتح الملهم)دا دەفەرموێ: دایکی ناوی زەینەبی کچی حەربی کوڕی ئومەییەیە، لەکاتی موئاخاتا، کە پێغەمبەر پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی موسوڵماناندا، دوو دوو کردنی بەبرای یەکتری، پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی صەعبو عەوفی کوڕی مالیکدا، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی ئیستەخر بووە، دەڵێن: لەپاش ئازادکردنی ئیستەخر، جارچی جاڕدەدا: کەوا جەجاڵ هەڵساوە! کە دەگەن بە صەعب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (شتی وا نییە، چونکە بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: جەجاڵ هەڵناسێ هەتا خەڵك باسی پشت گوێ دەخەن). صەعب چەند فەرموودەیەکی تەندروستی گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، ڕاستتر ئەوەیە کە لە ئاخرو ئۆخری جێنشینی ئیمامی عومەردا مردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموو هاوەڵە بەڕێزو ئازدارەکانی پێغەمبەر بێ).

٧٤٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رضي الله عنه) قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِالْقَاحَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى ثَلاَثٍ ح . وَحَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ - رضي الله عنه - قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِالْقَاحَةِ ، وَمِنَّا الْمُحْرِمُ ، وَمِنَّا غَيْرُ الْمُحْرِمِ ، فَرَأَيْتُ أَصْحَابِي يَتَرَاءَوْنَ شَيْئًا فَنَظَرْتُ ، فَإِذَا حِمَارُ وَحْشٍ - يَعْنِي وَقَعَ سَوْطُهُ - فَقَالُوا لاَ نُعِينُكَ عَلَيْهِ بِشَيْءٍ ، إِنَّا مُحْرِمُونَ . فَتَنَاوَلْتُهُ فَأَخَذْتُهُ ، ثُمَّ أَتَيْتُ الْحِمَارَ مِنْ وَرَاءِ أَكَمَةٍ ، فَعَقَرْتُهُ ،

فَأَتَيْتُ بِهِ أَصْحَابِي ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ كُلُوا . وَقَالَ بَعْضُهُمْ لاَ تَأْكُلُوا . فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – وَهُوَ أَمَامَنَا ، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ «كُلُوهُ حَلاَلٌ»: [٧٤٣]

**ئەمە دەقی ژمارە (٨٣٨)ی تەجریدی بوخارییە دەیكەین بە روونكردنەوەو راڤە بۆ ئەم گێڕانەوەی ئێرە:**

عَنْ أَبِي قَتَادَةَ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ قَالَ انْطَلَقْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ، وَلَمْ أُحْرِمْ، فَأُنْبِئْنَا بِعَدُوٍّ بِغَيْقَةَ فَتَوَجَّهْنَا نَحْوَهُمْ، فَبَصُرَ أَصْحَابِي بِحِمَارِ وَحْشٍ، فَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَضْحَكُ إِلَى بَعْضٍ، فَنَظَرْتُ فَرَأَيْتُهُ فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ الْفَرَسَ، فَطَعَنْتُهُ، فَأَثْبَتُّهُ، فَاسْتَعَنْتُهُمْ، فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي، فَأَكَلْنَا مِنْهُ، ثُمَّ لَحِقْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَخَشِينَا أَنْ نُقْتَطَعَ، أَرْفَعُ فَرَسِي شَأْوًا، وَأَسِيرُ عَلَيْهِ شَأْوًا، فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ بَنِي غِفَارٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ فَقُلْتُ أَيْنَ تَرَكْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ تَرَكْتُهُ بِتَعْهِنَ وَهُوَ قَائِلٌ السُّقْيَا. فَلَحِقْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَتَّى أَتَيْتُهُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَصْحَابَكَ أَرْسَلُوا يَقْرَءُونَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ وَبَرَكَاتِهِ، وَإِنَّهُمْ قَدْ خَشُوا أَنْ يَقْتَطِعَهُمُ الْعُدُوُّ دُونَكَ، فَانْظُرْهُمْ، فَفَعَلَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا اصَّدْنَا حِمَارَ وَحْشٍ، وَإِنَّ عِنْدَنَا فَاضِلَةً. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لأَصْحَابِهِ « كُلُوا ». وَهُمْ مُحْرِمُونَ. (الحديث: ١٨٢٢، وأطرافه ١٨٢١، ١٨٢٣، ١٨٢٤، ٢٥٧٠، ٢٨٥٤، ٢٩١٤، ٤١٤٩، ٥٤٠٦، ٥٤٠٧، ٥٤٩٠، ٥٤٩١، ٥٤٩٢).

وَعَنْهُ فِي الرِوايَة: قالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِالْقَاحَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى ثَلاَثٍ، وَمِنَّا الْمُحْرِمُ، وَمِنَّا غَيْرُ الْمُحْرِمِ. (الحديث ١٨٢٣).

---

[٧٤٣] تجريد/٢، ژمارە: ٨٣٨ = ١٨٢٢، ١٨٢٤ مسلم: ٢٨٤٣، ترقيم شيحا.

وَعَنْهُ فِي الرِوايَة: فَقالَ: فَلَمَّا أَتَوا رَسُولُ اللّٰـهِ -صـلى الله عليـه وسـلم- قَـالَ: «أَمِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عَلَيْهَا أَوْ أَشَارَ إِلَيْهَا». قالُوا: لا، قَـالَ: فَكُلُـوا مَـابَقِيَ مِـنْ لَحْمِهَا). (الحديث ١٨٢٤).

ئـەبو قـەتادە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) لەمەدینەو دەوروبەرییەوە بەرەو مەککە دەرچووین بۆ عەمرە، ساڵی ڕێکەوتی حودەیبییە، لەعوسفان هـەواڵ گەیـشت بـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـە لەشـکرێکی دوژمـن والـە غـەیق، کەشـیوێکە وا لـەنێوانی مەککـەو مەدینـەدا، جـا پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) دەستەیەکی نارد بۆ سۆراخی ئەو دوژمنە من لەو دەستەیەدا بووم، بەرەو ئەوان ڕۆیـشتین، هاوڕێکـانم ئیحرامـی عـەمرەیان دابەسـت، مـن ئیحـرامم دانەبەسـت، جاکاتێ گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر، هاوڕێکـانم کـەرە کێوییـەکیان بینـیو لـەناو خۆیانا دەستیانکرد بەپێکەنین، کەوا هەلێکی وایان بۆ هەڵکەوتووە، بەڵام لەبـەر ئیحرام بەستنەکەیان دەستەڵاتی هیچیان نییە، منـیش تەماشـایم کـردو بینـیمو ئەسپەکەمم لـی تاوداو، ڕمێکم لـێ داو چەسپم کرد لەجێگەی خۆیـدا، جـا داوای یارمەتیم لەهاوڕێکانم کرد کە لەگەڵما هـەڵبگرن، بـەڵام قاییـل نـەبوون، کـەهیچ کۆمەکییـەکم بکـەن لـەم لایەنـەوە، لەپاشـان لەگۆشـتەکەیمان خـوارد، لـەڕێ کـە گەڕاینــەوە بـۆلای پێغەمبــەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) مەترسـی ئـەوەمان هەبوو، کە دوژمن برمان بکەنو بنەبڕمان بکەن.

جا سەرێ بەغارو سـەرێ بـەڕەوت دەڕۆیـشتین، تـا لـەنیوە شـەوا گەیـشتین بەپیاوێ لەخێڵی نەوەی غیفار، من لێمپرسی لەکوێ پێغەمبەرت بەجێ هێـشت؟ گوتی: لەتەعهین بەجێم هێشت، کە ئاوێکە سـێ میـل لەگونـدی سـوقیاوە دوورە،

پێغەمبەر کە من بەجێم هێشت دەیویست وچانی نیوەڕۆ لەگوندی سوقیا بگرێ، کە گوندێکە وا لەنێوانی مەککەو مەدینەدا، لەوێ سەرخەوێ بشکێنێ.

ئەبوقەتادە فەرمووی: جا من خۆم گەیاندە لای پێغەمبەرو عەرزیم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! هاوڕێکانت کەلەگەڵ من دا بوون، عەرزی سڵاوو ڕەحمەتو بەرەکەتی خودایان هەیە لەخزمەتتا، وە مەترسی ئەوەیان هەیە کە دوژمن بڕیان بکاو دوور لەتۆو لەسوپاکەت قەڵاچۆیان بکا، کەواتە چاوەڕوانیان بکە هەتا دێن ئەویش لەوێ چاوەنواڕی کردن هەتا هاتن جا من عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە کەرە کێوییەکمان راو کردووە، وەهەندێ لەگۆشتەکەیمان لەلاماوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) بەهاوڕێکانی خۆی کە لەئیحرامیشدا بوون فەرموو: (لێی بخۆن، زیانی نییە بۆ ئیحرامەکەتان).

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەبوقەتادە فەرمووی: لەقاحە، کەشێوێکە دەوری میلێ لەسوقیاوە دوورە، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، هەمان بوو لەئیحرامدا بوو، وەهەمان بوو بێ ئیحرام بوو، ئەوجا تەواوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەبوقەتادەدا فەرمووی: هاوڕێکانی کاتێ هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری لێ کردن: ئایا کەستان پێی گوت کە بنیشێتە سەری، یا کەس لەئێوە ئەو نێچیرەی پێ نیشان دا؟ گوتیان نەء، فەرمووی: دە ئەوەی ماوە لەگۆشتەکەی لێی بخۆن لەکاتی وادا، لەبارودۆخی ئاوادا، خواردنی گۆشتی نێچیر زیانی نییە بۆ خاوەنی ئیحرام.

**راڤەو شیکردنەوە:**

**مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە رونکردنەوەی بڕیاری راوکردنو لەگۆشتی نێچیری راوکراو خواردنە بۆ کەسێ لەئیحرامی حەج یا عەمرەدا بێ.**

٧٤٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ انْطَلَقَ أَبِي عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ ، وَلَمْ يُحْرِمْ ، وَحُدِّثَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – أَنَّ عَدُوًّا يَغْزُوهُ ، فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – ، فَبَيْنَمَا أَنَا مَعَ أَصْحَابِهِ يَضْحَكُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا أَنَا بِحِمَارِ وَحْشٍ ، فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ ، فَطَعَنْتُهُ ، فَأَثْبَتُّهُ ، وَاسْتَعَنْتُ بِهِمْ ، فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي ، فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهِ ، وَخَشِينَا أَنْ نُقْتَطَعَ ، فَطَلَبْتُ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – أَرْفَعُ فَرَسِي شَأْوًا ، وَأَسِيرُ شَأْوًا ، فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ بَنِي غِفَارٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ قُلْتُ أَيْنَ تَرَكْتَ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ تَرَكْتُهُ بِتَعْهِنَ ، وَهُوَ قَائِلٌ السُّقْيَا . فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَهْلَكَ يَقْرَءُونَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ ، إِنَّهُمْ قَدْ خَشُوا أَنْ يُقْتَطَعُوا دُونَكَ ، فَانْتَظِرْهُمْ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُ حِمَارَ وَحْشٍ ، وَعِنْدِي مِنْهُ فَاضِلَةٌ . فَقَالَ لِلْقَوْمِ « كُلُوا » وَهُمْ مُحْرِمُونَ: [٧٤٤]

**مەبەستو واتاکەی لەژمارەکەی پێشیەوە نووسرا.**

٧٤٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ( رضى الله عنه) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَاجًّا، وَخَرَجْنَا مَعَهُ، قَالَ: فَصَرَفَ مِنْ أَصْحَابِهِ فِيهِمْ أَبُو قَتَادَةَ فَقَالَ: « خُذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ حَتَّى تَلْقَوْنِي، فَأَخَذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا قِبَلَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَحْرَمُوا كُلُّهُمْ إِلاَّ أَبَا قَتَادَةَ فَإِنَّهُ لَمْ يُحْرِمْ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَسِيرُونَ إِذْ رَأَوْا حُمُرَ وَحْشٍ، فَحَمَلَ عَلَيْهَا أَبُو قَتَادَةَ، فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا، فَنَزَلُوا فَأَكَلُوا مِنْ لَحْمِهَا، قَالَ: فَقَالُوا: أَكَلْنَا لَحْمًا وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ؟ قَالَ: فَحَمَلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِ الأَتَانِ، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا أَحْرَمْنَا، وَكَانَ أَبُو

---

[٧٤٤] بروانە ژمارە (٧٤٣).

قَتَادَةَ لَمْ يُحْرِمْ، فَرَأَيْنَا حُمُرَ وَحْشٍ، فَحَمَلَ عَلَيْهَا أَبُو قَتَادَةَ، فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا، فَنَزَلْنَا فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهَا، فَقُلْنَا: نَأْكُلُ لَحْمَ صَيْدٍ وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ، فَحَمَلْنَا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا، فَقَالَ: « هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَوْ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ ؟». قَالَ: قَالُوا: لاَ. قَالَ: « فَكُلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا ». {الحديث: ٢٨٤٧ = ٢٨٣١ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٨٣٨ = ١٨٢٢، ١٨٢١، ١٨٢٣، ١٨٢٤، ٢٥٧٠، ٢٨٥٤، ٢٦١٤، ٤١٤٩، ٥٤٠٦، ٥٤٠٧، ٥٤٩٠، ٥٤٩١، ٥٤٩٢} :[٧٤٥]

ئـەبو قـەتادە (ڕەزای خـودای لیّ بـێ) فـەرمووی: لـە خزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) لـە مەدینـەو دەوروبەریـەوە، بـەرەو مەککە، لەکاتی غەزای حودەیبییـەدا، دەرچـووین بەمەبەسـتی عـەمرە، جا پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسـەر بـێ) کۆمـەڵێکی لـە هـاوەڵانی خـۆی جیـاکردەوە، کـە ئـەبو قـەتادە یـەکێ بـوو لـەو کۆمەڵەیـە، فـەرمووی پێیـان: (ئێـوە بـەری دەریـا بگـرن هـەتا دەگەنەوە بەخۆم، ئیتر ئێمەیش بەرەو ڕێگەی دەریـا، ڕووەو مەککـە ڕۆیـشتین‌و ئەو ئەرکەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی سپاردین ئـەنجامـمان داو کاتێ بـەرەو پێغەمبـەرو یـارانی گەڕاینـەوە، هاوڕێکـانم هـەموویان ئیحرامـی عەمرەیان دابەست تەنیا من نەبێ، من ئیحرامم دانەبەسـت، جـا لـەڕێ بڕکـەیێ کـەرە کێویمـان تـووش بـوو، مـن بـە ئەسـپەکەم هەڵمـەتم بـردە سـەریان‌و دێڵـە کەرێکم لێ کوشتن، جا هەموو دابەزین‌و دەستمانکرد بە خواردن لە گۆشـتەکەی، دوایی بـوو بـە مقـۆ مقۆیـان‌و گوتیـان: چـۆن شـتی وا دەبـێ، ئێمـە لای خـۆی لـە ئیحرامـدا بـووین، چـۆن دەبـێ گۆشـتی نەچیری ڕاوکـراو بخۆین؟ ئـەبو قـەتادە دەفـەرموێ: جـا ئـەوەی مـابوو لەگۆشـتی کـەرە کێوییەکـە هـەڵیان گـرت‌و کاتـێ چوونە خزمەتی پێغەمبـەر، عـەرزیان کـرد: قوربـان! ئێمـە لـە ئیحرامـا بـووین،

[٧٤٥] بڕوانە ژمارە (٧٤٣).

بەڵام ئەبو قەتادە ئیحرامی دانەبەستبوو، بڕکەیێ کەرە کێویمان بینی، ئەبو قەتادە نیشتە سەریان، دێڵە کەرێکی لێ کوشتن، ئێمەیش دابەزین‌و لە گۆشتەکەیمان خواردو گوتمان: شتی وا چۆن دەبێ، ئێمە ئیحرامدارین، چۆن دەبێ گۆشتی نەچیری راوکراو بخۆین؟ ئەوەتا ئەوەی مابوو لە گۆشتەکەی لەگەڵ خۆمان هێناومانە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: (ئایا کەسێ لەئێوە پێی گوت کە بنیشێتە سەری، یا سەبارەت بەو نێچیرانە ئاماژەیەکی بۆ ئەبو قەتادە دەکرد؟) گوتیان: نەء. فەرمووی: (دەی ئەوەیشی کەماوە لە گۆشتەکەی بیخۆن).

**(٩) باب: ما يندب للمحرم وغيره قَتْلُهُ من الدواب في الحل والحرام**

**بۆ هەموو کەسێ لە هەموو شوێنێ، ئیحرامدار بێ، یان بێ ئیحرام، لە خاکی بەستدا بێ، یان لە خاکی نابەست نەبێ، سوننەتە ئەم جانەوەرانە بکوژێ**

٧٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ «خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ، يُقْتَلْنَ فِي الحِلِّ والْحَرَمِ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ». (الحديث-١٨٢٩)، (طرفه في: ٣٣١٤).[٧٤٦]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێنج جانەوەری زیانە خرۆ هەن لەڕادە دەرچوون‌و زیانیان لەئەندازە بەدەرە، لەبەرئەوە چ لەخاکی حەرەم‌و چ لەشوێنێکی تر جگە لەخاکی بەست، کوشتنیان دروستەو دەکوژرێن، ئەوانیش ئەمانەن: قەلەڕەش‌و

[٧٤٦] تجرید/٢، ژمارە: ٨٤٠ = ١٨٢٩، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٨٣ = ١١٩٣، محمد فؤاد عبدالباقی = ٢٨٥٤ شیحا.

کۆلارەو دوپشكو مشكو سەگی نهێنی گر. (ت/٢/١٦٤ ف/٤ = زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ١٥٠٨ ش/د/ت/ن).

**راڤەو شیكردنەوە:**

زۆرینەی مامۆستایانی یاساناسی ئایینی دەفەرموون: مەبەست لە كەلبی عەقوور لەم فەرمودەیەدا هەموو دڕندەیەكە كە زۆرینەی كات زیانە خرۆبێ. شێخ عەینی لە ڕاڤەكردنی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (وذهب الشافعي والثوري وأحمد وجمهور العلماء الى أن المراد كل مفترس غالباً).

٧٤٧- حديث حَفْصَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لاَ حَرَجَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ »: [٧٤٧]

حەفصە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێنج جانەوەری زیانەخرۆ هەن، هەركەسێ بیانكوژێ گوناهی ناگات..... تاد. وەك ژمارە (٧٤٦).

٧٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَيْسَ عَلَى الْمُحْرِمِ فِي قَتْلِهِنَّ جُنَاحٌ »: [٧٤٨]

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێنج جانەوەری زیانەخرۆ هەن تەنانەت ئەگەر كەسێ لەئیحرامیشدا بێ، گوناهی ناگات ئەگەر بیانكوژێ).

---

[٧٤٧] بخاری: ١٨٢٨، مسلم: ٢٨٦١ شیحا.

[٧٤٨] مسلم: ٢٨٦٧.

## (١٠) باب: جواز حلق الرأس للمحرم إذا كان به أذى، و وجوب الفدية لحلقه وبيان قدرها

## ئیحرامدار ئەگەر ئازاری لە سەریدا هەبوو، دەتوانێ سەری خۆی بتاشێ و تۆڵە بدات

٧٤٩- أَنَّ كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ حَدَّثَهُ قَالَ وَقَفَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحُدَيْبِيَةِ ، وَرَأْسِي يَتَهَافَتُ قَمْلاً فَقَالَ « يُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ » . قُلْتُ نَعَمْ . قَالَ « فَاحْلِقْ رَأْسَكَ – أَوْ قَالَ – احْلِقْ » . قَالَ فِيَّ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ( فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ ) إِلَى آخِرِهَا . فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ، أَوْ تَصَدَّقْ بِفَرَقٍ بَيْنَ سِتَّةٍ ، أَوِ انْسُكْ بِمَا تَيَسَّرَ » . (الحديث ١٨١٥، أطرافه ١٨١٤ ، ١٨١٦ ، ١٨١٧ ، ١٨١٨ ، ٤١٥٩ ، ٤١٩٠ ، ٤١٩١ ، ٤٥١٧ ، ٥٦٦٥ ، ٥٧٠٣ ، ٦٧٠٨) وعنهُ رضي في رواية: قالَ: نزَلَتْ في خاصة وهي لكم عامة (الحديث ١٨١٦): [٧٤٩]

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی حودەیبیەدا، ئاگرم لەژێر مەنجەڵێکا خۆش دەکرد، ئەسپێ لەسەرم هەڵ دەوەری لەبەر زۆری، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆلام، فەرمووی پێم: ئەم جرو جانەوەرانەی سەرت ئازارت دەدەن؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: دەسەرت بتاشە، لەپاشا مەڕێ یا بزنێکی خێر سەربڕە، یاخود سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، یاخود سێ مەن خورما بدە بەشەش هەژار. (تاج/٢/٢٥٣ ز/١٢٥ = ژمارە: ١٦٤٩).

لەگێڕانەوەیەکا: کەعب فەرمووی: ئەم ئایەتە {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ} بەهۆی منەوە هاتە خوارەوە، من هۆی هاتنی بووم، کە بەهۆی

---

[٧٤٩] تجرید/٢، ژمارە: ٨٣٧ = ١٨١٥، مسلم. حج: ١٢٠١ = محمد فؤاد = ٢٨٦٩ شیحا.

ئەو ئەسپیّ تیّدانەوە نەخۆش بووم‌و ئیتر ئایەتەکە دابەزی بۆ چارەسەری ئەو حاڵەی من، بەڵام بڕیارو حوکمەکەی گشتییە، بەتێکڕایی بۆ هەمووتانە.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لیّ بیّ) هاوڕێی پێغەمبەر بوو، کۆمەڵیّ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هۆی هاتنی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوو کەئێستا خوێندرایەوە، ئامادەی ڕۆژی حودەیبییە بوو، لەشەڕێکا دەستێکی پەڕی، لەکووفە دادەنیشت، خەڵکی مەدینەو کووفە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەهێزتر ڕاو بۆچوون ئەوەیە کەساڵی پەنجاو سیّ لە مەدینە مردووە لەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا.

٧٥٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبٍ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ). فَقَالَ كَعْبٌ: نَزَلَتْ فِيَّ، كَانَ بِي أَذًى مِنْ رَأْسِي، فَحُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: « مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ الْجَهْدَ بَلَغَ مِنْكَ مَا أَرَى، أَتَجِدُ شَاةً؟». فَقُلْتُ: لاَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ)، قَالَ: «صَوْمُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ أَوْ إِطْعَامُ سِتَّةِ مَسَاكِينَ، نِصْفَ صَاعٍ طَعَامًا لِكُلِّ مِسْكِينٍ»، قَالَ: فَنَزَلَتْ فِيَّ خَاصَّةً، وَهْيَ لَكُمْ عَامَّةً. {الحديث: ٢٨٧٥ = ٢٨٥٩ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٨٣٧ = ١٨١٥، ١٨١٤، ١٨١٦، ١٨١٧، ٦٨٠٨، ١٨١٨، ٤١٥٩، ٤١٦٠، ٤١٩١، ٤٥١٧، ٥٦٦٥، ٥٧٠٣، ١٨١٦. ترمذي. تفسير: ٢٩٧٣} : [٧٥٠]

عەبدوڵڵای کوڕی مەعقیل فەرمووی: کەعبی کوڕی عوجرە لە مزگەوتەکەی کووفە بوو، سەبارەت بەم ئایەتە پرسیارم لیّی کرد، کە

[٧٥٠] تجريد/٢، ژمارە: ٨٣٧، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٨٨ - ٢٨٧٥ شيحا.

دەفەرموێ: {فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ}. کەعب فەرمووی: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە من بووم، بردمیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر، ئەسپێ لەسەرم هەڵدەوەری لەبەر زۆری، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (نەمزانی کە ئاوا بەدەست ئەم جڕو جانەوەرەی سەرتەوە پەرێشانی، ئایا مەڕێ، یا بزنێکت هەیە کە سەری ببڕیت؟). گوتم: نەء، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ}. واتە: دەی ئەگەر کەسێ لەئێوە، لە ئیحراما بوو، نەخۆش کەوت، یا ئازارێ لەسەریا بوو، وە بەهۆی ئەو نەخۆشینەوە، یا بەهۆی ئەو ئازارەوە سەری خۆی تاشی بەناچاری، ئەوە لەسەریەتی تۆڵەیێ (واتە: فیدیەیێ) بدا لەباتی ئەو سەر تاشینەی، کە ئەو تۆڵەیەیە بریتییە لە ڕۆژووی سێ ڕۆژ، یا خواردەمەنی شەش هەژار، یا ئاژەڵێ سەر ببڕێو دابەشی بکا بەسەر هەژارانا).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنێتیی جێبەجێکردنی ئایەتەکە، بەمنی فەرموو: (یا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، یا خواردەمەنی شەش هەژار بدە، هەر هەژارەی نیومەن خۆراکی پێ بدە). چونکە من نەم بوو کە ئاژەڵێ سەر ببڕم.

کەعب فەرمووی: ئەم ئایەتە {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ}: بەهۆی منەوە هاتە خوارەوەو ئەم دۆخەی من بوو بەهۆی هاتنی، بەڵام بڕیارو حوکمەکەی بە تێکڕایی بۆ هەمووتانە).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ١٦٤٩ — مکرر = ١٦٥٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

**کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەر بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هۆی هاتنی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوو، کە ئێستا خوێندرایەوە، ئامادەی ڕۆژی حودەیبییە بوو، وە ئەم داستانی سەرتاشینەی لەو ڕۆژەدا بوو. {تاج. ژمارە: ١٦٥٠}.**

**لە شەڕێکا دەستێکی پەڕی، لە کووفە نیشتەجێ بوو، خەڵکی مەدینەو کووفە، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەهێزتر ڕا ئەوەیە کە ساڵی پەنجاو سێ لە مەدینە مردووە، لە تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا.**

## (١١) باب: جواز الحجامة للمحرم
## کەڵەشاخگرتن بۆ ئیحرامدار دروستە

**٧٥١- عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ احْتَجَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُحْرِمٌ بِلَحْيِ جَمَلٍ فِي وَسَطِ رَأْسِهِ. (الحديث ١٨٣٦، طرفه ٥٦٩٨):** [٧٥١]

**ئیبنو بوحەینە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەئیحرام دا بوو، لە لەحیی جەمەل بوو، کە جێگەیەکە وا لەنێوان مەدینەو مەککەدا، بەڵام لەمەدینەوە نزیکترە، کەڵەشاخی لە ناوەڕاستی سەری خۆی گرت، لەبەر ئازارێ کە لەسەریدا بوو کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: شەقیقە.**

[٧٥١] تجرید/٢، ژمارە: ٨٤٤ = ١٨٣٦، مسلم: ١٢٠٣، محمد فؤاد - مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٨٥ = ٢٨٧٨.

## (١٣) باب: جواز غسل المحرم بدنه ورأسه
## ئیحرامدار بۆی هەیە سەرو لەشی خۆی بشۆرێ

٧٥٢- عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْعَبَّاسِ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ. وَقَالَ الْمِسْوَرُ لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ. فَأَرْسَلَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْعَبَّاسِ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ، وَهُوَ يُسْتَرُ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ مَنْ هَذَا فَقُلْتُ أَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْعَبَّاسِ، أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَغْسِلُ رَأْسَهُ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ، فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ اصْبُبْ. فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ وَقَالَ هَكَذَا رَأَيْتُهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَفْعَلُ. (الحديث ١٨٤٠):[٧٥٢]

عەبدوڵلای کوڕی حونەین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عەبباسو میسوەری کوڕی مەخرەمە (ڕەزای خوایان لێ بێ) لە ئەبواء بوو بە ڕاجیاییيان ئیبنو عەباس دەیفەرموو: ئیحرامدار مافی ئەوەی هەیە کە سەری خۆی بشۆرێ، میسوەر دەیفەرموو: ئیحرامدار مافی ئەوەی نییە کە سەری خۆی بشۆرێ. جا ئیبنو عەبباس منی نارد بۆ خزمەتی ئەبو ئەیووبی ئەنصاری، کە گەیشتمە خزمەتی، تەماشامکرد لەبەینی دوو شاخەی چەرخی بیرەکەدا خۆی دەشۆرێ، بە جلکێ پەردەی بۆ کرابوو منیش لەم دیو پەردەکەوە سڵاوم لێکرد، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم، عەبدوڵلای کوڕی حونەینم، ئیبنو عەباس ناردوومی بۆ خزمەت جەنابت، کە لێت بپرسم: کاتێ پێغەمبەر لەئیحرامدا بوایە چۆن چۆنی سەری خۆی دەشۆرد؟ ئەبوئەیوب ئەوکاتە خۆی

---

[٧٥٢] تجريد/٢، ژمارە: ٨٤٦ - ١٨٤٠، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٨٧ - ٢٨٨١ شیحا.

لەئیحرامدا بوو، جا دەستی خۆی لەسەر پەردەکە دانا، کەمێ داینەواند، هەتا سەری لەمنەوە دەرکەوت، ئەوجا بە مرۆڤێکی فەرموو: کە ئاوی دەکرد بەسەریا ئاوی پیاکە، ئەویش ئاوەکەی کرد بەسەریدا، ئەوجا ئەبوئەیوب بەهەردوو دەستی خۆی قژی خۆی هەڵگلۆفتو لەپێشە سەریەوە دەستەکانی برد بۆ پشتە سەری‌و لەوێوە هێنانیەوە بۆ پێشەوە، وە فەرمووی: بەچاوی خۆم دیم کە پێغەمبەری خودا خۆی دەشۆردو لەئیحرامدا بوو، وە هەروەها پێغەمبەرم دی لەو خۆشۆردنەدا سەری خۆی ئاوا هەڵدەگلۆفت، کەمن ئێستا لەبەر چاوی تۆ کردم. (تاج/٢/١٦٦ ز/٨٦ = ژمارە: ١٥١٢ - ش/د).

## (١٤) باب: ما يفعل بالمحرم إذا مات
## کەسێ لە ئیحرامدا بێ‌و بمرێ چی لێ دەکرێ

٧٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): خَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَعِيرِهِ، فَوُقِصَ، فَمَاتَ. فَقَالَ: « اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا ». {الحديث: ٢٨٨٨ = ٢٨٧٢ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٦٠٨ = ١٢٦٥، ١٢٦٦، ١٢٦٧، ١٢٦٨، ١٨٣٩، ١٨٥١. أبو داود. جنائز: ٣٢٣٨. ترمذي. حج: ٩٥١. نسائي. جنائز: ١٩٠٣. تحفة الأشراف: ٥٥٨٢}: [٧٥٣]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە حەجی ماڵاواییدا، لە کێوی عەرەفە، لە خزمەتی پێغەمبەردا بوو، لە وشترەکەی کەوتە خوارەوە، ئەستۆی شکاو مرد، ئەم پیاوە کە بەرەوە بوو لە ئیحرامدا بوو، پێغەمبەر خۆشی لە ئیحرامدا بوو، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بە

[٧٥٣] تجريد/٢، ژمارە: ٦٠٨ = ١٢٦٥، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٨٩ = ٢٨٨٨ شيحا.

ئاوو مۆرد پاك بیشۆرن، لە دوو لۆ جلەکەی بەری خۆیدا کفنی بکەن، بەڵام حەنووتو بۆنی خۆشی لێ مەدەنو سەریشی بە کفنەکەی دامەپۆ شن، چونکە رۆژی قیامەت کە خودا زیندووی دەکاتەوە، بە بەرگی ئیحرامەوە زیندووی دەکاتەوەو وەك حاجیان لەببەیکە دەکات). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٦، ژمارە: ١٠٨٠}.
حەنووت: بۆنێکی گیراوەیە، تایبەتە بە مردووەوە.

## (١٥) باب: جواز إشتراط المحرم التحلل بعذر المرض ونحوه
## دروستە بۆ ئیحرامدار مەرج دابنێ، بەهۆی نەخۆشیو شتی تری واوە

٧٥٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّه عَنْها قَالَتْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ علَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ فَقَالَ لَهَا: لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الْحَجَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ لَا أَجِدُنِي إِلَّا وَجِعَةً فَقَالَ لَهَا: حُجِّي وَاشْتَرِطِي قُولِي: اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي. وَكَانَتْ تَحْتَ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ.(الحديث ٥٠٨٩): [٧٥٤]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چوو بۆ سەردانی ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموطەلیب، کەئامۆزای پێغەمبەر بوو، ضوباعە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا؟ دەمەوێ بچم بۆ حەج،بەلاّم دەترسم لەرێ نەخۆش بکەوم؟ فەرمووی پێی- دروودی خودای لەسەر بێ -: (برۆ بۆ حەجو مەرج دابنێ، ئاوا: بلّێ : ئەی خودایە! لەهەر کوێ تۆ نەخۆشت خستم، لەوێ ئیحرام دەشکێنم). ضوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسەدبوو. (تاج/٢ ل/١٧٠ ز: ٨٧ ژمارە/١٥١٨، چ/٤).

---

[٧٥٤] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٤٩ - ٥٠٨٩، مسلم: ٢٨٩٤ شیحا.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

**دەی ئەگەر بێجگە لەهاوکوفی لەئایین دا، هاوکوفی لەنەژادو نەسەبدا مەرج بوایە، مارەی ضوباعەی ئامۆزای پێغەمەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لەمیقداد نەدەهات. {بڕوانە: ژمارە/١٥٣٥ تجرید = ٤٠١٩ فتح الباری = بەرگی چوارەم ل/٢٦٩}.**

**(١٧) باب: بيان وجوه الإحرام وأنه يجوز إفراد الحج والتمتع والقران**
**ڕوونكردنەوەی شێوەكانی ئیحرامی حەج، كە دروستە حەج بەجیا بكرێ، بەبێ عەمرە، یا لەسەر شێوەی تەمەتوع، یا لەسەر شێوەی حەجو عەمرە بەیەكەوە**

٧٥٥– عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْىٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ ، ثُمَّ لاَ يَحِلَّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا » فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي ، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ ، وَدَعِي الْعُمْرَةَ » . فَفَعَلْتُ فَلَمَّا قَضَيْنَا الْحَجَّ أَرْسَلَنِي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ فَاعْتَمَرْتُ فَقَالَ: « هَذِهِ مَكَانَ عُمْرَتِكِ» . قَالَتْ فَطَافَ الَّذِينَ كَانُوا أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ، ثُمَّ حَلُّوا ، ثُمَّ طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى ، وَأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا: [٧٥٥]

---

[٧٥٥] **تجرید/١، ژمارە: ٢٠٨ = ٣١٧، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٧٥ = ٢٩٠٣، ترقيم شيحا لمسلم.**

بـۆ روونكردنـــەوەی ئــەم فەرموودەیــە، ئــەم گێڕانەوانــەی تــر راگــوێز دەكەین:

پرسیار كرا لە ئیبنو عەبباس (خودایـان لێ ڕازی بـێ) لـە بـارەی پـشوودان (تەمـــەتتووع)ی حەجـــەوە، گـــوتی: لـــە حـــەجیماڵئاوایيـــدا كۆچـــكەران و یاریـدەدەران و هاوسـەرانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئیحرامـی حـەجیان بەسـت وە ئێمـەیش ئیحرامـان بەسـت، جـا كـە چـووینە مەككـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: ئـەوەی لـە ئێـوە حـەیوانی دیاری مەككەی نیشانە نەكردووە بـا حەجەكەی بكـا بـە عـەمرە ئـیتر ئێمـەیش تەوافی بەیت و تەوافی صەفاو مەروەمان كـردو مـووی سـەرمان كـورت كـردەوەو ئیحرامـمـان شـكاندو چـووینە لای ژنـی خۆمـان و وەك جـاران جـل و بـەرگی ئاساییمان پۆشییەوە.

وە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـشی: هەركەسـێ دیـاریی بـەیتی نیـشانەكردووە ئـەوە نابـێ ئیحـرام بـشكێنێ، هـەتا ئـەو دیارییـە دەگاتـە جێگـەی خـۆی و لـە مینـا سـەر دەبـڕرێ، ئینجا تـاقی ئێـوارەی ڕۆژی هەشـتەمی قوربان كە نـاوداره بـە ڕۆژی تەروییـە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمانی پێ كردین: كە سەر لەنوێ لەناو مەككەوە ئیحرامی حەج ببەستینەوە، وە كاتێ لە فەرمانەكانی تری حەج بووینەوە، دیسان بێینەوە بۆ مەككەو دیسان تەوافی بەیت و تەوافی سـەفاو مـەروە بكـەین، ئـیتر حەجەكـەمان تـەواو دەبـێ و دەبین بە خاوەنی یەك عەمرەو یەك حەج، وەڵێ سەرو كوشتی وامـان دەكەوێتـە سەر كە بۆ قوربانی دەست بدات، ئەمەیش ئەوەیە كە خودای گەورە دەفەرموێ: {فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنْ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ}. واتـە: هەركەسـێ لـە پـاش كردنـی عـەمرە ئیحرامـی



شکاندو خۆشی وەرگرتەوە تا کاتێ ئیحرامی حەج دادەبەستێ ئەوە چی بۆ هەڵسوورا ئاژەڵی دەست بدا بۆ قوربانی سەری ببڕێ دەی کەسێ ئاژەڵی دەست نەکەوێ ئەوە پێویستە کە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ لە کاتی حەجدا وە حەوت ڕۆژیش کە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆتانو چوونەوە ناو کەسوکاری خۆتان جا مەڕێ یا بزنێ بۆ ئەم کوشتییە بۆ یەك کەس بەش دەکا ئیتر لەو ساڵەدا هەردوو پەرستش (عیبادەت)ی حەجو عەمرەیان لە یەك وەرزا کۆ کردەوە، وە خودا ئەم حوکمەی لە نامەی خۆیدا ناردۆتە خوارەوەو پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کردوویە بە یاساو بۆ خەڵکی غەیری مەککە ڕەوای دیوە، خودا دەفەرموێ: {ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ} ئەم حوکمە کە پێویست بوونی فیدیەیە لەسەر کەسێ تەمەتتوع بکا، بۆ ئەو کەسەیە کە خەڵکی نزیکی مەسجیدولحەرام نەبێ بە کەمتر لە ماوەی کورت کردنەوەی نوێژ (مسافه القصر) (ش/د).

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە حەجی ماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین، فەرمووی: هەرکەس دەیەوێ ئیحرامی حەجو عەمرە بەیەکەوە دابەستێ با وا بکا، هەر کەسەیش دەیەوێ ئیحرامی حەج بە تەنیا (یا ئیحرامی عەمرە بە تەنیا) دابەستێ ئەوە ئارەزووی خۆیەتی.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەس ئیحرامی حەجی بەست، وە کەسانێکی تریش لەگەڵ ئەودا تەنیا، ئیحرامی حەجیان بەست، دەستەیەکیش ئیحرامی هەردوولایان پێکەوە بەست، کەسانێکیش بەس ئیحرامی عەمرەیان بەست، من خۆم یەکێك بووم لەوانە کە تەنیا ئیحرامی عەمرەیان بەستبوو، لە پاشا کە چووینە مەککە لەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر




بێ) فەرمووی: هەرکەسێ دیاریی بەینی هاپێ با حەج و عەمرە بەیەکەوە دابەستێ، ئیتر ئیحرام نەشکێنێ، هەتا هەردووکیان تەواو دەکاو ئیحرامی هەردووکیان بەیەکەوە دەشکێنێ جا من کە گەیشتمە مەککە بێنوێژ بووم لەبەر ئەوە تەوافی بەیت و تەوافی سەفاو مەروەم نەکرد، جا کە سکاڵای ئەم حاڵەم لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد فەرمووی: قژەکەت هەڵوەشێنەوەو شانەی بکەو ئیحرامی حەج ببەستەو واز لە عەمرە بێنە منیش ئاوام کرد، جا کاتێ کە حەجمان تەواو کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ عەبدولڕەحمانی براما ناردمی بۆ تەنعیم لەوێوە ئیحرامی عەمرەم بەستەوە جا کە عەمرەکەم تەواو کرد حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم عەمرەیە لە جیاتی عەمرەکەی پێشوو (ش/د/ن).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چوار پێنج ڕۆژی مابوو بۆ مانگی نوێ ی قوربان، لەمەدینە بەرەو مەککە دەرچووین. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ حەزدەکا عەمرە دابەستێ باعەمرە دابەستێ، من خۆم بۆیە عەمرە دانابەستم چونکە ئاژەڵی دیاری ی بەیتم هێناوە لەگەڵ خۆم) جاهەندێ کەس عەمرەیان دابەست، جاکاتێ ڕۆژی عەرەفە هات من بێنوێژ بووم، لەخزمەت حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) سکاڵای حاڵم کرد، عەرزیم کرد: من لەسەر شێوەی تەمەتتوع (پشوو وەرگرتن) ئیحرامم دابەستووە. بەڵام وا ڕۆژی عەرەفە هات، من لەبەرئەوەی کەبێنوێژم هێشتا عەمرەکەمم تەواو نەکردووە، چونکە تەوافی بەیتم نەکردووە، کەیەکێکە لەبنیاتەکانی عەمرە، کەمەرجە لەسەر پاکی بکرێ، دەی ئەگەر چاوەڕێ ی پاك بوونەوە بکەم بۆ تەواو کردنی عەمرەکەم، حەجی ئەمسالم دەفەوتێ، چونکە فریای وەستانی کێوی عەرەفە ناکەوم، کەواتە چار چییە؟

حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (واز لەتەواو کردنی عەمرەکەت بهێنەو، قژە سەرەکەت هەڵوەشێنەو شانەی بکەو، ئیحرامی حەج دابەستە باحەجی ئەمساڵت لەکیس نەچێ). جا منیش چۆنی فەرموو وام کرد، تاشەوی حەصبە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆمن عەمرەم نەکردووە؟ جا عەبدوڕەحمانی برامی لەگەڵ دا ناردم، دەرچووم بۆ تەنعیم، کەنزیکترین هەرێمی خاکی حیللە لەخاکی حەرەمەوە، لەوێوە ئیحرامی عەمرەم دابەست لەجیاتی عەمرەکەی پێشووم.

هیشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام فەرمووی: لەهەموو ئەم گۆڕانکاریانەدا عائیشە نەدیاری ی بەستی سەربڕیوە، نەرۆژووی گرت، نەنانی هەژاری دا (بڕوانە فەرموودەی ژمارە (١٩٨) و (٢٠٧) بڕوانە: (ت/٢/١٧٤/١ = ز-٩٠ ژ-١٥٢٧ + ز-٩٢ ژ-١٥٢٨ + ز-٩٦ ژ-١٥٥٠ + ل/١٧٧/١ + ل/١٧٩/١ + ل/١٨٧/١ + ل/٢/١/٢٠٣ + ل/٢٢٥/١). بۆئەوەی بەباشی بزانی ئیحرام دابەستن بەچەند جۆر دەکرێ، وە (تمتع- پشوو وەرگرتن) چییەوچۆنە، وەعەمرە چۆن دەکرێ بفەرموو تەماشای فیقهی ئاسان بەرگی یەکەم لاپەڕە (٣٥٨، ٣٧٩، ٣٨٠، ٣٨٢، ٣٩٢ = ز-١٦٣ هەتا ز-١٦٧ بکە).

٧٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي عَامِ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَلَمْ يُهْدِ فَلْيَحْلِلْ، وَمَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَأَهْدَى فَلاَ يَحِلُّ حَتَّى يَنْحَرَ هَدْيَهُ، وَمَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ فَلْيُتِمَّ حَجَّهُ »، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَحِضْتُ فَلَمْ أَزَلْ حَائِضًا حَتَّى كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ وَلَمْ أُهْلِلْ إِلاَّ بِعُمْرَةٍ، فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ أَنْقُضَ رَأْسِي، وَأَمْتَشِطَ، وَأُهِلَّ بِحَجٍّ، وَأَتْرُكَ الْعُمْرَةَ، قَالَتْ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَضَيْتُ حَجَّتِي. بَعَثَ مَعِي رَسُولُ

للّه (صلى الله عليه وسلم) عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ وَأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَمِرَ مِنَ التَّنْعِيمِ مكانَ عُمْرَتِي الَّتِي أَدْرَكَنِي الْحَجُّ وَلَمْ أَحْلِلْ مِنْهَا. {الحديث: ٢٩٠٣ = ٢٨٨٧ ف.م. تجريد/١/ ٢١٦، رقم: ٢٠٨ = ٣١٧} : [٧٥٦]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) دەفەرموێ: لە خزمەتی حەزرەتدا، لە ساڵی حەجی ماڵاواییدا، لە مەدینەوە دەرچووین بۆ مەککە بۆ حەج، هەمان بوو لە میقات تەنیا نێتی ئیحرام دابەستنی عەمرەی هێنا، وەهەمان بوو تەنیا نێتی ئیحرام دابەستنی حەجی هێنا، تا گەیشتینە مەککە،، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کەسانەی کە ئیحرامیان بە عەمرە بەستووەو دیاریی خانەی خودایان پێ نییە، با عەمرەکەیان تەواو بکەن‌و ئیتر ئیحرام بشکێنن، بەڵام ئەوانەی کە دیاریی خانەی خودایان واپێ‌و ئیحرامیان بەعەمرە بەستووە، با ئیحرام نەشکێنن، هەتا حەجیش تەواو دەکەن، ئەوسا لەڕۆژی جەژنا، لەپاش سەربڕینی دیاریی بەیت ئیحرام بشکێنن، ئەو کەسانەیشی کە ئیحرامیان تەنیا بە حەج بەستووەو دیاریی بەیتیان واپێ با حەجەکەیان تەواوبکەن).

عائیشە فەرمووی: کاتێ گەیشتینە سەریف، لەوێ من بێنوێژ کەوتم‌و سووڕی مانگانەم بۆ هات‌و هەتا ڕۆژوی عارفە بەبێ نوێژیی مامەوە، وە تەنیا ئیحرامم بە عەمرە دابەست، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم کرد، کە قژە سەرەکەم هەڵوەشێنمەوەو شانەی بکەم‌و عەمرەکەم واز لێ بهێنم‌و ئیحرام بەحەج دابەستم، وە منیش وەهام کرد، هەتا حەجەکەمم تەواو کرد، جا لەسەر داوای خۆم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

---

[٧٥٦] تجرید/١، ژمارە: ٢٠٨ = ٣١٧، بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٧٥ = ٢٩٠٣ شیحا.

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری، برامی، لەگەڵ دا ناردم، چووم بۆ تەنعیم، کە نزیکترین خاکی حیللە لە خاکی حەرەمەوە، لەوێ ئیحرامم بە عەمرە دابەست، لەجیاتی ئەو عەمرەیەی کە بۆم تەواو نەکرا، چونکە ئەگەر ئەو عەمرەیەم تەواو بکردایە فریای کردارەکانی حەج نەدەکەوتم). {بڕوانە: تەجرید/٢، ژمارە: ٢٠٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ١٥٣٨ + تاج/٢، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ١٥٦٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ١٥٥٠}.

٧٥٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) تَقُولُ: (خَرَجْنَا لَا نَرَى إِلَّا الْحَجَّ فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ حِضتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَبْكِي قَالَ مَا لَكِ أَنُفِسْتِ؟ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ إِنَّ هَذا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطوفِي بِالْبَيْتِ قَالَتْ وَضحَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ). (الحديث ٢٩٤- أطرافه في: ٣٠٥، ٣١٦، ٣١٧، ٣١٩، ٣٢٨)[٧٥٧]:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ حەج، وەبەتەمای عەمرە نەبووین، چوونکە گومانمان وابوو کەلەمانگەکانی حەجدا عەمرە ناکرێ، کەگەیشتینە سەریف لەوێ من بێ نوێژ کەوتمو دەستم کرد بەگریان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بەسەرما دەگریام، فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆچی دەگری؟) گوتم: بەخوا حەزم دەکرد کەئەمساڵ نەهاتمایە بۆ حەج، فەرمووی: (ڕەنگبێ بێنوێژ بیت؟) گوتم: بەڵێ. فەرمووی: (ئەمە شتێکە خودا نووسیوویەتی لەسەر کچانی ئادەمو سووچی تۆی تێدا نییە، جاهەرچی حاجی دەیکا تۆیش بیکە، بەڵام تەواف بەیت مەکە، هەتا پاك دەبیتەوە).

---

[٧٥٧] تجرید/١، ژمارە: ١٩٨ = ٢٩٤ بخاری. مسلم: ٢٩١٠، ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاکەگەییشتینە مەککە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەهاوڕێیانی خۆی فەرمووو: بیکەن بەعەمرە، ئیتر خەڵکەکە ئیحرامیان شکان، مەگەر ئەو کەسانە نەبێ کەئاژەڵی دیاریی بەمیتیان پێ بوو. فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) خۆی دیاری پێ بوو، وەئەبوبەکرو عومەریش دیارییان پێ بوو، هەروەها دەوڵەمەندەکانیش دیارییان پێ بوو، جا کەتاقی ئێوارەی ڕۆژی تەروییە کەوتنەوە ڕێ، دیسانەوە ئیحرامی حەجیان دابەستەوە فەرمووی: ڕۆژی جەژن لەبێنوێژیی پاك بوومەوە، ئەوجا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم تەواف ئیفازەم کرد، فەرمووی: جاگۆشتی گایان بۆهێناین، گوتم: ئەم گۆشتە هی چی یە؟ گوتیان: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) گای کردووە بەقوربانی بۆ هاوسەرەکانی. (ت/٢/١٩٨/١ = ز-١٠٠ ژ-١٥٦٧ = ش/د/ ت/ ن).

٧٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ خَرَجْنَا مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ . وَحُرُمِ الْحَجِّ ، فَنَزَلْنَا سَرِفَ ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) لأَصْحَابِهِ « مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ ، فَأَحَبَّ أَنْ يَجْعَلَهَا عُمْرَةً ، فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلاَ » . وَكَانَ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَرِجَالٍ مِنْ أَصْحَابِهِ ذَوِي قُوَّةٍ الْهَدْيُ ، فَلَمْ تَكُنْ لَهُمْ عُمْرَةً ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ « مَا يُبْكِيكِ » . قُلْتُ سَمِعْتُكَ تَقُولُ لأَصْحَابِكَ مَا قُلْتَ فَمُنِعْتُ الْعُمْرَةَ . قَالَ « وَمَا شَأْنُكِ » . قُلْتُ لاَ أُصَلِّي . قَالَ « فَلاَ يَضُرَّكِ أَنْتِ مِنْ بَنَاتِ آدَمَ ، كُتِبَ عَلَيْكِ مَا كُتِبَ عَلَيْهِنَّ ، فَكُونِي فِي حَجَّتِكِ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَرْزُقَكِهَا » . قَالَتْ فَكُنْتُ حَتَّى نَفَرْنَا مِنْ مِنًى ، فَنَزَلْنَا الْمُحَصَّبَ فَدَعَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ ، فَقَالَ « اخْرُجْ بِأُخْتِكَ الْحَرَمَ ، فَلْتُهِلَّ بِعُمْرَةٍ ، ثُمَّ افْرُغَا مِنْ طَوَافِكُمَا ، أَنْتَظِرْكُمَا هَا هُنَا » . فَأَتَيْنَا فِي جَوْفِ اللَّيْلِ . فَقَالَ « فَرَغْتُمَا » . قُلْتُ

نَعَمْ . فَنَادَى بِالرَّحِيلِ فِي أَصْحَابِهِ ، فَارْتَحَلَ النَّاسُ ، وَمَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ ، قَبْلَ صَلاةِ الصُّبْحِ ، ثُمَّ خَرَجَ مُوَجِّهًا إِلَى الْمَدِينَةِ): [٧٥٨]

**لەباتی ئەمە گێڕانەوەی تەجریدی بوخاری دەنووسین کە دەفەرموێ:**

عَنْ عائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في أَشْهُرِ الحج، وَلَيالي الحَجّ، وَحُرُمِ الحجِ، فَنزَلْنا بِسَرَف، قَالَتْ: فَخَرَجَ إلى أصْحَابِهِ فَقَالَ: (مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ مَعَهُ هَدْى، فَأَحَبَّ أنْ يَجْعِلَهَا عُمْرَةً فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ الهَدْيُ فَلا). قَالَتْ: فالآخِذُ بِها والتارِكُ لَهَا مِنْ أصْحابِهِ قالَتْ: فَأما رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرجالٌ مِنْ أحابِهِ، فَكانُوا أَهْلَ قُوَّةٍ، وَكَانَ مَعَهُمُ الهَدْى، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى العُمْرةِ، قالَتْ: فَدَخَلَ عَلَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ: (ما يُبْكِيكِ ياهَنْتاهُ). قُلْتُ: سَمِعْتُ قَوْلَكَ لأصْحابِكَ، فَمُنِعْتُ العُمْرَةَ، قَالَ: (وَما شَأنُكِ) قُلْتُ: لاأُصَلي، قَالَ: (فَلاَ يَضِيرُكِ، إنَّما أَنْتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَناتِ آدمَ، كَتَبَ اللهُ عَلَيْكِ ماكَتَبَ عَلَيْهِنَّ، فُكونِي في حَجَّتِكَ، فَعَسى اللهُ أَنْ يَرْزُقَكيها).

قالَتْ: فَخَرَجْنا في حَجَتِهِ حَتَّى قَدِمْنَا مِنى، فَطَهُرْتُ، ثُمَّ خَرَجْتُ مِنْ منى، فَأفضْتُ بالبَيْتِ، قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجْتُ مَعُه في النَّفرِ الآخِرِ، حَتَّى نَزلَ المُحَصَّبَ، وَنَزَلْنا مَعَهُ، فَدَعَا عَبْدالرَّحمنِ بْنَ أبي بَكْرٍ، فَقَالَ: (اخْرُجْ بِأُخْتِكَ مِنَ الحَرَمِ فَلْتُهِلَّ بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ افْرُغَا، ثم ائْتياها هُنا، فَإني أَنْظُرُكُمَا حَتَّى تَأْتياني). قالَتْ: فَخَرَجْنَا حَتَّى إذا فَرَغْتُ، وَفَرَغْتُ مِنَ الطَوافِ، ثُمَّ جِئْتُهُ بِسَحَرٍ فَقَالَ: (هَلْ فَرَغْتُمْ) فقلتُ: نَعَمْ، فآذَنَ بالرَّحيلِ في أصْحابِهِ، فارْتَحَلَ النَّاسُ فَمَرَّ مُتَوجِهاً إلى المدينَةِ). (الحديث ١٥٦٠):

**عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمانگەکانی حەج و لە شەوەکانی حەج و لەشوێن و کات و بارودۆخەکانی حەج دا، لەساڵی حەجی ماڵاوایی‌دا، لە**

---

**[٧٥٨] تجرید/٢، ژمارە: ٧٤٩ - ١٥٦٠، بخاری. مسلم: ٢٩١٤ شیحا.**

خزمەت پێغەمبەردا، لەگەڵ جەماوەرێکی حەجکاری زۆردا، لەمەدینەوە بەرەو مەککە کەوتینەڕێ بۆ حەج، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەرەف، کە ناوی شوێنێکە دەکەوێتە سەر سنووری مەککە، لەوێ بارو بنەمان خستو دابەزین. عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەگومەزییەکەی دەرچوو، تەشریفی برد بۆ ناو هاوڕێکانی، پێیانی فەرموو؛ (هەرکەسێ ئاژەڵی دیاریی بەیتی پێ نییە، ئەگەر حەزدەکا باحەجەکەی هەڵوەشێنێتەوەو بیکات بە عەمرە، بەڵام ئەوەی کە ئاژەڵی دیاریی بەیتی واپێ با بەردەوام بێ لەسەر حەجەکەی‌و ئیحرام نەشکێنێ). عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جا بەپێی حاڵ، هەندێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- حەجەکەیان کرد بە عەمرە، وە هەیانبوو نەیانکرد بە عەمرەو بەردەوام بوون لەسەر حەج).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڵام پێغەمبەرو کۆمەڵێ لە هاوڕێیانی تەوانایان هەبوو، ئاژەڵی دیاریی خانەی خودایان پێ بوو، لەبەرئەوە ڕێگەی عەمرە کردنیان نەبوو. عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- تەشریفی هات بۆ لام، من لەوکاتەدا دەگریام، فەرمووی: (ها کچەکە! ئەوە چیتە بۆ دەگری ؟!). گوتم: گوێم لەفەرمایشتەکەی تۆبوو، دەبینم ئەم عەمرەیەم لە کیس چوو. فەرمووی: (بۆچی چیتە کەوا ناتوانی عەمرە ئەنجام بدەی ؟!) گوتم: بێنوێژم، نوێژو شتی تری وام بۆ ناکرێ! فەرمووی: (قەیناکات، زیانی نییە بۆت، ئەوە شتێکی خوانووسە، تۆیش یەکێکیت لەکچانی نەوەی ئادەم، خودا لەچارەی هەموو مێینەیەك لەنەوەی ئادەم ئەم بێنوێژییەی نووسیوە، کەواتە: بەردەوام بە لەسەر حەجەکەت، خوا یاربێ عەمرەکەیشت بە نسیب دەبێ).




عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر پێ بەپێی پێغەمبەر لەو حەجەیدا، لەگەڵی ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە مینا، لەوێ لە بێنوێژیی پاکەوە بووم، ئەوجا لە میناوە چووم بۆ مەککە، لەوێ تەوافی ئیفازەی بەیتم کرد.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپاشا لە خزمەت پێغەمبەردا لە ڕۆژی سیازدەی قوربانـدا، لـە ڕۆژی چـوارەمی ڕۆژەکـانی مینـادا، دەرچـووم، پێغەمبـەر -درووودی خـوای لەسـەر بـێ- ڕۆیـشت هـەتا لەموحەصـصەب دابـەزی، وەمنێمەش لەوێ لە خزمەتیدا دابەزین. جا عەبدوڕڕەحمانی برامی بـانگ کـردو پێـی فـەرموو: (لەگـەڵ عائیـشەی خوشـکتا بـڕۆ، تـا لـە بەسـت (خـاکی حـەرەم) دەچنە دەرەوە، با لە تەنعیم عائیشە ئیحرامی عەمرە دابەستێ، کاتێ لێبوونەوە وەرنەوە بۆلای خۆم بۆ ئێرە، چونکە من لێرە چاوەڕوانتان دەکەم هـەتا دێنـەوە بۆ لام).

عائیـشە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: جـامن و عەبـدوڕڕەحمانی بـرام دەرچووین، هەتا لەعەمرەکە بوومـەوە، وەلەتـەوافی وەداع بوومـەوە، ئـەوجا لـە بەرە بەیانا چوومەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر.

فـەرمووی: (وادیـارە لەعەمرەکـەت لێبوویتـەوە؟). گـوتم: بـەڵێ، ئەوسـا پێغەمبــەر -درووودی خــوای لەســەر بــێ- جاڕیــدا بــەناو هاوڕێیــانیدا کــەوا دەگەڕێینەوە، ئەوسا خەڵکەکە کەوتنە ڕێ و بەرەو مەدینە گەڕانـەوە). (بڕوانـە: بەرگی/١ ل/٣٤٨).

٧٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَلاَ نُرَى إِلاَّ أَنَّهُ الْحَجُّ ، فَلَمَّا قَدِمْنَا تَطَوَّفْنَا بِالْبَيْتِ ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْىَ أَنْ يَحِلَّ ، فَحَلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْىَ ، وَنِسَاؤُهُ لَمْ يَسُقْنَ فَأَحْلَلْنَ ، قَالَتْ عَائِشَةُ (رضى الله عنها) فَحِضْتُ فَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ ، فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ

الْحَصْبَةِ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، يَرْجِعُ النَّاسُ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ وَأَرْجِعُ أَنَا بِحَجَّةٍ قَالَ « وَمَا طُفْتِ لَيَالِيَ قَدِمْنَا مَكَّةَ » . قُلْتُ لاَ . قَالَ « فَاذْهَبِي مَعَ أَخِيكِ إِلَى التَّنْعِيمِ ، فَأَهِلِّي بِعُمْرَةٍ ثُمَّ مَوْعِدُكِ كَذَا وَكَذَا » . قَالَتْ صَفِيَّةُ مَا أُرَانِي إِلاَّ حَابِسَتَهُمْ . قَالَ « عَقْرَى حَلْقَى ، أَوَمَا طُفْتِ يَوْمَ النَّحْرِ » . قَالَتْ قُلْتُ بَلَى . قَالَ « لاَ بَأْسَ ، انْفِرِى » . قَالَتْ عَائِشَةُ (رضى الله عنها) فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ مُصْعِدٌ مِنْ مَكَّةَ ، وَأَنَا مُنْهَبِطَةٌ عَلَيْهَا ، أَوْ أَنَا مُصْعِدَةٌ وَهْوَ مُنْهَبِطٌ مِنْهَا): [٧٥٩]

بەشی زۆری واتای ئەم ژمارەیە، لە ژمارەکانی پێشەوە رابورد، بۆ روونکردنەوەو بەهرەی پتر ئەم گێرانەوەی تەجریدی بوخاری ژمارە: (٧٥٠) دەنووسین:

دیسان لەگێرانەوەیەکی تردا عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجەکەی پێغەمبەر -درووودی خوای لەسەر بێ- لەمەدینەوە لەخزمەت پێغەمبەردا کەوتینە رێ بۆ مەککە، وامان هەست دەکرد کە دەچین بۆ حەج و بەس، کاتێ گەیشتینە پێشەوە تەوافی بەیتمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر -درووودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی کرد: هەرکەسێ ئاژەڵی دیاری خانەی خودای پێ نییە با ئیحرام بشکێنێ، جائەوانەی کەدیاری بەیتیان پێنەبووکردیان بە عەمرەو ئیحرامیان شکاند، ژنەکانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) ئاژەڵی دیاری بەیتیان نەهێنابوو لەگەڵ خۆیان، لەبەرئەوە ئەوانیش ئیحرامیان شکاند، شەوی نەفر، سەفییە (رەزای خوای لێ بێ) کەوتە سەر بێ نوێژیی، جا صەفییەی هاوسەری پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وابزانم گلتان دەدەمەوە، چونکە کەوتوومەتە بێ نوێژییەوەو هێشتا تەوافی مالآوایی (تەوفی

---

[٧٥٩] تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٠ = ١٥٦١ مسلم: ١٢١١، ترقيم محمد فؤاد عبدالباقى = ٢٩٢١، مسلم/شيحا.

ویـداع) یـشم نـەکردووە، پێغەمبـەریش (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لەش بەبارو زار بە ئازار بێ، بۆ خێر بە دەمیا نایێ ئـەی ڕۆژی جـەژن تـەوافی نەکردووە ؟). عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خودا ئەو تەوافەی کردووە، بەڵام تەوافی مـاڵاوایی نـەکردووە؟ فـەرمووی: (دەبـا بکەوێتە ڕێ لەگەڵمان دەڕۆینەوە بۆ مەدینە، مادەم تەوافی فەرزی بـەجێهێناوە، تـەوافی مـاڵاوایی بـۆ ئـەو، لەبەرئـەوەی کـە بـێ نوێـژە، نەشـی کـات قـەیناکات (تاج/٢/ زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦٢٥، ج/٤).

**ڕوونکردنەوە:**

صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەبی نەضرییە (ڕەزای خوای لێ بـێ) بە ڕەگەز جوولەکەیە، لە نـەوەی حـەزرەتی هـاروونی بـرای حـەزرەتی مووسـایە سلاوی خودا لەسەر پێغەمبـەری خۆمـان و ئـەوانیش بـێ- لـە غـەزای خەیبـەردا یەخسیرکرا، کاتێ ژنە تاڵانییەکان دابەش دەکرێن بەسەر جەنگاوەرەکانا، صـەفێ بەر دەحیەی کەلبی دەکەوێ، بەڵام لەپاشا عەرزی پێغەمبەر دەکەن، کـە صـەفێ شازادەیە، هەر قابیل بەخۆیەتی، ئیتر پێغەمبەریش وەریدەگرێتـەوە لەدەحیـەو مـارەیکرد لـەخۆیو ئـازادیکردو ئازادکردنەکـەی خـستە بـری مـارەیی بـۆی. صـەفییە خـاتوون دە فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، یـەك فـەرموودەی لـە بوخاریـدا هەیە.

صەفێ زۆر هێمنو بەڕێزو سەلارو هۆشمەند بـوو، لـە سـەرەمەرگا عـەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ! سـوێندم بـەخودا حەزدەکەم کـە ئـەم ئـێشو ئـازارەی تـۆ بەمنـەوە بوایـە نـەوەك بـەتۆوە، پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسەر بێ- فەرمووی: ڕاست دەکەیت.

قسه دەگاتەوه بە صەفیٚخان کە حەزرەتی عائیشەو حەزرەتی حەفصە دەڵێن: صەفیٚ بنە جووە، ئێمە لەو باشترین، ئێمە ئامۆزای پێغەمبەرین، ئەو کچە جوولەکەیە، ئەویش لەداخا دەست دەکا بەگریان، پێغەمبەر دەچێ بە سەریا، دەپروانێ دەگری، دەفەرموێ: ئەوە بۆچی دەگری؟ دەڵێ: حەفصەی ژنت‌و عائیشەی ژنت پێم دەڵێن: من کچە جوولەکەم‌و تانەی بنە جووییم لێ دەدەن. پێغەمبەر فەرمووی: بۆ پێت نەگوتن: منیٚ کە باوکم هاروون پێغەمبەر بیٚ و، مامەم موسا پێغەمبەر بیٚ و، مێردم موحەممەد پێغەمبەر بیٚ، ئیتر چۆن ئێوە لە من باشتر دەبن. لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچیدا، لە سەردەمی موعاوییەدا خاتوو صەفیٚ گیانی پاکی سپارد. ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ. (بڕوانە: تاج/٩٣/٣ ف/٣ = تاج/٢، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢١٢٤، ج/٤ + ل/٨٢ ف/٢ = تاج/٢، ژمارە: ٢١٠٠، ج/٤ + تاج/١٦١/٥- ف/١ = تاج/٣، ژمارە: ٢٤٤٤، ج/٤ + تاج/٢٢٣/٨ ف/١).

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بیٚ) فەرمووی: کاتیٚ من لە تنعیمەوە داپەڕیم بۆ تەوافی بەیت‌و بۆ صەفاو مەڕوەی عەمرەکەم، گەیشتم بە پێغەمبەرو هاوەڵانی کەوتبوونە ڕیٚو لەمەککە دەردەچوون، جا لەپاش تەوافی بەیت‌و تەوافی صەفاو مەڕوە لە موحصەب پێیان گەیشتینەوە.

٧٦٠- عَنْ عبدالرحمن بن أبي بكر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُ أَنْ يُرْدِفَ عَائِشَةَ وَيُعْمِرَهَا مِنَ التنعيمِ. (الحديث ١٧٨٤ – طرفه في: ٢٩٨٥)[٧٦٠]:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێ کردم، کە عائیشەی خوشکم

[٧٦٠] تجرید/٢، ژمارە: ٨٢٤ = ١٧٨٤. مسلم: ٢١٦ = ٢٩٢٨ شیحا.

له پاشکۆی خۆمەوە سوار بکەم و بچم له تەنعیم ئیحرامی عەمرەی پێ ببەستم و عەمرەیەکی پێ تەواو بکەم، منیش وامکرد (تـاج/٢/١٧٩ ز/٩٢ = ژمـارە: ١٥٣٨ + تاج/٢/١٩٨ ز/١٠٠ ف/١ = ژمارە: ١٥٦٧ + بڕوانه: ژمارە/٧٤٩ی تەجریدی بوخاری).

## ڕوونکردنەوە:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبـەکری صـەدیقی کـوڕی ئـەبو قوحافـە خـۆیو ئەبوبەکری باوکیو ئەبو قوحافەی باپیری له هاوەڵانی پێغەمبەر بوون، کوڕێکی بووه نـاوی موحەممـەد بـووه، نازنـاوی ئـەبو عـەتیق بـووه، کـه ناسـراوه بـه (أبـو عتيق محمد بن عبـدالرحمن بـن أبـی بكـر الـصديق) دادەنـرێ لـەریزی صـەحابه بچکۆلەکان، چونکه لەپێش مەرگی پێغەمبەرا لەدایك بووه، ئیبنو عەبدول بـەڕ، له ئیستیعابا دەفەرموێ: (ئەم بەهەرمیـه کەچـوار پـشت صـەحابەی پێغەمبـەربن تەنیا بۆ ئەم چوار کەسه چەسپاوەو بەس: موحەممـەدی کـوڕی عەبـدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئـەبو قوحافـه) کـه هەرچـواریان بەخزمـەت پێغەمبـەر گەیشتوون.

عەبـدوڕەحمان بـرای حـەقی حـەزرەتی عائیـشەیه، واتـه: بـرای بـاوكو دایکییەتی. لـەڕیزی لەشـکری بێبڕوایـانی قوڕەیـشا، لـەدژی موسـوڵمانان ئامـادەی شەڕی بەدرو شەڕی ئوحود بووه، پاڵەوانێکی ناسراو بوو، داوای کرد که پاڵەوانێ بۆی بچێته مەیدان، ئەبوبەکری باوکی ویستی بچێ بۆ مەیـدان بـۆی، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیهێشتو پێی فەرموو: (خوتمان پێ بهێڵه!).

دەڵـێن: جـارێ لـەپاش ئیـسلامبوونی عـەرزی بـاوکی دەکـاو پێـی دەڵـێ: لەشەڕی ئوحوددا تۆ بەرهەوێڵم کەوتی، دڵم بـەرایی نـەدەدا، دەنـا دەمکوشـتیت! ئەبو بـەکریش پێـی دەڵێ: دەی ئەگـەر تـۆ بەرهـەوێڵی مـن بکەوتیتایـه، بـوارەم

نـەدەدای دەمکوشـتیت! کـەکاتێ موسـوڵمان بـوو، موسـوڵمانێکی زۆر جـوانی لێ دەرچوو، لەگـەڵ ئیمـامی خالیـدی کوڕی وەلیـددا ئامـادەی شـەڕی یەمامـە بـوو، حەوت کەسی لە سـەرکردەکانیان کوشـت، یـەکێکیان (محکم)ی یەمامـە بـوو، کـە لەسەر کەلێنێ لە کەلێنـەکانی قەڵاکە بـوو، ئـیتر سوپای ئیسلام لـەو کەلێنـەوە هەڵڕژانـە نـاو قەڵاکـەوە، عەبـدورەحمان کـوڕی گـەورەی ئەبوبـەکرە، لـە ئـوم ڕۆمانە، پیاوێکی پیاو چاکی دین قایمی خاوەن پەیمانی ڕاستگۆ بـوو، قـەت درۆی لێ نـەبینراوە، لـەرووداوی ئـەل‌جەمەلـدا لەگـەڵ عائیـشەی خوشـکی بـوو، بـەڵام موحەممـەدی بـرای لەگـەڵ پێـشەوا عـەلی بـوو، ڕۆژێ موعاوییـە لەسـەر دوانگـە وتارێ دەدا، لە خەڵکەکە داوا دەکا، کـە لـەپاش خـۆی، یەزیـدی کـوڕی هەڵبـژێرن بەجێنشین!!

عەبـدوڕەحمانیش دەفـەرموێ: (بـۆ ئەمـە هیرقەلییەتـە؟ کـە دەسـتووریان وایە هەرکاتێ قەیصەر دەمرێ، قەیسەرێ تر لەشوێنی دادەنیشێ!).

موعاوییە لەپاش ئەم هەڵوێستە سـەد هـەزار درەمـی زیـوینی بـۆ دەنێـرێ، بـەڵام ئـەو وەری نـاگرێو دەفـەرموێ: (ئـایینم نافرۆشـم بـۆ جیهـانم) جـا عەبـدوڕەحمان بـەرەو مەککـە دەکەوێتـە ڕێ، لـەڕێ لـەناو خـەودا بـە مـەرگی کوتوپڕ دەمـرێ، تەرمەکـەی هـەڵ دەگـرنو دەیبـەن بـۆ مەککـە لـەوێ دەینێـژن، ساڵی پەنجاو سێی کۆچی دەبێ. کاتێ عائیشە هەواڵی مەرگی دەبیستێ دەچێ بۆ حـەج، لەمەککـە دەچـێتە سـەر گۆڕەکـەیو لەسـەری دەگـریو ئـەم شـیعرەی موتەممیمی کوڕی نوومیرە دەخوێنێتەوە، کە بەسەر مـالیکی برایـدا هـەڵی داوە، لە بەحری طەویلە:

وَكُنَّـــا كَنَـــدْ مَـــانَىْ جُذَيْمَـــةَ حِقْبَـــةً

مِـــنَ الـــدَّهْرِ حَتَّـــى قِيـــلَ لَـــنْ يَتَـــصَدَّعَا

قَلَمَّـــا تَفَرَّقْنَـــا، كَـــأَنِّي وَمَالِكـــاً
لِطُـــولِ اجْتِمَـــاعٍ لَـــمْ نَبِـــتْ لَيْلَـــةً مَعَـــا

واته:

وەک دوو هـــاودەمی گیـــانی بـــەگیانی
ڕۆژگـــاریێ زۆرمـــان پێکـــەوە رانـــی!
گـــەردوون لـــەناکاو بـــێ چـــاوەڕوانی
ڕۆژگـــاری دووری و جـــودایی هـــانی!
تـــەونی جـــودایی وەهاتـــە نیـــوە
ڕێگـــەی پەیوەنـــدی تـــەواو بڕیـــوە
منـــی لـــەکاکم وا دابڕیـــوە
دەڵێـــی لەمەوبـــەر یـــەکمان نـــەدیوە!

عەبدوڕەحمان لە سەرەتاوە ناوی عەبدولکەعبە بووە، پێغەمبەر (دروودی خـوادای لەسـەر بـێ) ناوەکـەی گـۆڕی‌و کـردی بـە عەبـدوڕەحمان، چـەند فەرموودەیەکی لە صەحیحدا هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی (متفق علیـه)یـە، شێخی بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتـەوە، ساڵێ لـەپاش مـەرگی عەبـدوڕەحمان عائیشەی خوشکیشی دەمرێ (رەزای خودایان لێ بێ). {بڕوانە: ژمـارە: ٤١ و ١٢٣٧ و ١٨٩}ی تەجریدی بوخاری، هەروا بۆ شانازی‌و سەروەرییەکانی ئـەم بنەماڵەیـە بڕوانە ئەم ژمارانە لە تەجریدی بوخاری، بەشی کوردییەکەی:

١- ژمارە: ٣ ژياننامەی خاتوو عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٢- ژمارە: ٧٥ ژياننامەی خاتوو ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٣- ژماره: ٣٤٩ ژياننامەی عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكری صەدیق لێرەدا ژياننامەی ئەبوبەكری صەدیق، بەتێرو تەسەلی تۆمار دەكەین:

ئەبوبەكری صەدیق ناوی (عەبدوڵلای كوڕی عوثمانە) ناسراوە بە ئەبوبەكری كوڕی ئەبو قوحافە، لەسەردەمی نەزانیدا ناوی عەبدولكەعبە بوو، پێغەمبەر گۆڕی بە عەبدوڵلا، ئەبوبەكر قورەیشییە، تەمیمییە، دايكی ناوی سەلمای كچی صەخرە، ناسراوە بە ئوممولخەیر. لەپاش ساڵی فیل بەدوو ساڵو نیو لەدايك بووە، لەپێش هاتنی ئیسلامو لەپاش هاتنی ئیسلام هاوڕێتی پێغەمبەری كردووە، لەكاتی كۆچو لەسەفەری كۆچدا هاوڕێی پێغەمبەر بوو، لەهەرە موسوڵمانە پێشینەكانە، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، بە هەڵبژاردن ئەبوبەكر بوو بەیەكەم جێنشینی پێغەمبەر، پیاوێكی سپیكاری لەڕكەلەی لاواز بوو، ڕووخۆشو نەرمونیان بوو، شارەزای زانستی بنەچەی عەرەب بوو، بەتايبەتی ڕەگەزی هۆزی قورەیش، بازرگان بوو، ڕەفتاری زۆر جوان بوو، هەمیشە خاوەنی دیوەخان بوو، متمانەی بەهەركەسێ بكردايە بانگهێشتی لێ دەكرد بۆسەر ئیسلامەتی، زۆر كەس لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام بووە، وەك: عوثمانی كوڕی عەففانو طەلحەو زوبەیرو سەعدو عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف. بە دەوڵەمەندی موسوڵمان بوو، بەڵام كاتێ مەرگ بوو بەمیوانی هیچی لەپاش بەجێ نەما! چەندین كۆیلەی لەژیانی خۆیدا ئازاد كردووە، كە یەكێ لەوانە بیلالی حەبەشی بوو، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەفەرمانی خودا ناوی نا (صديق).

ئەبوبەكر ئەو صاحیبی غارەیە، كە خودا لەم ئایەتەدا باسی فەضلی دەكاو دەفەرموێ: {إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا - التوبة}.

ئەبوبەکر رابەری خێربوو لەنێوانی خاتوو خەدیجەو پێغەمبەردا، هەتا لەئەنجاما پێغەمبەر مارەیکرد بۆ خۆی. ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەبوبەکر هەڵبژێررا کرا بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەی جێنشینییەکەی دوو ساڵو دەوری (٣) سێ مانگ بوو، ڕۆژی هەینی (٢١) بیستو یەکی (جمادی الآخرە) ساڵی سیازدەی کۆچی مەرگ بوو بەمیوانی بەهۆی نەخۆشی سیلەوە، خۆی رایسپارد کە ژنەکەی بیشوات کە ئەسمائی کچی عومەیس بوو، عومەری کوڕی خەتاب نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، لەهۆدەکەی عائیشەدا، لەپاڵ گۆڕی پێغەمبەردا، بەشەو ناشتیان، تەمەنی (٦٣) شەستو سێ ساڵ بوو، بۆ زانینی چمکێ لە کۆششو هەوڵو فەضلی ئەبوبەکر بۆ خزمەتی ئیسلام بڕوانە ئەم شوێنانە:

١- تاجی کوردی بەرگی سێ، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٥ + زنجیرە: ١٠١ بەتەواوی + تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٤، ٣٢٣٥، ٣٢٣٦، ٣٢٣٧، ٣٢٣٨، ٣٢٣٩، ٣٢٤٠، ٣٢٤١، ٣٢٤٢، ٣٢٤٣، ٣٢٤٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٢٥٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٢٥٨ هەتا ژمارە: ٣٢٦٩ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٤، ٣٢٧٥، ٣٢٧٣، ٣٢٧٦ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٩، ٣٢٨٠ + ژمارە: ١٥٣٤ لە پوختەی موسلیم.

بۆ ڕوونکردنەوەو بەهرەی پتر ئەم گێڕانەوەی ژمارە: (٦٦٠)ی پوختەی موسلیمیش دەنووسین:

عَنْ جَابِرٍ (رضی الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْنَا مُهِلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وَأَقْبَلَتْ عَائِشَةُ بِعُمْرَةٍ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرِفَ عَرَكَتْ عَائِشَةُ حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا طُفْنَا بِالْكَعْبَةِ وَالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَحِلَّ مِنَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، قَالَ: فَقُلْنَا: حِلُّ مَاذَا؟ قَالَ: الْحِلُّ كُلُّهُ،

قال: فَوَاقَعْنَا النِّسَاءَ، وَتَطَيَّبْنَا بِالطِّيبِ، وَلَبِسْنَا ثِيَابَنَا، وَلَيْسَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ أَرْبَعُ لَيَالٍ، ثُمَّ أَهْلَلْنَا يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى عائشةَ، فَوَجَدَهَا تَبْكِي، فَقَالَ: «مَا شَأْنُكِ؟» قَالَتْ: شَأْنِي أَنِّي قَدْ حِضْتُ وَقَدْ حَلَّ النَّاسُ وَلَمْ أَحْلِلْ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَالنَّاسُ يَذْهَبُونَ إِلَى الْحَجِّ الآنَ، فَقَالَ: « إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاغْتَسِلِي ثُمَّ أَهِلِّي بِالْحَجِّ ». فَفَعَلَتْ، وَوَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ حَتَّى إِذَا طَهَرَتْ طَافَتْ بِالْكَعْبَةِ، وَالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ قَالَ: « قَدْ حَلَلْتِ مِنْ حَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ جَمِيعًا ». فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَجِدُ فِي نَفْسِي أَنِّي لَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ حَتَّى حَجَجْتُ، قَالَ: « فَاذْهَبْ بِهَا يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ ». وَذَلِكَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ. {الحديث: ٢٩٢٩ = ٢٩١٣ فم. أبو داود. حج: ١٧٨٥. نسائي. حج: ٢٧٦٢. تحفة الإشراف: ٢٩٠٨}:

جابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا، کەوتینە ڕێ، لە شوێنی تایبەت ئیحرامی حەجمان بەجیا دابەست، بەڵام عائیشە بەس ئیحرامی عەمرەی دابەست، کەوتینەڕێ هەتا گەیشتینە سەریف، کە دەمیل لە مەککەوە دوورە، لەوێ عائیشە کەوتە سەر بێنوێژی، جا کاتێ گەیشتینە مەککە، لەوێ تەوافی بەیتمان کردو تەوافی صەفاو مەڕوەمان کرد، جا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد: کە هەرکەسێ لەئێوە دیاریی بەیتی پێ نییە، با ئیحرامەکەی بشکێنێ). فەرمووی: گوتمان: قوربان بەم ئیحرام شکاندنە چیمان بۆ حەڵاڵ دەبێ، لەوەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە، لێمان قەدەغە بووە؟ فەرمووی: (هەموو شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە، وەك پێش ئیحرام دابەستن).

جابیر فەرمووی: جا هەمانبوو حەڵاڵو هاوسەری خۆی لەگەڵدا بوو، وەك لەوەو پێش دروست بوو لەگەڵ حەڵاڵو هاوسەری خۆی، هەروا بۆنی خۆشمان دا




لەخۆمانو جلو بەرگی ئاسایی خۆمان لەبەرکردەوەو بەرگی ئیحرامەکەمان دانا، هەمووی چوار شەومان مابوو بۆ شەوی عەرەفە، لەپاشا لە رۆژی هەشتی مانگا، کەپێی دەگوترێ رۆژی تەروییە، ئیحرامی حەجمان دابەستو بەرگی ئیحرامەمان پۆشیو دەستمانکرد بە لەببەیکە کردن!

لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆلای عائیشەی هاوسەری، دەبینێ کە عائیشە دەگری، پێی دەفەرموێ: (چیتە خێرە کەوا دەگری؟) دەڵێ: ئەوەبوو من کەوتمە سەر بێنوێژیو خەڵك لەم ماوەیەدا، عەمرەیەکیان ئەنجامداو ئیحرامیان شکاند، ئێستایش ئەوەتا ئیحرامی حەجیان دابەستووەو دەڕۆن بۆ کێوی عەرەفە بۆ حەج، منیش نە عەمرەم کردو نە ئیحرامم شکاندو نە تەوافی بەیتم ئەنجامدا، ئابۆ ئەمە دەگریم.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە شتێکی خوا کردەو خودا نووسیویەتی لەچارەی کچانی ئادەمو سووچی تۆی تیا نییە، دەی خۆت بشۆرەو غوسڵی سوننەتی ئیحرام دابەستن ئەنجام بدەو ئیحرامی حەج دابەستەو هەرچی حاجی دەیکا تۆیش بیکە، بەڵام تەوافی بەیت مەکە، تاپاك دەبیتەوە) عائیشەیش وایکردو هەموو مەڵبەندو وێستگاو کردارەکانی حەجی ئەنجامدا، لەمینا لە بێنوێژییەکەی پاکەوە بوو، ئەوسا تەوافی کابەی ئەنجام دا، هەروا سەعیی نێوانی صەفاو مەڕوەی ئەنجامدا. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عائیشەی فەرموو: (ئێستا تۆ لە حەجو عەمرەکەت بوویتەوە). عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئەوە بووە بەگرێ لەدڵما کەبەر لە ئەنجامدانی حەج تەوافی بەیتم ئەنجام نەدا، هەروا سەعیی نێوانی صەفاو مەڕوە، بەهۆی ئەمەوە واهەست دەکەم کە لەچاو خەڵکی تردا من بەجێماوم؟!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ قەرەبوو و دڵدانەوەی عائیشە، بە عەبدوڕەحمانی برای عائیشەی فەرموو: (ئەی عەبدوڕەحمان! عائیشەی خوشکت ببە، لە تەنعیمەوە عەمرەیەکی پێ بکە). ئەم گفتوگۆو ...ستانی عەمرە کردنەی عائیشە لە تەنعیمەوە، لەشەوی حەصبەدا بوو. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ١٥٣٨ + تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧ + زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦١٧}.

٧٦١- عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فِي أُنَاسٍ مَعَهُ قَالَ أَهْلَلْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فِي الْحَجِّ خَالِصًا لَيْسَ مَعَهُ عُمْرَةٌ - قَالَ عَطَاءٌ قَالَ جَابِرٌ - فَقَدِمَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَنَا النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - أَنْ نَحِلَّ وَقَالَ « أَحِلُّوا وَأَصِيبُوا مِنَ النِّسَاءِ » . قَالَ عَطَاءٌ قَالَ جَابِرٌ وَلَمْ يَعْزِمْ عَلَيْهِمْ وَلَكِنْ أَحَلَّهُنَّ لَهُمْ فَبَلَغَهُ أَنَّا نَقُولُ لَمَّا لَمْ يَكُنْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ خَمْسٌ أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ إِلَى نِسَائِنَا فَنَأْتِي عَرَفَةَ تَقْطُرُ مَذَاكِيرُنَا الْمَذْىَ قَالَ وَيَقُولُ جَابِرٌ بِيَدِهِ هَكَذَا وَحَرَّكَهَا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فَقَالَ « قَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّى أَتْقَاكُمْ لِلَّهِ وَأَصْدَقُكُمْ وَأَبَرُّكُمْ وَلَوْلاَ هَدْيِى لَحَلَلْتُ كَمَا تَحِلُّونَ فَحِلُّوا فَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِى مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ » . فَحَلَلْنَا وَسَمِعْنَا وَأَطَعْنَا. [٧٦١]

عەطاء (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، لەناو کۆمەڵێ خەڵکا، کە لەگەڵیا بوون، دەیفەرموو: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیحرامی حەجی پەتیمان دابەست، کە عەمرەی لەگەڵدا نەبێ، عەطا فەرمووی: جا جابیر فەرمووی: پێغەمبەرو خەڵکەکە، سەر لەبەیانی ڕۆژی چواری مانگی قوربان گەیشتنە بەرەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد، کە ئیحرام

[٧٦١] بخاری: ٢٥٠٥، مسلم: ٢٩٣٥ شیحا.

بـشكێنين، وه فـەرمووی پێمـان: (ئیحـرام بـشكێنن، تەنانـەت وەك پـێش ئیحـرام دابەستن ژنەكانتان حەڵاڵ دەبنەوه بۆتانو دەتوانن لەگەڵیان دروست ببن).

عەطاء فـەرمووی: جـابیر فـەرمووی: (بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) جەختی لێیان نـەكرد كـە هـەر دەبـێ دروسـت بـبن لەگـەڵ حـەڵاڵو هاوسەری خۆیاندا، بەڵام هـەر رێگـەی ئـەوەی پێیـان دا، كـە لـەم ماوەیـەدا هـەتا ئیحرام دادەبەستنەوه بەشێوەی ئاسایی پێـشین، هـەموو شـتێكی رەوا لەگـەڵیانا رەوایه.

جـابیر فـەرمووی: جـا هـەواڵ دەگاتـەوه بـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) كە گوایه ئێمه گوتومانە: (خۆ ئەوه تەنها هەر پێنـج رۆژمان ماوه بۆ وەسـتان لـەكێوی عەرەفـە، كەچـی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانمان پێـدەكا، كـە ژنـەكانمام حـەڵاڵن بۆمـانو دروسـت بـوونو سـەرجێیی لەگەڵیانا، لەم ماوەیەدا دروستە، دەی شتی وا سەردەكێشێ بـۆ ئـەوه، كـە لـەكاتی وەستان لەچیای عەرەفە تۆمـاو لـە چووكمان بتكێ لەبـەر نزیكی ئەنجامـدانی سەرجێیی لەگەڵ هاوسەرەكانماندا، ئەمە جێگەی سەرسوڕمانە).

عـەطـا فـەرمووی: جـابیر (رەزای خـودای لێ بـێ) بـەجوڵانی پەنجـەكانی دەستی ئاماژەی دەكرد بۆ چۆنی چۆڕانەوەی تۆماو لەچووكی پیاو!!

جـا كـە ئـەم هـەواڵو بـاسو خواسـە گەیـشتەوه بـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوه، وتارێكی دا بۆمان، تیادا فەرمووی: (ئێـوه خۆتـان بـاش بـاش دەزانـن كـەمن لەهـەمووتان زیـاتر لـەخودا دەترسـەمو خـۆم دەپـارێزم لـەبێ فـەرمانی ئـەو زاتـە مەزنـە، وه هـەروەها لەهـەمووتان راسـتگۆترمو لەهەمووشـتان چـاكە خواسـترم، دەی بـەش بـەحاڵی خـۆم ئەگـەر ئـاژەڵی دیـاری بەیتم پێ نەبوایه منیش لەم ماوەیەدا، هەتا رۆژی تەروییە، وەك ئێـستای ئێـوه

ئیحرامم دەشکان، کەواتە دڵنیابن لەکارەکەو ڕاڕا مەبن‌و بە بیانوی نابەجێ فەرمانەکەی من مەبەزێنن، بەڵکوو جێبەجێی بکەن‌و ئیحرام بشکێنن، دەی من بۆ خۆم ئەگەر ڕای پێشینم ڕای ئێستام بوایە (کورت گوتەنی خۆمان: ئەگەر عەقڵی ئێستام ئەوسا بوایە) منیش دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێناو ئێستا لەگەڵ ئێوەدا ئیحرامم دەشکاند).

جابیر فەرمووی: ئیتر ئێمەیش (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا)مان لێ کردو ئیحراممان شکاند.

بۆ ڕوونکردنەوەو بەهرەی زیاتر ژمارە: (٦٧٠)ی پوختەی موسلیمیش ڕاگوێز دەکەین:

عَنْ مُوسَى بْنُ نَافِعٍ قَالَ: قَدِمْتُ مَكَّةَ مُتَمَتِّعًا بِعُمْرَةٍ قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِأَرْبَعَةِ أَيَّامٍ، فَقَالَ النَّاسُ: تَصِيرُ حَجَّتُكَ الآنَ مَكِّيَّةً، فَدَخَلْتُ عَلَى عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ فَاسْتَفْتَيْتُهُ؟ فَقَالَ عَطَاءٌ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ أَنَّهُ حَجَّ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَامَ سَاقَ الْهَدْيَ مَعَهُ، وَقَدْ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ مُفْرَدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَحِلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ، فَطُوفُوا بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَقَصِّرُوا وَأَقِيمُوا حَلاَلاً حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بِالْحَجِّ، وَاجْعَلُوا الَّتِي قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً ». قَالُوا: كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً وَقَدْ سَمَّيْنَا الْحَجَّ؟ قَالَ: « افْعَلُوا مَا آمُرُكُمْ بِهِ، فَإِنِّي لَوْلاَ أَنِّي سُقْتُ الْهَدْيَ، لَفَعَلْتُ مِثْلَ الَّذِي أَمَرْتُكُمْ بِهِ، وَلَكِنْ لاَ يَحِلُّ مِنِّي حَرَامٌ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ »، فَفَعَلُوا. {الحديث: ٢٩٣٧ = ٢٩٢١ ف.م. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٨٣، ژمارە: ٧٥٦ = ١٥٦٨. تحفة الأشراف: ٢٤٩٠}:

موسای کوڕی نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ حەج، لەسەر شێوەی حاجی موتەمەتتیع، کاتێ گەیشتمە مەککە، عەمرەم ئەنجامدا لەپێش ڕۆژی تەروییەدا بەچوار ڕۆژ، خەڵکەکە گوتیان: حەجەکەت بوو بە

حەجێکی مەککەیی، پاداشی کەمە، چونکە ئەرکی کەمە، جا منیش بوو بەگرێ لەدڵماو چووم  بۆ خزمەتی زانای پایە بەرز: عەتای کوڕی ئەبو رەباح و لەم لایەنەوە پرسیارم لێی کرد؟

عەتاء فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری گێڕایەوە بۆم فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشتری دیاریی بەیتی لەگەڵ خۆی برد، من خۆم لە خزمەتیدا چووم بۆ حەج، لەو حەجەدا حەجکاران بەس ئیحرامی حەجیان بەجیا دابەستبوو، لەسەر شێوەی ئیفراد، کە برێتییە لە کردنی حەج بەتەنها بەبێ عەمرە، جا کاتێ گەیشتینە مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: (ئەوەی لەئێوە حەیوانی دیاریی بەیتی نیشانە نەکردووە، با حەجەکەی هەڵوەشێنێتەوەو بیکا بە عەمرە، لەسەر ئەم شێوەیە: تەوافی بەیت و سەعی نێوانی صەفاو مەروە بکاو مووی سەری کورت بکاتەوە، ئیتر کردارەکانی عەمرە تەواو، ئیتر لەوەپاش لەم ماوەیەدا بەبێ ئیحرام لە مەککە بمێنێتەوە، هەتا رۆژی تەروییە، کە رۆژی هەشتەمی مانگی قوربانە، جا ئەوانەی کە لەسەر ئەم شێوە ئیحرام دەشکێنن ئەوسا سەرلەنوێ لەناو مەککەوە ئیحرامی حەج بەجیا دابەستنەوە، وە ئەو حەجەی کە بەتەنها، لەپێش هاتنتان بۆ مەککە ئیحرامیتان بەستبوو لەسەر ئەم شێوەیەی باسکرا بیکەن بە عەمرە، وە لەم ماوەیەدا هەتا رۆژی تەروییە پشوو وەرگرن و بیکەن بە حەسانەوە).

حاجیان فەرموویان: چۆن بیکەین بە عەمرەو پشوو وەرگرین، خۆ ئێمە لەسەرەتاوە ناوی حەجمان لێ ناوەو نێتی حەجمان هێناوە، کەواتە ئیتر چۆن بیکەین بە عەمرە؟  پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من چیتان پێ دەڵێم بەبێ چەندو چوون بیکەن، خۆشم لەبەرئەوە نەبێ کە ئاژەڵی

نیاری بەیتم لەگەڵ خۆم هێناوە دەنا هەمان شتم دەکرد کە بەئێوە دەڵێم بیکەن، بەڵام ئەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام دابەستنەوە لەمن قەدەغە بوون، بۆم رەواو حەڵاڵ نابنەوە، هەتا ئاژەڵە دیارییەکانم نەگەنە جێگەی دیاریکراوی خۆیان‌و کاتی سەربڕینیان نەیەت، کە ئەومیە لە رۆژی دەی قوربانا لە مینا سەرببڕێن‌و بدرێن بە پێشیاوان).

ئەنجا ئێمەش وەك حەزرەت فەرمووی، ئەوانەمان کە دیاریی بەیتیان پێ نەبوو، تەوافی بەیت‌و سەعی نێوانی صەفاو مەروەمان کردو مووی سەرمان کورت کردەوەو ئیحرامەمان شکاندو چووینە لای ژنی خۆمان‌و وەك جاران جل‌و بەرگی ئاساییمان پۆشییەوە، وە تاقی ئێوارەی رۆژی تەروییە، سەرلەنوێ لەناو مەککەوە ئیحرامی حەجمان دابەستەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ١٥٢٧ + ژمارە: ١٥١٨، زنجیرە: ٨٧}.

٧٦٢- حديث جَابِرٌ قال أمر النبي (صلى الله عليه وسلم) عليا أن يقيم على حرامه. قال جابر: فَقَدِمَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (ضى الله عنه) بِسِعَايَتِهِ ، قَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم): « بِمَ أَهْلَلْتَ يَا عَلِيُّ » . قَالَ بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « فَأَهْدِ وَامْكُثْ حَرَامًا كَمَا أَنْتَ » . قَالَ وَأَهْدَى لَهُ عَلِيٌّ هَدْيًا: [٧٦٢]

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی حەجی ماڵاواییدا، عەلی لە یەمەنەوە هات بۆ حەج، کە عەلی لەوێ لەیەمەن، سەرکاری پێغەمبەر بوو، کاربەدەستی پێغەمبەر بوو، بۆ کۆکردنەوەی زەکات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عەلی فەرموو: (ئیحرامت چۆن دابەستووە؟) عەلی فەرمووی: (گوتوومە: ئەوا ئیحرامم دابەست رێك وەك ئیحرام دابەستنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی

---

[٧٦٢] بخاری: ٢٥٠٥، مسلم: ٢٩٣٥.

پێکرد کە بەردەوام بێ لەسەر ئیحرامەکەی‌و ئیحرام نەشکێنێ، چوونکە دیاری (هەدی) بەیتی واپێ.

لێرەدا بۆ پتر روونکردنەوەی ئەم گێڕانەوەی ژمارە: (٧٨٦)ی تەجرید بۆ شەرحی ئەم فەرموودەیە راگوێز دەکەین، بەپشتی خودای گەورەو سەرومر:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عبداللهِ رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: أَهَلَّ النَبِيّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ بالحَجِ، وَلَيْسَ مَعَ أحَدٍ مِنْهُم هَدْىٌ غَيْرَ النبِيّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَطَلْحَةَ، وَ قَدِمَ عَلِيٌّ مِنَ اليَمَنِ وَمَعَهُ هَدْىُ، فَقَال: أَهْلَلْتُ بِما أَهَلَّ بِهِ النَبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأمَرَ النَبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصْحَابَهُ أنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً وَيَطوفُوا، ثُمَّ يُقَصِرُوا وَيَحلّوا إلاّ مَنْ كانَ مَعَهُ الهَدْىُ، فَقَالُوا: نَنْطَلِقُ إلى مِنى وَذَكَرُ أَحَدِنَا يَقْطُرُ، فَبلَغَ النبِيَّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لَوِ أستَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِ مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَولاَ أَنَّ مَعِي الهَدْيَ لأَحْلَلْتُ) (الحديث:١٦٥١):

جابری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەرو هاوڕێکانی ئیحرامی حەجیان دابەست، جگە لە پێغەمبەرو طەلحە، کەسیان دیاری بەیتیان پێ نەبوو، عەلیش لە یەمەنەوە هات بۆ حەج ئاژەڵی دیاری لەگەڵ خۆی هێنابوو، عەلی فەرمووی: منیش کاتی ئیحرام دابەستن گوتوومە: ئەوا ئیحرامم دابەست رێك وەك ئیحرام دابەستنی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- جا لەمەککە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی کرد بەهاوڕێکانی، کە حەجەکەیان بکەن بە عەمرە، لەسەر ئەم شێوەیە: تەوافی بەیت بکەن‌و تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوەیش بکەن‌و ئەوجا مووی سەریان کورت بکەنەوە، ئیتر ئیحرام بشکێنن، هەتا ڕۆژی تەرویە (بڕ: ژمارە/٧٥٦ لە تەجریدی بوخاری) بەڵام ئەوانەیان کە ئاژەڵی دیاری

بەيتيان واپێ بابەردەوام بن لەسەر حەجەكەيان‌و ئيحرام نەشكێنن‌و نەيكەن بە عەمرە.

هاوڕێيانى پێغەمبەريش -دروودى خواى لەسەر بێ- وەك سەرسام بوونێ، فەرموويان: شتى وا سەيرە! چونكە سەردەكێشى بۆئەوە، كاتێ ئيحرام ببەستينەوەو بكەوينە ڕێ لە مەككەوە بەرەو ميناو عەرەفات، چووك (زەكەر) مان مەنى لێ بتكێ، كە ئيحرام بشكێنين، لەگەڵ ژنيش كۆدەبينەوە، شتى وايش لەگەڵ بارى حەج دا ڕێ ناكەوێ.

جا كاتێ ئەم قسەيەيان گەيشتەوە بەپێغەمبەر -دروودى خواى لەسەر بێ- فەرمووى: (لەدەستم چوو ! دەنا ئەگەر ئێستام ئەوسا بوايە، منيش ئاژەڵى ديارى بەيتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، وەلەبەر ئەوەيش نەبێ كەدياری بەيتم واپێ منيش ئێستا دەمكرد بە عەمرەو ئيحرامم دەشكاند).

## ڕوونكردنەوە:

أ- جەعفەرو عەلى‌و عەقيل‌و طاليب، هەرچواريان برا بوون، هەق ئامۆزاى پێغەمبەر بوون، چونكە هەرچواريان كوڕى ئەبو طاليبى مامەى بوون، كە ئەبو طاليب هەق براى باوكى‌و دايكى عەبدوڵلاى كوڕى عەبدولموطەليب بوو، كە عەبدوڵلا باوكى پێغەمبەر بوو، واتە: پێغەمبەر لەپشتەوە لەم چوار ئامۆزايەى خزمى نزيكترى نەبووە، جەعفەر دە ساڵ لەعەلى گەورەتر بوو، عەقيليش دە ساڵ لە جەعفەر گەورەتر بوو، طاليبيش دە ساڵ لە عەقيل گەورەتر بوو، واتە: طاليب يەكەم بوو، عەقيل دووەم بوو جەعفەر سێيەمبوو عەلى چوارەم بوو. تاليبيان لەغەزاى بەدردا بێ سەرو شوێن بوو، موسوڵمان نەبوو، جەعفەريان لە كۆچكارە پێشينەكان بوو، كۆچى كرد بۆ وڵاتى حەبەشە، لەغەزاى خەيبەردا

گەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ) (نازانم بەکام لەم دوو موژدە خۆشە، شادمانترم، بەهاتنی جەعفەر، یان بەئازادکردنی خەیبەر!).

ناوداره بە جەعفەری تەییار، واتە: جەعفەری باڵدار، چونکە لەغەزای مۆتەدا، لەوڵاتی شام، لەشەڕ لەگەڵ سوپای ڕۆمدا، کە شەهید کرا، هەردوو دەستی پەڕی، وە تەرمەکەی بەشەهیدی کە دۆزرایەوە، زیاتر لە نەوەد سەرە ڕمو دەمە شیرو جێگەی تیری پێوە بوو، لەوەدوا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جەعفەرم دی لە بەهەشتا لەگەڵ فریشتەکانا، بەدوو باڵ دەفڕی!).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەستووری وابوو، کاتێ سلاوی لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دەکرد، دەیفەرموو: (سلاو لەتۆ، ئەی کوڕی خاوەنی دووباڵ!).

لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێمشەو جەعفەرم پێ گەیشت، لەناو پۆلێ فریشتەدا بوو، هەردوو باڵی خەڵتانی خوێن بوو).

جەعفەر برای باوكو دایکی عەلی بوو، دەڵێن: بیستو شەشەم کەس بووە، کە موسوڵمان بووە، پێغەمبەر پێی فەرموو: (هەم شێوەی شیرینتو هەم ڕەفتاری جوانت لەخۆم دەچن!).

جەعفەر هەژارانی زۆر خۆشدەویست، خزمەتی زۆری دەکردن، بەدەستی خۆی نانو ئاوی بۆ دادەنانو لەلایان دادەنیشتو قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن، پێغەمبەریش ناوی نابوو (باوکی هەژاران!) لەکاتی موئاخاتدا — واتە: لەکاتی پەیمانی برایەتی بەستندا لە نێوان موسوڵماناندا — پێغەمبەر (دروودی

خوای لەسەر بێ) جەعفەری کرد بەبرای موعازی کوڕی جەبەل، نەجاشی پادشای حەبەشەو تاقمەکەی لەسەر دەستی جەعفەردا موسوڵمان بوون، کاتێ جەعفەر هاتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناوچەوانی ماچ کرد. ئیمامی جەعفەر دەوری چل ساڵ ژیاوە، لەساڵی هەشتی کۆچیدا، لەغەزای مۆتەدا شەهید بوو. (بڕوانە: تاج/٣ زنجیرە: ١٨ ژمارە: ٣٣٥٢ هەتا ژمارە: ٣٣٥٦ + تاج/٤ زنجیرە: ١٠٠ ژمارە: ٤٦٤٠، ٤٦٤١، ٤٦٤٢. ج/٤).

عەقیل درەنگ موسوڵمان بوو، لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا فەرموودەی نییە، زانایەکی ڕەگەزناس بوو، لەمزگەوتەکەی مەدینەدا، قاڵیچەیەکی دادەخستو لەپاش نوێژ لەسەری دادەنیشتو خەڵك لەدەوری کۆمەڵ دەبوون، فێری زانستی ڕەگەزناسی دەکردن، پیاوێکی وەڵام ئامادە بوو، وەڵامەکانی دەمکوتکەر بوو، لەعەلی برای جیاوە بوو، لەگەڵ موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، کە موعاویە نەیاری عەلی بوو، دەڵێن: ڕۆژێ، موعاویە دەڵێ: (عەقیل دەزانێ من بۆ ئەو لە عەلی برای باشترم، بۆیە لەگەڵ ئێمەدایەو وازی لە عەلی برای هێناوە!). عەقیل (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (قسەی ڕاستت دەوێ، براکەم بۆ ئایینم، بۆ من لەتۆ باشترە، وەتۆ بۆ من بۆ جیهانم لەو باشتری بۆم، وەمن ئێستا دوای دونیا کەوتووم، بەڵام لەخودای گەورە داوا دەکەم کە ئاخرم بەخێر بگێڕێ).

عەقیل (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەرەتای جێنشینی یەزیدی کوڕی موعاوییەوە مردووە. ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا دەفەرموێ: خۆم فەرموودەیەکم گێڕاوەتەوە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی ئەبو یەزید! من لەبەر ئەم دوو هۆیە، دووجار تۆم خۆشدەوێ: جارێ لەبەر ئەوە کە تۆ خزممی و ئامۆزامی، جارێکیش لەبەر ئەوە کە دەزانم ئەبو




تالیبی مامەم، کە بۆ من زۆر باش بوو، تۆی زۆر خۆشدەویست). (ڕەزای خودا لە ئەبویەزید — واتە: لەعەقیل - بێت).

ئــەمیرولمونمنین ئیمــامی عــەلی (ڕەزای خــودای لێ بــێ) هــەق ئــامۆزای پێغەمبــەر بــوو، هــەم زاوای پێغەمبــەرە، مێــردی فاتیمــەی کــچیەتی، بــاوکی حەســەنو حــسەینە، بــەپێی پــەیمانی گرێــدانی برایــەتی، (المؤاخــاة) عــەلی بــوو بــەبرای پێغەمبــەر، پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) پێــی فــەرموو: (تــۆ لەدونیاو لە قیامەتا برای منی!) عەلی یەکێ بــوو لــەو دە کەســەی کــە پێغەمبــەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مــوژدەی بەهەشــتی پێــدابوون، کــە ناســراو بــوون بــە عەشەرەی موبەششەرە، واتــە: دە کەســە مــوژدەی بەهەشــت پــێ دراوەکــان. عــەلی جێنــشینی چــوارەم بــوو، کاتــێ عوسمــان شــەهید کــرا، عــەلی کــرا بەخەلیفــەی موسوڵمانان. عەلی پیاوێکی زاهیدی دونیا نەویست بوو، تەواو خوداپەرست بــوو، هەتا بڵێی زاناو دانا بوو، زۆر دادپەروەرو بە ویــژدانو هــەقانی بــوو، هــەتا بڵێــی ڕۆشــنبیرو ڕەوانبێــژبوو، خوێنــەوار بــوو، نووســەری پەیماننامەکەی حودەیبییــە بــوو، دایکــی عــەلی نــاوی فــاطیمــەی کــچی ئەســەد بــوو، کاتــێ عــەلی لــەدایك بــوو، فاطیمەی دایکی ناوی نا (حەیدەر) (بڕوانە: تاج/٤ زنجیرە:٩٠ ژمارە: ٤٦١١).

فاطیمەی دایکــی عــەلی، موســوڵمان بــوو، وەکۆچــی کــرد بــۆ مەدینــە، عــەلی زاناو دانایەکی بلیمەت بوو، کتێبی نەهجولبەلاغەکەی، بەڵگەی ئــەم گوتەیەیــە، بــەڵام لەبــەر ئــەوەی زۆر بەتــەقوا بــوو، قــەت سازشــی نــەدەکرد لەگــەڵ دونیــادا، قوڕەیشی هۆزی خۆی، تانەی ئەوەیان لێ دەدا: کە عەلی لەسیاسەت نازانێ!

لەهــەموو جــەنگو نەبەردەکانــدا، لــە خزمــەت پێغەمبــەردا بــوو، جگــە لەغــەزای تــەبووك، لەغــەزای خەیبــەردا ئاڵاکــە لای عــەلی بــوو، زۆر بــە منــداڵی موســوڵمان بــووە، لــەماڵی پێغەمبــەردا پــەروەردە بــووە، لــە پێغەمبــەرەوە (٥٨٦)

فەرموودەی گێڕاوەتـەوە، (٢٠) بیـستیان پەسـەندی شـەیخەینە، بوخـاریش بـەبێ موسـلیم نـۆی تریـانی لـە صـەحیحی بوخاریـدا گێڕاوەتـەوە، موسـلیمیش بـەبێ بوخاری پازدەی تریانی گێڕاوەتەوە، کەواتە: (٢٩) فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، وە (٣٥) فــەرموودەی لــە موســلیمدا هەیــە، ســەرجەمی فــەرموودەکانی لــە صــەحیحەیندا، دەکاتــە: ٢٠ + ٩ + ١٥ = ٤٤ فــەرموودە. پێــنج ســاڵ شــتێ کــەم جێنشینی (خەلافەتی) کردووە، بەشەهیدی مردووە، خەلیفەی دووەمو سێیەمو چوارەم بەشەهیدی مردوون، تەمەنی عەلی لەکاتی مەرگیـدا شەسـتو سێ ساڵ بوو. لەشەوی یەك شـەممە، لـە نـۆزدەی ڕەمـەزانی ساڵی چلی کۆچی، لەکووفـە بەدەستی عەبدولڕەحمانی کوڕی مولجەمی ئەلموڕادی شەهید کرا، هەندێ دەڵێن: نەبەیانی ڕۆژی هەینی، شەوی حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچی لە کووفە ئیبنـو مولجـەم شـەهیدی کـرد، حەسـەنو حوسـەینی کـوڕی شـۆردیان، لەگـەڵ عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەردا، حەسەنی کوڕی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، عەلی سەوزەیەکی تۆخ بوو، چاوەکانی قەوی بوون، بالآی لەکورتەوە نـزیکتر بوو، هەتا لەدرێژەوە، ورگی کەمێ هەبوو، مووی چڕو پڕ بوو، ڕیشی گەورە بوو، کڕانە (ئەصلەع) بوو، سەروڕیشی پـاك سـپی بووبـوو، چوارشـانەیەکی تێکسمڕاو بوو، دەتگوت: مانگی چواردەیە، تەنیا خۆی لەناو یارانی پێغەمبـەرداناوی عـەلی کوڕی ئەبو تالیبـە، بـەلآم لـەناو فـەرموودە گێڕەوەکانـدا هەشـت کەسـی تـر بـەم ناوەوە هەیە. (تاج/٣ زنجیرە:٩ ژمارە: ٣٢٨٨ هەتا ژمارە: ٣٣١١. چاپی چووارەم) + (تەجریدی بوخاری/ ٢ ژمارە: ٧٦١ + پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ٣٦).

٧٦٣- عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْـدِ اللّـهِ (رضـى الله عنهمـا) أَنَّ النَّبِـيَّ (صـلى الله عليـه وسلم) أَهَلَّ وَأَصْحَابُهُ بِالْحَجِّ وَلَيْسَ مَعَ أَحَدٍ مِنْهُمْ هَدْىٌ ، غَيْرَ النَّبِـيِّ (صـلى الله عليـه وسلم) وَطَلْحَةَ ، وَكَانَ عَلِيٌّ قَدِمَ مِنَ الْيَمَنِ ، وَمَعَهُ الْهَدْىُ فَقَالَ أَهْلَلْـتُ بِمَـا أَهَـلَّ بِـهِ

رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) . وَإِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَذِنَ لأَصْحَابِهِ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً ، يَطُوفُوا بِالْبَيْتِ ، ثُمَّ يُقَصِّرُوا وَيَحِلُّوا ، إِلاَّ مَنْ مَعَهُ الْهَدْىُ ، فَقَالُوا نَنْطَلِقُ إِلَى مِنًى وَذَكَرُ أَحَدِنَا يَقْطُرُ فَبَلَغَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ « لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِى مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ ، وَلَوْلاَ أَنَّ مَعِى الْهَدْىَ لأَحْلَلْتُ » . وَأَنَّ عَائِشَةَ حَاضَتْ فَنَسَكَتِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا ، غَيْرَ أَنَّهَا لَمْ تَطُفْ بِالْبَيْتِ قَالَ فَلَمَّا طَهُرَتْ وَطَافَتْ ، قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَنْطَلِقُونَ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ ، وَأَنْطَلِقُ بِالْحَجِّ فَأَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِى بَكْرٍ أَنْ يَخْرُجَ مَعَهَا إِلَى التَّنْعِيمِ ، فَاعْتَمَرَتْ بَعْدَ الْحَجِّ فِى ذِى الْحَجَّةِ ، وَأَنَّ سُرَاقَةَ بْنَ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ لَقِىَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ بِالْعَقَبَةِ ، وَهُوَ يَرْمِيهَا ، فَقَالَ أَلَكُمْ هَذِهِ خَاصَّةً ، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «لاَ ، بَلْ لِلأَبَدِ»: [٧٦٣]

ئـەم فەرموودەیـە بەشـی زۆری لـەژمارە (٧٦٢)دا رابـورد، هـەتا ئـەوێ کـە دەفەرموێ: (کە دیاری بەیتم واپێ، منیش ئێستا دەمکرد بـە عـەمرەو ئیحـرامم دەشکاند).

ئەمەیش لەدواوە مەندە (باقییە)کەیەتی: هەروەها جابیر (رەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: لـەو حـەجـەدا عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (درووودی خـودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بـێ) کەوتـە سـەر بێ نوێژیی، بەڵام هەموو دەستوورو رێساکانی حـەجی بـەجێ هێنـا، تـەنیا هـەر تەوافی بەیتی نەکرد، جـابیر فـەرمووی: جـا کاتـێ عائیـشە لـە بـێ نوێژییەکەی پاکـەوەبوو، تـەوافی بـەیتی کـردو گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئێـوە هـەم عەمرەو هەم حەجتان ئەنجام داو یـەکی عەمرەیـەك‌و حـەجێ دەبەنـەوە، بـەڵام من هەر حەجم کـردووە، ئەمـە چۆنە؟ جـا پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی کـرد بـە عەبـدورەحمانی کـوڕی ئەبوبـەکری صـدیق، کـە بـرای

[٧٦٣] بڕوانە: (٧٦٢).

عائیشەیە، کە عائیشە بەرێ بۆ تەنعیم، لەوێ ئیحرامی عەمرەیەك دابەستێو تەواوی بکات، جا عائیشە لەپاش حەج، لەمانگی قوربانا ئەو عەمرەیەی تەواوکرد.

وە جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوراقەی کوڕی جوعشووم لە عەقەبە تووشی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرقاڵی ڕەمی جەمرەتول عەقەبە بوو، عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا کردنی عەمرە لەمانگی حەجدا، هەر بۆ ئێوە وایە بەتایبەتی، یا بۆ هەموو موسوڵمانێ وایە، هەتا هەتایە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا هەر بۆ ئێمە وانییە، بەڵکوو هەتا ڕۆژی قیامەت بۆ هەموو موسوڵمانێ هەر وایەو هەموو کەسێ دروستە بۆی کە لەمانگەکانی حەجدا عەمرە ئەنجام بدا!).

### (٢١) باب: في الوقوف وقوله تعالى: ﴿ثم أفيضوا من حيث أفاض الناس﴾ باسی وەستانی کێوی عەرەفەو مەبەست لەم ئایەتە ﴿ثم أفيضوا من حيث أفاض الناس﴾

٧٦٤- حديث عائشة: قَالَ عُرْوَةُ: كَانَ النَّاسُ يَطُوفُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ عُرَاةً إِلاَّ الْحُمْسَ ، وَالْحُمْسُ قُرَيْشٌ وَمَا وَلَدَتْ ، وَكَانَتِ الْحُمْسُ يَحْتَسِبُونَ عَلَى النَّاسِ يُعْطِي الرَّجُلُ الرَّجُلَ الثِّيَابَ يَطُوفُ فِيهَا ، وَتُعْطِي الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ الثِّيَابَ تَطُوفُ فِيهَا ، فَمَنْ لَمْ يُعْطِهِ الْحُمْسُ طَافَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانًا ، وَكَانَ يُفِيضُ جَمَاعَةُ النَّاسِ مِنْ عَرَفَاتٍ ، وَيُفِيضُ الْحُمْسُ مِنْ جَمْعٍ . قَالَ وَأَخْبَرَنِي أَبِي عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي الْحُمْسِ ( ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ ) قَالَ كَانُوا يُفِيضُونَ مِنْ جَمْعٍ فَدُفِعُوا إِلَى عَرَفَاتٍ: [٧٦٤]

---

[٧٦٤] بخاری: ١٦٦٥، ٤٥٢٠، مسلم: ٢٩٤٦.

عورووە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی نەفامیدا، خەڵك کە حەوت دەورەی بەیتیان ئەنجام دەدا، بەرووتو قووتی حەوت دەورەیان ئەنجام دەدا، تەنیا بەرەی قورەیش بەجلو بەرگەوە تەوافی بەیتیان ئەنجام دەدا، کە ناسراون بە (حومس).

جا حومسەکان بە ئومێدی پاداشی باشی لای خودا، جلو بەرگیان دەدا بە خەڵکانی تر کە تەوافیان پێوە بکەن، پیاو جلی دەدا بە پیاوو ژن جلی دەدا بەژن بۆ تەواف پێوەکردن، جا هەرکەسێ حومسەکان جلیان پێ نەدایێ، بەرووتو قووتی تەوافی دەکرد. جەماوەری خەڵکەکە لە عەرەفەوە ئیفاضەیان ئەنجام دەدا، بەڵام حومسەکان لە موزدەلیفە رادەوەستانو لەوێوە ئیفاضەیان ئەنجام دەدا.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بە (حومسە)کان دابەزیوە، کە دەفەرموێ: ( ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ).

عائیشە فەرمووی: حومسەکان لە موزدەلیفەوە ئیفاضەیان دەکرد، فەرمانیان پێ کرا: کە لە عەرەفەوە ئیفاضە ئەنجام بدەن.

ئەمەش دەقی گێڕانەوەی ژمارە (٧١٠)ی مختصر صحیحی موسلیمە، بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا، يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ/ وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ، أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ، فَيَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) {الحديث: ٢٩٤٥ = ٢٩٣٠ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٤٠ = ٢٥٢٠، ١٦٦٥ فتح الباري + تجريد/٢، رقم: ٧٩٠ = ١٦٦٤. أبو داود. حج: ١٩١٠. نسائي. حج: ٣٠١٢. تحفة الأشراف: ١٧١٩٠}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران هۆزی قوڕەیش‌و ئەوانەی لەسەر ئایینی قوڕەیش بوون، لە ڕۆژی عەرەفەدا، لە موزدەلیفە رادەوەستان، وە پێیان دەگوتن (حومس) کە کۆی (أحمس)ی عەرەبییە، واتە: دلێرەکان، عەرەبەکانی تریش لە عەرەفە رادەوەستان، کە لە دەرەوەی خاکی بەست (حەرەم)ە، جا کاتێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات، خودای گەورەو سەروەر، فەرمانی کرد بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەخاکی بەست (حەرەم) دەرچێ‌و لە موزدەلیفە نەوەستێ‌و وەك خەڵکانی تر بڕوات بۆ خاکی عەرەفات، لەوێ راوەستێ‌و لەپاشا لەوێوە داپەڕن‌و بڕۆن بۆ موزدەلیفەو مەشعەرولحەرام‌و مینا، وەك خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ – بەقەرە/١٩٩} واتە: ئێوەیش وەك موسوڵمانانی تر، هەر لەخاکی عەرەفاتدا راوەستن‌و هەر لەوێشەوە داڕژێن‌و وەرنە خوارەوە بۆ موزدەلیفەو، کاتێ لەلای مەشعەرولحەرامدا یادو زیکری خوداتان کرد، ئینجا لەوێوە هەڵ بڕژێنە خوارەوە بۆ مینا).

٧٦٥- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رضى الله عنه) قَالَ: أَضْلَلْتُ بَعِيرًا لِي، فَذَهَبْتُ أَطْلُبُهُ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَاقِفًا مَعَ النَّاسِ بِعَرَفَةَ فقُلْتُ: وَاللَّهِ إِنَّ هَذَا لَمِنَ الْحُمْسِ فَمَا شَأْنُهُ هَا هُنَا؟ وَكَانَتْ قُرَيْشٌ تُعَدُّ مِنَ الْحُمْسِ. {الحديث: ٢٩٤٧ = ٢٩٣٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٩٠ = ١٦٦٤. نسائی. حج: ٣٠١٣. تحفة الأشراف: ٣١٩٣} : [٧٦٥]

جوبەیری کوڕی موتعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وشترێکم ون بوو بوو، ڕۆژی عارفە بوو، چووم بۆی بگەڕێم، بینیم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخاکی عەرەفات وەستا بوو، کە عەرەفات وا لە دەرەوەی

[٧٦٥] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١١ = ٢٩٤٧ = شيحا.

خـاکی حـەرەم، لەبەرئـەوە سـەرم سـوڕما، چـونکە پێغەمبـەر قوڕەیـشییە، قوڕەیـشیش بـە خۆیـان دەگـوت: حـومس، لەبەرئـەوە لـە ڕۆژی عەرەفـەدا، نەدەچـوون بـۆ عەرەفـەو لـە خـاکی حـەرەم دەرنەدەچـوون، لـە موزدەلیفـە دەوەسـتان، جا عەجـەب مـاەو گـوتم چ عەجـەب پێغەمبـەر لێـرە وەسـتاوە، خـۆ بەخوا ئەویش لە حومسەکانە).

**ڕوونکردنەوە:**

جوبەیر لە پیاو ماقوڵانی قوڕەیش بوو، نوێنەری قوڕەیش بـوو، کـە هاتـە خزمـەت حـەزرەت بـۆ بـەردانی دیلـەکانی غـەزای بـەدر، لـەکاتی ئـازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بـوو، زانایـەکی ڕەگـەز نـاس بـوو، لـە ئەبوبـەکری صدیقەوە فێری زانستی بنەچە ناسیو ڕەگەز ناسـی بـوو بـوو، شەسـت فـەرموودەی هەیـە، نۆیـان لـە بوخاریـدان، ئـەم فەرموودەیـەی ئێـرەی پەسـەندی هـەردوو پـیری بوخـاریو موسـلیمە. لـە مەدینـە لەسـاڵی پـەنجاو چـواری کۆچـیدا مـردووە، لەسەردەمی جێنشینیی موعاوییەدا.

## (٢٢) باب في نسخ التحلُّلِ مِنَ الإحْرَامِ وَالأمر بِالتَّمَامِ

## سڕینەوەی ئیحرام شکاندنی حەجو کردنی بە عەمرە، وە فەرمانکردن بە تەواوکردنی حەج

٧٦٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رضى الله عنه) قَالَ قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) وَهُوَ بِالْبَطْحَاءِ . فَقَالَ: «أَحَجَجْتَ » . قُلْتُ نَعَمْ . قَالَ « بِمَا أَهْلَلْـتَ » . قُلْتُ لَبَّيْكَ بِإِهْلاَلٍ كَإِهْلاَلِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسـلم). قَـالَ: « أَحْـسَنْتَ ، انْطَلِـقْ فَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ » . ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ نِسَاءِ بَنِي قَيْسٍ ، فَفَلَتْ رَأْسِي ، ثُمَّ أَهْلَلْتُ بِالْحَجِّ ، فَكُنْتُ أُفْتِي بِهِ النَّاسَ ، حَتَّى خِلاَفَةِ عُمَرَ (رضى الله عنـه) فَذَكَرْتُـهُ

نه . فَقَالَ إنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللّٰهِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُنَا بِالتَّمَامِ ، وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) فَإِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَحِلَّ حَتَّى بَلَغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ): [٧٦٦]

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم داستانە، ئەم دوو گێڕانەوەی تری ئەم فەرموودەیە دەنووسم:

یەکەم: هی تەجریدی بوخاری، بەرگی دووەم ژمارە (٧٤٨) ئاوا:

عَنْ أبي مُوسى رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: بَعَثَنِي النَبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إلى قَوْمٍ بالْيَمَنِ فجِئْتُ وَهُوَ بالبَطْحَاءِ، فقَالَ: (بِمَا أَهْلَلْتَ). قلْتُ: أَهْلَلْتُ كَإهْلالِ النَّبِيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (هَلْ مَعَكَ مِنْ هَدْيٍ) قُلْتُ: لا، فَأَمَرَني فَطُفْتُ بالبَيْتِ وَبالصَّفَا والمَرْوَةِ ثُمَّ امرَني فَأَحْلَلْتُ فَاتَيْتُ أمرَأَةً مِنْ قَوْمي فَمَشَطَتْني، أوْ غَسَلَتْ رأسي. فقَدِمَ عمرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ، فَقَالَ: إنْ نَأخُذْ بِكِتابِ اللهِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُنا بالتَّمام، قَالَ اللهُ: (وَأَتِمُّوا الحَجَّ وَالعُمْرَةَ لله). وَإنْ نَأخُذْ بِسُنَّةِ النبيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الهَدْيَ.(الحديث ١٥٥٩ – أطرافه في: ١٥٦٥، ١٧٢٤، ١٧٩٥، ٤٣٤٦، ٤٣٩٧):

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- لەساڵی دەی کۆچیدا، ناردمی بۆ یەمەن کردمی بەسەرکاری سەرهۆزەکەی خۆم، جا ساڵی حەجی ماڵاوایی چووم بۆ حەج، کەچوومە بەرەوە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە ئەبطەح بوو، واتە: لە (موحەصصەب = تەحصیب = حەصبە = بەطحاء = خەیفی بەنی کینانە) لە سەرەتای حەجەوە بوو، فەرمووی: (ئیحرامت چۆن دابەستووە؟) گوتم: ئاوا ئیحرامم دابەستووە: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چۆن ئیحرامی

[٧٦٦] تجرید/٢ ژمارە: ٧٤٨ = ١٥٩٩ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢ ژمارە: ٦٧١ = ٢٩٥٠ شیحا.

دابەستووە منیش وەك ئیحرام بەستنەكەی ئەو ئیحرامم دابەست. فەرمووی: (ئاژەڵی دیاری بەیتت هێناوە لەگەڵ خۆت، كە لەشەرعا پێی دەگوترێ: هەدی بەیت؟). گوتم: نەء، پێم نییە. فەرمووی: (دەی مادەم دیاری بەیتت لەگەڵ خۆت نەهێناوە برۆ تەوافی بەیتو تەوافی صەفاو مەڕوە بكە، ئەوجا ئیحرام بشكێنەو تەمەتووعو خۆشی وەربگرە، منیش وام كردو فەرمانەكانی پێغەمبەرم بەجێ هێناو ئەوجا ئیحرامم شكاندو چووم بۆلای ژنێكی خزمی خۆم قژەكەمی بۆ شانە كردم – یافەرمووی: سەری شۆردم.

ئەبو مووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاكاتێ سەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) هات، وەباسی ئەوەم دەكردو فەتوای تەمەتتوعم لە حەجدا دەدا، دوایی بیستمەوە كەعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) نەهی لە تەمەتتوع دەكاو تەمەتتوعی لە حەجا پێ ناخۆشە.

جاكاتێ بەخزمەتی عومەر گەیشتمو ئەمەم عەرزی كردو عەرزیم كرد تۆ بۆ تەمەتتوعت لەحەج دا پێناخۆشە، عومەر لەوەڵاما فەرمووی: (من ئیحرام ناشكێنمو ڕام وانییە، چونكە شتی وا پێچەوانەی نامەی خوداو سوننەتی پێغەمبەرە -درودی خوای لەسەر بێ- ئەوەتا قورئان بەدەق دەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا الحَجَّ وَالعُمْرَةَ للهِ – واتە: ئەی مسوڵمانان! حەجو عەمرەتان كەدەست پێكرد، تەواویان بكەن، وە هەر بۆ خودا ئەنجامیان بدەن﴾. خۆ ئەگەر كار بەسوننەتی پێغەمبەریش بكەین، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- خۆی كە حەجی دابەست ئیتر ئیحرامی نەشكان هەتا ئاژەڵی دیاری بەست (حەرەم)ی سەربڕی).

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم داستانی نێوانی ئەبومووساو ئیمامی عومەرەوە بڕوانە تاج/٢/١٧٤ ز/٩٠) باسی تەمەتتوع.

**دووەم: گێڕانەوەی ژمارە (٦٧١) لە پوختەی موسلیم، ئاوا:**

**عَنْ أَبِي مُوسَى (رضى الله عنه) قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ مُنِيخٌ بِالْبَطْحَاءِ فَقَالَ: « بِمَا أَهْلَلْتَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ أَهْلَلْتُ بِإِهْلاَلِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: « هَلْ سُقْتَ مِنْ هَدْيٍ؟ » قُلْتُ: لاَ. قَالَ: « فَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ثُمَّ حِلَّ »، فَطُفْتُ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَبِالْمَرْوَةِ، ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ قَوْمِي فَمَشَطَتْنِي وَغَسَلَتْ رَأْسِي، فَكُنْتُ أُفْتِي النَّاسَ بِذَلِكَ فِي إِمَارَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَإِمَارَةِ عُمَرَ (رضى الله عنهما)، فَإِنِّي لَقَائِمٌ بِالْمَوْسِمِ، إِذْ جَاءَنِي رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي شَأْنِ النُّسُكِ، فَقُلْتُ: أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ كُنَّا أَفْتَيْنَاهُ بِشَيْءٍ فَلْيَتَّئِدْ، فَهَذَا أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ قَادِمٌ عَلَيْكُمْ، فَبِهِ فَائْتَمُّوا، فَلَمَّا قَدِمَ، قُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَا هَذَا الَّذِي أَحْدَثْتَ فِي شَأْنِ النُّسُكِ؟ قَالَ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: ( وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ) وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ نَبِيِّنَا محمد (صلى الله عليه وسلم) فَإِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الْهَدْيَ. {الحديث: ٢٩٥٠ = ٢٩٣٥ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٤٨ = ١٥٥٩، ١٥٦٥، ١٧٢٤، ١٧٩٥، ٤٣٤٦، ٤٣٩٧. نسائي. حج: ٢٧٣٧ تحفة الأشراف: ٩٠٠٨} :**

**ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەساڵی دەی کۆچیدا، ناردمی بۆ یەمەن، کردمی بەسەرکارو بەرپرسی سەر هۆزەکەی خۆم، جا ساڵی حەجی ماڵاوایی چووم بۆ حەج، کە چوومە بەرەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە بەطحاء (ئەبطەح = بەطحاء = موحەصەب = تەحصیب = حەصبە = خەیفی بەنی کینانە — تاج/٢، ژمارە: ١٦١٧ ج/٤) دابەزی بوو، لەسەرەتای حەجەوە بوو، فەرمووی: (ئیحرامت چۆن دابەستووە؟) گوتم: ئاوا ئیحرامم دابەستووە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن ئیحرامی دابەستووە منیش وەك ئیحرام**

بەستنەکەی ئەو ئیحرامم دابەست. فەرمووی: (ئاژەڵی دیاری بەیتت هێناوە لەگەڵ خۆت، کە لەشەرعا پێی دەگوترێ: هەدیی بەیت؟). گوتم: نەء، پێم نییە. فەرمووی: (دەی کەواتە مادەم دیاریی بەیتت لەگەڵ خۆت نەهێناوە، برۆ تەوافی بەیتو تەوافی صەفاو مەروە بکە، ئەوجا ئیحرام بشکێنەو تەمەتتوعو خۆشی وەربگرە). منیش وامکرد، فەرمانەکانی پێغەمبەرم بەجێهێناو ئەوجا ئیحرامم شکاندو چووم بۆلای ژنێ لە خزمانی خۆم، کە خۆیی (مەحرەم)م بوو، قژەکەمی بۆ شانە کردمو سەری بۆ دۆزیمو پاك شۆردی بۆم. ئیتر ئاوا لەسەر ئەم شێوەیەی باسمکرد، فەتوام بۆ حاجیان دەدا، کە ئەوەی دیاریی بەیتی پێ نەبێ دەتوانێ حەجەکەی بکا بە عەمرەو لەوەدوا ئیحرام بشکێنێ تا رۆژی تەروییە، ئەوسا حەج دابەستێتەوە لەسەر شێوەی تەمەتتوعو حەسانەوەو پشوودان، لەسەردەمی فەرمانڕەوایی‌و جێنشینی ئەبوبەکردا، هەتا سەردەمی فەرمانڕەوایی‌و جێنشینیی عومەر بەردەوام بووم لەسەر ئەم فەتوا دانە، جا ساڵێ لەکاتی حەجدا، لە مەڵبەندێ لە مەڵبەندەکانی کۆبوونەوەی حاجیان، وەك جاران ئەم فەتوایەم دەدا، لەم کاتەدا پیاوێ هات بۆلام، گوتی: تۆ کە ئەم فەتوایە دەدەی‌و بەردەوامی لەسەری، ئاگات لەوەنییە، کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان، عومەری کوڕی خەتاب، لەم بارەیەوە چی دەفەرموێ‌و ڕای چۆنە، جا منیش بە خەڵکەکەم گوت: ئەی موسوڵمانینە! ئەوەی کە من فەتوای تەمەتتوعم بۆی داوە، با پەلەنەکاو چاوەڕوان بکا هەتا فەرمانڕەوای موسوڵمانان تەشریف دێنێ، ئەو چی فەرموو پەیڕەوی ئەو بکەن، جا کاتێ عومەر کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو هات، عەرزیم کرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! لەسەر چی بنیاتێ ڕێگریی لە حەج لەسەر شێوەی حەسانەوەو تەمەتتوع دەکەی؟ فەرمووی: من ئیحرام ناشکێنم‌و ڕام وانییە، چونکە شتی وا پێچەوانەی

نامەی خوداو سوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ)، ئەوەتا قورئان، کە نامەی خودای گەورەو سەروەرە بەدەق دەفەرموێ: {وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ} واتە: ئەی موسوڵمانەکان! حەجو عەمرەتان کە دەست پێکرد، تەواویان بکەن، وە هەر بۆ خودا ئەنجامیان بدەن).

خۆ ئەگەر کار بە سوننەتی پێغەمبەریش بکەین، پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) کە حەجی دابەست، ئیتر ئیحرامی نەشکان، هەتا ئاژەڵەکانی دیاریی بەست (حەرەم)ی سەربڕی). {بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ١٨٨، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ١٥٢٧، چ/٤}.

## (٢٣) باب جواز التَّمَتُّع
## کردنی حەج لەسەر شێوەی تەمەتوع

٧٦٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ انْزِلَتْ ايَةُ الْمُتْعَةِ فِي كِتَابِ اللّٰهِ فَفَعَلْنَاهَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَمْ يُنْزَلْ قُرانٌ يُحَرِّمُهُ وَلَمْ يَنْهَ عَنْهَا حَتَّى مَاتَ قَالَ رَجُلٌ بِرَايِهِ مَا شَاءَ(الحديث ٤٥١٨): [٧٦٧]

موطەرریف فەرمووی: لە سەرەمەرگا، عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێم: فەرموودەیەکت پێ دەڵێم، هیوایە کەخودا بیکا بەمایەی بەهرە بۆت: پێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- و ئێمەش لەخزمەتیدا بە تەمەتتوع حەجمان کردووە، وە هەتا خۆشی کۆچی دوایی کرد ئەمکارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مابوو، نە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەپێش مەرگیدا یاساخی کردبوو، وە نە قورئان قەدەغەی کردبوو،

[٧٦٧] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٣٩ - ٤٥١٨ بخاری مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٦٧ - محمد فؤاد/١٢٢٦ - ٢٩٦٨ شیحا.

له گێڕانـەوەی ئـەم شـوێنەدا: (عیمرانـی کـوڕی حوصـەین (رەزای خـوای لێ بـێ) فەرمووی: ئایەتی پشوودان و حەسانەوە، لەنێوانی عەمرەو حەجدا، کـە نـاودارە بە ئایەتی تەمەتتوعی حـەج، لـە نامـەی پیرۆزی خـودادا هـاتووە، ئێمـە خۆمـان لەگـەڵ حـەزرەت خۆیـدا، عـەمرەو حـەجمان لەسـەر ئـەو شـێوەیە کـەوا لـە ئایەتەکەدا کردووە، وەهەتا حەزرەتیش -دروودی خوای لەسەر بێ- کۆچی دوایی کرد، ئەم کارە لەسـەر ئـەم شێوەیە وەك خـۆی مـابوو، وە نـە قورئـان قەدەغـەی کردبـوو، وە نـە پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- یاسـاخی کردبـوو ئـیتر هەندێ کەس— وەك ئیمامی عومەر، یا ئیمامی عوسمان بێ — لەلای خۆیەوە بـە ئارەزووی خۆی شتێ بڵێ، کە جیابێ لـەم شێوەیەی کـە مـن لـەم فەرموودەیـەدا ڕوونم کردەوە، ئەوە لەبەر ئەوەی بە ڕای خۆیـەتی بایـەخی نییـە). (تـاج/٢/١٧٦ /١٧٨ = ژمارە: ١٥٢٩، ج/٤ + تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٧).

ئەمەش دەقی گێڕانەوەی ژمارە (٦٦٧)ی موختەصەری موسلیمە:

عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رضى الله عنه) قَالَ: تَمَتَّعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم)، وَلَمْ يَنْـزِلْ فِيـهِ الْقُـرْآنُ، قَـالَ رَجُـلٌ بِرَأْيِـهِ، مَـا شَـاءَ. {الحـديث: ٢٩٦٨ = ٢٩٥٤ فم. تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٧ = ١٥٧١، ٤٥١٨. تحفة الأشراف: ١٠٨٥٠}:

له تەجریدی بوخاریدا دەفەرموێ: موطەرریف فەرمووی: لەسەرە مـەرگا، عیمرانی کوڕی حوصەین، (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێم: فەرموودەیـەکت پێ دەڵێم، هیوایە کە خودا بیکا بە مایـەی بـەهرە بـۆت: لـە خزمـەت پێغەمبـەر خۆیـدا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) تەمـەتتوعی حـەجمان کـردووە، وە هـەتا خۆشی کۆچی دوایـی کـرد ئـەم کـارە لەسـەر ئـەم شێوەیە وەك خـۆی مـابوو، نـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێش مەرگیدا یاساخی کردبوو، وە نـە

قورئـان قەدەغـەی کردبـوو. {تـاج/٢، زنجـیرە: ٩١، ژمـارە: ١٥٣٦ = مـسلم. حــج: ٢٩٦٤} .

لەگێڕانەوەی تەجریددا ئاوایە:

عیمرانـی کـوڕی حوصـەین (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: ئایـەتی پـشوودانو حەسـانەوە، لـەنێوانی عـەمرەو حەجـدا، کـە نـاودارە بـە ئایـەتی تەمەتتوعی حەج، لەنامەی پیرۆزی خوادا هاتووە، ئێمە خۆمان لەگەڵ حـەزرەت خۆیدا، عەمرەو حەجمان لەسەر ئـەو شێوەیە کـەوا لـە ئایەتەکـەدا کـردووە، وە هـەتا حـەزرەتیش (دروودی خـودای لەسـەر بێ) کۆچـی دوایـی کـرد، ئـەم کـارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مابوو، وە نـە قورئـان قەدەغـەی کردبـوو، وە نـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) یاسـاخی کردبـوو، ئـیتر هەنـدێ کـەس (وەك ئیمامی عومەر، یا ئیمـامی عوسمـان) لـەلای خۆیـەوە، بـە بۆچـوونی خـۆی شتێ بڵێ، کە جیابێ لەم شێوەیەی کەمن لەم فەرموودەیەدا روونم کردەوە، ئەوە لەبەرئەوەی بەڕای خۆیەتی بایەخی نییە.

### (٢٤) بابُ وُجُوب الدَّمِ عَلَى المتمتّع، وَ إِذَا عَدِمَهُ لَزِمَهُ صَوْمُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعَ إِلى أَهلِهِ

### کەسێ لەسەر شێوەی پشوودانو حەسانەوەو تەمەتتوع حەج بکا، پێویستە لەسەری ئاژەڵێ سەربڕێ، ئەگەر نەیبوو، لە کاتی حەجەکەدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێو کە گەڕایشەوە بۆلای کەسوکاری حەوت ڕۆژی تر بەڕۆژوو بێ

٧٦٨- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ وَأَهْدَى، وَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْىَ مِـنْ ذِى الْحُلَيْفَةِ، وَبَدَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَـنْ

أَهْدَى فَسَاقَ الْهَدْيَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَّةَ قَالَ لِلنَّاسِ: « مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ. وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَهْدَى فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلْيُقَصِّرْ وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لْيُهِلَّ بِالْحَجِّ. وَلْيُهْدِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا فَلْيَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ». وَطَافَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ أَوَّلَ شَيْءٍ، ثُمَّ خَبَّ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ، وَمَشَى أَرْبَعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضَى طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ فَانْصَرَفَ فَأَتَى الصَّفَا فَطَافَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى قَضَى حَجَّهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ يَوْمَ النَّحْرِ، وَأَفَاضَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وَفَعَلَ مِثْلَ مَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَنْ أَهْدَى وَسَاقَ الْهَدْيَ مِنَ النَّاسِ. {الحديث: ٢٩٧٢ = ٢٩٥٨ ف.م. تجريد/٢/٢١٤، رقم: ٧٩٨ = ١٦٩١، ١٨٠٥. نسائي. حج: ٢٧٣١ تحفة الأشراف: ٦٨٧٨} : [٢٦٨]

سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەحمەتو ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، عەمرەو حەجی بەیەکەوە کرد، لەسەر شێوەی قیران، وە ئاژەڵی دیاری بەیتیشی لە زولحولەیفەوە لەگەڵ خۆی برد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێشەوە ئیحرامی بە حەج دابەست، ئەوسا عەمرەیشی تێکەڵکرد، لەکاتی تێکەڵکردنی عەمرەکە بە حەجەکەوە، دیسان دەستی کردەوە بە تەلبییە کردن، بەڵام ئەمجارە تەلبییەی بە حەجو عەمرە بەسەر یەکەوە ئاوا

[٢٦٨] تجرید/٢، ژمارە: ٧٩٨ = ١٦٩١ بخاری مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٧٤ = ٢٩٧٢ شیحا = ١٣٢٢ محمد فؤاد عبدالباقی لترقیم مسلم.

دەكرد: دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ بِعَمْـرَةٍ وَ حَجَّـةٍ مَعـاً) واتـه: نێتمـه ئیحرامـی عـەمرەو حەجم پێکەوە دابەست بۆ تۆ ئەی خودایە!

جا حـەجکاران هـەیان بـوو رێـك وەك پێغەمبـەر حـەج‌و عـەمرەیان کـرد، چونکه هـەیان بـوو ئـاژەڵی دیـاریی خانـەی خـودای لەگـەڵ خـۆی لـه میقاتـەوە هێنابوو، وە هەیان بوو ئاژەڵی دیاریی خانەی خودای لەگـەڵ خـۆی نـەهێنا بـوو، جـا کاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گەیـشتە مەککـە، بـه مەردومەکەی فەرموو: (هەرکەسێ له ئێوە ئـاژەڵی دیـاریی بـەیتی لەگـەڵ خـۆی هێناوە، ئەوە دەبێ بەردەوام بێ لەسـەر ئیحرامەکـەی‌و ئیحـرام نەشـکێنێ، هـەتا حەجەکـەی تـەواو دەکـا، چـونکه هـیچ شـتێ لەوانـەی کـە بـەهۆی ئیحـرام بەستنەکەیەوە لێی قەدەغە بووە، هەتا حەجەکەی تەواو نەکا، ئەو شـتانەی کـە بەهۆی ئیحرام بەستنەکەیەوە لێی قەدەغە بووە، هـەتا حـەجەکـەی تـەواو نـەکا، ئەوشتانەی بۆ رەوا نابێتەوە، بەڵام هەرکەسێ لەئێوە دیاری بەیتی لەگـەڵ خـۆی نەهێناوە، با تەوافی بـەیت‌و تـەوافی نێـوانی صـەفاو مـەروە بکـاو مـووی سـەری کورت بکاتەوەو ئیتر ئیحرام بشکێنێ، لەپاشا لەرۆژی تەرویيـەدا ئیحرامـی حـەج ببەستێتەوە، بەڵام ئەوانەی کە ئیحرام دەشکێنن دەبێ دیاری بەیت سەربڕن، جا ئەگەر ئەمانە دیاریی بەیتیان بۆ پەیـدا نـەکرا، ئـەوا دەبـێ سـێ رۆژ لـه رۆژانـی کـاتی کردنـی حەجەکـە بـەڕۆژووبن‌و حـەوت رۆژیـش کـە گەڕانـەوە بۆنـاو کەسوکاریان).

جا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ گەیشتە ناو شاری مەککە، تەوافی قودومی ئەنجامدا، بەم شێوەیە: لـەپێش هـەموو شـتێکا، لـەوێوە دەستی کرد بەم تەوافە: دەستی هێنـا بـه گۆشـه (روکـن)ی حەجەرولئەسوەدداو ماچی کردو سێجار بە هەڕاکردن‌و چوار جار بە رۆیشتنی ئاسایی هەڵسووڕا بـه

گردی خانەی خواداو، کاتێ تەوافەکەی بەیتی تەواوکرد، ڕۆیشت بۆ مەقامی ئیبراهیم (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) وە مەقامی خستە بەینی خۆیو بەینی بەیتەوەو دوو رکات سوننەتی نوێژی تەوافی کرد، ئەوجا سڵاوی دایەوە، ئەوجا ڕۆیشتو چوو بۆ صەفاو حەوت جار تەوافی صەفاو مەڕومیشی کرد، ئیتر بە بەرگی ئیحرامەوە مایەوەو ئیحرامی نەشکان هەتا حەجەکەی تەواو کرد، وە لەو ماوەیەدا ئەوەی کە بەهۆی ئیحرام دابەستنەوە لێی قەدەغە بوو بوو، وەك خۆیان مانەوە هەتا حەج تەواو بوو، وە ڕۆژی جەژن ئاژەڵە دیارییەکانی بەیتی سەربڕی، کە سەرجەم سەد وشتر بوون، ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وشترەکەی بوو، ڕۆیشت بۆ بەیتو تەوافی ئیفاضەی کرد، ئەوجا ئیحرامی شکاندو ئەوەی کە لێی قەدەغە بوو بوو، هەمووی ڕەوا بوونەوە بۆی وەك جاری جارانی.

هەموو ئەو کەسانەی کە دیاریی خانەی خودایان هێنابوو لەگەڵ خۆیان، پێغەمبەری خودا، لە حەجەکەیدا چیکرد، ئەوانیش هەمان شتیان کرد. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ١٦٢٥ ج/٤ + ژمارە: ١٦١٠ + ژمارە: ١٥٦٧ + ژمارە: ١٥٥٦ + ١٥٥٥ + ١٥٤٢} .

### ڕوونکردنەوە:

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب، لەپەیڕەوانە، واتە: تابیعیە، لەچینی دووەمی موسوڵمانانە، دایکی کچی یەزدەجورد بوو، کەپاشای ئێران بوو، ناسراو بوو بە (أبو عبدالله المدني الفقيه) گێڕانەوی زۆری ئەنجام داوە: لە عەبدوڵڵای باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرە، لەکەسانی ترەوە، قورئانخوێنێکی جوان بوو، ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەسەردەمی

سالدا، لەپیاوچاکیو خواناسیو زوهدو بەرێزیو شکۆمەندیدا وێنەی سالم کەم بوو!).

ئیبنو موبارەك دەفەرموێ: سالم یەکێکە لەحەوت شەرعزانەکانی مەدینە، کە پرسیارێکیان بۆ دەهات، هەر حەوتیان لێی دەکۆڵینەوە، قازی مەدینە ئەگەر پرسیارێکی بۆ حەل نەکرایە، دەینارد بۆ ئەوان، هەتا وەڵامەکەی ئەوانی وەرنەگرتایەتەوە بڕیاری نەدەدا. سالم سەوداو مامەڵەی بازاڕی دەکرد، هەتا مرد، ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە دەفەرموون: (دروستترین ڕشتە واتە: أَصَحُّ الأسَانِيد) زوهری لەسالم، لەباوکیەوە.

ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: سالم بیستنی لەعائیشەوە نیە، وا باوە کەلەمانگی قوربانی ساڵی سەدو شەستی کۆچیدا مردووە، دایکی سالمو دایکی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو دایکی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی، هەرسێکیان خوشك بوونو کچی یەزدەجورد بوون، کەدواهەمین پاشای ئێران بووە. لەساڵی (٦٥١)ی زاینیدا، لە کاتی ئازادکردنی خۆراساندا، لەلایەنی سوپای ئیسلامەوە کوژراوە، نافیع کەفەقێی ئیبنو عومەر بووە، دەیفەرموو: هەموو جارێ کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، دەگەیشت بەسالمی کوڕی، ماچی دەکردو دەیفەرموو: (پیرێ پیرێ ماچ دەکا!).

جارێ هیشام لەناو بەیتا تووشی سالم بوو، پێی گوت: پێویستیت چییە پێم بڵێ، هەتا جێبەجێی بکەم بۆت. سالم پێی فەرموو: (شەرم لەخودا دەکەم کە لەناو ماڵەکەی ئەودا، داوا لەغەیری ئەو بکەم!) کاتێ کەلەبەیت چوونە دەرەوە، هیشام پێی گوتەوە: دەی ئێستا داوات چییە لێمی داوا بکە، هەتا پێتی بدەم. سالم فەرمووی: (بەخودا داوای دونیام لەخاوەنەکەی نەکردووە کە خودای گەورەیە، دەی لەکەسێکی تر چۆن داوای بکەم کەخاوەنی نییە!).

دەڵێن: ئیتر هیشام دەیکا بەچاواو نەخۆش دەکەوێو دەمرێ (ڕەزای خودا لەخۆیو لە عەبدوڵلای باوکیو لەعومەری باپیری بێو خودا لەخاکوپای ئەواندا حەشرمان بکا).

٧٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَخْبَرَتْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي تَمَتُّعِهِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَهُ بِمِثْلِ الَّذِى أَخْبَرَنِى سَالِمٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم):(٧٦٩)

لەژمارە (٧٦٨)دا واتاو مەبەست لێی رابورد.

## (٢٥) باب بَيَانِ أَنَّ الْقَارِنَ لاَ يَتَحَلَّلُ إِلاَّ فِي وَقْتِ تَحَلُّلِ الْحَاجِ الْمُفْرِدِ

## کەسێ حەج لەسەر شێوەی جووتکار (قارن) بکا، واتە: حەجو عەمرە بخاتە پاڵ یەكو بە یەکەوە بیان کات دەبێ ئیحرام نەشکێنێ، تا ئەوانەی کە حەجیان بە تەنیا دابەستووە لەسەر شێوەی ئیفراد، ئیحرام دەشکێنن، ئەویش ئیحرام بشکێنێ

٧٧٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا بِعُمْرَةٍ وَلَمْ تَحْلُلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: إِنِي لَبَّدْتُ رَأْسِ، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلا أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ. (الحديث ١٥٦٦ – أطرافُهُ في: ١٦٩٧، ١٧٢٥، ٤٣٩٨، ٥٩١٦):(٧٧٠)

ئیبنوعومەر لە حەفصەی خوشکیەوە کە هاوسەری پێغەمبەر بوو -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوە بۆچی ئەو خەڵکەی تر ئیحرامیان شکاندو کردیان بە عەمرە، کەچی تۆ وات نەکرد؟

---

(٧٦٩) بڕوانە: (٧٦٨).

(٧٧٠) تجرید/٢، ژمارە: ٧٥٤ - ١٥٦٦ بخاری. مسلم ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی: ١٢٤٠ = ٢٩٧٤ شیحا.

فەرمووی: (ئاخر من قژە سەری خۆم پەستاندوومتەوەو، وشتری دیاریی بەیتم لەگەڵ خۆم هێناوەو، نیشانەم کردوونو، سەرو جووت سۆلم کردۆتە ملیان، تا خەڵك بزانن کە ئەوە دیاریی بەیتە، لەبەرئەوە من ئیحرام ناشکێنم هەتا قوربانی سەرنەبڕم).

## (٢٦) باب جَواز التحلُّل بالإحصار وَجَواز القران
## کەسێ ئیحرام دابەستێو دوایی ڕێگەی لێ بگیرێ، دروستە ئیحرام بشکێنێ، وە حەج لەسەر شێوەی جووتکار (قارن) دروستە

٧٧١- عَنْ نَافِعٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) خَرَجَ فِى الْفِتْنَةِ مُعْتَمِرًا، وَقَالَ: إِنْ صُدِدْتُ عَنِ الْبَيْتِ صَنَعْنَا كَمَا صَنَعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَخَرَجَ فَأَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَسَارَ حَتَّى إِذَا ظَهَرَ عَلَى الْبَيْدَاءِ الْتَفَتَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: ((مَا أَمْرُهُمَا إِلاَّ وَاحِدٌ. أُشْهِدُكُمْ أَنِّى قَدْ أَوْجَبْتُ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ))، فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا جَاءَ الْبَيْتَ طَافَ بِهِ سَبْعًا وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا، لَمْ يَزِدْ عَلَيْهِ وَرَأَى أَنَّهُ مُجْزِئٌ عَنْهُ، وَأَهْدَى. {الحديث: ٢٩٧٩ = ٢٩٦٥ ف.م. بخاری. حج: ١٦٢٩، ١٦٤٠، ١٦٩٣، ١٧٠٨، ١٧٢٩، ١٨٠٦، ١٨٠٧، ١٨٠٨، ١٨١٠، ١٨١٢، ١٨١٣، ٤١٣٠، ٤١٨٤، ٤١٨٥. نسائی. حج: ٢٧٤٥}:[٧٧١]

نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ئاژاوەکەی کە حەجاج هات بۆ کوشتاری عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، کە پەنای بردبووە بەربەیت، لەو سەردەمەدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەرچوو بچێت بۆ عەمرە، فەرمووی: ئەگەر قەدەغە کرام لە تەوافی بەیت، کاتی خۆی کە قەدەغەیان کردین، کە لەخزمەت پێغەمبەردا چووین بۆ عەمرە، لەساڵی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەدا،

[٧٧١] مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٧٣.

ئەوکاتە چیمان کرد ئێستەیش هەمان شت دەکەین‌و ئیحرامەکەمان دەشکێنین، وەك لە خزمەت پێغەمبەرا، ساڵی حودەیبییە ئیحرامی عەمرەکەمان شکاند.

جا لەمەدینەوە کەوتە رێ‌و نێتی عەمرەی هێناو رۆیشت هەتا گەیشتە زولحولەیفە، لەوێ دەنگی بە لەبەیکە کردنی بەعەمرە بەرزکردەوە، ئەوجا کەوتە رێ هەتا گەیشتە بەیداء، رووی کردە هاورێکانی خۆی‌و فەرمووی: کاروباری حەج‌و عەمرە وەك یەکە لەوەدا، کە دروستە ئیحرام بشکێنرێ، لەکاتی قەدەغەکردن (ئیحصار)دا، ئێوە بە شایەت بن کەوا ئیحرامی حەجیشم دابەست لەگەڵ عەمرەکەدا، وە حەجیشم لەسەر خۆم پێویست کرد، وە دیاریشی لەگەڵ خۆی برد بۆ بەیت، ئاژەڵە دیارییەکانی لە قەدید کڕی، ئەوجا رۆیشت هەتا گەیشتە بەیت‌و حەوت تەوافی بەیتی کردو حەوت جار سەعی نێوانی صەفاو مەروەی تەواوکرد، لەوەزیاتری نەکرد، بەڵام کردارەکانی تری حەجی تەواوکرد، لەو ماوەیەدا نە ئاژەڵە دیارییەکانی سەربڕی، وە نە ئیحرامی شکان بەکردنی شتێ لەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام دابەستنەوە قەدەغە دەبن، وە نە سەری تاشی، وە نە مووی سەری کورت کردەوە، هەتا رۆژی جەژن، ئەوجا ئاژەڵە دیارییەکانی سەربڕی‌و سەری خۆی تاشی، وە باوەڕی وابوو کە بەتەوافی یەکەم، تەوافی حەج‌و عەمرەی جێبەجێ کردووە. وە گوتی: پێغەمبەر خۆشی (درودی خودای لەسەر بێ) ئاوەهای کردووە. {تاج/٢، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ١٥٦٥ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩، ج/٤ = چاپی چوارەم} .

**روونکردنەوە:**

دیاریی بەیت، کە پێشی دەگوترێ: دیاریی خانەی خودا، جیایە لە قوربانی، دیاریی (هەدی)ی بەیت بەو ئاژەڵە دەگوترێ کە بەدیاری، لەبەر رەزای خودا، دەبرێ بۆ هەژارانی ناو شاری مەککەو بۆ هەژارانی ناو سنووری بەست

(حەرەم)ی مەککە، جا ئیتر لەسەر شێوەی نەزرو ئاه بێ، یا لەسەر شێوەی خێر بێ، هەدیی بەم واتایە: کاتەکەی کاتی قوربانییە، وە دەبێ لەناو سنووری بەست (حەرەم)ی مەککەدا سەرببڕێو بدرێ بە هەژارانی ئەوێ، هەدیی بەواتای تریش هاتووە وەك (دِمَاءُ الجَبَرَانَاتِ وَالَمحْظُورَاتِ) ئەوە کاتی تایبەتی نییە، بەڵام جێگەی تایبەتی هەیە.

**ڕوونکردنەوە:**

نافیعی کوڕی سەرجیس (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) تابیعییە، هاوەڵی زۆری پێغەمبەری دیوە، ئازادکراوی ئیبنو عومەر بوو، فەقێشی بوو، فەرموودەی زۆری لەوەوە گێڕاوەتەوە، لە بنەڕەتدا خەڵکی مەغریبە، لە غەزایەکا د دیل کراو بەرپشکی ئیبنو عومەر کەوت، لە خزمەتی ئیبنو عومەردا بوو تا کاتی مەرگی، زانستو فەرموودەیەکی زۆری لە ئیبنو عومەر وەرگرت، عومەری کوڕی عەبولعەزیز، کاتێ جێنشین بوو، ناردی بۆ میصر، هەتا خەڵکەکەی لە شەریعەتو سوننەتی پێغەمبەردا شارەزا بکا، وە لەوەمەودایەدا ڕۆڵێکی جوانی بینی، زۆربەی فەرموودە زانە گەورەکان گێڕانەوەیان لێوە ئەنجام داوە، لەکۆی گێڕانەوەکانیا هەڵەی لێ نەبینراوە، ناسراوە بە نافیعی فەقیە، بوخاری دەفەرموێ: (دروستترین رشتەی فەرموودە: مالیکە، لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە). عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەیفەرموو: (نافیع بەهرەو خەڵاتی خوای گەورەیە، بەخشیوێتی بە ئێمەی گەلی ئیسلام). بەهێزترین ڕا ئەوەیە کە ساڵی سەدو حەڤدەی کۆچی لە مەدینە، مەرگ بوو بەمیوانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

٧٧٢- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَرَادَ الْحَجَّ عَامَ نَزَلَ الْحَجَّاجُ بِابْنِ الزُّبَيْرِ . فَقِيلَ لَهُ إِنَّ النَّاسَ كَائِنٌ بَيْنَهُمْ قِتَالٌ ، وَإِنَّا نَخَافُ أَنْ يَصُدُّوكَ . فَقَالَ ( لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ) إِذًا أَصْنَعَ كَمَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ، إِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ عُمْرَةً . ثُمَّ خَرَجَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِظَاهِرِ الْبَيْدَاءِ قَالَ مَا شَأْنُ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ إِلاَّ وَاحِدٌ ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجًّا مَعَ عُمْرَتِي . وَأَهْدَى هَدْيًا اشْتَرَاهُ بِقُدَيْدٍ وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذَلِكَ ، فَلَمْ يَنْحَرْ ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ ، وَلَمْ يَحْلِقْ وَلَمْ يُقَصِّرْ حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ ، فَنَحَرَ وَحَلَقَ ، وَرَأَى أَنْ قَدْ قَضَى طَوَافَ الْحَجِّ ، وَالْعُمْرَةِ بِطَوَافِهِ الأَوَّلِ . وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَذَلِكَ فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): [٧٧٢]

**بۆ تێگەیشتنی تەواو، چۆنێتی شەهیدبوونی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، لەسەر دەستی حەجاجدا لە پەڕاوی (شەرحی بلوغ المرام مِن أدلةِ الأحكام) بەرگی دووەم، لە کۆتایی ژمارە (٧٩٩)وە راگوێز دەکەین و ئەوسا فەرموودەکە وەردەگێڕینە سەر زمانی شیرینی کوردی:**

وَعَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ اَلْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَنْ كُسِرَ، أَوْ عُرِجَ، فَقَدَ حَلَّ وَعَلَيْهِ اَلْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ قَالَ عِكْرِمَةُ. فَسَأَلْتُ اِبْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَا: صَدَقَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ. {أبـوداود: ١٨٦٢. ترمذى: ٩٤٠. نسائى/٥/١٩٨. رقم: ٢٨٦١ ابن ماجة: ٣٠٧٧. أحمد ٣/٤٥٠. حاكم ٦٤٢/١ + رقم: ١٧٧٥} + {صحيح الجامع: ٦٥٢١. الصحيح المسند: ٢٩١}:

---

[٧٧٢] بخارى: ١٦٤٠ مسلم ترقيم شيحا: ٢٩٨٢.

عیكریمه (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: حەججاجی كوڕی عەمری ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەسێ پەكی بكەوێ، یان لەنگ ببێ، وە لەئیحرامدا بێ، ئەوە ئیحرامەكەی دەشكێ و ئاژەڵی دیاری سەردەبڕێ، وە لەساڵی ئایندەدا حەجی لەسەرە). عەكرەمە گوتی: بۆ ئەم قسەیە لە ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەم پرسی، گوتیان: حەججاج ڕاست دەكا: پێغەمبەر وای فەرمووە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ١٦٤٥ – د/ت/ن – س/ص}.

## ڕوونكردنەوە:

١- عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیری كوڕی عەوام، خوشكەزای حەزرەتی عائیشەیە، دایكی ئەسمائی كچی ئەبو بەكرە، زوبەیری باوكی پورزای پێغەمبەرە، چونكە دایكی زوبەیر كە نەنكی ئەم عەبدوڵڵایە صەفییەی كچی عەبدولموطەلیبە، كەخوشكی عەبدوڵڵای باوكی پێغەمبەرە، زوبەیر یەكێكە لەعەشەرەی موبەشەرە، كەواتە عەبدوڵڵا پورزا زای پێغەمبەرە. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٦٤٥. ئەسماء كاتێ كۆچی كرد بۆ مەدینە سكی پڕ بوو بە عەبدوڵڵا، ساڵی (٣) سێی كۆچی عەبدوڵڵا لەدایك بووە، یەكەم شت كە چووەتە دیوی دەروونی، تفی پیرۆزی پێغەمبەر بوو، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتفی خۆی گۆشی كرد، لەگەڵ باوكیداو لەگەڵ عائیشەی پووریدا، ئامادەی جەنگی ئەل – جەمەل بووە. {بڕوانە: ریاضی صالحین/ ١٨٦/١ ژمارە: ٢٠٢}.

عەبدوڵڵا زۆر مەردو دلێرو ئازاو بلیمەت و ڕەوانبێژو قسەزان بوو، كۆستە بوو، ڕیش و دەموچاوی مووی پێوە نەبوو، شەونوێژێكی زۆری دەكرد، زۆر بەڕۆژوو دەبوو، لەساڵی شەست و چواری كۆچیدا، لەپاش مردنی موعاوییەی

کوڕی یەزیدی کوڕی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان، پەیمانی جێنشینی پێ درا، خەڵکانو جەماوەری حیجازو یەمەنو عێراقو خۆراسان، گوێڕایەڵی بوون، هەشت ساڵ خۆی میرحەج بوو، حەجی بە موسوڵمانان دەکرد، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بەمیوانی، عەبدوڵڵا نۆساڵان بوو، لەگەڵ ئەوەیشا فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە لەبەر کردووە، (١٠) فەرموودەی لە صەحیحی بوخاریدا هەیە، یەکێکە لەچوار عەبدوڵڵاکان، ئامادەی شەڕگای یەرمووك بووە، لەخزمەت باوکیدا، ئامادەی ئازادکردنی ئەفریقیاش بووە. لەپاش شەڕو شۆڕو بگرەو بەردەو کێشمە کێشمێکی زۆر، عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوان، حەجاجی بەلەشکرێکی گەورەوە نارد بۆ سەر عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، عەبدوڵڵا پاش شەڕو ئابڵوقەیەکی قورس، خۆی دایە پاڵ بەیت، بەڵام حەجاج گوێی بەشتی وا نەدا، سەرەنجام لەساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا، لەتەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا، عەبدوڵڵا کوژرا، لەمەککە، لە هەورازێ، کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی مەککە – مەدینە، کرا بەقەد دار خورمایەکا، دوایی دایان گرتو لاشەکەیان لەناو گۆڕستانی جوولەکەکاندا تووڕدا!!

{بڕوانە: تاجی کوردی/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ چاپی چوارەم + تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢ هەتا ٣٣١٩ چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٦٠١ – مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ریاضی صالحین/١٨٦/١، ژمارە: ٢٠٢، زنجیرە: ٢٥ چاپی دووەم + تجریدی بوخاری/٣٣٦/٣، ژمارە: ١٢١٣ + پوختەی موسلیم. ژمارە: ٨، بەرگی یەکەم}.

٢- عیکریمە یەکێکە لەپیاوانی صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیم، فەقێی ئیبنو عەبباس بووە، کۆیلەشی بووە، بەڕەگەز بەربەرە، خەڵکی مەغریبە، فەرموودەی لەزۆر لەهاوڕێیان وەرگرتووە، یەکێکە لەزانا گەورەکانی سەردەمی

خۆی، قورئانزانێکی چاك بووە، ئەیوبو خالیدو ئەلحەززاء فەقێی بوون، دەڵێن: گوایە لە بیروباوەڕدا هەواخوای خەواریج بووە، نافیعو کەسانی تر تۆمەتی درۆیان لێ دەدا، جێگەی متمانەی بوخارییە، بەڵام موسلیم بەمەرجێ فەرموودەی عیکریمە دەگێڕێتەوە، کە طاووسو سەعیدی کوڕی جوبەیری لەگەڵدا بێ، بۆرەگلەیی لەبوخاری دەکرێ لەسەر عیکریمە کە نەدەبوو حەدیثی عیکریمە لەبوخاریدا بگێڕێتەوە، واتە: عیکریمە لەپیاوانی مەرجی بوخارییە، بەڵام لەپیاوانی مەرجی موسلیم نییە، بەڵام بەسە بۆ بەهرەوەریو سەروەریی عیکریمە کەجێگەی متمانەی پێشەوا بوخارییە، عیکریمە گەڕیدە بوو، بە وڵاتانا دەسووڕایەوە، کاتێ ئیبنو عەبباس دەمرێ، عیکریمە هێشتا ئازاد نەبوو بوو، هێشتا هەر کۆیلە بوو، عەلی کوڕی ئیبنو عەبباس دەیفرۆشێ بەخالیدی کوڕی موعاوییە، بەچوار هەزار دیناری زێڕ! عەکرەمە پێی دەفەرموێ: (هەموو زانستو عیلمەکەی باوکتت فرۆشت بەچوار هەزار دینار!).

عەلیش پەشیمان دەبێتەوەو سەوداکە هەڵدەوەشێنێتەوەو ئازادی دەکا، لەمەدینە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا مردووە، رەحمەتو رەزای خودای لێ بێ.

ئەو ساڵەی کە حەجاجی کوڕی یوسفی ثەقەفی، بەفەرمانی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، هات بۆسەر عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر بە سوپایەکی گەورەوە، عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) ویستی بچێ بۆ حەج. خەڵکەکە عەرزیانکرد: قوربان! بەبێ گومان شەڕو شۆڕ دەقەومێ لەنێوانی ئەم دوو لایەنەدا، دەی ئێمە مەترسی ئەوەمان هەیە، کە بەهۆی ئەو شەڕو هەرایەوە رێگەی حەجت لێ بگیرێ.

ئیبنو عومەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە، بۆ وەڵامی ئەوان، کە دەفەرموێ: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ} کە واتای ئەم ئایەتە ئاوایە:

لەڕاستیدا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشەواو سەرمەشقێکی فرە جوانە بۆ ئێوەی گەلی ئیسلام، وە شایانی ئەوەیە کە مەردانە پەیڕەوی ڕەوشتو ڕەفتارە جوانەکانیو کردەوە باشەکانی بکەن، هەنگاو بە هەنگاوو بست بە بست).

ئەوجا ئیبنو عومەر بە پێوەری کردار بەم ئایەتە، فەرمووی: (کەواتە منیش ئەوە دەکەم کە پێغەمبەر کردوویەتی، لە بارودۆخی ڕێ لێگیرانا، دەی ئەوا من ئێوە دەکەم بەشایەت کەوا من نێتی عەمرەم دابەستو کردنی عەمرەیەکم لەسەر خۆم پێویست کرد).

ئەوجا کەوتە ڕێو ڕۆیشت بۆ مەککە هەتا گەیشتە بەیداء، کە ناوی شوێنێکە، وا لەنێوانی مەککەو مەدینەدا، لەنزیك ذولحولەیفە، فەرمووی: (دیارە کە لەکاتی ڕێ چوونە بەستدا بڕیاری حەجیش وەك هی عەمرە وەهایە، ئەوەبوو پێغەمبەر لەکاتی پەیمانی حودەیبییەدا کە ڕێگەی لێ گیراو بێباوەڕەکان مەودایان نەدا کە عەمرەکەی تەواو بکا، ئیحرامی عەمرەکەی شکاند، کەواتە ئێوە بەشایەت بن، ئەوا من حەجیشم لەسەر خۆم فەرزکرد لەگەڵ عەمرەکەمدا ئەنجامیان دەدەم، ئەگەر ڕێگەم لێ نەچووە بەست بە قیران دەیانکەم، خۆ ئەگەر ڕێگەی تەواوکردنیشم لێ گیرا، ئەوا ئیحرام دەشکێنم، دیاری بەیتیشی سەربڕی کە لە قودەید کڕی، ئیتر لەوە زیاتری نەکرد، ئیتر نە دیاری سەربڕی، نە ئیحرامی لەهیچ شتێ شکان کە لێی قەدەغە بوو بوو، نە سەری خۆی تاشی، نە مووی سەری کورت کردەوە، تا ڕۆژی جەژن، جا کاتێ طەوافی فەرزی تەواوکردو حەوت جار خولاوە بە دەوری بەیتاو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەی تەواوکرد، ئیتر دیارییەکانی سەربڕیو سەری خۆی تاشیو بڕیاری دا کە ئەم تەوافە بەسە بۆ حەجەکەیشیو بۆ عەمرەکەیشی. وە ئیبنو عومەر فەرمووی: پێغەمبەر

(دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خۆشـی بـەم شـێوەی قیرانـە حـەج و عەمرەکـەیی تەواوکرد).

## (٢٧) باب في الإفراد والقران بالحج والعُمرَة
## حەجکردن بە جیا بەبێ عەمرە، یا کردنی حەج و عەمرە بە یەکەوە، کە پێی دەگوترێ (قران)

٧٧٣- حديث ابن عمر وأنس. عن بَكْرٌ أَنَّهُ ذَكَرَ لاِبْنِ عُمَرَ أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ ، فَقَالَ أَهَلَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بِالْحَجِّ ، وَأَهْلَلْنَا بِهِ مَعَهُ ، فَلَمَّا قَدِمْنَا مَكَّةَ قَالَ « مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْىٌ فَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً » . وَكَانَ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) هَدْىٌ ، فَقَدِمَ عَلَيْنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ مِنَ الْيَمَنِ حَاجًّا فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « بِمَ أَهْلَلْتَ فَإِنَّ مَعَنَا أَهْلَكَ » . قَالَ أَهْلَلْتُ بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « فَأَمْسِكْ ، فَإِنَّ مَعَنَا هَدْيًا »: [٧٧٣]

بەکری کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: لەلای ئیبنو عومەر باسی ئەوە کرا، کە ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەساڵی حەجی ماڵاواییدا، حەج و عەمرەی بەیەکەوە دابەست، ئیبنو عومەر فەرمووی: (نەخەیر، بەڵکوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوساڵەدا، تەنیا نێتی حەجی هێنا، وە ئێمەیش لەگەڵ ئەودا بەس بەتەنیا حەجمان دابەست، جا کاتێ گەیشتینە مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ دیاری خانەی خودای پێ نییە، با حەجەکەی بکا بە عەمرەو کرداری عەمرەیێ تەواوبکاو ئیحرام بشکێنێ. (بڕوانە: ژمارە: ٧٦٨).

---

[٧٧٣] بخاری. حج: ٤٣٥٣، ٤٣٥٤، مسلم: ٢٩٨٥.

ئیبنو عومەر فەرمووی: پێغەمبەر خۆی دیاری خانەی خودای پێ بوو، واتە: هەدی بەیتی پێ بوو. جا عەلی کوڕی ئەبو طالیب لە یەمەنەوە هات بۆ حەج، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (چۆن چۆنی نێتت هێناوە، فاطیمەی ژنیشت لەگەڵ ئێمەدا هاتووە).

عەلی فەرمووی: (گوتوومە ئەوا نێتی حەجم دابەست، لەسەر ئەو شێوەیەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نێتی دابەستووە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی ئیحرام مەشکێنەو بەردەوامبە لەسەری چونکە من دیاری بەیتم هێناوە).

بۆ روونکردنەوەو تێگەیشتنی تەواو لەم باسە، ئەم چەند فەرموودەیە لە موختەصەری صەحیحی موسلیمەوە راگوێز دەکەین:

عَنْ أنس (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَهَلَّ بِهِمَا جَمِيعًا: « لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا ». {الحديث: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٦٢ = ٣٠١٨ = ٣٠٠٤ ف.م. بخاری. مغازی: ٤٣٥٣، ٤٣٥٤. أبو داود. مناسك: ١٧٩٥. نسائی. حج: ٢٧٢٨}:

ئیمامی ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لێبوو، لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، ئیحرامی حەج و عەمرەی بەیەکەوە دابەست و فەرمووی: نێتمە ئیحرامی عەمرەو حەج دادەبەستم بۆ تۆ ئەی خودایە). {تاج/٢، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ١٥٣٣، ١٥٣٢}.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُهِلَّنَّ ابْنُ مَرْيَمَ بِفَجِّ الرَّوْحَاءِ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا أَوْ لَيَثْنِيَنَّهُمَا ». {الحديث: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٦٣ - ٣٠٢٠ = ٣٠٠٦ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەو باڵا دەسە، عیسای کوڕی مەریەم، کاتێ لە ئاخر زەمانا، لەکۆتایی ڕۆژگارا، لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆسەر زەوی، ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە بەردەوامەو ئەویش کاری پێ دەکا، تەنانەت لە فەججورەوحاوە، کە ناوی شوێنێکە، لە بەینی مەککەو مەدینەدا، شەش میل لە مەدینەوە دوورە، تەنانەت عیسا، کاتێ دێتە خوارەوە دەچێ بۆ حەجو عەمرە، لە فەجوورەوحا ئیحرامی حەج، یا ئیحرامی عەمرە، یا هەردووکیان پێکەوە دادەبەستێو حەجو عەمرە وەك موسوڵمانان ئەنجام دەدا). {بڕوانە: تاج/٥، لاپەڕە: ٦٣٩، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٥٦٢٧ هەتا ژمارە: ٥٦٣٢. ج/٤ بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیەی ئێرە} .

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْحَجِّ مُفْرَدًا (وَفِى رِوَايَةٍ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَدًا. {الحديث: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٦٤: ٢٩٨٤ = ٢٩٧٠ فم} :

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەردا، لە حەجی ماڵاواییدا، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا، نێتی حەجمان، بەجیا بەبێ عەمرە دابەست. لەگێڕانەوەیەکدا: پێغەمبەری خودا، (دروودی خودای لەسەر بێ) حەجی بەتەنها کرد، واتە: حەجی بەتەنیا، بەجیا بەبێ عەمرە کرد).

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَفْرَدَ الْحَجَّ. {الحديث: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٦٥ - ٢٩١٣ = ٢٨٩٧ ف.م} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ)، حەجی بەجیا، بەبێ عەمرە کرد).

عَنْ بَكْرِ بن عبدالله عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يُلَبِّى بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ جَمِيعًا، {قَالَ بَكْرٌ} : فَحَدَّثْتُ بِذَلِكَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: لَبَّى بِالْحَجِّ وَحْدَهُ، فَلَقِيتُ أَنَسًا، فَحَدَّثْتُهُ بِقَوْلِ ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ أَنَسٌ: مَا تَعُدُّونَنَا إِلاَّ صِبْيَانًا! سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا ».
{الحديث: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٦٦ - ٢٩٨٥ – ٢٩٧١ ف.م} :

بەکری کوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، بۆخۆم گوێم لێبوو، لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیحرامی حەج و عەمرەی بەیەکەوە دابەست و فەرمووی: (لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا: نێتمە عەمرەو حەجم پێکەوە دابەست بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم!).

بەکر فەرمووی: جا ئەم فەرموودەیەی ئەنەسم باسکرد بۆ ئیبنو عومەر، کە ئەنەس دەفەرموێ لە حەجی ماڵاواییدا پێغەمبەر عەمرەو حەجی پێکەوە دابەست، ئیبنو عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو حەجەدا، بەس حەجی بەتەنیا دابەست. لەوەدوا کە گەیشتمەوە بە ئیمامی ئەنەس، عەرزم کرد، فەرموودەکەی تۆم گێڕایەوە بۆ ئیبنو عومەر، کەچی ئەو وەهای گوت؟ ئەنەس فەرمووی: دیارە لەئێوە وایە، کە ئەوکاتە من منداڵکار بووم، لەبەرئەوە زەبتی چۆنێتیی ئیحرام دابەستنی پێغەمبەرم نەکردووە، من ئەوکاتە تەمەنم بیست ساڵ بوو، پیاوێ کامڵ بووم، من بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیست، لەکاتی ئیحرام دابەستندا، فەرمووی: (لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجّاً: نێتمە عەمرەو حەجم پێکەوە دابەست بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم!).

**ڕوونکردنەوە:**

١- لە فەتحولمولهیمدا، لە ڕاڤەی ئیهلالـدا، لـە فـەرموودەی ژمـارە: (٢٧٨٨)دا، دەفەرموێ: (قَوْلُهُ: أَهَلَّ، إلخ: أي رَفَعَ صَوْتَهُ بِالتَّلْبِيَةِ، وَنَوَى أَحَدَ النُسُكَيْنِ، أَوْ بِهِمَـا) بڕوانە ژمارە: (٢٩٤٨) هەتا ژمارە: (٢٩٥٢) لە شەرحی نـەوەوی لەسـەر صـەحیحی موسلیم.

٢- بـۆ تـەئویلی ئـەو جیاوازییـەی کـە لـەنێوانی ئـەم کۆمەڵـە فـەرموودەو چەندین فەرموودەی تردا هەیە، کە ئایا حەجەکـەی پێغەمبـەر لەسـەر شێوەی ئیفراد بـووە، یـا لەسـەر شـێوەی قـیران بـووە، یـا لەسـەر شـێوەی تەمـەتتوع بـووە، نەوەوی ئاوا تـەئویلی دەکـا: ڕێگـەی جـەمع لـەنێوانی ئـەم فەرموودانـەدا ئاوایـە: لەسـەرەتاوە موفریـد بـووە، لەپاشـا بـووە بـە قـارین، مەبەسـتیش لـە تەمـەتتوع تەمەتتوعی لوغەوییە، کە مەبەست لێی (إِنْتِفَاع وإِرْتِفَاقه)، چونکە قارینیش وەك موتەمەتتیع سوود لە تێکەڵکردنی حەجو عەمرە دەبینێو یەك کردار لـەجیاتی هەردوکیان دەکا.

### (٢٨) باب ما يلزم من أحرم بالحج ثمَّ قدمَ مكَّةَ مِنَ الطَّوَافِ وَالسَّعْيِ
### ئیحرامدار کە دەگاتە مەککە، دەبێ تەوافو سەعی ئەنجام بدات

٧٧٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَأَلْنَا ابْنَ عُمَـرَ (رضـى الله عـنهمـا) عَـنْ رَجُـلٍ قَدِمَ بِعُمْرَةٍ فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَلَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ أَيَأْتِي امْرَأَتَهُ؟ فَقَالَ: قَدِمَ رَسُـولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَـبْعًا وَصَـلَّى خَلْفَ الْمَقَـامِ رَكْعَتَـيْنِ وَبَـيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِـي رَسُـولِ اللَّـهِ أُسْـوَةٌ حَـسَنَةٌ. {الحديث: ٢٩٨٩ =

٢٩٧٥ فـم. تجريـد/٢، رقـم: ٢٥٠ = ٣٩٥، ١٦٢٣، ١٦٢٧، ١٦٤٥، ١٦٤٧، ١٧٩٣. نسائي. حج: ٢٩٣٠، ٢٩٦٠. ابن ماجة. مناسك: ٢٩٥٩ تحفة الأشراف: ٧٣٥٢}: [٧٧٤]

عـەمری کـوڕی دینـار (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: لـە ئیبنـو عومـەرمان پرسـی: پیـاوێ لـەکاتی کردنـی عـەمرەدا، تـەوافی بـەیت بکـا، بـەڵام هاموشۆ (سەعی)ی نێوانی صەفاو مەڕوە نەکا، ئایا دروستە کە لەگەڵ ژنەکەی دروسـت ببـێ، یـا بـچێتە لای حـەڵاڵو هاوسـەری خـۆی؟ فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کـە تەشـریفی بـرد بـۆ مەککـە حـەوتجار بـەدەوری بەیتـدا هەڵسووڕا، وە لەپـشتی مـەقامی ئیبراهیمـەوە دوو ڕکـات نوێـژی تـەوافی کرد، وە حەوت جاریش لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا هاتوچۆی کرد، ئەنجا ئیبنـو عومەر بۆئەوەی کە بەباشی بـزانین کـە ئەمـە یاسـای ڕەسـای ئایینـەو پـەیڕەوی کردنی مەبەستە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {لَقَدْ كَـانَ لَكُـمْ فِـي رَسُـولِ اللَّـهِ أُسْـوَةٌ حَسَنَةٌ}. واتە: لە ڕاستیدا، پێغەمبەری خودا، ڕابەرو سەرمەشقێکی هـەرە جوانـە بۆ ئێوە، وە شایانی ئەوەیە کە ئێوە چاوی لێ بکەن و، هەنگاو بـە هـەنگاوو بـست بەبست شوێنی بکەون). {تاج/٢، رقم: ١٥٥٥}.

## (٢٩) باب مَا يلزم مَنْ طَافَ بالبَيْتِ وَسَعى مِنَ البقَاءِ عَلَى الإحْرامِ وَتَرْك التَّحَلُّل
## کەسێ حەوت دەورەو سەعی نێوانی سەفاو مەروە ئەنجام بداتو لە هەمان کاتدا دەبێ ئیحرام نەشکێنێ

٧٧٥- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ الْقُرَشِيِّ أَنَّهُ سَـأَلَ عُـرْوَةَ بْـنَ الزُّبَيْـرِ فَقَالَ قَدْ حَجَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ (رضى الله عنهـا) أَنَّـهُ أَوَّلُ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ حِينَ قَدِمَ أَنَّهُ تَوَضَّأَ ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ ثُمَّ لَمْ تَكُنْ عُمْرَةً ، ثُمَّ حَـجَّ أَبُـو بَكْـرٍ

[٧٧٤] تجريد/١، ژمارە: ٢٥٠ = ٣٩٥ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٠٤ = ١٢٣٤ = ٢٩٨٩.

رضی الله عنه) فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ ثُمَّ لَمْ تَكُنْ عُمْرَةً . ثُمَّ عُمَرُ رضی الله عنه) مِثْلُ ذَلِكَ . ثُمَّ حَجَّ عُثْمَانُ (رضی الله عنه) فَرَأَيْتُهُ أَوَّلُ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ ثُمَّ لَمْ تَكُنْ عُمْرَةٌ ، ثُمَّ مُعَاوِيَةُ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ، ثُمَّ حَجَجْتُ مَعَ أَبِي الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ، فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ ، ثُمَّ لَمْ تَكُنْ عُمْرَةٌ ، ثُمَّ رَأَيْتُ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارَ يَفْعَلُونَ ذَلِكَ ، ثُمَّ لَمْ تَكُنْ عُمْرَةٌ ، ثُمَّ آخِرُ مَنْ رَأَيْتُ فَعَلَ ذَلِكَ ابْنُ عُمَرَ ثُمَّ لَمْ يَنْقُضْهَا عُمْرَةً ، وَهَذَا ابْنُ عُمَرَ عِنْدَهُمْ فَلاَ يَسْأَلُونَهُ ، وَلاَ أَحَدٌ مِمَّنْ مَضَى ، مَا كَانُوا يَبْدَءُونَ بِشَيْءٍ حَتَّى يَضَعُوا أَقْدَامَهُمْ مِنَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ ، ثُمَّ لاَ يحِلُّونَ ، وَقَدْ رَأَيْتُ أُمِّي وَخَالَتِي ، حِينَ تَقْدَمَانِ لاَ تَبْتَدِئَانِ بِشَيْءٍ أَوَّلَ مِنَ الْبَيْتِ ، تَطُوفَانِ بِهِ ، ثُمَّ لاَ تَحِلاَّنِ.

وَقَدْ أَخْبَرَتْنِي أُمِّي أَنَّهَا أَقْبَلَتْ هِيَ وَأُخْتُهَا وَالزُّبَيْرُ وَفُلاَنٌ وَفُلاَنٌ بِعُمْرَةٍ قَطُّ فَلَمَّا مَسَحُوا الرُّكْنَ حَلُّوا وَقَدْ كَذَبَ فِيمَا ذَكَرَ مِنْ ذَلِكَ: (٧٧٥)

**ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە، لە صەحیحی بوخاریدا، بەڵام لە صەحیحی موسلیما ئەمەی دواوە، وەرگەڕاوەکەیەتی:**

**موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی نەوفەلی قوڕەیشی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی عێراقی گوتی پێم: ئەم پرسیارەم لە عوروەی کوڕی زوبەیر بۆبکە: ئەگەر پیاوێ ئیحرامی حەج دابەستێو نێتی حەج بهێنێ، کاتێ کە تەوافی بەیتی تەواوکرد ئایا دروستە ئیحرام بشکێنێ یانا؟ جا ئەگەر عوروە گوتی: شتی وا نابێ، تۆ پێی بڵێ: ئەی بۆچی پیاوێ هەیە دەڵێ شتی وا دەبێ.**

**موحەممەد فەرمووی: پرسیارەکەم لە عوروە کرد، فەرمووی: نابێ ئیحرام بشکێنێو حەجەکەی بکا بە عەمرە، بەڵکوو ئەوەی کە نێتی حەجی هێناوە**

---

**(٧٧٥) بخاری. حج: ١٦٤١، ١٦٤٢، مسلم: ٢٩٩١ شیحا.**

دەبێ حەجەکەی تەواوبکا. منیش عەرزی عوروەم کرد: پیاوێ شتی وەهای دەگوت. عوروە فەرمووی: شتێ بەدی گوتووە. موحەممەد فەرمووی: پیاوە عێراقییەکە داوای وەڵامەکەی عوروەی لێم کرد، منیش پێیم گوت: عوروە واوا دەفەرموێ: عێراقییەکە گوتی: دەی ئەمجارە ئاوای پێ بڵێ: کە پیاوێ هەیە (کە مەبەست لێی ئیبنو عەبباسە) دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، بە هاوەڵانی خۆی فەرمووە کەوا بکەن (واتە: ئەوانەی کە دیاری بەیتیان پێ نییە، بیکەن بە عەمرەو ئیحرام بشکێنن، وەك لەپێشەوە بەدوورو درێژی باسکرا) وە هەروەها ئەی موحەممەد! بە عوروە بڵێ: ئەی بۆچی ئەسماءو زوبەیر ئاوایان کرد؟

موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: جا منیش چوومەوە بۆ خزمەتیو عەرزیم کرد: پیاوێ هەیە رایسپاردووم کە ئەم پرسیارە لەتۆ بکەمو دەیشڵێ: پیاوێ دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە خەڵکەکەی وا گوتووە، کە ئیحرام بشکێنن، سەرەڕای ئەوەیش ئەسماو زوبەیریش شتی وایان دەکرد، دەی ئەگەر شتی وا دروست نییە، ئەو پیاوە بۆ وا دەڵێ، وە ئەسماءو زوبەیر چۆن شتی وایان کردووە؟

عوروە فەرمووی: ئەو پیاوە کێیە؟ گوتم: نازانم. فەرمووی: ئەی خۆی بۆچی نایێ بۆ لامو ئەم پرسیارەم لێ بکا، وا دەزانم کە ئەوە عێراقییە، چونکە عێراقی بەربەرەکانێی بێ سوود دەکەن. گوتم: نازانم. عوروە فەرمووی: (دەی ئەو پیاوە درۆ دەکا). چونکە سەبارەت بە حەجەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عائیشەی پوورم، ئاوا هەواڵی داوە بەمن: (لەساڵی حەجی ماڵاواییدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە گەیشتە بەرەوەو هاتە ناو مەککەوە، لەپێش هەموو شتێکا دەستنوێژی گرت بۆ تەوافو ئەوسا تەوافی

بەیتی تەواو کردو ئیتر بەردەوام بوو لەسەر حەجەکەیی‌و جگە لە کردارو یاساکانی حەج هیچی تری نەکرد، لەپاش پێغەمبەریش ئەبوبەکریش کە حەجی کرد هەروەها، عومەریش لەسەردەمی خۆیدا هەروەها، بەچاوی خۆم عوثمانم بینی، یەکەم شت کە دەستی پێکرد دەستنوێژی گرت‌و حەوت دەورەی بەیتی تەواوکردو بەس، موعاوییە لەسەردەمی خۆیدا هەروا، عەبدوڵلای کوڕی عومەر هەروەها، لەپاشا لەخزمەتی زوبەیری باوکمدا حەجم ئەنجامدا ئەویش هەروەها، بەچاوی خۆشم موهاجیرین‌و ئەنصارم دیوە، ئەوانیش هەروەها. ئاخر کەس کە دیومە وابکا عەبدوڵلای کوڕی عومەر بوو، دەستنوێژی دەگرت‌و تەوافی بەیتی تەواو دەکردو لەسەر ئیحرامی حەجەکەی بەردەوام بوو، لەپاش تەوافی بەیت حەجەکەی هەڵ نەدەوەشانەوە، بەوە کە بیکا بە عەمرە، دەی خۆ ئەوە ئیبنو عومەر ماوەو لەلای خۆیانە، بۆچی لەم بارەیەوە پرسیاری لێ ناکەن، تا دەربکەوێ کە قسەی دۆغری ئەمەیە کەمن دەیلێم. ئەوەی کەمن دڵنیام لێی ئەوەیە: پێشینانی ئێمە هەموویان کاتێ کە دەگەیشتنە مەککە، زووبەزوو حەوت دەورەی دەوری بەیتیان ئەنجام دەدا، وە لەپاش ئەوە ئیحرامیان نەدەشکان، تا لەچیای عەرەفەو مەناسیکەکان دەگەڕانەوە. هەروەها بەخودی خۆم ئەسمائی دایکم‌و عائیشەی پوورم دیوە، کە دەگەیشتنە بەرەوە یەکەم شت کە دەستیان پێ دەکرد، تەوافی بەیت بوو، کە حەوت دەورەکەیان تەواو دەکرد، ئیحرامیان نەدەشکان، تا لەکاتی خۆیدا حەجەکەیان تەواو دەکرد.

عوروە فەرمووی: هەر لەم بارەیەوە دایکم، کە ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیقە، هەواڵی پێم دا: گوتی: کە من‌و عائیشەی پوورم کە خوشکی دایکمەو زوبەیری کوڕی عەوام، کە مێردی دایکمە، ئەم سێ کەسە: ئەسماءو عائیشەو زوبەیر، لەگەڵ فیسارە کەس‌و ئەو فیسارە کەسدا چووین بۆ عەمرەو بەس، جا

که تەوافی بەیتمان تەواوکردو صەفاو مەڕوەمان تەواوکرد، ئیتر عەمرەکەمان تەواوکردو ئیحراممان شکاند!

جا لەسەر رووناکی ئەم روونکردنەوەیە، قسەی ئەو کابرایە درۆیە، کە ئەم پرسیارو قسانەی بەتۆ گوتووە. {بڕوانە: ژمارە: ٧٧٦}.

## روونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە، زۆر پێچیدەو ئالۆزە، راڤەکاران رای جیاجیایان هەیە، لەبارەی واتاو مەبەست لێی، بە تەئویلی زۆر نەبێ پینەو پەڕۆ ناکرێ. بەڵام پوختەی قسەی راڤەکاران ئەمە بوو کە نووسرا. خوا لە هەڵەی هەموو لایێ ببورێ.

٧٧٦- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ حَدَّثَهُ أَنَّهُ كَانَ يَسْمَعُ أَسْمَاءَ تَقُولُ كُلَّمَا مَرَّتْ بِالْحَجُونِ صَلَّى اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ لَقَدْ نَزَلْنَا مَعَهُ هَا هُنَا ، وَنَحْنُ يَوْمَئِذٍ خِفَافٌ ، قَلِيلٌ ظَهْرُنَا ، قَلِيلَةٌ أَزْوَادُنَا ، فَاعْتَمَرْتُ أَنَا وَأُخْتِي عَائِشَةُ وَالزُّبَيْرُ وَفُلاَنٌ وَفُلاَنٌ ، فَلَمَّا مَسَحْنَا الْبَيْتَ أَحْلَلْنَا ، ثُمَّ أَهْلَلْنَا مِنَ الْعَشِيِّ بِالْحَجِّ: [٧٧٦]

عەبدوڵڵا (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە کۆیلەی ئازادکراوی ئەسمائی کچی ئەبوبەکر بوو، دەیفەرموو: ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خوای لێ بێ) هەمووجارێ، کە دەگەیشتە حەجوون، کەناوی کێوێکی ناسراوە وا لەمەککە، دەیفەرموو: (صَلَّ اللهُ علی محمد = دروودی خودا لەسەر موحەممەد، ئا لەم شوێنەدا لەخزمەتیدا، دابەزین و وچانمان گرت، ئەو ڕۆژگارە بارمان سووك بوو، شمەکی کەممان پێ بوو، وڵاخی سواریشمان کەم بو، نان و ئاوو توێشوویەکی

---

[٧٧٦] تجرید/٢، ژمارە: ٨٢٧ = ١٧٩٦، مسلم: ١٢٣٧، ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی = ٢٩٩٤ ترقیم شیحا لمسلم.

سووکەڵەمان پێ بوو، من و عائیشەی خوشکم و زوبەیری هاوسەرم و فیسارو ئەو فیسار، پاش ئەوە حەجەکەمان پووچ کردەوە لەبەرئەوە ئاژەڵی دیاریمان پێ نەبوو، عەمرەمان ئەنجامدا، جاکاتێ لەو عەمرەیەدا، تەوافی بەیتمان کردو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەمان تەواوکردو سەرمان کورت کردەوە ئیتر لەئیحراما نەماین و بووینەوە بەبێ ئیحرام، جا لە پاشا، ڕۆژی تەروییە کە هەشتی مانگی قوربانە، تاقی ئێوارێ، ئیحرامی حەجمان دابەست).

## (٣١) باب جواز العمرة في أشهر الحج
## عەمرە لە مانگەکانی حەجا دروستە

٧٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهما) قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الْعُمْرَةَ فِى أَشْهُرِ الْحَجِّ، مِنْ أَفْجَرِ الْفُجُورِ فِى الأَرْضِ، وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَراً، وَيَقُولُونَ إِذَا بَرَأَ الدَّبَرْ، وَعَفَا الأَثَرْ، وَانْسَلَخَ صَفَرْ، حَلَّتِ الْعُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ. فَقَدِمَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَتَعَاظَمَ ذَلِكَ عِنْدَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَىُّ الْحِلِّ؟ قَالَ: « الْحِلُّ كُلُّهُ ». {الحديث: ٢٩٩٩ = ٢٩٨٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٥٣ = ١٥٦٤. نسائي. مناسك: ٢٨١٢. تحفة الأشراف: ٥٧١٤} : [٧٧٧]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لەسەردەمی نەزانیدا، قورەیش و ئەوانەی کە لەسەر ئایینە پووچەکەی قورەیش بوون، وایان دانابوو کە کردنی عەمرە، لە مانگەکانی حەجدا، کە شەشەڵان و ناو جەژنان و قوربانن، لە گوناهە هەرە گەورەکانەو لەوە خراپتر رووی نەداوە لەسەر روی زەوی!

---

[٧٧٧] تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٣ = ١٥٦٤ بخاری. مسلم: ١٢٤٠ ترقیم الشیخ محمد فؤاد عبدالباقی مختصر صحیح مسلم: ٧٥٦ = ٢٩٩٩.

وەجێ گۆڕکێیـان بـە مانگـە حەرامـەکان دەکـرد، کـە پێیـان دەگـوترێ ئەشـهورولحوروم، کـە چـوار مـانگن، کـە رەجـەبو ناوجـەژنانو نۆمینـەو موحـەڕەمن، کە رەجـەبیان بـە تەنیایـەو دەکەوێتـە پـێش شـەعبانەوە، ئەوسێ مانگەکـەی تریـشیان بەسـەر یەکـەوەن، دەچـوون مـانگی موحـەڕەمیان ناودەنـا صـەفەرو بـە مـانگی حـەڵاڵیان دائـەناو، بـە پێچەوانەیـشەوە مـانگی سـەفەریان ناودەنا ناموحەڕەمو بە مانگی حـەرامیان دائـەنا، کە لـەزاراوی شـەرعی پیرۆزدا بەم کرداره دەگوترێ (نەسیئ). جا لەپاش ئەم جێ گۆڕکێیـە، ئـاوا کـاتی کردنـی عەمرەیان دیاری دەکردو دەیانگوت: کاتـێ زامو ناوکـە رێـژی پـشتی وڵاخـی ژێـر حاجیان، لەپاش تەواوکردنی حەج سارێژ بـوو، وە شـوێنەواری کـاروانی حاجیـان کوێرەوە بوو، وە مـانگی موحـەڕەم، کـە ئـەوان ناویـان نـابوو سـەفەر تـەواو بـوو، ئەوحەلە هەرکەسێ کە بیەوێ عەمرە بکا، عەمرەی بۆ دروست بوو).

جاکاتێ لە حـەجی ماڵاوایـدا، کـە پێغەمبـەرو هاوڕێکانی (دروودی خـودا لـەخۆیو رەزای خـودا لـە هاوڕێکـانی بـێ) لـە بـەیانی رۆژی چـوارەمی مـانگی نۆمینە (قوربان)دا هاتن بۆ مەککە، ئیحرامی حەجیان بەستبوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی پێکـردن، کـە حەجەکـەیان بکـەن بـە عەمرە، لەپاشا کە عەمرەکەیان تەواوکرد ئیحرام بشکێنن، بەڵام ئەوان ئەم کاره زۆر گەورەو گـران بـوو لەسـەر شـانیان، چونکە ئـەوان لـەوەو پـێش شـتی وایـان نەدیبوو، وە کردنی عەمرەیان لە مانگەکانی حەجدا بە گوناهێکی گەورە دادەنا، ئەنجا کە بەباشـی لـە باسـەکە تێگەیـشتن گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بـەم ئیحرام شکاندنە چیمان بـۆ حـەڵاڵ دەبێتـەوە، لـەو شـتانەی کـە بـەهۆی ئیحـرام بەسـتنەوە لێمـان قەدەغـە بـوو بـوون؟ فـەرمووی: (هـەموو شـتێکتان بـۆ رەوا

ـحبێتەوە وەك جاران، تا كاتێ ئیحرامی حەج دادەبەستنەوە!). {تـاج/٢، زنجیـرە:
١٣٠. ژمارە: ١٦٣٨ + تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٨، لاپەڕە: ٣٨٢}.

لەگێڕانەوەی ئێرەدا لە ئاخرەكەیەوە ئەمـەی زیـاترە: (إلاَّ مَـنْ كَـانَ مَعَـهُ
ـهَدْی) كە لەپاش ئەم زیادەیە، واتاكەی ئاوای لێ دێ:

(...... كـە حەجەكـەیان بكـەن بەعــەمرە، لەپاشـا كـە عەمرەكـەیان
ـەواوكرد ئیحرام بشكێنن، بەڵام ئەوانـەی كـە دیـاری خانـەی خودایـان هاپـێ، بـا
ـیحرام نەشكێننو بەردەوام بن لەسەر حەجەكەیان هەتا تەواوی دەكەن).

٧٧٨- عَنْ شُعْبَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: أخْبرَنَا أبوُ جَمْرَةَ، نَصْرُ بْنُ عمْرانَ الضُبَعيُّ،
قَـالَ: تَمَتَّعْتُ فَنَهاني ناسٌ، فَسَأَلْتُ ابنَ عَباسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ فَـأمَرَني، فَرأيْـتُ في المَنـامِ
كَأنَّ رَجُلاً يَقُولُ لي: حَجٌّ مَبْرُوُرٌ، وَعَمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ، فَأخْبَرْتُ ابْنَ عَباسٍ، فَقَالَ: سُنَّةُ النبيَ
صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقالَ: لِيَ أقِمْ عِندِي فَأَجْعَلُ لَكَ سَـهْماً مِـنْ مـالي، قَـالَ شُـعْبَةَ:
فقُلْتُ: لِمَ؟ فَقَالَ: لِلرُّؤْيا الَتِي رَأيْتُ). (الحديث ١٥٦٧ – طرفه: ١٦٨٨): [٧٧٨]

شـوعبە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: ئـەبو جـەمرە، نەصـری كـوڕی
عیمرانی زوبەعی هەواڵی پێمان دا، فەرمووی: جارێ چووم بۆ حەج تمتعم كرد،
چەند كەسێ گوتیان شتی وا مەكە، منیش بۆ ئەم مەسەلەیە لە ئیبنو عەبباسـم
پرسی، فـەرمووی: بیكـە قـەیناكا، جـا شـەوێ لـە خـەوما، وەك پیـاوێ پـێم بڵـێ:
حەجەكەت پیرۆزبێ و عەمرەكەت قەبووڵ بێ ! منیش ئـەم خەونـەم بـۆ ئیبنـو
عەبباس گێڕایەوە، فەرمووی: ئەڵڵاهو ئەكبەر، ئەڵڵاهو ئەكبەر، حەج و عـەمرە
لەسەر شێوەی تەمەتتوع، سوننەتە، پێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسـەر بـێ-
فەرمانی پێكردووە، ئـەوجا ئینـو عـەباس فـەرمووی پـێم: (لـەلای مـن بمێنـەوە،
پشكێ لە سامانەكەمت بۆ دەبڕمەوە، وەئەم خەونەت لەبارەی موتعەی حەجەوە

---

[٧٧٨] تجرید/٢، ژمارە: ٧٥٥ = ١٥٦٧، ١٦٨٨، مسلم: ١٢٤٢ محمد فؤاد = ٣٠٠٥ تخریج شیحا لمسلم.

بۆ مەردوم بگێڕەوە) شوعبە فەرمووی بە ئەبوجەمرەم گوت: لەبەرچی وایفەرمووە ؟ فەرمووی: لەخۆشی ئەم خەونە کەمن لەم بارەیەوە بینیم، کە بەڵگەی ڕاستو دروستی فەتواکەی ئیبنو عەباس بوو، سەبارەت بەکردنی عەمرەو حەج لەسەر شێوەی تەمەتتوع).

## ڕوونکردنەوە:

ئەم چەند بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. مژدانە دروستە، کەسێ هەواڵێکی خۆشت پێ دەدا، واباشە خەڵاتی بکەی، مژدانەیەکی سامانی پێ بدەی.

٢. کاتێ قسەی زانایێ ڕێکی حەق دەرچوو، خۆشحاڵی دەربڕین بۆی دروستە.

٣. دروستە خەونی باش، بەتایبەتی کە هی پیاوێکی باش بێ، بکرێ بە پاڵپشت بۆ بەڵگەی شەرعیو، لەم بارەیەوە استئناسی پێ بکرێ.

٤. گێڕانەوەی خەون بۆ زانا کارێکی باشە.

٥. ئەڵڵاهو ئەکبەر کردن لەکاتی ڕوودانی خۆشی و لەکاتی گەیشتنی هەواڵی خۆشدا باشەو کارێکی پەسەندە.

٦. کار بەظاهیری بەڵگە دەکرێ، تەنانەت بە بەڵگە غەیری ظاهر تەرجیح دەکرێ.

٧. ڕاجیایی لەنێوان زانایاندا دروستە، بەنیازی ئەوە کە فەرمایشتی بەهێز کاری پێ بکرێ، وە بەڵگەکاری پێ بکرێ، هەروەك دەبێ بەهۆی ڕەحمەت بۆ ئوممەت.

٨. شوعبەی کوڕی حەججاج (ڕەزای خوای لێ بێ) تابیعی تابیعی‌یە واتە: تابیعی دیوە لە چینی سێیەمی موسوڵمانانە، بەیەکڕایی زانایان پێشەوایەکە لەپێشەوایانی فەرموودە، شوعبە لەپیاوان (رجال)ی صحیحەینە، جێگەی بتمانەی شێخی بوخاری‌و شێخی موسلیمە، تەنیا ئەو لە (کوتوبی سیتتە = شەش پەڕاوە) کەدا ناوی شوعبەی کوڕی حەججاجە، بەڵام شوعبە ناوی تر، کە ناوی باوکی جیابێ لە نەسائی‌و ئەبوداودا هەیە، شوعبەی کوڕی تەوئەمیش هەندێ دەڵێن: صەحابی‌یە، ئەگەر وابێ شوعبەناو لەناو یارانی پێغەمبەردا هەیە، لە ئیصابەدا دەفەرموێ: شوعبەی عەنبەری، پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- بە ذوئەیبی کوڕی دەفەرموێ: (خودا پیت و فەڕت تێخاو بتهێڵێ بۆ باوك و دایکت) کەچی لە تەرجەمەی ناوی ذوئەیبا، لە ئیستیعاب‌و لەاصابەدا: ذوئەیبی کوڕی شوعثەم نووسروە، لە ئیستیعابدا: ذوئەیبی کوڕی شوعثەنی عەنبەریش نووسراوە، لەئیصابەش دا ئامازە بۆ شوعثەن کراوە!

پێشەوا موسلیم -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- پەسن‌و مەتحێکی زۆری جوانی شوعبە دەکا، بەتایبەتی لەپێشەکی صەحیحی موسلیم دا دەفەرموێ: (پێشەوایانی فەرموودەناسەکان وەك: مالیکی کوڕی ئەنەس‌و شوعبەی کوڕی حەجاج‌و سوفیانی کوڕی عویەینەو یەحیای کوڕی سەعیدی قەططان‌و عەبدو ڕڕەحمانی کوڕی مەهدی و.. لەپێشەوا پایە بەرزەکانی فەرموودەن).

سوفیانی ثەوری – کە هاوڕێی فەقێیەتی بووە، ئاوا شوعبە دەنرخێنێ: (شوعبە میری ئیماندارانە لەزانستی فەرموودەدا). ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ: (لەم بوارەدا شوعبە بەتەنیا خۆی نەتەوەیەکی سەربەخۆیە).




یەحیای کوڕی سەعید دەفەرموێ: (لە سوفیانی ئەوری و شوعبەو مالیکی کوڕی ئەنەس‌و ئیبنو عویەینەم پرسی لەبارەی پیاوێکەوە کە (ثبت = چەسپاو) نەبێ، گەلێ جار هەندێ پیاو لەبارەی پیاوی واوە پرسیارم لێ دەکەن ؟!

فەرموویان: (تەنیا ئەوەندەیان پێ بڵێ: کە ئەو پیاوە چەسپاو (ثبت) نییە).

عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەفەرموێ: (چووم بۆ خزمەت شوعبە، کە گەیشتمە خزمەتی گوێم لێبوو دەیفەرموو: ئەو پیاوە عوببادی کوڕی کەپیرە پارێز لەگێڕانەوەی فەرمووده لەوە وەبکەن).

عەبدوڵلای کوڕی موعاذی ئەل -عەنبەری دەفەرموێ: باوکم فەرمووی: نامەم نووسی بۆ شوعبە، لەبارەی ئەبوشەیبەوە، کە قازی واسیط بوو، لێیم پرسی، فەرمووی: شوعبە بەنامە وەڵامی دامەوە، فەرموو‌بوی: ڕیوایەتی لێوە مەکە، واتە: زەعیف‌و لاوازە.

جا لەبەرئەوەی کە ئاژاوە دروست نەبێ، نامەکەی من بۆیم نووسی بوو دەدڕێنێ، نەبادا بگاتەوە بەقازی و بەحوکمی ئەوەی کە قازییە کێشەیێ، ئازارێ، ناهەمواریەکمان بۆ دروست بکا.

نموونەیێ لە (جەرح‌و تەعدیل) ئیمامی موسلیم -ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: مەحموودی کوڕی غەیلان فەرموودەی پێمان فەرموو، ئەبو داوود فەرموودەی پێمان فەرموو: فەرمووی: شوعبە پێی فەرمووم: بچۆ بۆ لای جەریری کوڕی حازم، پێی بڵێ: (ڕەوانییە بۆت کە گێڕانەوەی فەرموودە لە حەسەنی کوڕی عومارەوە ئەنجام بدەیت چونکە درۆدەکا).

ئەبوداوود فەرمووی: گوتم بەشوعبە: بۆم ڕوون بکەرەوە چۆن؟ شوعبە فەرمووی: (چەند شتێکی بۆمان گێڕایەوە لەحەکەمەوە، کە چوومە بنج و بناوانی وانەبوو، بێبناغە بوو) گوتی: پێم گوت: وەکو چی؟ فەرمووی: لە

حەكەمم پرسی: ئایا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نوێژی لەسەر تەرمی شەهیدەكانی ئوحود كردووە ؟

فەرمووی: نوێژی لەسەر نەكردوون، كەچی حەسەنی كوڕی عومارە لە حەكەمەوە، لە میقسەمەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نوێژی مردووی لەسەر تەرمی شەهیدانی ئوحود كردووەو ناشتوونیشی).

لە حەكەمم پرسی: سەبارەت بەمناڵی زۆڵ چی دەفەرمووێ ؟

فەرمووی: (نوێژ لەسەر تەرمی زۆڵ دەكرێ) عەرزیم كرد: لە فەرموودەی كێدا شتیوا گێڕدراوەتەوە ؟

فەرمووی: لە حەسەنی بەصرییەوە دەیگێڕنەوە، كەچی حەسەنی كوڕی عومارە لەم بارەیەوە دەڵێ: حەكەم لە یەحیای كوڕی جەززارەوە لە عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە !).

مەبەست لەم ڕوونكردنەوە لە پلەی یەكەما، پیادەكردنی زانستی فەرموودەیە، ئاشنابوونە بە كەڵە پیاوانی فەرموودە شوناس، لەبەرئەوە درێژە پێدانی بێ بەهرە نابێ.

هەندێ زانیاری بەنرخی تر لەبارەی شوعبەوە، شوعبە زمان پس (ألثغ) بوو، كەسناوی ئەبو بوسطامە نازناوی ئەزدییە، لە واسیط و لە بەصرە ژیاوە، فەرموودەی لە زۆركەس وەرگرتووە، خۆی فەقێو شاگردی زۆری هەبووە، شوعبە مامۆستای بوخارییە، واتە: شێخی شێخەكەیەتی، لەم فەرموودەی كە وایـن لەخزمەتیدا، ڕشتەكەی لەصەحیحی بوخاریدا ئاوایە: بوخاری دەفەرمووێ: (حَدثنا آدَمُ حدَّثَنا شُعبَةُ.. تاد) هەندێ لەمامۆستاكانی شوعبە:

١- عەطای کوڕی سائیب، عەطا لەکۆتایی تەمەنیدا تووشی تێکەڵ و پێکەڵی بووبوو، بەلام سوفیانی ثەوریو شوعبە لەسەردەمی متمانە پێکراویدا فەرموودەکانیان لێ بیستووە، لەبەرئەوە فەرموودەی ئەم دوو زاتە لە عەطاوە ئیحتیجاجی پێدەکرێ، هەروا ئەو فەرموودانەی کەوان لە صەحیحەینداو لەعەطاوەن هی پێش ئیختیلاط (تێکەڵ و پێکەڵی)ن.

٢- الحکم: ثقە بوو، جێگەی باوەڕ بوو، متمانە پێکراوی فەرموودەناسان بوو، لەپیاوانی صەحیحەینە، ئەوەوی لەبارەیەوە دەفەرموێ: (ج/١/٦٣): (حەکەمی کوڕی عوتەیبە یەکێکە لە شەرعزانە گەورەکانی تابیعین و، یەکێکە لەبەندە هەرە خواپەرستەکانی تابیعین).

یەکەم فەرموودەی لەبوخاریدا فەرموودەی ژمارە (١١٧)میە لە فەتح الباریدا. شێخی عەینی دەفەرموێ (ج/٢/١٧٨): (پیاوێکی خواناسی سۆفیلکەی سوننەتپەروەر بوو، جێگەی متمانەی فەرموودە شوناسان بوو، کۆمەڵی فەرموودە شوناسەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ساڵی سەدو چواردە، یا سەدو پازدەی کۆچی مردووە).

٣- مەنصوری کوڕی معتمری کوڕی عەبدوڵلا، لە پیاوانی صحیحین و شەش پەڕاوەکەیە، شێخی بوخاری لەصەحیحی بوخاریدا فەرموودەکانی لەم زاتانەوە دەگێڕێتەوە: لە شوعبەو ثەوری و ئیبنو عویەینەو شەیبانو ڕوحی کوڕی قاسمو حەممادی کوڕی زەیدو جەریری کوڕی عەبدولحەمید، پێشەوا ئەوەوی دەفەرموێ: (ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلا دەفەرموێ: چەسپاوترینی خەڵکی کووفە مەنصوورە، ڕاستو ڕەوانە وەکو دووخ، کەسێ نییە لە فەرموودە شوناسان کە ڕەخنەی لێی هەبێ، شەست ساڵ بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، بە شەویش

شەونوێژی دەکرد، پەرستش و زوهدو وەرعی لە ئەندازە بەدەر بوون، میریی بەزۆر ویستی بیکا بە قازی قەبووڵی نەکرد، ڕەحمەتی خودای لێ بێ..).

هەندێ لە شاگردەکانی شوعبە:

١- یەحیای کوڕی سەعیدی قەططان، کەسناو (کونیە)ی ئەبو سەعیدە، کۆمەڵەی فەرمودەناسەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەکۆی دەنگ، بەبێ ڕاجیایی دایانناوە بەپێشەوایەکی پایەبەرزی حوججەی متمانە پێکراو، شاگردی ئەم زاتانە بووە، لەگێڕانەوەی فەرموودەدا:

یەحیای ئەنصاری و موحەممەدی کوڕی عەجلان و ثەوری و ئیبنوئەبی ذیئب و مالیك و شوعبەوکەسانی تریش، ئەم زاتانەیش شاگردی ئەوبوون.

ثەوری و ئیبنو عویەینەو شوعبەو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدیو ئەحمەدو یەحیای کوڕی معین و عەلی کوڕی مداینی و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویە و.. کەسانی تریشن کەواتە: هەندێ لە فەقێکانی مامۆستاشی بوون، وەك: ثەوری و شوعبە، شتی وایش لەگێڕانەوەدا هەر زۆر زۆرە، یەحیای کوڕی معین دەفەرموێ: (بیست ساڵی ڕەبەق لەسەر یەك هەموو شەوو ڕۆژێ یەحیای کوڕی سەعید، خەتمێکی قورئانی دەکرد، چل ساڵ لەسەر یەك یەحیا لەکاتی زوودا ئامادەی مزگەوت دەبوو).

## (٣٢) بابُ تَقْلِيدِ الهدى وَإِشعَارُهُ عِنْدَ الإِحْرَامِ

## حاجی، یا عەمرەکار کاتێ نیەتی ئیحرام دەهێنێ، سوننەتە ئاژەڵی دیاری خانەی خودا نیشانە بکات، وەك ئەوە سۆڵێ بکاتە ملی

٧٧٩- عَنْ ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: لاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ حَاجٌّ، وَلاَ غَيْرُ حَاجٍّ، إِلاَّ حَلَّ، قُلْتُ لِعَطَاءٍ: مِنْ أَيْنَ يَقُولُ ذَلِكَ؟ قَالَ: مِنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: (ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ). قَالَ: قُلْتُ: فَإِنَّ ذَلِكَ بَعْدَ الْمُعَرَّفِ، قَالَ:

كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضى الله عنه) يَقُولُ: هُوَ بَعْدَ الْمُعَرَّفِ وَقَبْلَهُ، وَكَانَ يَأْخُذُ ذَلِكَ مِنْ أَمْرِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ أَمَرَهُمْ أَنْ يَحِلُّوا فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ. {الحديث: ٣٠١٠ = ٢٩٩٦ فم. بخارى. مفازى: ٤٣٩٦} : [٧٧٩]

ئیبنو جورەیج (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەطای شاگردی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەواڵی پێم دا، فەرمووی: جاران ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ تەوافی قودوم ئەنجام بدا، حاجی بێ، یا عەمرەکەر، ئیتر بۆی هەیە کە ئیحرام بشکێنێ!!

ئیبنو جورەیج دەفەرموێ: عەرزی عەطام کرد: ئەمە چۆن وا دەڵێ، خۆ کەس ئەم گوتەیەی ئەوی نەگوتووە؟ عەطا فەرمووی: لەم ئایەتەوە وەری گرتووە، کە دەفەرموێ: { ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ – حج/٣٣} واتە: ئاژەڵی دیاری خانەی خودا، پێویستە لە جێگەی دیاریکراوی خۆیدا سەرببڕێ کەناو بەستی مەککەیە). ئیبنو جورەیج دەفەرموێ: منیش عەرزی عەطام کرد: بەڵام ئەوە لە دوا وەستانە لە عەرەفە؟ فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: لەپاش وەستانی عەرەفەو لەپێش وەستانی عەرەفەیشدا دەبێ! وە ئەم فەتوایەی خۆی لەو فەرمانەی پێغەمبەرەوە وەرگرتووە، کە لە حەجی ماڵاواییدا فەرمانی کرد بەوانەی کە دیاریی بەیتیان پێ نییە، حەجەکەیان فەسخ بکەنەوەو بیکەن بە عەمرە، تەوافی قودووم بکەن و ئیحرام بشکێنن). {بڕوانە ئەم ژمارانە لە پوختەی موسلیم: ٧٠٧، ٦٧٠} . {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧} .

---

[٧٧٩] بخارى. مغازى: ٤٣٩٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٧٤ - ٣٠١٠ ترقيم شيحا لمسلم.

**ڕوونكردنەوە:**

لە شەرحەكانی وا لەبەردەستا، دەفەرموێ: ئەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەگەر بەپێی ئەم فەتوایەی ئیبنو عەبباس بێ، حاجی لەپاش تەوافی قودوم، بەتەواوی ئیحرام دەشكێنێو ژنو بۆنی خۆشو هەموو شتێكی تری بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە، وە لەوەدوا باقی مەندەی كردارەكانی تری حەج تەواو دەكا، وەك وەستانی عەرەفەو... تاد. بەڵام ئەمە بە پێچەوانەی مەزهەبی جەماوەری زانایانی ئیسلامەوەیە، چونكە ئیحرام شكاندنی تەواو، لەسەر ڕێڕەوی پیرۆزی ئەوان دەبێ لەپاش وەستانی عەرەفەو ڕەجمی شەیتانو تەوافی زیارەو سەر تاشین بێ. جا ئومێدەكەم ئەم جۆرە جیاوازییە، لەنێوانی زاناكانا نەبێ بەمایەی سەر لێشێوان بۆ خوێنەوارانو مامۆستایان. لە ڕاستیدا گەرچی ئەم قسەیەی ئیبنو عەبباس، تەئویلی زۆر هەڵ دەگرێ، وەبێ حیكمەت نییە، وە شەرعی خودای پێ دەوڵەمەند دەبێ، بەڵام بەشێوەی گشتی، هەمیشە ڕای جەماوەری زانایان، بۆ ئێمە مانان، سازترو گونجاو ترو لەبارترو بێگەردترە.

## (٣٣) باب التقصير في العمرة
## موو كورتكردنەوەی سەر لە دوای كردنی عەمرە

٧٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ (رضى الله عنهم) أَخْبَرَهُ قَالَ: قَصَّرْتُ عَنْ {رأس} رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِمِشْقَصٍ وَهُوَ عَلَى الْمَرْوَةِ. أَوْ رَأَيْتُهُ يُقَصَّرُ عَنْهُ بِمِشْقَصٍ وَهُوَ عَلَى الْمَرْوَةِ. {الحديث: ٣٠١١ = ٢٩٩٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٨١٠ = ١٧٣٠}: [٧٨٠]

---

[٧٨٠] تجريد/٢، ژمارە: ٨١٠ - ١٧٢٨ بخاری مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٦٠ - ١٣٠٢ محمد فؤاد: ٣٠١١ شيحا.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەواڵی داپێم: گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەمرەی کرد، لەپاش تەواوکردنی عەمرەکە، من بەدەمە پەیکانێکی پانکۆڵە، مووی سەریم کورت کردەوە، لەوکاتەدا لەسەر مەڕوە بوو، یا موعاوییە فەرمووی: پێغەمبەرم بینی لەپاش تەواوکردنی عەمرە، بەدەمە پەیکانێکی پانکۆڵە، لەسەر تەپۆڵکەی مەڕوە، مووی سەریان کورت دەکردەوە بۆی!!).

## (٣٤) بابُ إِهْلالِ النَّبِي ﴿ﷺ﴾ وَهَدْيَهَ

## باسی ئیحرام دابەستنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و دیاری خانەی خودای

٧٨١– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ قَدِمَ عَلِيٌّ (رضى الله عنـه) عَلَـى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) مِنَ الْيَمَنِ فَقَالَ « بِمَا أَهْلَلْتَ » . قَالَ بِمَا أَهَـلَّ بِـهِ النَّبِـيُّ (صلى الله عليه وسلم). فَقَالَ: « لَوْلاَ أَنَّ مَعِي الْهَدْىَ لأَحْلَلْتُ».[٧٨١]

بڕوانە: ژمارە (٧٧٣ و ٧٦٢).

## (٣٥) بابُ بَيَانِ عَدَدِ عُمُرِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾

## پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چەند عەمرەی کردووە

٧٨٢- عَنْ أَنَس (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اعْتَمَـرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ كُلُّهُنَّ فِـى ذِى الْقَعْـدَةِ، إِلاَّ الَّتِـى مَـعَ حَجَّتِـهِ عُمْـرَةً مِـنَ الْحُدَيْبِيَـةِ، أَوْ زَمَـنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِى ذِى الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ فِى ذِى الْقَعْدَةِ، وَعُمْـرَةً مِـنْ جِعْرَانَـةَ

---

[٧٨١] بخاری. حج: ١٥٥٨، مسلم: ٣٠١٦.

حيثْ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِـهِ. {الحـديث: ٣٠٢٣ = ٣٠٠٩ ـه. تجريد/٢، رقم: ٨٢٢ = ١٧٧٨، ١٧٧٩، ١٧٨٠، ٣٠٦٦، ٤١٤٨} :[٧٨٢]

ئەنـەس (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـەسەر بێ) چوار عەمرەی کردووە، هەر چواریانی لـە مـانگی ناوجـەژنان (ذیلقـە عدة)دا کردووە، تەنیا ئەوەیان نەبێ کە لەگـەڵ حەجە فەرزەکـەی کـردی، سـاڵی حەجی ماڵاوایی، عەمرەیەکی تریان لەکاتی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەدا بوو، لـە مانگی ناوجەژناندا بوو، هەرچەند کافرەکان ڕێگـەیان نـەدان کـە تـەواوی بکـەن، بەڵام دادەنرێ بە عەمرەیێ، ئەمەیان لە ساڵی شەشی کۆچیدا بـوو، عەمرەیـەکی تریـان لەسـاڵی ئایینـدەدا بـوو، ئەمـە عـەمرەی دووهـەمی بـوو، وە لەسـاڵی حەوتـەمی کۆچـیدا بـوو، وەپێـی دەگـوترێ: عەمرەتولقـەزا، وە ئـەویش هـەر لەمانگی ناوجەژناندا بوو، عەمرەیەکی تریان لەکاتی غەزای حونەینـدا بـوو، لـە جیعرانـەوە ئیحرامـی بەسـت بـۆی، ئـەمیش هـەر لـەمانگی ناوجەژنانـدا بـوو، لەوکاتـەدا کـردی کـە تاڵانەکـەی غـەزای حونـەینی دابەشـکرد، ئەمـە عـەمرەی سێیەم بوو، لەساڵی هەشتەما بوو، کە ساڵی ئازادکردنی مەککە بـوو، عەمرەکـەی تریشیان کە چوارەمە ئەوەبوو کە لەگەڵ حەجە فەرزەکەیدا کـردی، ئەمـە هـەر چوار عەمرەکە). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ١٦٣١}.

٧٨٣- عنْ زَيْدِ بْنِ ارْقَمَ (رضيَ اللهُ عنهُ) فَقِيلَ لَهُ:(كَمْ غَزَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ غَزْوَةٍ؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ قِيلَ: كَمْ غَزَوْتَ انْتَ مَعَهُ؟ قَـالَ: سَـبْعَ عَـشْرَةَ ،

---

[٧٨٢] تجرید/٢، ژمارە: ٨٢٢ = ١٧٧٨ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٩ = محمد فؤاد/١٢٥٣ = ٣٠٢٣ شیحا.

قُلْتُ: فَأَيُّهُمْ كَانَتْ اوَّلَ؟ قَالَ: الْعُسَيْرَةُ اوْ الْعُشَيْرُ فَذكَرْتُ لِقَتَادَةَ فَقَالَ: الْعُشَيْرُ).
(الحديث: ٣٩٤٩، طرفاه في: ٤٤٠٤، ٤٤٧١): [٧٨٣]

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: تووشی زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) بووم، عەرزیم کرد: پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) چەند غەزای کردووە؟ فەرمووی: نۆزدە غەزا، گوتم: لەچەند غەزایان تۆخۆت لەگەڵیا بووی؟ فەرمووی: لەحەڤدە غەزایاندا لەگەڵی دا بووم و بەشداریم کردوون گوتم: کامەیان یەکەم غەزای بوو؟ فەرمووی: غەزای عوشەیر، یافەرمووی: غەزای عوسەیر (تاج/٨ ل/١٩٥ ز/٨٣ ف/٢ - باسی غەزاکان).

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمم پرسی (ڕەزای خودای لێ بێ): چەند غەزات لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە؟ فەرمووی: حەڤدە غەزام لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە. فەرمووی: زەیدی کوڕی ئەرقەم خۆی هەواڵی پێم داوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نۆزدە غەزای کردووە، وە یەك حەجیشی کردووە لەپاش کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینە، کە ئەویش حەجی ماڵاواییە. ئەبو ئیسحاق فەرمووی: کاتێ لە مەککە بوو، بەرلەوە کە کۆچ بکا بۆ مەدینە حەجی تری کردووە.

---

[٧٨٣] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٢٣ - ٣٩٤٩ بخاری مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٨ - مسلم: ١٢٥٤ - ٣٠٢٥.




**ڕوونکردنەوە:**

**١- لە سونەتی تەرمەزیدا، جابیر دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ حەجی کردووە، دوو حەج پێش کۆچو حەجێ پاش کۆچ.**

**٢- ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەر لەکۆچ سێ حەجی کردووە (ابن ماجة الحاکم).**

**٣- ئیبنو جەوزی دەفەرموێ: حەجێ زۆری بێ شوماری کردووە.**

**عەسقەلانی دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککە بەر لەکۆچ، حەجی نەفەوتاوە، بەتایبەتی لە مەوسیمەکانی حەجدا بانگەشەی ئیسلامی بڵاو دەکردەوە.**

**٧٨٤- حديث زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) غَـزَا تِـسْعَ عَـشْرَةَ غَزْوَةً ، وَأَنَّهُ حَجَّ بَعْدَ مَا هَاجَرَ حَجَّةً وَاحِدَةً لَمْ يَحُجَّ بَعْدَهَا حَجَّةَ الْوَدَاعِ):** (٧٨٤)

**واتاو وەرگەڕاوەکەی لەژمارە (٧٨٣)دا، ڕابورد بەتەواوی.**

**٧٨٥- حديث عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَعَائشة (رضى الله عنهم) عَـنْ مُجَاهِـدٍ قَـالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ الْمَسْجِدَ ، فَـإِذَا عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ عُمَـرَ (رضـى الله عنهمـا) جَالِسٌ إِلَى حُجْرَةِ عَائِشَةَ ، وَإِذَا نَـاسٌ يُـصَلُّونَ فِـى الْمَـسْجِدِ صَـلاَةَ الـضُّحَى . قَـالَ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ صَلاَتِهِمْ . فَقَالَ بِدْعَةٌ . ثُمَّ قَالَ لَهُ كَم اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليـه وسلم – قَالَ أَرْبَعَ إِحْدَاهُنَّ فِي رَجَبٍ ، فَكَرِهْنَا أَنْ نَرُدَّ عَلَيْهِ.**

**قَالَ: وَسَمِعْنَا اسْتِنَانَ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فِي الْحُجْرَةِ ، فَقَالَ عُرْوَةُ يَا أُمَّاهُ ، يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ . أَلاَ تَسْمَعِينَ مَا يَقُولُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ . قَالَتْ مَا يَقُولُ قَالَ يَقُولُ إِنَّ رَسُولَ**

اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرَاتٍ إِحْدَاهُنَّ فِي رَجَبٍ . قَالَتْ يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، مَا اعْتَمَرَ عُمْرَةً إِلاَّ وَهُوَ شَاهِدُهُ ، وَمَا اعْتَمَرَ فِي رَجَبٍ قَطُّ. (٧٨٥)

موجاهید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من و عورووەی کوڕی زوبەیر چوین بۆ مزگەوت، کە چووینە ژوورەوە تەماشامان کرد ئیبنوعومەر دانیشتووە، پشتی داوە بەهۆدەکەی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە، کە تەماشامان کرد وا کۆمەڵێ لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا نوێژی چێشتەنگاو دەکەن. فەرمووی: لەبارەی ئەم نوێژکردنەی ئەم کۆمەڵەوە لەئیبنوعومەرمان پرسی: ئەمە حوکمی چییە؟ فەرمووی: بیدعەتە، کاری تازە قەڵلایە، لەپاشان عورووە لە ئیبنو عومەری پرسی: قوربان ! پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چەند عەمرەی کردووە؟

فەرمووی: چوار عەمرە، یەکێکیان لەڕەجەبا بوو، ئیتر حەزمان نەکرد کە ڕەدد لەئیبنوعومەر بدەینەوە. فەرمووی: گوێمان لەدەنگی سیواك کردنی عائیشە بوو، کە لەژوورەوە لەهۆدەکەی خۆیدا، کەدەرگاکەی لەسەرماڵی مزگەوت بوو، بەسیواکێ سیواکی دەکرد، جا عورووەی خوشکەزای عەرزی کرد: پووری: ئەی دایکی ئیمانداران! خۆ گوێت لێیە ئەبوعەبدوڕەحمان - واتە: ئیبنوعومەر- چی دەفەرموێ ؟

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چی دەفەرموێ:

فەرمووی: دەفەرموێ: (پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چوار عەمرەی کردووە، عەمرەیەکیان لە مانگی ڕەجەبا بووە).

فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە باوکی عەبدوڕەحمان، چ زوو وا لە بیری چوو، خۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- چەند عەمرەی کردبێ ئەوی

---

(٧٨٥) تجرید/٢، ژمارە: ٨٢١ = ١٧٧٥ بخاری. مسلم: ١٢٥٥ = ٣٠٢٧ شیحا.

ـەگەڵ دا بووە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەرگیز لە ڕەجەبـدا عەمرەی نەکردووە).

## (٣٦) باب فَضْلِ العمرة في رَمَضَان
## خێرو بەهرەی عەمرە لە مانگی ڕەمەزانا

٧٨٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهمـا): أَنَّ النَّبِـىَّ (صـلى الله عليـه وسـلم) قَالَ لامْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهَا أُمُّ سِنَانٍ: « مَـا مَنَعَـكِ أَنْ تَكُـونِى حَجَجْـتِ مَعَنَـا »؟ قَالَتْ: نَاضِحَانِ كَانَا لأَبِى فُلاَنٍ - زَوْجِهَا - حَجَّ هُوَ وَابْنُـهُ عَلَـى أَحَـدِهِمَا، وَكَـانَ الآخَـرُ يَسْقِى عَلَيْـهِ غُلاَمُنَـا، قَـالَ: « فَعُمْـرَةٌ فِـى رَمَـضَانَ تَقْـضِى حَجَّـةً، أَوْ حَجَّـةً مَعِـى ». {الحديث: ٣٠٢٨ = ٣٠١٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٥٠ = ١٨٦٣، ١٧٨٢. نسائى. صوم: ٢١٠٩}:[٧٨٦]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لـێ بێ) فەرمووی: ساڵی حـەجی مـاڵاوایی کاتێ پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە حـەجەکـەی گەڕایـەوە، ژنێکـی ئەنـصاری هـەبوو، نـاوی ئـوم سـینان بـوو، پێـی فـەرموو: (دایکـی سـینان بۆچـی نەهاتیت بۆ حەج لەگەڵ ئێمە؟) ژنەکـەیش گـوتی: بـاوکی منـاڵـەکان دوو وڵاخـی ئاو کێشی هەبوو، خـۆی‌و کوڕەکـەی بەسـواری یـەکێکیان لەگـەڵ تـۆدا چـوون بـۆ حەج، ئەویتریشیان خوڵامەکەمان ئاوی پێ دەکێشاو ئـاوی پـێ هـەڵ دەگـۆزی بـۆ ئاودانی دێبەرەکەمان، لەبەرئەوە پێم نەکرا ئەم ساڵ لەگەڵ تۆدا بێم بۆ حـەج. فەرمووی: (دەبزانن کە عـەمرەیێ لـە مـانگی رەمـەزانا خـۆی دەدا لەحـەجێ) یـا فەرمووی: (خێری حەجێکی هەیە کە لەگـەڵ منـدا بـێ!). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١١٧، ژمارە: ١٦٢٩}.

---

[٧٨٦] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٧ - ٣٠٣٨ شيحا.

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەم فەرموودەیە بەڵگەیێ لەسەر کۆمەڵێ بەهرە:**

**١- کە کرداری باش لەکاتی باشا، یا لەشوێنی باشا، یا لەگەڵ پیاو چاکانا، خێرو پاداشی زیاترە، لەکاتو شوێنی ئاسایی. وەك عەمرە لە ڕەمەزانا، یا سەلاوات لەشەوی هەینیدا، یا نوێژ لە مزگەوتی حەرامو مزگەوتەکەی پێغەمبەرا (دروودی خودای لەسەر بێ).**

**٢- بەلام گەرچی عەمرە لە ڕەمەزانا خێری حەجێکی هەیە، بەلام حەجی فەرز یا نەزر لەکۆڵ ناخا، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێ چەندین عەمرەیش لە ڕەمەزانا بکا، مادەم حەجی فەرزی لەسەربێ، برێتی حەجە فەرزەکەی ناکەوێ.**

## (٣٧) بابُ إستِحبَابِ دُخُولِ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ العُليَا، وَالخُروجِ مِنهَا مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَىٰ

## وا پەسەندە بۆ چوونە ناو مەککە لە ئەنییەتول عولیاوە بێ، بۆ دەرچوون لێی لە ئەنییەتول سوفلاوە بێ

٧٨٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَخْرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ وَيَدْخُلُ مِنْ طَرِيقِ الْمُعَرَّسِ وَإِذَا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى. {الحديث: ٣٠٣٠ = ٣٠١٨ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٥٨ = ١٥٧٦. أبو داود. حج: ١٥٧٦} : [٧٨٧]

**ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕێگەی ئەل-شەجەرەوە لە مەدینە دەردەچوو، لە ڕێگەی ئەل-موعەرریسەوە دەگەڕایەوە بۆی، کە دەچوو بۆ مەککەش لە ئەنییەتول**

[٧٨٧] **تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٨ = ١٥٧٥، ١٥٧١، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٩١ = ١٢٥٧ - ٣٠٣٠.**

عولیاوه دەرِۆیشته ناوی، وه له ئەنییەتول سوفلاشەوه لێی دەردەچوو). {تاج/٢، زنجیره: ٩٣، ژماره: ١٥٤٠، ١٥٣٩}.

٧٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ رَسُولَ الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ مَكَّةَ مِنْ كَداءٍ، مِنَ الثَّنِيَّةِ العُلْيَا التِي بِالبَطْحَاءِ، وَيَخْرُجُ مِنَ الثنيَّةِ السُّفْلى) (الحديث ١٥٧٥) طرفه في: ١٥٧١): [٧٨٨]

ئیبنوعومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر وابوو له کەدائەوه (واته: لەدانەی ژووروووەوه کە پێی دەگوترێ: ئەنییه تولعولیا، کەوا لەناو بەطحادا) دەرِۆیشته ناو شاری مەککەوه، وه لەدانەی خوارووشەوه کە پێی دەگوترێ: ئەنییەتول سوفلا، له مەککە دەردەچوو). (تاج/٢/١٨١ز٩٣ = ژماره: ١٥٤٠ - ش/د/ت/ن).

٧٨٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) لَمَّا جَاءَ إِلَى مَكَّةَ دَخَلَ مِنْ أَعْلاَهَا وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا): [٧٨٩]

لەژماره (٧٨٧ و ٧٨٨)دا رابورد.

٧٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ عَامَ الْفَتْحِ مِنْ كَدَاءٍ ، وَخَرَجَ مِنْ كُدًا مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ): [٧٩٠]

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، لەچیای کەدائەوه، کە ناوی کێوێکە وا لەلای سەرووی مەککەوه، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆیشته ناو شاری مەککەوه، وەکاتێ مەککەی بەجێ هێشت لەکوداوه، کەوا لەخوارووی مەککەوه دەرچوو.

---

[٧٨٨] له ژماره (٧٨٧) تخریج کرا.

[٧٨٩] بخاری. حج: ١٥٧٧ مسلم: ٣٠٣١.

[٧٩٠] بخاری. حج: ١٥٧٧ مسلم: ٣٠٣١، ٣٠٣٢.

وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهَا: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) لَمَّـا جَـاءَ إِلَـى مَكَّـةَ دَخَلَهَا مِنْ أَعْلَاهَا، وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا} مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ. {تجريـدی بوخـاری/٢، ژمـاره: ٧٥٨ = ١٥٧٦، ١٥٧٧ بوخاری. لەپوختەی موسلیم = مسلم. حج: ٣٠٣١ شیحا = مسلم ١٢٥٨. أبوداود. مناسك: ١٨٦٩. ترمذی. حـج: ٨٥٣. تحفـة الأشـراف: ١٦٩٢٣}:

مەبەست لەم فەرموودەیەی عائیشە، ئەمەیە کە لەم فەرموودەیـەی ئیبنـو عومـەردا، لـە تجریـدی بوخـاریو پوختـەی موسـلیمدا دەفـەرموێ: ئیبنـو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) لەرێگەی ئەل – شەجەرەوە لەمەدینە دەردەچوو، لەرێگەی ئەل – موعەررەیسەوە دەگەڕایـەوە بـۆی، کـە دەچـوو بـۆ مەککـەیش لـە کەدائـەوە دەڕۆیـشتە نـاو شـاری مەککەوە، واتە: لەدانەی ژووروووەوە کەپێی دەگوترێ: ثەنییەتولعولیا، کـەوا لـەناو بەطحادا، وەلە کوداءەوەیش لەشاری مەککە دەردەچوو، واتە: لەدانەی خـوارووەوە، کـەپێی دەگـوترێ: ثـەنییـەتول سـوفلا. {تـاج/٢، زنجـیرە: ٩٣، ژمـارە: ١٥٤٠ – س/د/ت/ن}.

**روونکردنەوە:**

(گـداء = کـەداء) نـاوی شـوێنێکە لەسـەرووی مەککـەوە، لەسـاڵی ئـازادکردنی مەککەدا، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەو ملیـەوە ڕۆیـشتە ناوشـاری مەککـەوە، وە لـەپاش تـەواوبوونی سـەفەری حـەج، کـە لەمەککـە دەرچـوو، وە گەڕایەوە بۆ مەدینـە لەشـوێنێکەوە دەرچـوو، کـەپێی دەگـوترێ: (کـودا) هـەروەك پێی دەگوترێ (الثنیةُ السُّفْلی = دانەی خواروو = ملەی خواروو) (کودا) بە ضـەمـەی

كفەوە مەقصورە، بەڵام (كەداء) بـە فەتحـەی كافـەوە مەمـدوودە، خـەڵكی مەككـە دەڵێن: (إِفْتَحْ وَادْخَلْ واضْمُمْ واخْرُجْ!).

كـوداء ملەيـەكی پـلانو سـەخت بـوو، بەچـەند قۆناغـێ ئـەو پلانـە كـرا بەرێگەيەكی خۆشی ئاسانی ئاسايی.

١- لەسەردەمی موعاويیەدا.

٢- لەپاشا لەسەردەمی عبدول مەليكدا.

٣- لەپاشا لەسەردەمی ئەلمەهديد.

٤- لەپاشا بەتـەواوی هـەمووی لەسـەردەمی ئەلموئەييـەدی پادشـای ميـصردا، لەسـنووری سـاڵی (٨٢٠) هەشـت سـەدو بيـستدا خۆشـكراو تـەخت كـراو بـوو بەرێگەيەكی خۆشی ئاسانی ئاسايی.

## (٣٨) باب إستحباب المبيت بذي طَوَى عِنْدَ إرادَةِ دُخُولِ مَكَّةَ وَالإغتسال لِدُخُولِهَا، وَدخولها نَهَاراً

## شەو مانەوە لە ذی طەواو خۆشۆردن بۆ ڕۆيشتنە ناو شاری مەككە، وا باشە كە بە ڕۆژ بڕواتە ناوی

٧٩١- عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضی الله عنهما) كَانَ لاَ يَقْدَمُ مَكَّةَ إِلاَّ بَاتَ بِذِي طَوًى حَتَّى يُصْبِحَ وَيَغْتَسِلَ، ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ نَهَارًا، وَيَذْكُرُ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ فَعَلَهُ. {الحديث: ٣٠٣٤ = ٣٠٢١ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٤٦ = ١٥٥٣، ١٥٥٤، ١٥٧٣، ١٥٧٤ز أبو داود. حج: ١٨٦٥. تحفة الأشراف: ٧٥١٣} : [٧٩١]

ئەمە دەقی ئەم فەردوودەيە لە مختصر صحيح موسليمدا، بـەرگی دووەم ژمارە (٦٩٠):

[٧٩١] تجريد/٢، ژمارە: ٧٤٦ = ١٥٥٣، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٩٠ = ٣٠٣٦.

نـافيع (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـاران كاتـێ ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایان لـێ بێ) لە زولحولەیفە نوێژی بـەیانی دەكـرد، ئەوسـا فـەرمانی دەدا: وشترەكەییان كۆپان دەكرد بۆی، ئەوجا سوار دەبوو، جا كە بەباشی لەسـەر پـشتی وشـترەكەی ژێـری خـۆی دەگـرتو ڕێـك دادەمـەزرا لەسـەر پـشتی، بەسـەر وشترەكەوە قیت دادەنیشتو رووی دەكردە رووگەی پیرۆز، ئیتر دەستی دەكرد بە لەبەیكە كردنو بەینـە بەینـە بـەبێ پـسان تەلبییـەی دەكـرد، هـەتا دەگەیـشتە خـاكی حـەرەمو ئـەوجا بـە ئەركـەكانی تـری حەجـەوە خـەریك دەبـوو، كـەمتر دەیپەرژایە سەر تەلبییە، ئەوجا دەچوو بـۆ زوطـەوا، كـە ئێـستا پیـی دەگـوترێ: (بئر الزاهر = بیری زاهیر)لەوێ شەو دەمایەوە هەتا بەیانی، جا كاتێ لەوێ نوێژی بـەیانی دەكـرد، ئەوسـا خـۆی دەشـۆرد، ئـەوجا لـە ڕۆژدا دەڕۆیـشتە نـاو مەككـە، بەقسەی ئیبنو عومەر، پێغەمبەر خۆشی (درودی خودای لەسەر بـێ) ئـەم سـێ شتەی ئاوا بەرودوا دەكرد).

٧٩٢- حديث ابْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَنْزِلُ بِـذِي طُوًى وَيَبِيتُ حَتَّى يُصْبِحَ ، يُصَلِّي الصُّبْحَ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ ، وَمُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ (صـلى الله عليه وسلم) ذَلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ ، لَيْسَ فِي الْمَـسْجِدِ الَّـذِي بُنِـيَ ثَـمَّ ، وَلَكِـنْ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ: [٧٩٢]

ئەمـە ئـەطـرافـەكانی ئـەم فەرموودەیـە لـە موختەصـەری صـەحیحی بوخاریدا، كە ناسراوە بە (التجريـد الـصريح) وە دەقـی ئـەم فەرموودەیـە ژمـارە (٤٩١)ی صەحیحی بوخارییە، ژمارەی كۆی گێڕانەوەكان لـە تەجریـدی بوخاریـدا (٢٩٥).

---

[٧٩٢] تجريـــــد/١، ژمـــــارە: ٢٩٥ = ٤٨٤ و ٤٨٥ و ٤٨٦ و ٤٨٧ و و٤٨٨ و ٤٨٩ و ٤٩٠ و ٤٩١ و ٤٩٢، مسلم/شيحا: ٣٠٣٥.

عَنْ نافع (رحمه الله تعالى) أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَنْزِلُ بِذي الْحُلَيْفَةِ حِينَ يَعْتَمِرُ وَفِي حَجَّتِهِ حِينَ حجَّ تَحْتَ سَمُرَةٍ فِي مَوْضِعِ الْمَسْجِدِ الَّذي بِذي الْحُلَيْفَةِ وَكَانَ إِذا رَجَعَ مِنْ غَزْوٍ كَانَ فِي تِلْكَ الطرِيقِ أَوْ حَجّ أَوْ عُمْرَةٍ هَبَط مِنْ بَطنِ وَادٍ فَإِذا ظَهَرَ مِنْ بَطنِ وَادٍ أَنَاخَ بِالْبَطحَاءِ الَّتِي عَلَى شَفِيرِ الْوَادِي الشَّرْقِيَّةِ فَعَرَّسَ ثَمَّ حَتَّى يُصْبِحَ لَيْسَ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الَّذي بِحِجَارَةٍ وَلَا عَلَى الْأَكَمَةِ الَّتِي عَلَيْهَا الْمَسْجِدُ كَانَ ثَمَّ خَلِيجٌ يُصَلِّي عَبْدُ اللَّهِ عِنْدَهُ فِي بَطنِهِ كُثبٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَمَّ يُصَلِّي فَدَحَا السَّيْلُ فِيهِ بِالْبَطحَاءِ حَتَّى دَفَنَ ذلِكَ الْمَكَانَ الَّذي كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي فِيهِ). (الحديث ٤٨٤ - أطرافه في: ١٥٣٢، ١٥٣٣، ١٧٩٩).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى حَيْث الْمَسْجِدُ الصَّغِيرُ الَّذي دُونَ الْمَسْجِدِ الَّذي بِشَرَفِ الرَّوْحَاءِ وَقَدْ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَعْلَمُ الْمَكَانَ الَّذي صَلَّى فِيهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ ثمَّ عَنْ يَمِينِكَ حِينَ تَقُومُ فِي الْمَسْجِدِ تُصَلِّي وَذلِكَ الْمَسْجِدُ عَلَى حَافَةِ الطرِيقِ الْيُمْنَى وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمَسْجِدِ الْأَكْبَرِ رَمْيَةٌ بِحَجَرٍ أَوْ نَحْوُ ذلِكَ. (٤٨٥ رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يُصَلِّي إِلَى الْعِرْقِ الَّذي عِنْدَ مُنْصَرَفِ الرَّوْحَاءِ وَذلِكَ الْعِرْقُ انْتِهَاءُ طرَفِهِ عَلَى حَافَةِ الطرِيقِ دُونَ الْمَسْجِدِ الَّذي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمُنْصَرَفِ وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ وَقَدْ ابْتُنِيَ ثمَّ مَسْجِدٌ فَلَمْ يَكُنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يُصَلِّي فِي ذلِكَ الْمَسْجِدِ كَانَ يَتْرُكُهُ عَنْ يَسَارِهِ وَوَرَاءَهُ وَيُصَلِّي أَمَامَهُ إِلَى الْعِرْقِ نَفْسِهِ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرُوحُ مِنْ الرَّوْحَاءِ فَلَا يُصَلِّي الظهْرَ حَتَّى يَأْتِيَ ذلِكَ الْمَكَانَ فَيُصَلِّي فِيهِ الظهْرَ وَإِذا أَقْبَلَ مِنْ مَكَّةَ فَإِنْ مَرَّ بِهِ قَبْلَ الصُّبْحِ بِسَاعَةٍ أَوْ مِنْ آخِرِ السَّحَرِ عَرَّسَ حَتَّى يُصَلِّيَ بِهَا الصُّبْحَ). (٤٨٦ رقم الحديث في فتح البارى)

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ (رَضي اللهُ عَنْهُ) حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَنْزِلُ تَحْتَ سَرْحَةٍ ضَخْمَةٍ دُونَ الرُّوَيْثَةِ عَنْ يَمِينِ الطَرِيقِ وَوِجَاهَ الطَرِيقِ فِي مَكَانٍ بَطحٍ سَهْلٍ حَتَّى يُفْضِيَ مِنْ أَكَمَةٍ دُوَيْنَ بَرِيدِ الرُّوَيْثَةِ بِمِيلَيْنِ وَقَدْ انْكَسَرَ أَعْلَاهَا فَانْثَنَى فِي جَوْفِهَا وَهِيَ قَائِمَةٌ عَلَى سَاقٍ وَفِي سَاقِهَا كُثُبٌ كَثِيرَةٌ). (٤٨٧- رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (صَلَّى فِي طَرَفِ تَلْعَةٍ مِنْ وَرَاءِ الْعَرْجِ وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى هَضْبَةٍ عِنْدَ ذلِكَ الْمَسْجِدِ قَبْرَان أَوْ ثَلَاثَةٌ عَلَى الْقُبُورِ رَضمٌ مِنْ حِجَارَةٍ عَنْ يَمِينِ الطَرِيقِ عِنْدَ سَلَمَاتِ الطَرِيقِ بَيْنَ أُولَئِكَ السَّلَمَاتِ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرُوحُ مِنْ الْعَرْجِ بَعْدَ أَنْ تَمِيلَ الشَّمْسُ بِالْهَاجِرَةِ فَيُصَلِّي الظهْرَ فِي ذلِكَ الْمَسْجِدِ). (٤٨٨ رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (نَزَلَ عِنْدَ سَرَحَاتٍ عَنْ يَسَارِ الطَرِيقِ فِي مَسِيلٍ دُونَ هَرْشَى ذلِكَ الْمَسِيلُ لَاصِقٌ بِكُرَاعِ هَرْشَى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطَرِيقِ قَرِيبٌ مِنْ غَلْوَةٍ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي إِلَى سَرْحَةٍ هِيَ أَقْرَبُ السَّرَحَاتِ إِلَى الطَرِيقِ وَهِيَ أَطوَلُهُنَّ). (٤٨٩ رقم الحديث في فتح البارى/ طرفاه في: ١٧٦٧، ١٧٦٩).

وأنَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَنْزِلُ فِي الْمَسِيلِ الَّذي فِي أَدْنَى مَرِّ الظهْرَان قِبَلَ الْمَدِينَةِ حِينَ يَهْبِط مِنْ الصَّفْرَاوَاتِ يَنْزِلُ فِي بَطنِ ذلِكَ الْمَسِيلِ عَنْ يَسَارِ الطَرِيقِ وَأَنْتَ ذاهِبٌ إِلَى مَكَّةَ لَيْسَ بَيْنَ مَنْزِلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ الطَرِيقِ إِلَّا رَمْيَةٌ بِحَجَرٍ). (٤٩٠- رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (كَانَ يَنْزِلُ بِذي طوًى وَيَبِيتُ حَتَّى يُصْبِحَ يُصَلِّي الصُّبْحَ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ وَمُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ لَيْسَ فِي الْمَسْجِدِ الَّذي بُنِيَ ثمَّ وَلَكِنْ أَسْفَلَ مِنْ ذلِكَ عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ). (٤٩١ رقم الحديث في فتح الباري).

وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اسْتَقْبَلَ فُرْضَتَيْ الْجَبَلِ الَّذي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَبَلِ الطويلِ نَحْوَ الْكَعْبَةِ فَجَعَلَ الْمَسْجِدَ الَّذي بُنِيَ ثمَّ يَسَارَ الْمَسْجِدِ بِطرَفِ الْأَكَمَةِ وَمُصَلَّى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْفَلَ مِنْهُ عَلَى الْأَكَمَةِ السَّوْدَاءِ تَدَعُ مِنْ الْأَكَمَةِ عَشَرَةَ أَذرُعٍ أَوْ نَحْوَهَا ثمَّ تُصَلِّي مُسْتَقْبِلَ الْفُرْضَتَيْنِ مِنْ الْجَبَلِ الَّذي بَيْنَكَ وَبَيْنَ الْكَعْبَةِ ). (٤٩٢- رقم الحديث في فتح الباري).

نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) هەواڵی پێدام: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ دەچوو بۆ عەمرە، کەدەگەیشتە ذولحولەیفە، کەچوار میل لەمەدینەوە دوورە، کەئێستا پێی دەگوترێ بیری عەلی، لەوێ لە ذولحولەیفە دادەبەزیو لای دەدا بۆ وچان گرتن، لەحەجی ماڵاواییشدا لەوێ دابەزی، لەژێردارموغەیلا نێکالای دەدا، لەشوێنی ئەو مزگەوتەدا بوو کەوا لەذولحولەیفە.

جاران دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کەلەوڕێگەوە، لەغەزا، یالەحەج، یالەعەمرە، دەگەڕایەوە بۆمەدینە، لەناو شیوی عەقیقەوە دادەبەڕی، کەلەناو شیوەکە دەردەچوو لای دەدا، ولاخەکەی لەوزیخەلانە پانو بەرینە دا یێخ دەدا، کەدەکەوێتە سەرقەراخی شیوەکە، لەخۆرهەلاتی کەوانەی شیوەکەوە، ئەوزیخەلانە ناودارە بە بەطحای ذولحولەیفە، ئالەوێدا وچانی دەگرتو هەتا بەیانی لێ دەدا لەوێ دەمایەوە، لەلای ئەو مزگەوتەدا نا کەوا لەسەر گردە بەردینەکە، وەلەسەر ئەو تەپۆلکەیەیش نا کەمزگەوتێکی وابەسەرەوە، لەوێدا دەرمیێ هەبوو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) لەناو ئەو دەرمیەدا نوێژی دەکرد، لەناو ئەودەرمیەدا

چەند تەپۆڵکە لێ هەبوو، جاران پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەوێدا نوێژی دەکرد، بەڵام بەرەبەرە لافاو پاڵی نا بەزیخو لی زیخەڵانەکەوەو، لەقوڕولیتەی بەطحا کە ناو ئەودەرەیەی پڕکردەوەو، ئەو شوێنەی کەعەبدوڵڵا بۆ پیرۆزی نوێژی تیادا دەکرد لەو چەوو قوڕو لیتە داپۆشی.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وەعەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) گێڕایەوەبۆم: کە پێغەمبەری سەروەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەوێدا نوێژی دەکرد کەمزگەوتە بچکۆلەکەی لێیە، کەوا لەنزیکی مزگەوتە ناونجی یەکەوە، کەوا لەسەر ئەو بەرزای یەی کەدەڕوانێ بەسەر گوندی ڕەوحادا، ڕەوحاء دووڕۆژ ـ کەدەکاتە سییو شەش میل ـ لەمەدینەوە دوورە، عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەوشوێنەی دەزانی کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لێ کردبوو، ئاوا نیشانەی ئەو جێگەیەی هەڵدەدا: کاتێ لەمەدینەوە دەچیت بۆ مەککە، لەوێ لەلای ڕاستتەوە کاتێ لەناو مزگەوتەکەدا رادەوەستیت نوێژ دەکەی، مزگەوتە ناونجی یەکە دەکەوێتە سەر قەراخی لای ڕاستی ڕێگەکە، کەلەمەدینەوە بچیت بۆ مەککە، بەردەهاوێژێ، یادەوری بەردەهاوێژێ لەمزگەوتە گەورەکەوە دوورە!

وەئیبنوعومەر لەپاڵ ئەو یاڵەیشدا نوێژی دەکرد، کەوا لەلای کۆتایی ڕەوحادا، کەناودارە بەیاڵی (عرق الظبیة) کلکەی ئەم یاڵە کۆتایی دێ، لەسەر قەراخی ڕێگەکە، لەنزیك ئەو مزگەوتەوە کەوا لەنێوانی یاڵەکەو کۆتایی ڕەوحادا، کەلەمەدینەوە بچێ بۆ مەککە. ئالەوێدا مزگەوتێ دروست کرابوو، عەبدوڵڵا لەو مزگەوتەدا نوێژی نەدەکرد، بەڵکوو ئەو مزگەوتەی بەجێ دەهێشتو لەلای چەپیەوە دەیخستە پشت خۆیو لەبەردەم مزگەوتەکەوە بەرەو خودی یاڵی عیرقول زەبیە نوێژی دەکرد، وەجاران عەبدوڵڵای کوڕی عومەر

سەرلەبەیانیان لەرەوحائەوە بەرەو مەککە دەکەوتەرێ، نوێژی نیوەڕۆی نەدەکرد، تا دەهاتە ئەوشوێنەو لەوێ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد بەڵام ئەگەر لەمەککەوە بهاتایەتەوە، وەبەتاوێ لەپێش بەیانا بگەیشتایەتە ئەوێ، یا لەبەرە بەیانا بگەیشتایەتە ئەوێ لەوێ لای دەدا، هەتا نوێژی بەیانی لێ دەکرد.

ومنافیع فەرمووی: وەعەبدوڵڵا گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژێر شێخەڵێکی گەورەدا، لەنزیك گوندی رووەیثەوە لای دەدا، لەلای راستی رێگەکەوە رێك لەبەرابەری رێگەکە، لەشوێنێکی دەشتانی تەختانی پانو پۆڕدا دادەبەزی، لەو تەپۆڵکەوە سەری هەڵدەدا کە دوو میل دوورە لەو جێگەیەوە کەبەریدی رووەیثەی لێ دادەبەزێ. ئەو تەپۆڵکە لەیش لووتکەی شکاوەتەوە نووشتاوەتەوە ناوخۆی، لەبەرئەوە رێك وەك خانوو لەسەر دیوار ئاوا قنج راوەستاوە، نەك وەك گرد لەبنەوە پانو لەسەرەوە تەسك بێ، لەبنیدا کۆمەڵێ تەپکە لی زۆری لێ بوو.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وەعەبدوڵڵا گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدامێنی تافگەیێ نوێژی دەکرد، لەپشت عەرجەوە، کەبەرەو یالێ بڕۆی، لەلای ئەو مزگەوتە دوو گۆڕ یاسێ گۆڕ هەیە، گۆڕەکان کۆمەڵە بەردیان والەسەر، وان لەلای راستی رێگەکەوە، لەلای تاوێرەکانی سەر رێگەکەدان، لەناو ئەو تاوێرانەوە عەبدوڵڵا لەپاش قرچەی نیوەڕۆ کەخۆر لاردەبۆوە لەعەرجەوە دەچووبۆ ئەو مزگەوتەو نوێژی نیوەڕۆی لەوێ دەکرد.

دیسان نافیع (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای کۆمەڵێ شێخەلا، لەچەپی رێگەکەوە، لەناوەڕۆگەیەکی

لافاوا، لەنزیك ملەی هەرشاوە، لای دا بۆ وچان، ئەو ئاوەڕۆگەیە لکاوە بەدامێنی لاپاڵی هەرشاوە، لەنێوانی ئەو و ڕێگەکەدا نزیکەی تیرەهاوێژێ دەبێ، وەعەبدوڵلا رووەو شێخەڵێ لەوشێخەلانە نوێژی دەکرد، کەنزیکترین شێخەڵێ بوو لەوشێخەلانەی کەلەڕێگەکەوە نزیك بوون، وەلەگشت شێخەڵەکانی تریش درێژتر بوو.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی پێ گوتم: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جاران لەوئاوە ڕێژگەی لافاوەدا دادەبەزی کەوا لەخوارووی مەڕوظەهرانەوە، لەئاستی مەدینە، لەوێدا کەبەرەو شیوە زەردەکان دادەپەڕێت لەناو ئەو ئاوڕێژگەیەدا دادەبەزیت، کەوا لەلای چەپی ڕێگەکەوە، کەبەرەو مەککە بڕۆیت، جێگەی دابەزینەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەردەهاوێژێ لەڕێگەکەوە دوورە.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە بۆم کەجاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەذیطەوا دادەبەزی، وەشەو لەوێ دەمایەوە تابەیانی، وەنوێژی بەیانی لەوێ دەکرد، ئەوجا دەڕۆیشتە ناو مەککەوە، نوێژگاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەذی طەوا، لەسەر تەپۆڵکەیەکی گەورە بوو، لەناو ئەو مزگەوتەدا نا کەئێستا لەوێ دروست کراوە، بەڵام لەخوار ئەوەوە لەسەر گردێکی گەورە.

دیسان نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر گێڕایەوە بۆم: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی کردە سەرکەل، کەڕێگەکە لەسەر شاخەکەبەبەینیدا دەڕوا، ئەو شاخەی کەدەکەوتە نێوانی

پێغەمبەرو نێوانی شاخەدرێژەکەی لای کەعبەوە، ئەو مزگەوتەی کەئێستا لەوێ دروست کراوە دەیخستە لای چەپی مزگەوتەکەوە کەلەئاخری گردەکەوە بوو، نوێژگاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخواریەوە بوو، لەسەر گردە رەشەکە، دەگەز یالەدەوری دەگەز لەوگردە بەجێ بهێڵە، ئەوجا رووبکەرە سەرکەلەکە لەسەر کێوەکەو نوێژ بکە، کێوەکە لەم کاتەدا دەکەوێتە نێوانی تۆو نێوانی کەعبەوە.

### راڤەو شیکردنەوە:

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم چەند فەرموودەیە پێویست بەنەخشەیەکی ئەم رێگەوبانانە هەیە، شێخی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (لەم سەردەمەی ئێمەدا لەم مزگەوتانە تەنیا دوو مزگەوتەکەی ذولحولەیفەو مزگەوتەکانی رەوحاء دەزانرێن‌و بەس) وەهەروا دەفەرموێ: (پوختەی ئەم فەرموودانە بەڵگەی ئەوەیە: کەئیبنوعومەر خۆی پیرۆز دەکرد لەپیت‌و فەرِی ئەو شوێنە پیرۆزانە.. سوودی زانینی ئەم جێگایانەیش ئەوەیە کەبەغەوی دەفەرموێ: هەر مزگەوتێ ساخ ببێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی تیادا کردووە، ئەگەر کەسێ ئاە و نەزربکا کەنوێژی تیادا بکا، نەزرەکەی دادەمەزرێ‌و لەسەریەتی کەجێ بەجێ ی بکا، هەروەك چۆن کەسێ نەزربکا کەنوێژ لەمەسجیدولحەراما، یالەمزگەوتەکەی پێغەمبەردا، یالەمەسجیدولئەقصادا بکا ئاوا.

٧٩٣- وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) اسْتَقْبَلَ فُرْضَتَيِ الْجَبَلِ الَّذِى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَبَلِ الطَّوِيلِ نَحْوَ الْكَعْبَةِ ، فَجَعَلَ الْمَسْجِدَ الَّذِى بُنِيَ ثَمَّ يَسَارَ الْمَسْجِدِ بِطَرَفِ الأَكَمَةِ ، وَمُصَلَّى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَسْفَلَ مِنْهُ عَلَى الأَكَمَةِ

السَّوْدَاءِ ، تَدَعُ مِنَ الأَكَمَةِ عَشَرَةَ أَذْرُعٍ أَوْ نَحْوَهَا ، ثُمَّ تُصَلِّى مُسْتَقْبِلَ الْفُرْضَتَيْنِ مِنَ الْجَبَلِ الَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَ الْكَعْبَةِ):[٧٩٣]

دەقى ژمارە (٤٩٢ – رقم الحديث في فتح البارى)يە، كەدوا ژمارە بوو، لەژمارەكانى فەتحولبارى كە لەژمارە (٧٩٢)ى ئەم كتێبەدا رابورد.

## (٣٩) باب إستحباب الرمل في الطوَاف وَالعمرة وَفي الطواف الأوّل في الحَج
## راكردنو ڕۆيشتنو لۆقەكردنى ناو تەوافى بەيت، لە كاتى عەمرەو حەجو بۆنەكانى تردا

٧٩٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا طَافَ بالبَيْتِ الطَواف الأَوَّلَ يَخُبُّ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ،يَمْشِى أَرْبَعَةً، وَأنه كَانَ يَسْعَى بَطْنَ المَسِيلِ إذا طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. {الحديث: ٣٠٣٨ = ٣٠٢٥ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٧٧ = ١٦١٦، ١٦٠٣، ١٦٠٤، ١٦١٧، ١٦٤٤، + أبو داود. حج: ١٨٩٣. نسائى. حج: ٢٩٤١ تحفة الأشراف: ٨٤٥٣} :[٧٩٤]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، کاتێ دەچوو بۆ حەج یا بۆ عەمرە، کاتێ دەگەیشتە ناو مەککە، لەپێشا تەوافی قودومی لەسەر ئەم شێوەیە ئەنجام دەدا: سێجار بەهەڕاکردن هەڵ دەسووڕا بە دەوری بەیتداو، چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی، هەڵ دەسووڕا بە دەوریدا، ئینجا دوو رکات نوێژی سوننەتی تەوافی دەکرد. ئینجا تەوافی نێوانی سەفاو مەڕوەشی دەکرد). {تاج/٢، لاپەڕە: ١٩٧، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ١٥٤٢، ج/٤} .

---

[٧٩٣] بروانە ژمارە: (٧٩٢).

[٧٩٤] تجريد/٢، ژمارە: ٧٧٧ = ١٦١٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٩٣ = ٣٠٣٨ شيحا.

عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ قَدِمَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا ، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ ، وَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا ، وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ . وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ الطَّوَافَ الأَوَّلَ خَبَّ ثَلاثًا وَمَشَى أَرْبَعًا وَكَانَ يَسْعَى بِبَطْنِ الْمَسِيلِ إِذَا طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە هات بۆ مەککە حەوت جار بە دەوری بەیتدا هەڵسووڕا، وە لە پشتی مەقامی ئیبراهیمەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تەوافی کرد، وە حەوت جاریش لە ناوەندی صەفاو مەروەدا هاتوچۆی کرد، ئینجا بۆ ئەوەی کە بە باشی بزانین کە ئەمە یاسای ئایینە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ}:

بێگومان کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەهبەرو سەرمەشقێکی هەرە جوانە بۆ ئێوە، وە شایانی ئەوەیە کە پیاوانە پەیڕەوی خوو ڕەوشتە جوانەکانیو کردەوە باشەکانی بکەن، هەنگاو بە هەنگاوو بست بە بست...

لە گێڕانەوەیەکا: وە لە کاتی تەوافی صەفاو مەروەدا بەناو بەتنول مەسیلدا ڕای دەکرد (ش/ت/ن).

بەتنولمەسیل شێوێکە دەکەوێتە نێوانی تەپۆڵکەی صەفاو تەپۆڵکەی مەروەوە، ئێستا ئەو شیوە ڕێکخراوەو بە بەردی مەڕمەڕ فەرشکراوە، سەرەتای شیوەکەو کۆتایی شیوەکە، بەدوو گوڵۆپی سەوز دیاریکراوە. لەکاتی سەعی نێوانی صەفاو مەروەدا، تەوافکار، لەوماوە دیاریکراوەدا بەو دوو گوڵۆپە سەوزە لۆقە دەکەن.

**ڕوونكردنەوە:**

شێخی عەینی -ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: (مەسیل -كە بە واتا ئاورێژگەیە -شیوێكە وا لەنێوانی گردی صەفاو گردی مەڕوەدا، بریتییە لە ئەندازەیەكی زانراو، لەپێش ئەوەی كە بگەیتە میلە سەوزەكەی كە بەگۆشەی مزگەوتەكەوە هەڵواسراە، هەتا دەگاتە ئاستی دوو میلە سەوزەكەی كەوان لە بەرابەی یەكتری، كە یەكێكیان وا لەحەوشەی مزگەوتاو ئەوی تریان وا لەخانووەكەی عەبباس دا (ڕەزای خوای لێ بێ)).

٧٩٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّهُ يَقْدمُ عَلَيْكُمْ وَقَدْ وَهَنَتْهُمْ حُمَّى يَثْرِبَ فَأَمَرَهُمُ النبيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْواطَ الثَلاثَةَ، وَأَنْ يَمْشُوا مَابَيْنَ الركنَيْنِ، ولَمْ يَمْنَعْهُ أَنْ يَأمُرَهُمْ أَنْ يَرْمَلُوا الأَشْواطَ كُلَهَا إلاَّ الإِبْقَاءُ عليهِمْ. (الحديث ١٦٠٢– طرفه في ٤٢٥٦): [٧٩٥]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی حەوتەمی كۆچیدا، كە پێغەمبەرو یارانی هاتن بۆ مەككە بۆ كردنی عەمرە، لەپاش ڕێكەوتنی حودەیبییە، هاوبەش پەیداكەرەكان گوتیان: وا محمد خۆی و تاقمەكەی دێن بۆ ناوتان لەرزو تای مەدینە كزو بێ هێزی كردوون!

پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی بەیارانی كرد: كە لەسێ سەری پێشەوەی تەوافدا بە لۆقە بڕۆن و چالاكی و هێزی خۆیان نیشانی دوشمن بدەن، تاچاو ترسێنیان بكەن، بەڵام لەنێوانی دوو ڕوكنە یەمانییەكانا بەڕۆیشتنی ئاسایی بڕۆن، هەتا لەو ماوەیەدا كەمێ بحەسێنەوە، چونكە لەوێدا

---

[٧٩٥] تجرید/٢، ژمارە: ٧٧٠ = ١٦٠٢، ٤٢٥٦. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٩٥ = مسلم: ١٢٦٤ = ٣٠٤٤.

ـنە بتپەرستەکانەوە دیار نـەبوون! بۆیـەیش فـەرمانی پێـنـەدان کەهـەر حـەوت جارەکەی تەواف بەلۆقە بڕۆن، نەبادا بەهۆی ئەوەوە تەواو شپرزەیان بکا).

لەگێڕانەوەیـەکی تاجـا: جـا هـاوەڵ پەیداکـەرەکان گوتیـان: بەمانـەتان ـدگوت: گوایە لەرزوتای مەدینە کەنەفتی کـردوون، چاکی کەنـەفت نـەکردوون، خۆنەوەتانێ لە هەمووکەس ئـازاو نەبـەردترن ! تـاج/١٨٤/٢ ز/٩٤ = ژمـارە: ١٥٤٣ - ش/د/ت/ن).

عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما): أَرَأَيْتَ هَذَا الرَّمَلَ بِالْبَيْتِ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ وَمَشْيَ أَرْبَعَةِ أَطْوَافٍ أَسُنَّةٌ هُوَ؟ فَإِنَّ قَوْمَكَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ سُنَّةٌ، قَالَ: فَقَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا قَوْلُكَ صَدَقُوا وَكَذَبُوا؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدِمَ مَكَّةَ فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّ مُحَمَّدًا وَأَصْحَابَهُ لاَ يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يَطُوفُوا بِالْبَيْتِ مِنَ الْهُزَالِ، وَكَانُوا يَحْسُدُونَهُ، قَالَ: فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَرْمُلُوا ثَلاَثًا وَيَمْشُوا أَرْبَعًا، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي عَنِ الطَّوَافِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ رَاكِبًا، أَسُنَّةٌ هُوَ؟ فَإِنَّ قَوْمَكَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ سُنَّةٌ، فَقَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا قَوْلُكَ صَدَقُوا وَكَذَبُوا؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَثُرَ عَلَيْهِ النَّاسُ، يَقُولُونَ: هَذَا مُحَمَّدٌ، هَذَا مُحَمَّدٌ، حَتَّى خَرَجَ الْعَوَاتِقُ مِنَ الْبُيُوتِ، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لاَ يُضْرَبُ النَّاسُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا كَثُرَ عَلَيْهِ رَكِبَ، وَالْمَشْيُ وَالسَّعْيُ أَفْضَلُ. {الحديث: ٣٠٤٤ = ٣٠٣١ فـم}:

ئەبو طوفەیل فەرمووی: گوتم بە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لـێ بێ) ئەرێ پێم نافەرمووی ئەم سێجار هەڕاکردنو چوار جار ڕۆیشتن بـە ڕۆیـشتنی ئاساییە، بەدەوری بەیتا، لەکاتی تەوافا، ئایا ئەمە سوننەتە یانا؟

بەقسەی خزمانی تۆبێ ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەو پێغەمبەر وایکـردووە، فەرمووی: قسەکەیان نیوەی ڕاستەو نیوەی درۆیە؟ فەرمووی: ئەوەی کە دەڵێن:

پێغەمبەر وایکردووە، ئەوە راستە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێن: ئەمە سوننەتێکی دامەزراوە لەکاتی کردنی هەموو تەوافێکا، ئەوە درۆیە!! بەپێی ئەم روونکردنەوەیە: ساڵی عەمرەتولقەزا، کە پێغەمبەر تەشریفی هات بۆ عەمرە، کە گەیشتە مەککە، هاوبەش پەیداکەرەکان لە حەسوودیدا، گوتیان: موحەممەدو هاوەڵەکانی، لەرزوتای مەدینە لەڕو لاوازی کردوون، ناتوانن تەافی بەیت ئەنجام بدەن، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەنیا ئەو ساڵە فەرمانی کرد بە هاوڕێیانی، کە لەسێ سەری پێشەوەی تەوافدا، بە لۆقەو نەرمە غار بڕۆنو چالاکیو هێزی خۆیان نیشانی دوژمن بدەن، تا چاوترسێنیان بکەنو چوار سەرەکەی تری تەوافیش بە رۆیشتنی ئاسایی تەواو بکەن، دەی کە ئێستا ئەو مەبەستە نەماوە، پێویست بە هەڕاکردن ناکا لەسێ سەری یەکەما، چونکە هۆکەی نەماوە، کە پێشاندانی هێزە بۆ چاو ترسێنی دوژمن، ئەنجا عەرزیم کرد: خزمانی تۆ دەفەرموون، کە تەوافی نێوانی صەفاو مەروە بەسواری سوننەتە، تۆ بۆ ئەمە دەفەرمووی چی، ئایا شتی وا سوننەتە یانا؟ فەرمووی: ئەم قسەشیان هەندێکی راستەو هەندێکی درۆیە، عەرزیم کرد: چۆن چۆن؟ فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی سەعی نێوانی سەفاو مەڕوەدا، خەڵکێکی زۆر کەڵەکەیان لێکرد، دەیانگوت: ئەمە موحەممەدە، ئەمە موحەممەدە، تەنانەت گەورە کچەکانیش لەماڵ دەرچوو بوونو هاتبوون، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێو سەرو ماڵو مناڵو هەستو نەست، گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکەرانی ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) عادەتی وا نەبوو، کە وەك میرو ئاغا، بە لێدانو بە پاڵ، دڕ بە خەڵك بدرێ لەبەردەمیەوەو رێگەی بۆ چۆڵ بکرێ، جا لە ناچاریدا کە خەڵکەکە ئاوا کەڵەکەیان لێکرد، سواری وڵاخەکەی بوو، هەتا خەڵکەکە چاویان

نە کردارەکانی بیّو بیانکەن بەسەر مەشق، کەواتە: ئەو قسەیان راستە، کە دەڵێن: پێغەمبەر بەسواری وڵاخ سەعی نێوانی سەفاو مەڕوەی کردووە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێن: ئەمە سوننەتە ئەوە وانییە، چونکە پێغەمبەر، کە لەسەعی نێوانی سەفاو مەڕوەدا سواری وڵاخ بوو، بۆ ئەوە نەبوو کە ئەوە سوننەتە، بەڵکوو لەبەر ناچاری بوو، وە لەبەر ئەو عوزرە بوو کە بەیان کرا، کەواتە: رۆیشتن بەپێو هەڕاکردن بەپێ لە نێوانی سەفاو مەڕوەدا سوننەتە، نەوەك سوار بوونی وڵاخ، وەك ئەو خەڵکە بە هەڵە وا دەڵێن). {بڕوانە ژمارە: ٣٠٦٤ لە صەحیحی موسلیم}.

**روونکردنەوە:**

١- نەوەوی (رەحمەتی خودای لیّ بیّ) دەفەرمویّ: ئەمەی کە ئیبنو عەبباس دەفەرمویّ رەمل (هەڕاکردن) لەسیّ سەری پێشەوەی تەوافا سوننەت نییە، ئەمە مەزهەبی خۆیەتی، بەڵام هەموو زاناکان، لە سەحابەو تابیعینو دوای ئەوان، رایان وایە کە رەمل لەم سیّ تەوافەدا سوننەتە، بەڵام ئەوەی کە دەفەرمویّ تەواف بەپیّ سوننەتە، نەوەك بەسواری، ئەمە بەکۆی دەنگ وایەو قسەکەی ئیبنو عەبباس لەم مەسەلەیەدا تەواوە، چونکە زاناکان دەفەرموون: تەواف بەسواری دروستە، بەڵام بەپیّ ئەنجام بدریّ باشترە، مەگەر لەبەر ناچاری.

٢- ئەبو طوفەیل، ناوی عامیری کوڕی واثیلەی لەیثییە، ساڵی شەڕی ئوحود لەدایك بووە زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، دواترین کەس بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر کە مردووە، هەواداری ئیمامی عەلی بوو، فریای هەشت ساڵ لە ژیانی پێغەمبەر کەوتووە، واتە: کە پێغەمبەر مردووە ئەو هەشت ساڵان بووە، لەهەموو نەبەردەکانا لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بووە، لە کووفە دادەنیشت، کە

ئیمامی عەلی شەهید بوو لە مەککە نیشتەجێ بوو، لەوێش مرد، گەلێ جار دەیفەرموو: لەوانەی کە پێغەمبەریان دیوە، بەس من ماوم لەسەر رووی زەوی).
پیاوێکی هۆشمەندو شاعیرێکی بەهرەمەند بوو، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

لەم ژمارەدا بۆئەوەی خوێنەری هێژا ئاگاداربێ، لەچۆنێتی گێڕانەوەکان، گێڕانەوەی بوخاریو گێڕانەوەی موسلیمەمان گواستەوە.

٧٩٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ إِنَّمَا سَعَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِيُرِىَ الْمُشْرِكِينَ قُوَّتَهُ: (٧٩٦)

مەبەست لێی لەژمارەی پێشیدا رابورد، کە ژمارە (٧٩٥) بوو لەم پەڕاوە.

## (٤٠) باب إستحباب إستِلامِ الرُكنين في الطَوَافِ دُونَ الرُكنَينِ الآخَرَينِ
## دەستهێنان بە حەجەرولئەسوەدو هەردوو گۆشە یەمانییەکانو بە مولتەزەمدا سوننەتە

٧٩٧- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: مَا تَرَكْتُ اسْتِلاَمَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِىَ وَالْحَجَرَ مُذْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَلِمُهُمَا فِى شِدَّةٍ وَلاَ رَخَاءٍ. {الحديث: ٣٠٥٣ = ٣٠٣٩ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٧٣ = ١٦٠٦، ٦١١١. نسائى. حج: ٢٩٥٢، تحفة/٨١٥٢} : (٧٩٧)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەوکاتەوە کە بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، لەکاتی تەوافی بەیتدا، دەستی هێناوە بەم دوو گۆشە یەمانییەی بەیتاو بە بەردە رەشەکەداو ماچی کردوون، لەوکاتەوە منیش لەکاتی تەوافی بەیتا، وازم لە دەست پیاهێنانو ماچکردنی ئەم دوو

(٧٩٦) بخاری. حج: ١٦٤٩، ٤٢٥٧ مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا: ٣٠٤٩.
(٧٩٧) بخاری. حج: ١٦٠٨، مسلم: ٣٠٥٥.

گۆشــە یەمانییــەو حەجەرولئەســومد نــەهێناوە، لــەکاتی دەور چــۆڵیو دەور قەرەبالْغیدا، ئەمانەم ئەنجامداوە). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٩٥}.

٧٩٨- حديث ابن عباس (رضى الله عنهما) عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ أَنَّهُ قَالَ وَمَنْ يَتَّقِي شَيْئًا مِنَ الْبَيْتِ ، وَكَانَ مُعَاوِيَةُ يَسْتَلِمُ الأَرْكَانَ ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) إِنَّهُ لاَ يُسْتَلَمُ هَذَانِ الرُّكْنَانِ:

ئــەبو شــەعثــاء (ڕەحمــەتی خــودای لێ بــێ) دەفــەرموێ: کــێ بــێ شــوێنێ لەبــەیت اســتلام نــەکاو شــتیوا بــەباش بزانــێ، دەســتهێنانو ماچــکردنی هــەموو شوێنێکی بەیت ناباش نییە، موعاوییە (ڕەحمەتی خودای لێ بــێ) کــە تەشــریفی دەهات بۆ حەج، لەکاتی تەوافی حەوت دەورەدا هەر چوار گۆشەکەی بەیتی مــاچ دەکردو دەستی پیایانا دەهێنــا، ئیبنــو عــەبباس (ڕەزای خــودا لــەخۆیو لــەباوکی بــێ) پێــی فــەرموو: دوو گۆشــە شــامیو عێراقییــەکان مــاچ نــاکرێن). لــە موختەصــەری صــەحیحی موســلیم، بــۆ زانیــاری تــەواو لــەم باســە، ئەمــە ڕاگــوێز دەکەین:

عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضــى الله عنهمــا ) قَــالَ: لَــمْ أَرَ رَسُــولَ اللَّــهِ (صــلى الله عليــه وسلم) يَسْتَلِمُ غَيْرَ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. {الحديث: ٣٠٥٥ = ٣٠٤١ فم}:

ئیبنــو عــەبباس (ڕەزای خودایــان لــێ بــێ) دەفــەرموێ: نەمــدیوە کــە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەدوو گۆشە یەمانییەکانی بەیت، هیچ گۆشەیەکی تری ماچ بکات).

## ڕوونکردنەوە:

بەیت، یا ماڵی کەعبە چوار گۆشــەی هەیــە، دوانیــان پێیــان دەگــوترێ: دوو گۆشە یەمانییەکان کە گۆشەی حەجەرولئەسوەدو گۆشەی یەمانییە، کە لــەرووی یەمەنەوەیە، دوو گۆشەکەی تریش پێیان دەگــوترێ: دوو گۆشــە شامییەکان، کــە

بـرێتین لـە گۆشـەی شـامیو گۆشـەی عێراقـی. مولتـەزەمیش ئـەو شـوێنەیە لـە دیواری کەعبە، کە تەوافکار دەستی پیادەهێنێو باوەشی پیادەکاو ماچی دەکا، کە دەکەوێتە نێوانی حەجەرولئەسوەدو دەرگاکەی کەعبـەوە، پێشی دەگوترێ حەطیم، گۆشەی شامی بۆیە پێی دەگوترێ شامی، چونکە لە جیهەتی شامەوەیە، گۆشەی عێراقیش لەرووی عێراقەوەیە.

## (٤١) باب إستِحْبَابُ تقبيلِ الحجرِ الأسْوَدِ في الطَّوَافِ
## ماچکردنی حەجەرولئەسوەد لە کاتی تەوافی بەیتدا سوننەتە

٧٩٩- عَنِ عُمَرَ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ أنه جَاءَ إِلَى الحَجَـرِ الاسْـوَدِ فَقَبَلَـهُ، فَقَـالَ: إنـي اَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، لا تَضُرُّ وَلا تَنْفَعُ، وَلَولا أني رَأَيْتُ النَبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ. (الحديث ١٥٩٧- طَرَفاهُ في: ١٦٠٥، ١٦١٠)؛ [٧٩٩]

پێشەوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) چوو بۆلای حەجەرولئەسوەدو ماچی کردو، فەرمووی: (ئەی حەجەرولئەسوەد من دەزانم کە تۆ بـەردێکیت، نـە زیـان دەبەخشیتو، نە بەهرەو سوود، بـەڵام ئەوەنـدە هەیـە مـن خـۆم بەچاوی خـۆم پێغەمبەرم دیوە کە تۆی ماچ کردووە، بۆیە منیش ماچت دەکـەم، ئـەگینا ماچـم نەدەکردیت) (تـاج/٢/١٨٥ ز/٩٥- ١/ د/ت/ن) + (تـاج/٢/١٨٥ ز/٩٥ هـەتا کۆتـایی لـە ژمارە: (١٥٤٧)ەوە هەتا ژمارە: (١٥٥١) + (ژ/٧٧٥) لە تەجریدی بوخاری.

---

[٧٩٩] تجریـد/٢، ژمـارە: ٧٦٧ = ١٥٩٧، مـسلم: ١٣٧٠ = ٣٠٥٧ شـیحا = مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمارە: ٦٩٦.

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

چەند زانیارییەکی بەسوود لەم بارەیەوە، کە لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێن، ڕاگوێزیان دەکەم لە شەرحی عەینی و لەشەرحی فەتحول بارییەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ژمارە: ١٦٠٥و ١٦١٠ و١٦٠٩ لە صەحیحی بوخاری.

١- ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (بەردە ڕەشەکە کە کاتێ لە بەهەشتەوە هاتە خوارەوە، لەچڕی شیر سپیتر بوو، بەرەبەرە گوناهی ئادەمیزادەکان لەکاتی ماچکردنیدا ڕەشی کرد). تەرمزی دەفەرموێ: فەرموو دەیەکی دروستە (حەدیسێکی صەحیحە).

٢- بەردەڕەش زمانو دوو لێوی هەیە، هەروا دوو چاوی هەیە، قسە دەکا، لەڕۆژی قیامەتدا شایەتی بۆ ئەوانە دەدا کە بەهەق زیارەتیان کردووە.

٣- بەردە ڕەشەکە لەخۆیەوە زیان یا سوود نابەخشێ، بەڵام بەفەرمانی خوا هەم سوود، هەم زیان دەبەخشێ.

٤- حەزرەتی عومەر هەمووجارێ سێ ماچی دەکرد.

٥- فەزڵ و گەورەیی بەردە ڕەش لەخواوەیە نەوەك لەخۆیەوە.

٦- کارێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کردبێتی، بەبیانووی ئەوەی کەباوی بەسەرچووە، یا هۆکەی کاتی بووە، ئێستا ئەو هۆیە ڕۆڵی نەماوە، نابێ کارێ پێغەمبەر کردبێتی بەم جۆرە مەهانانە تەرك بکرێ. لەکاتی وادا، ڕاو قیاس کاریان پێ ناکرێ، بەڵکو اتباع پەسەندە.

٧- لەکاتی زیارەتکردنی بەردە ڕەشەکەدا ماچکردنی سێجار سوننەتە، وا باشە ماچەکە دەنگی نەیێ، هەردوولێوی لەسەر بەرەدەکە دانێ، ئەگەر مەودای ماچکردنی نەبوو دەستی پیابهێنێو دوایی دەستی خۆی ماچ بکات،

لەحەدیسێکی موسلیما دەفەرموێ: (پێغەمبەر لەتەوافی بەیتدا بەگۆچانێ ئیستیلامی بەردەڕەشی کردو دوایی گۆچانەکەی ماچکرد).

٨- موتابەعەی پێغەمبەر دەبێ بکرێ، باهۆو بایستی پەیڕەوی - واتە: اتباعەکەیش نەزانرێ، هەتا پەیڕەویی پێغەمبەر هەبێ کار بە رای ئەم و ئەو ناکرێ.

٩- خوا باوو فەزڵی هەندێ بەردو دارو ئاژەڵی داوە بەسەر هەندێ بەردو دارو ئاژەڵێتردا، وەك چۆن باوی هەندێ شوێن‌و کات‌و ڕۆژی داوە بەسەر هەندێ شوێن‌و کات‌و ڕۆژی تردا.

١٠- جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستی بەبەردە ڕەشەکەدا هێناو چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و ماچی کردو دەستەکانی دانا لەسەری و هێنانی بەڕووی خۆیدا بۆ موفەڕکی.

١١- ماچ کردنی شوێنە پیرۆزەکان بەمەبەستی موفەڕکی، وە هەروا ماچ کردنی گۆڕی پیاوچاکان‌و هەڵسان لەبەر چاکان‌و گەورە پیاوان‌و هەروەها ماچکردنی دەست‌و پێ‌و ڕیش‌و جەستەی پیاوچاکان کارێکی جوانی پەسەندە، بەپێی مەبەست‌و نیازەکەی (تاج/١٠/١٢٩-ز/٤٢) = تاج/٥، زنجیرە: ٤٢، لە ژمارە: (٥٣١١)وە هەتا تەواوی زنجیرەکە. بڕوانە: فتح الباري ج/٣ ص/٦٥، حيث قال الشيخ العَسْقَلانِي بِالنَصِّ: (.. واخْتُلِفَ فِي شَدِّ الرِّحَالِ إلى غَيْرِهَا، كالـذَّهَابِ إِلَى زِيَارَةِ الصَّالِحِينَ أَحيَاءً وَأَمْواتَاً وَإِلَىَ المَواضِعِ الفاضِلَةِ، لِقَصد التَبَرُّك بِها وَالصَّلاةِ فِيها، فَقَالَ الشَيخ أَبُو مُحَمَد الجُوَيْنِي: يَحْرُمُ شَدُّ الرِّحَالِ إلى غَيرِها.. إلخ.. إلى أَن قالَ العَسْقَلاني: (.. والصَّحيحُ عِنْدَ إِمَامِ الحَرَمَين وَغَيرِهِ مِنَ الشَّافِعِيَّةِ أَنَّهُ لاَ يَحْرُمُ..)

١٢- ئەبو هورەیرە ناوکی ئیمامی حەسەنی ماچ کرد، گوتی: چونکە دیومە کە پێغەمبەری باپیرەت ئەو شوێنەی ماچ کردووە.

١٣- ثابيتى بەنانى هەمووجارێ دەستى ئيمامى ئەنەسى ماچ دەكردو دەيفەرمو: (ئەمە دەستێكە كە لەدەستى پێغەمبەر كەوتووە !).

١٤- ئيمامى ئەحمەد فەتواى داوە كە ماچكردنى قەبرى پێغەمبەرو ماچ كردنى مينبەرەكەى قەيدى نييە.

١٥- ئيمامى ئەحمەد كراسێكى شافيعى شۆردو ئاوەكەى بۆ موبارەكى‌و موفەڕك خواردەوە! شێخى ئيبنوتيميە لەم دووكارەى ئيمام ئەحمەد متعجب بوو!

١٦- ماچ كردنى بەرگ‌و پەڕەى قورئان‌و پەڕاوى حەديث وكتێبى شەريعەت‌و ماچ كردنى گۆڕى پياوچاكان دروستە، بگرە موحيببى طەبەرى دەفەرموێ: (يُسْتَنْبَطُ مِنْ تَقْبِيلِ الحَجَرِ وأسْتِلامِ الارْكَانِ جَوازُ تقبيل مَا فِي تقبيلِهِ تعظيمُ اللهِ تَعالى فانْ لَمْ يَرِدْ فيه خبرٌ بالنـدْب لَـمْ يَـرِدْ بالكَراهـة). بڕوانە كۆتايى بەرگى يەكەمى تەرجەمەى فيقهى ئاسان بە كوردى (ل/٤٢١).

١٧- جێ بەجێكردنى سوننەت فەرقى قەول‌و عەمەلى نييە.

دروستە كە دارو بەردو بێگيان قسە بكات، شت ببينێ، يا بگرى، ياكەسێكى خۆش بوێ، يا ڕقى لێى بێ، وەك تەسبيحاتى زيخ‌و بەردە وردەو نان‌و چێشت‌و كۆڵەكەو قسەكردنى گورگ و حوببى كێوى ئوحود فەرمووى: (دروودى خوداى لەسەر بێ) (أحُدُ جَبَلُ يُحبُّنَا ونُحبُّهُ).

## (٤٢) باب جَوَازِ الطَوَاف عَلَى بَعيرٍ وَغَيْرِهِ، وَإِسْتِلَام الحَجَر بمِحْجَنٍ وَنَحْوِهِ لِلرَاكِبِ
## تەواف بە سواریو دەستهێنان بە بەردە ڕەشا بە گۆچانو شتی تری وەها دروستە

٨٠٠- عَنِ ابنِ عباسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قَالَ طافَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في حَجَّةِ الوَداعِ عَلى بَعيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ. (الحديث ١٦٠٧- أطرافه في: ١٦١٢، ١٦١٣، ١٦٣٢، ٥٢٩٣): [٨٠٠]

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی مالآواییدا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بە سواری وشترێ تەوافی بەیتی دەکرد، هەمووجارێ کە دەگەیشتە ئاستی گۆشەی بەردە ڕەشەکە، گۆچانێکی بەدەستەوە بوو، گۆچانەکەی دەهێنا بە بەردە ڕەشەکەدا). لەگێرانەوەیەکی پێشەوا موسلیم دا دەفەرموێ: (بە گۆچانێ ئیستیلامی حەجەرولئەسوەدی دەکردو پاشان گۆچانەکەی ماچ دەکرد).

بۆ سوودی پتر گێڕانەوەی پێشەوا موسلیم (٣٠٦٣ = ٦٩٩ مختصر صحیح موسلیم) دەنووسین:

عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْبَيْتِ فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِمِحْجَنِهِ لأَنْ يَرَاهُ النَّاسُ وَلِيُشْرِفَ وَلِيَسْأَلُوهُ، فَإِنَّ النَّاسَ غَشُوهُ. {الحديث: ٣٠٦٣ = ٣٠٤٩ فم}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی مالآواییدا، بەسواری وشترەکەی خۆی، تەوافی بەیتی دەکرد، وە بەگۆچانەکەی دەستی دەهێنا بە گۆشەی حەجەرولئەسوەددا،

---

[٨٠٠] تجرید/٢، ژمارە: ٧٧٤ = ١٦٠٧ مسلم: ١٢٧٢ = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٩٩ = ٣٠٦٣ شیحا.

بۆئەوەی حاجیەکان بیبینن‌و بیکەن بەسەر مەشق بۆخۆیان‌و چاویان لێی بێ، هەتا پرسیاری لێ بکەن، چونکە خەڵکەکە گەمارۆیان دابوو). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ١٥٤٨}:

٨٠١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنِّى أَشْتَكِى، فَقَالَ: « طُوفِى مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ ». قَالَتْ: فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَئِذٍ يُصَلِّى إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، وَهُوَ يَقْرَأُ بِ (الطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ). {الحديث: ٣٠٦٧ = ٣٠٥٣. أبو داود. حج: ١٨٨٢. نسائى. حج: ٢٩٢٧ + تجريد/١، رقم: ٢٨٤ = ٤٦٤، ١٦١٩، ١٦٢٦، ١٦٣٣، ٤٨٥٣}: [٨٠١]

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، سکاڵای حاڵم لەلای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد: کە نەخۆشم، ناتوانم بەپێ تەواف بکەم؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەپاش خەڵکەکەوە بەسواری وشترەکەت تەواف بکە)، جامنیش وامکرد، لەوکاتەدا کە من تەوافم دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ مەردومەکە دەکرد، لە تەنیشتی کەعبەوە، سوورەتی (وَالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ) لەو نوێژەدا دەخوێند. {تاج/٢، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ١٥٤٢}.

---

[٨٠١] تجرید/١، ژمارە: ٢٨٤ = ٤٦٤ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٠٠ - مسلم: ٢٠٦٧ - ٣٠٦٧ شیحا.

## (٤٣) باب بيان أنَّ السعْىَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَة رُكْنُ لا يَصِحُّ الحَجُّ إلاَّ بِهِ

## بەبێ سەعی نێوانی صەفاو مەروە حەج دانامەزرێ، چونکە سەعی نێوانی ئەو دوو تەپۆڵکەیە ڕوکنی حەجە

٨٠٢- عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ (رضى الله عنها): مَا أَرَى عَلَيَّ جُنَاحًا أَنْ لاَ أَتَطَوَّفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، قَالَتْ: لِمَ؟ قُلْتُ: لأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) الآيَةَ. فَقَالَتْ: لَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ لَكَانَ: ((فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا)). إِنَّمَا أُنْزِلَ هَذَا فِى أُنَاسٍ مِنَ الأَنْصَارِ كَانُوا إِذَا أَهَلُّوا، أَهَلُّوا لِمَنَاةَ فِى الْجَاهِلِيَّةِ، فَلاَ يَحِلُّ لَهُمْ أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا قَدِمُوا مَعَ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) لِلْحَجِّ ذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ، فَلَعَمْرِى مَا أَتَمَّ اللَّهُ حَجَّ مَنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. (وفي رواية): مَا أَتَمَّ اللَّهُ حَجَّ امرىء ولا عمرته لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. {الحديث: ٣٠٦٩، ٣٠٦٨ = ٣٠٥٥، ٣٠٥٤ فم = فم = فتح الملهم. تجريد/٢، رقم: ٧٨٤ = ١٦٤٣، ١٧٩٠، ٤٤٩٥، ٤٨٦١}: [٨٠٢]

عوروه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بە عائیشەم گوت (ڕەزای خودای لێ بێ): بەخودا وادەزانم ئەگەر من، یا هەرکەسێ، لەکاتی حەجو عەمرەدا، نەیشگەڕێ لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا، گوناهی ناگاو حەجو عەمرەکەی تەواوە؟ فەرمووی: بۆ؟ گوتم: چونکە خودای گەورە دەفەرموێ:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا}:

واتە: صەفاو مەڕوە لە دروشمەکانی خودان، جا هەرکەسێ حەجی کرد، یا عەمرەی کرد، گوناهی لەسەر نییە، کە بگەڕێ لەنێوانی ئەم دووەدا).

[٨٠٢] تجريد/٢، ژمارە: ٧٨٤ - ١٦٤٥ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٠١ = ١٢٧٧ - ٣٠٦٩ شيحا.

عائیـشەیش فـەرمووی لـە وەڵامـا: هەرکەسـێ لـەنێوانی صـەفاو مـەڕوەدا هاتوچۆ نەکاو، سەعیی بەینی صەفاو مەڕوە حـەوت جار نـەکا، ئـەوە خـودا نـە حەجی تەواو دەکاو نە عەمرەی، چونکە ئەگـەر وەك تـۆ دەڵێیـت ئاوابـێ، دەبـێ ئایەتەکە وابێ: {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْـهِ أَن لاَيَطَّـوَّفَ بِهِمَـا}. واتـە: (گونـاهی ناگـا کـە لـە ناوەند یانا هاتوچۆ نەکا).

دەزانی بۆچی ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیەی کە هەیـە، هاتـە خـوارەوە: چـونکە لەپێـشا یاریـدەدەران (ئەنـصار) لەسـەردەمی نەزانیـدا، لـەپێش ئیـسلام بوونیاندا، جاران ئیحرامی حەجیان بۆ بتێ دادەبەست کە ناوی مەنات بوو، کـە موسوڵمانان ناویان نا: مەناتی طاغیة: واتە: مەناتی سەرکەش، چونکە خەڵکێکی ئێجگار زۆری گومڕا کردبوو، ئەم بوتە لەلای موشەللەلا بوو، کەناوی شوێنێکە وا لە نزیکی قەدیدەوە، جا ئەوانەی کە ئیحرامی حـەجیان بـۆ ئـەم بتـە سەرکەشـە دەبەست، ئیتر دوورە پارێزیان لە تـەوافی صـەفاو مـەڕوە دەگـرت، هـەتا تـوخنی بتەکانی خەڵکی مەککە نەکەون، کە ناویان ئیسافو نائیلـە بـوو، ئیـساف لەسـەر تەپۆڵکـەی صـەفا بـوو، وە نائیلـە لەسـەر تەپۆڵکـەی مـەڕوە بـوو، جـا کاتـێ یاریدەدەران ئیسلام بوون، لەم بارەیەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد، ئەوکاتەی کە لەخزمەتیدا لە مەدینەوە هاتن بۆ حەج، ئەم باسو خواسەیان عـەرزی کـرد، کە ئێمە جاران حاڵمان وابوو، ئێستا چی بکەین؟؟ ئیتر بـەم بۆنەیـەوە، خـودای گەورە، یەزدانی مەزن، ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ – سورة البقرة/ ١٥٨}.

عائیشە فەرمووی: وەکی تریش ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) بەکردارو گوتار، تەوافو هەڵسووڕانی نێـوانی صـەفاو مـەڕوەی کـردووە بـە

دەستوور، دەی بەگیانی خۆم! خودا حەجی ئەوکەسە تەواو ناکا، کە تەوافی نێوانی صەفاو مەروە ئەنجام نەدا). لە فەرموودەی ژمارە (٣٠٦٨)ی موسلیمدا ئەم رستەیەی دواوە ئاوایە: خودا حەج و عەمرەی ئەوکەسە تەواو ناکا، کە تەوافی بەینی صەفاو مەروە نەکا).

**روونکردنەوە:**

عوروەی کوڕی زوبەیر، کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، زانایەکی گەورەیە، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشەی پووری دەبوون، کە عائیشە لەماڵی خۆیدا، لە مەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو راگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەرو تەفسیری ئایەتەکانی قورئان، عوروە یەکێکە لە پێشەوا هەرە ناودارە رێزدارە مەزنەکانی پەیرەوان، کە پێیان دەگوترێ: (تابعین: چینی دووەمی موسوڵمانان) یەکێکە لە حەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لەزاراوی شەرعدا ناودارو ناسراون بە (فوقەهای سەبعە = حەوت شەریعەت زانەکان) کە ئەم زاتانەن: ١- عوروە ٢- سەعیدی کوڕی موسەییب ٣- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە ٤- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق ٥- سلێمانی کوڕی یەسار ٦- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت ٧- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

عوروە، دایکی ناوی ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیقە، کە خوشکی باوکیی عائیشەیە، خاوەنی ئەم شانازییانەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوایەتی، مێردی پووریەتی، ئەبوبەکر باپیریەتی، زوبەیر باوکیەتی، ئەسماء دایکیەتی، عائیشە پوریەتی خوشکی دایکیەتی، ساڵی بیستی کۆچی لەدایکبووە، لە نەوەدو چوار مردووە، کۆمەڵەی فەرموودە زانەکان

فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە. واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، كەواتە: لە پیاوانی صەحیحی بوخاریو موسلیمە، لەناو پەیڕەوان (تابعین)دا، عوروەی كوڕی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە، بۆ زێدە بەهرەو شارەزا بوون بڕوانە: {تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢، ٣٣١٩ — مەزناهی زوبەیری كوڕی عەوام + ژمارە: ٣ لە تەجریدی بوخاری، بەرگی یەكەم + ژمارە: ٣٤٩ = ٦٠٢ + ژمارە: ٧٥ تەجرید + تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ج/٤، ژیاننامەی خاتوو عائیشە + ریاض/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢ + تاج/١٠، زنجیرە: ٩٧ ژمارە: ٥٥٣٩ ج/٤} .

٨٠٣ـ عَنْ عُرْوَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها فَقلتُ لَهَا: أَرَأيْتِ قَوْلَ الله تعالى: إنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ فَمَن حَجَّ البَيتَ أو اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أنْ يَطوَّفَ بِهِمَا) فَوَاللهِ مَا عَلى أحدٍ جُناحُ أنْ لايَطُوفَ بالصّفَا وَالمَرْوَةِ قالَتْ عَائشة رَضِي اللّٰهُ عَنْها بئسَ مَا قُلْتَ يا ابْنَ أُخْتِي، إنَّ هذهِ لَوْ كانت كَمَا أَوَّلْتَهَا عَلَيْهِ، كَانَتْ: لاَجُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لايَتَطَوَّفَ بِهِمَا، وَلَكنَّهَا أُنْزِلَتْ فِي الأنْصارِ، كَانُوا قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا، يُهِلّونَ لِمَنَاةِ الطَّاغِيَةِ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَهَا عِنْدَ المُشَلَّلِ، فَكَانَ مَنْ أَهَلَّ يَتَحَرَّجُ أنْ يَطُوفَ بالصَّفَا والمَرْوَةِ، فَلَمَّا أَسْلَمُوا، سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذلِكَ، قَالُوا: يَارَسُولَ الله إنَّا كُنَّا نَتَحَرَّجُ أنْ نُطُوفَ بَيْنَ الصفا وَالمَرْوَةِ، فَأنزَلَ اللهُ تَعالى: (إنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ) الآية. قالَتْ عَائشَةُ رَضِي اللّٰهُ عَنْها: وَقَدْ سَنَّ رَسُولَ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الطَوافَ بينهما، فَلَيْسَ لأحَدٍ أنْ يَتْرُكَ الطَّوافَ بَيْنَهُمَا).
(الحديث ١٦٤٣ – أطرافة في: ١٧٩٠، ٤٤٩٥، ٤٨٦١)[٨٠٣]:

عوروەی كوڕی زوبەیری خوشكەزای حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە عائیشەی پوورمم پرسی، پێم گوت: پووری بەخودا وادەزانم ئەگەر كەسێ لەكاتی حەجو عەمرەدا نەیش گەڕی لەناوەندی صەفاو مەروەدا

---

[٨٠٣] تجرید/٢، ژمارە: ٧٨٤ - ١٦٤٣ مسلم: ١٢٧٧ = ٣٠٧٠ شیحا.

گوناهی ناگا؟ فەرمووی: بۆ؟ عەرزیم کرد: چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أو اعتَمَرَ فَلاَ جُناحَ عَلَيْهِ أنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا – واتە: صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خودان، جا هەرکەسێ حەجی کرد، یا عەمرەی کرد، گوناهی لەسەرنییە کە بگەڕێ لە نێوانی ئەم دووەدا﴾. دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کەکردنەکەی تاوان نییە، نەك بەڵگەی ئەوەبێ کەکردنەکەی پێویستە. کەواتە: نەکردنی دروستەعائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی خوشکەزای شیرینم !

ئەمەی تۆ دەیڵێیت قسەیەکی زۆر ناپەسەندە، چونکە ئەم ئایەتە، ئەگەر وەك تۆ تەئویلی دەکەیت وابێ، دەبوو نەظمەکەی ئاوا بوایە:

﴿لاجُنَاحَ عَلَيْهِ أنْ لايَطوَّفَ بِهِمَا: تاوانی لەسەر نییە ئەگەر تەوافی نێوانی ئەم دووە نەکا﴾. لەبەرئەوە هەرکەسێ لەناوەندی صەفاو مەڕوەدا هاتوچۆ نەکا، لەسەر شێوەی بڕیاردراو، ئەوە خودا نەحەجی تەواو دەکاو نە عەمرەی.

دەزانی بۆچی ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیەی کەهەیە هاتە خوارەوە: چونکە لەپێشا یاریدەدەران (ئەنصار) لە سەردەمی نەزانیدا، لەپێش ئیسلام بوونیاندا، جاران ئیحرامی حەجیان بۆ بوتێ دەبەست کە ناوی مەنات بوو، کە مسوڵمانان ناویان نا: مەناتی طاغیە، واتە: مەناتی سەرکەش، چونکە خەڵکێکی ئێجگار زۆری گومڕاکردبوو، ئەم بتە لەلای موشەللەلا بوو، کە ناوی شوێنێکە وا لەنزیکی قەدیدەوە، لەڕووی دەریاوە، لەوێدا دەیانپەرست، جا ئەوانەی کەئیحرامی حەجیان بۆ ئەم بتە سەرکەشە دەبەست، ئیتر دوورە پارێزیان لەتەوافی صەفاو مەڕوە دەگرت، هەتا توخنی بتەکانی خەڵکی مەککە نەکەون، کە ناویان ئیساف و نائیلە بوو، ئیساف لەسەر تەپۆلکەی صەفا بوو، وە نائیلە

لەسەر تەپۆڵکەی مەروە بوو، جاکاتێ کەیاریدەدەران ئیسلام بوون، لەم بارەیەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد، عەرزیان کرد:

قوربان! ئێمە جاران ئاقاری ڕاکردنی نێوانی صەفاو مەروە نەدەکەوتین، جا ئایا ئێستا ئەرکی سەرشانمان لەم بارەیەوە چییە؟

ئیتر بەم بۆنەیە خودای گەورە، یەزدانی مەزن، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ. البقرة: من الآية ١٥٨﴾ تا کۆتایی ئایەت.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وەکی تریش ئەوەتا پێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- بەکردارو بە گوتار، تەواف و هەڵسووڕانی نێوانی سەفاو مەروەی کردووە بە دەستوور، کەواتە: هیچ کەسێ مافی ئەوەی نییە کە واز لە هەڵسووڕانی نێوانی ئەم دوانە بهێنێ بەهیچ مەهانەیێ. (تاج/٢/١٨٩٨ز-٩٧).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

عوروەی کوڕی زوبەیر کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشە دەبوون، کە لە ماڵی خۆیدا لە مەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانست و ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ-.

عووروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناودارە ڕێزدارە مەزنەکانی پەیڕەوان کە پێیان دەگوترێ: (تابعین: چینی دووەمی مسوڵمانان) یەکێکە لە حەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لە زاراوی شەرعدا ناودارو ناسراون بە (فوقەهای سەبعە = حەوت شەرعزانەکان).

که ئەم زاتانەن:

١. عووروە.
٢. سەعیدی کوڕی موسەییب.
٣. عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە.
٤. قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق.
٥. سلێمانی کوڕی یەسار.
٦. خاریجەی کوڕی زەیدی کووڕی ثابیت.
٧. سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر.

هەندێ دەڵێن: حەوتەم: ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریثە، هەندێ تر دەڵێن: حەوتەم: ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدورڕەحمانە.

ناوی دایکی ئەسمای کچی ئەبوبەکری سەدیقە، کە لە باوکەوە خوشکی باوکی عائیشەیە خاوەنی ئەم شانازییانەیە: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- زاوایەتی، ئەبوبەکر باپیرەتی، زوبەیر باوکیەتی، ئەسماء دایکیەتی، عائیشە پوریەتی خوشکی دایکیەتی،ساڵی بیستی کۆچی لەدایك بووە، لە نەوەدو چوارا مردووە، کۆمەڵەی فەرمووده زانەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە،

واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، کەواتە: لە پیاوانی صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیمیشە، لەشەش کتێبە ناودارەکانی فەرموودەدا جگە لە خۆی عوروەی کوڕی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە، لەناو هاوەڵانیشدا عوروەی زوبەیر ناویان تیادا نییە، بۆ زێدە بەهرەو شارەزابوون بڕوانە: (تاج/٧٩/٥ز-١٠-مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ژمارە/٣، کەوا لەبەرگی یەکەمی تەجریددا + ژ/٦٠٢/٣٤٩ + ژ/٧٥ لە تەجرید/١ + تاج/١٥٢/٥ ز/٣٧ = تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ج/٤+ ریاض/١٨٦/١ ز/٢٠٢ ز/٢٥ + تاج/٢٥٤/١٠ ز/٩٧ = تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ج/٤).

پێشەوا زوهری – بگێڕی ئەم فەرموودەیە – دەفەرموێ: لەپاشا هەواڵم پێ درا، کە ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریثی کوڕی هیشام، دەفەرموێ: (ئەمەی عائیشە دەفەرموێ، بەڕاستی زانستێکی بەرزە، کەمن هەتا ئێستا لەکەسی ترم نەبیستووە). هەروا ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: بەڵام من لەکۆمەڵێ پیاوی زانام بیستووە، کە خەڵکانێ، جگە لەوانەی کە عائیشە باسی کردوون لەم فەرموودەدا – لەو کەسانەی کە لەسەردەمی نەفامیدا، ئیحرامی حەجیان بۆ بتێ دادەبەست، کەناوی مەنات بوو، ئەمانە کە موسوڵمان بوون، تەوافی نێوان صەفاو مەڕوەیان ئەنجام دەدا، بەڵام کاتێ خودای گەورەو سەرومر لە قورئانی پیرۆزدا، ئایەتی نارده خوارەوە، سەبارەت بە تەوافی بەیت، وەك دەفەرموێ: ﴿وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ – البقرة/١٢٥﴾. واتە:

فەرمانمان دا بە ئیبراهیمو بە ئیسماعیلی کوڕی، کە ئەم ماڵی منە، ئەم خانەی خودایە، دەروناوی پاكو خاوێن رابگرنو پاکی بکەنەوە لەهەر شتێ کە نەگونجێ لەگەڵ بەندەگیو موناجاتو گوفتوگۆی خۆمانە لەگەڵ خودادا، بۆ ئەو کەسانەی کە بەشێوەی ئایین هەڵ دەسووڕێن بەدەوریدا، وەیا لەناویدا ئەمێننەوە بۆ خواپەرستیو بەندەیی خودا، وەبۆ ئەو کەسانەیش کە نوێژی تیادەکەنو روکوعو چەمینەوەو کوڕنووشی تیادەبەن بۆ خودای گەورەو سەرومر). کاتێ خودای گەورە سەبارەت بە تەوافی خانەی خودا، ئایەتی ناردو سەبارەت بە سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە هیچی نەنارده خوارەوە، ئەم کەسانەی لەپێشەوە باسکران، گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە هەتا ئێستا تەوافی بەیتو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە ئەنجام دەدەین، بەڵام دەبینین خودای گەورە سەبارەت بەحەوت دەورەی بەیت، لە قورئانا، ئایەتی نارده

خوارەوە، وەلێ لەبارەی هەڕاکردنی نێوانی تەپۆڵکەی صەفاو تەپۆڵکەی مەڕوەوە، ئایەتی نەناردووە، جا ئایا گوناهمان دەگات، ئەگەر تەوافی صەفاو مەڕوە نەکەین؟جا لەم بارەیەوە خودای مەزن ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ﴾.... تا کۆتایی ئایەت.

ئەبوبەکر فەرمووی: جا وا دەبینم کە ئەم ئایەتە، سەبارەت بەم دوو لایەنە دابەزیوە، سەبارەت بەوانەی کە لەپاش ئیسلام بوون، دوورە پارێزیان لە تەوافی صەفاو مەڕوە دەکرد، وە سەبارەت بەوانەیش کە لەپاش ئیسلام بوون تەوافی صەفاو مەڕوەیان دەکرد، بەڵام داوایان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە وازی لێ بهێنن، چونکە قورئان سەبارەت بە تەوافی بەیت دابەزیوە، بەڵام قورئان سەبارەت بە سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە دانەبەزیوە.

٨٠٤ـ حديث أنس بن مالك (رضى الله عنه) عن عَاصِمٌ قَالَ قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَالَ نَعَمْ . لأَنَّهَا كَانَتْ مِنْ شَعَائِرِ الْجَاهِلِيَّةِ ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ ( إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا): [٨٠٤]

عاصیم فەرمووی: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم گوت: ئایا ئێوە تەوافی صەفاو مەڕوەتان پێ ناخۆش بوو؟ فەرمووی: بەڵێ، چونکە دروشمی سەردەمی نەزانی بوو، تا خودای گەورە، ئەم ئایەتەی نارده خوارەوەو فەرمانی کرد بەکردنی: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾.

[٨٠٤] بخاری. حج: ١٦٤٨ مسلم: ٣٠٧٣.

## ٤٥) باب إستِحْباب إدامَةِ الحاجِ التَّلْبِيَةَ حَتىَّ يَشْرَعَ في رَمىِ جَمْرَةِ العَقَبَةِ يَوْمَ النَّحرِ

## سوننەتە حاجی بەردەوام بێ لەسەر تەلبییە، هەتا دەست دەكا بە ڕەجمی شەیتان لە ئەلعەقەبە، لە یەكەم ڕۆژی جەژندا

٨٠٥- حديث أسامة بن زيد والفضل عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ - رضى الله عنهما - أَنَّهُ قَالَ رَدِفْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - مِنْ عَرَفَاتٍ فَلَمَّا بَلَغَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - الشِّعْبَ الأَيْسَرَ الَّذِى دُونَ الْمُزْدَلِفَةِ أَنَاخَ ، فَبَالَ ثُمَّ جَاءَ فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ الْوَضُوءَ ، فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا خَفِيفًا . فَقُلْتُ الصَّلاَةَ يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « الصَّلاَةُ أَمَامَكَ » . فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ ، فَصَلَّى ثُمَّ رَدِفَ الْفَضْلُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - غَدَاةَ جَمْعٍ.

قَالَ كُرَيْبٌ فَأَخْبَرَنِى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ الْفَضْلِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَزَلْ يُلَبِّى حَتَّى بَلَغَ الْجَمْرَةَ:[٨٠٥]

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا، لەژمارە (٧١٢)دا، بەرگی دووەم ئاوایە:

كورەیب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ئوسامەی كوڕی زەیدم پرسی، (ڕەزای خودایان لێ بێ) تۆ خۆت لە پاشكۆی پێغەمبەرەوە سوار بووبوویت، ئەو ئێوارەی كە عەرەفەتان بەجێ هێشتو ڕۆیشتن بۆ موزدەلیفە، چیتان كرد؟؟

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵئاواییدا، لە ئێوارەی عەرەفەدا، لە عەرەفاتەوە گەڕایەوەو كەوتەڕێو بەرەو موزدەلیفە

[٨٠٥] تجريد/١، ژمارە: ١١٣ = ١٣٩ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٢ = ٣٠٩٠ شيحا.

رۆیشت، ئێمەیش لە خزمەتیدا رۆیشتین، هەتا گەیشتینە رێچکەکانی حاجیان، کە پێیان دەگوترێ: (شیعەبی حاجیان) شیعب واتە: رێچکەی قەد شاخ، جا لەوێ خەڵکەکە دابەزینو وشترەکانیان ییخ دا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەزیو وشترەکەیی ییخ داو، گمێزی کرد (کورەیب فەرمووی: ئوسامە بەدەق فەرمووی گمێزی کرد، وە نەیفەرموو سەراوی کرد، بۆیە منیش دەقی قسەکەی ئەوم گوتەوە) ئەوسا داوای ئاوی دەستنوێژی کردو دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرت، منیش عەرزیم کرد: قوربان! لێرە نوێژی شێوان دەکەی؟ فەرمووی: (نەء، نوێژ وا لەپێشمانەوە لەولاترە).

ئەوجا سوار بووەوەو ئێمەیش رۆیشتین هەتا گەیشتینە موزدەلیفە لەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەزیو دەستنوێژێکی تێرو تەسەلی گرت، ئەوجا قامەتی نوێژی شێوان کرا، لەوێ بەجەمعە تەئخیر (کۆکردنەوەی پاشخراو) نوێژی شێوانی بۆمان کرد، ئینجا هەرکەسە لە جێگەی خۆی وشتری خۆی ییخ دا، بەڵام بارو بنەیان نەخست، هەتا قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنانو نوێژی خەوتنانیشی بە جەماعەت بۆ کردین، ئەوجا بارو بنەیان خست.

عەرزیم کرد: باشە کاتێ بەیانی دا چیتان کرد؟ ئوسامە فەرمووی: کە کەوتەڕێ بۆ مەشعەرولحەرام، لەپاش نوێژی سبەینێ، فەزڵی کوڕی عەبباسی خستە پاشکۆی خۆی، منیش لەگەڵ ئەوانەدا، کە زوو بەزوو رۆیشتن بۆ رەجمی شەیتان، بەپێ رۆیشتم). {بڕوانە: تجرید/٢، ژمارە: ٧٤٢ + تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤} .

فەزڵی کوڕی عەباس، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، برای هەقی ئیبنو عەباسە، لەیەك باوكو دایكن، کوڕی گەورەی ئیمامی عەباسە، لە غەزای مەککەو غەزای حونەینا لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ رێز لینان لە پاشکۆی خۆیەوە سواری

كردبوو، لەكاتی شۆردنی تـەرمی پـیرۆزی پێغەمبـەردا، عـەلیو فـەزڵو ئوسـامەی كوڕی زەید شۆردیان، هەر ئەوانیش تەرمەكەیان داهێڵایـە نـاو گۆڕەكـەوە، عـەلی تەرمەكەی دەشۆردو فەزڵ ئاوەكەی دەكرد بە دەسـتیدا، فـەزڵ پیـاوێكی جـوانی، قژ جوانی سپیلكەی قۆز بوو، زۆر كەس فـەرموودەیان لێیـەوە گێڕاوەتـەوە، وەك عەبدوڵڵای برایو ئەبو هورەیرەو تەنانەت عەباسی باوكیـشی یـەك فـەرموودەی ئەموەوە گێڕاوەتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ژنی بـۆ هێنـاو، خۆی مارەیەكەیشی دا، یەك كچی لەدوا بەجێ ما، ناوی ئوم كولثووم بوو، شـووی كـرد بـە حەسـەنی كـوڕی عـەلی، لـەپاش ئـەو شـووی كـرد بـە ئـەبو مووسـای ئەشعەری، راجیاییەكی زۆر هەیە لەبارەی مێژووی مەرگیەوە، وا دەردەكەوێ كە ئیبنـو عەبباسـی بـرای، ئـەم فەرموودەیـەی لـە فـەزڵی برایـەوە وەرگرتـووە).

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥}.

## (٤٦) باب التلبية وَالتكبير في الذهَابِ مِنْ مِنىً إلى عَرَفَاتٍ في يَوْمِ عَرَفَةَ
## تەلبییەكردنو ئەڵلاهوئەكبەر كردن لە كاتی ڕۆیشتن بۆ چیای عەرەفە لە ڕۆژی عارفەدا

٨٠٦- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ الثَّقَفِيِّ (رضى الله عنه) أَنَّهُ: سَأَلَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ وَهُمَا غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ، كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ فِى هَذَا الْيَوْمِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ فَقَالَ: كَانَ يُهِلُّ الْمُهِلُّ مِنَّا فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ: وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ مِنَّا فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ. {الحديث: ٣٠٨٥ = ٣٠٧٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٥٠٦ = ٩٧٠، ١٦٥٩ فتح الباري. نسائي. حج: ٣٠٠٠}: [٨٠٦]

---

[٨٠٦] تجريد/٢، ژمارە: ٥٠٦ = ٩٧٠ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٠٩ = ٣٠٨٥ شيحا.

موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری ئـەل‌ـثـەقـەفی (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لـە حـەجێکا لـە خزمـەتی ئەنەسـی کـوڕی مالیکـا بـووین، لـەرۆژی عەرەفـەدا، سـەر لەبـەیانی لـەو کاتـەدا، کـە لەخزمەتیـدا، خـەریك بـووین دەردەچووین لە میناوە بۆ عەرەفات، عەرزیم کـرد: لـەم رۆژانـی مینایـەدا، کاتـێ ئێوە لە خزمـەتی پێغەمبـەردا دەبـوون چیتان دەکـرد؟ فـەرمووی: هـەمان بـوو تەلیلەی دەکردو، هەمان بوو (الله اکبر)ی دەکردو هەمان بـوو تەلبییـەی دەکـردو هـەمان بـوو تەسـبیحاتی دەکـرد، کەسـیش رەخنـەی لەکـەس نـەدەگرت، نـەیان دەگوت ئەمـەیان بکـەنو ئـەوەیان مەکـەن). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٠١، ژمـارە: ١٥٦٨ ج/٤}.

## (٤٧) باب الإفَاضَةِ مِنْ عَرَفَاتٍ إلى المُزدَلفَةِ وإستِحْبابِ صَلاَتي المَغرب وَالعِشَاءِ مَعاً بالمزدَلفَةِ في هذه الَّليْلَةِ

## رۆیشتن لە عەرەفاتەوە، لەپاش تەواوکردنی راوەستانی عەرەفە، بۆ موزدەلیفەو نوێژی شێوانو خەوتنانی ئەو شەوە لە موزدەلیفە، بەجەمع بکرێن، خێری زۆرترە

٨٠٧- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قالَ: (دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى إِذا كَانَ بِالشِّعْبِ نَزَلَ فَبَالَ ثمَّ تَوَضأَ وَلَمْ يُـسْبِغْ الْوُضُـوءَ فَقُلْـتُ الصَّلَاةَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ الصَّلَاةُ أَمَامَكَ فَرَكِبَ فَلَمَّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ نَزَلَ فَتَوَضأَ فَأَسْبَغَ الْوُضوءَ ثمَّ أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ ثمَّ أَنَـاخَ كُـلُّ إِنْـسَانٍ بَعِيرَهُ فِـي مَنْزِلِـهِ ثـمَّ أُقِيمَـتْ الْعِـشَاءُ فَـصَلَّى وَلَـمْ يُـصَلِّ بَيْنَهُمَـا). (الحـديث ١٣٩ ـ أطرافـه في: ١٨١، ١٦٦٧، ١٦٦٩، ١٦٧٢):[٨٠٧]

---

[٨٠٧] تجريد/١، ژمارە: ١١٣ - ١٣٩ مسلم: ١٢٨٠ - ٢٠٨٧.

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی ماڵئاواییدا لەڕۆژی عەرەفەدا لەعەرەفاتەوە گەڕایەوەو کەوتەڕێو ڕۆیشت بۆموزدەلیفە، تاگەیشتە ڕێچکەکانی حاجیان، کەپێیان دەگوترێ: (شیعبی حاجیان) شیعب واتە: ڕێچکەی قەدشاخ، جالەوێ تەشریفی دابەزیو گمێزی کردو دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرت منیش عەرزیم کرد: قوربان! لێرە نوێژ دەکەی؟ فەرمووی: نەخەیر، نوێژ هالەپێشمانەوە لەولاترە، ئینجا سواری وڵاخەکەی بووەوەو ڕۆیشت تاگەیشتە موزدەلیفە، لەوێ دابەزیو دەستنوێژێکی تێروپڕی گرت. ئەوجا قامەتی نوێژ کراو نوێژی شێوانی کرد، ئنجا هەرکەسە لەجێگەی خۆی وشتری خۆی لێ پیخ دا، نەبادا تەشویشو سەرلێشێوان دروست بکەن، لەپاشا قامەتی جەماعەتی نوێژی خەوتنانیش کراو نوێژی خەوتنانیشی بەجەماعەت بۆ کردینو، هیچ نوێژی تری لەنێوانیاندا نەکرد).

٨٠٨- عَنْ عروة قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ، وَأَنَا شَاهِدٌ (أَوْ قَالَ: سَأَلْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ) (رضى الله عنهما) وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَرْدَفَهُ مِنْ عَرَفَاتٍ: كَيْفَ كَانَ يَسِيرُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ. {الحديث: ٣٠٩٤ = ٣٠٨١ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٩١ = ١٦٦٦، ٢٩٩٩، ٤٤١٣. نسائي. حج: ٣٠١٨} : [٨٠٨]

عوروە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆم دانیشتبووم، لە خزمەت ئوسامەی کوڕی زەیدا، (ڕەزای خودایان لێ بێ) کە لێیان پرسی، یا فەرمووی بۆ خۆم لە ئوسامەی کوڕی زەیدم پرسی: لە حەجی ماڵاواییدا، ئەوکاتەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عەرەفاتەوە دەرچوو بۆ موزدەلیفە،

---

[٨٠٨] تجريد/٢، ژمارە: ٧٩١ = ١٦٦٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٣ = ٣٠٩٤ شيحا.

كە بەم كردارە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ (دەفع) یا (إفاضة) لەم کاتەدا، لەرێ چۆن دەرۆیشت؟ فەرمووی: بەرەوت وشترەکەی ژێری لێ دەخورێ، ئەگەر بواریشی دەست بکەوتایە، وشترەکەیی تاودەدا).

فەرمووی: لەم حەجەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عەرەفەوە بەرەو موزدەلیفە کەوتەرێ، ئوسامەی سوار کرد لە پاشکۆی خۆیەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٧٧ + تەجرید/٢، ژمارە: ٧٩٢ + ژمارە: ٧٩٥ + ٧٩٦}.

٨٠٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، بِجَمْعٍ لَيْسَ بَيْنَهُمَا سَجْدَةٌ، وَصَلَّى الْمَغْرِبَ ثَلاَثَ رَكَعَاتٍ، وَصَلَّى الْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ. فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي بِجَمْعٍ كَذَلِكَ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ. {الحديث: ٣٠٩٩ = ٣٠٨٦ فم. نسائي. حج: ٣٠٢٩. تحفة الأشراف: ٧٣٠٩}: [(٨٠٩)]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوی دەفع لە عەرەفاتەوە بۆ مینا، نوێژی شێوانو خەوتنانی کۆکردەوەو بە جەمعە تەئخیر، لە موزدەلیفە، ئەو دوو نوێژەی بە کۆمەڵی بۆمان کرد، نوێژی سوننەتی لە بەینیاندا نەکرد، شێوانی بەسێ رکات کردو کورتی نەکردەوە، بەڵام نوێژی خەوتنانی، بە قەصرو جەمع بە دوو رکات کرد بۆمان. دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، هەتا گەیشتەوە بەدیداری خودای گەورە، لە حەجدا، ئەم دوو نوێژەی لە جەمع (واتە: لە موزدەلیفە) لەسەر ئەم شێوە دەکرد کە باسمان کرد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٨٠ + ١٥٧٩}.

---

(٨٠٩) مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٤ - ٣٠٩٩.

**روونكردنەوە:**

لەبەر يەكێ لەم دوو بۆنەى ناونانە، يا لەبەر هەردوو بۆنەكە بە موزدەليفە دەگوترێ: جەمع، واتە: كۆبوونەوە چونكە ئادەمو حەوواء، كاتێ لە بەهەشت دەركران، لەوێ يەكيان گرتەوە، يا لەبەرئەوەيە: چونكە لەوێ لەكاتى حەجدا نوێژى شێوانو خەوتنان كۆدەكرێنەوە.

٨١٠- حديث ابن عمر قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ: [٨١٠]

ئيبنو عومەر (رەزاى خودا لەخۆىو لەباوكى بێ) فەرمووى: جاران پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ئەگەر پەلەى رۆيشتنى بوايە، نوێژى شێوانو خەوتنانى كۆدەكردەوە.

## (٤٨) باب إستحباب زيادة التغليس بِصَلاَةِ الصُّبْحِ يَوْمَ النَّحْرِ بالْمُزْدَلِفَةِ، وَالْمُبَالغة فِيهِ بَعْدَ تَحَقُّقِ طُلُوعِ الفَجْرِ

## كردنى نوێژى بەيانى رۆژى جەژن لە موزدەليفە، بە تاريكوليلەكە سوننەتە، بە مەرجى دلنيابوون لە شەبەقى بەيان

٨١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رضى الله عنه) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ لِمِيقَاتِهَا إِلاَّ صَلاَتَيْنِ، صَلاَةَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، وَصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا. {الحديث: ٣١٠٤ = ٣٠٩١ فم. بخارى/٢، رقم: ٧٩٥ = ١٦٨٣، ١٦٧٥، ١٦٨٢}: [٨١١]

---

[٨١٠] مسلم: ٣١٠٢ شيحا. أخرجه البخارى فى (١٨) ككتاب تقصير الصلاة (١٣) باب الجمع فى السفر.

[٨١١] بخارى/٢، ژمارە: ٧٩٥ = ١٦٨٣ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٦ = ٣١٠٤ شيحا.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەمدیوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ نوێژێ لەکاتی ئاسایی خۆیدا نەکا، جگە لەم دوو نوێژە:

**یەکەم:** نوێژی شێوان‌و خەوتنانی لە موزدەلیفە بەیەکەوە بە کۆکردنەوەی دواخراو کردو نوێژی شێوانی دواخست تا کاتی نوێژی خەوتنان.

**دووەم:** ئەو ڕۆژە، نوێژی بەیانیشی لەپێش کاتی ئاسایی خۆیدا کردو بە تاریکو لێڵەکە لەگەڵ شەبەقدا کردی تا زوو بڕوا بۆ مەشعەرولحەرام. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٨٠}.

## (٤٩) باب إستحباب تقديم دَفْع الضَّعَفَة مِنَ النساءِ وَغَيْرِهِنَّ مِنْ مُزْدَلِفَةَ إلى مِنىً في أوَاخِرَ اللَّيلِ قَبْلَ زَحمَةِ النَّاس. وَ إستحبابُ المكث لِغَيْرِهِمْ حَتىً يَصلُوا الصُّبْحَ بِمُزْدَلِفَةَ

## ڕۆیشتن لە موزدەلیفەوە بۆ مینا بە شەو، بۆ زەبوونەکان لە ژنان‌و لە کەسانی تریش لە کۆتایی شەودا، بەر لە قەرەباڵغی، بەڵام کەسانی تر دەمێننەوە لە موزدەلیفە تا نوێژی بەیانی لەوێ دەکەن

٨١٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: اسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ تَدْفَعُ قَبْلَهُ، وَقَبْلَ حَطْمَةِ النَّاسِ - وَكَانَتِ امْرَأَةً ثَبِطَةً. (يَقُولُ الْقَاسِمُ: وَالثَّبِطَةُ الثَّقِيلَةُ ). قَالَتْ: فَأَذِنَ لَهَا، فَخَرَجَتْ قَبْلَ دَفْعِهِ، وَحَبَسَنَا حَتَّى أَصْبَحْنَا، فَدَفَعْنَا بِدَفْعِهِ، وَلأَنْ أَكُونَ اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَمَا اسْتَأْذَنَتْهُ سَوْدَةُ فَأَكُونَ أَدْفَعُ بِإِذْنِهِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مَفْرُوحٍ بِهِ. {الحديث: ٣١٠٦ = ٣٠٩٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٩٤ = ١٦٨١. تحفة الأشراف: ١٧٤٧٣} : [٨١٢]

---

[٨١٢] تجريد/٢، ژمارە: ٧٩٤ = ١٦٨١ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٧ = ٣١٠٦ شيحا.

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەودەی دایکی موسوڵمانان، ئافرەتێکی قەبەی گرانەڕۆ بوو، لەبەرئەوە شەوی موزدەلیفە، داوای لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە ڕێگەی پێبدا، کە بەشەو لە موزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا لەگەڵ لازە بوون و بێ هێزەکانا، بەرلەوە کە خەڵکەکە بیکەن بە قەرەباڵغیو جەنجاڵی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی پێدا، جا سەودە لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربچێ، ئەو دەرچوو بۆ مینا، بەڵام ئێمە لە موزدەلیفە گلمان خوارد هەتا ڕۆژمان لێ بۆوە، ئەوجا کە پێغەمبەر بەڕێکەوت، ئێمەیش لەگەڵ ئەودا بەڕێ کەوتین، خۆزگەم منیش کاتی خۆی، وەك سەودە، بۆ ئەمە مۆڵەتم لە پێغەمبەر وەردەگرت و ئێستا لەکاتی حەج کردندا، لە شەوی موزدەلیفەدا ئەوەم جێبەجێ دەکرد، لەسەر ئەو ڕێپێدانەی ئەو، بەڕاستی شت نییە کە وەك ئەو مۆڵەتە پێم خۆش بێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ١٥٨٣، ١٥٨٤} .

قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق، کە برازای حەزرەتی عائیشەیە، فەرمووی: وشەی (ثَبِطَةٌ) کە لەدەقی عەرەبییەکەدا هاتووە، بە واتا (ثَقِیلَةٌ)یە، واتە: قورس و گرانەڕۆ.

٨١٣- عَنِ عَبْدُ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ قَالَ: قَالَتْ لِى أَسْمَاءُ وَهْىَ عِنْدَ دَارِ الْمُزْدَلِفَةِ: هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: لاَ، فَصَلَّتْ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَتْ: يَا بُنَىَّ هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتِ: ارْحَلْ بِى، فَارْتَحَلْنَا حَتَّى رَمَتِ الْجَمْرَةَ، ثُمَّ صَلَّتْ فِى مَنْزِلِهَا، فَقُلْتُ لَهَا: أَىْ هَنْتَاهْ لَقَدْ غَلَّسْنَا، قَالَتْ: كَلاَّ أَىْ بُنَىَّ إِنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) أَذِنَ لِلظُّعُنِ.

{الحـديث: ٣١١٠ = ٣٠٩٧ فـم. تجريـد/٢، رقـم: ٧٩٣ = ١٦٧٩. تحفـة الأشـراف ١٥٧٢٢} : [(٨١٣)]

عەبدوڵڵای مەولای ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق، (ڕەزای خودایان لـێ بێ) فەرمووی: شەوی موزدەلیفە، کە شەوی جەژنی قوربانە، کە پێی دەگوترێ شەوی جەمع، چونکە نوێژی شێوانو خەوتنان لەوێ کۆدەکرێنەوە، لە خزمـەتی ئەسماءدا بووم، خـەریکی ئـەنجام دانـی حـەج بـوو، لـە موزدەلیفـە دابـەزی بـوو هەستا تاوێ دەستی کرد بە نوێژ کردن، پاشان پێی فەرمووم: ڕۆڵەکەم! ئا بزانـە مانگ ئاوا بووە؟ گوتم: نـەء، دیسان تـاوێ تـریش دەسـتی کـردەوە بەشـەو نوێـژ، دیسان فەرموویەوە: ئایا مانگ ئاوا بوو؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: کەواتـە بارکـەن بـابڕۆین بـۆ ڕەجمـی شـەیتانی گـەورە، جـا کەوتینـەوە ڕێگـەو ڕۆیـشتین هـەتا ڕەجمی شـەیتانی کـرد، لـە کۆگا بەردەکـەی عەقەبـە، کـە پێـی دەگـوترێ: (جمـرة العقبـة: الجمـرة الکـبری: کۆگـا بەردەکـەی عەقەبـە) ئینجـا ئـەسماء گەڕایـەوە بـۆ هەوارەکـەی مینـای، وە لـەوێ نوێـژی بـەیانی کـرد، منـیش پـێم گـوت: خـانم! وا دەزانم زوو ڕۆیـشتین لـە موزدەلیفـەوە بـۆ بـەردە بـاران کردنـی شـەیتان، هـەروا زوویش گەڕاینەوە لە ڕەجمی شەیتانەوە بۆ هەواری مینامـان؟ فـەرمووی: کـوڕی شیرینم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی ژنـانی داوە، کـە بەشـەو لە موزدەلیفەوە بکەونەڕێ بـۆ مینـا، وە بـەر لـە جـەنجاڵیو قـەرەباڵغی، ڕەجمـی شەیتان ئەنجام بدەنو نوێژی بەیانی لە مینا بکەن، بۆیەکا منیش وەهام کرد.

٨١٤- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهمـا) قَـالَ: بَعَثَنِـی رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلی الله علیه وسلم) فِی الثَّقَلِ أَوْ قَالَ فِی الضَّعَفَةِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْـلٍ. {الحـديث: ٣١١٣ = ٣١٠١

---

(٨١٣) تجرید/٢، ژمارە: ٧٩٣ = ١٦٧٩ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٨ = ٣١١٠ شیحا.

فم. بخاري. حج: ١٦٧٧ ، ١٦٧٨ ، ١٨٥٦. أبو داود. حج: ١٩٣٩. نسائي. حج: ٣٠٣٢} : (٨١٤)

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ بارگەکەدا، یا فەرمووی: لەگەڵ زەبوونەکاندا، کە شەوی موزدەلیفە لە پێشەوە ناردنی بۆ مینا، منیشی لەگەڵ ئەواندا بەشەو نارد. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ١٥٨٤}.

٨١٥- عَنِ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَانَ يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، فَيَقِفُونَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِاللَّيْلِ، فَيَذْكُرُونَ اللَّهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَدْفَعُونَ قَبْلَ أَنْ يَقِفَ الإِمَامُ، وَقَبْلَ أَنْ يَدْفَعَ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ مِنًى لِصَلاَةِ الْفَجْرِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِذَا قَدِمُوا رَمَوُا الْجَمْرَةَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: أَرْخَصَ فِي أُولَئِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣١١٧ = ٣١٠٥ فم. بخاري: ١٦٧٦} : (٨١٥)

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: دەستووری باوکم وابوو، کە دەچوو بۆ حەج، شەوی جەژن، لازەبوونەکانی کەسوکاری خۆی پێش دەخست، لە موزدەلیفەوە دەچوون بۆ مەشعەرولحەرام، کە کێوێکە وا لە داوێنی موزدەلیفەوە، وە لەوێ وەستانی مەشعەرولحەرامیان دەشەودا ئەنجام دەداو نزاو پاڕانەوەو یادی خودایان دەکرد، ئەوەندەی دەیانویست، ئەوجا بەر لە راوەستانی میر حەج و لەپێش دەرچوونی ئەودا، دەکەوتنە ڕێ بۆ مینا، بۆ بەردە باران کردن (رەجم)ی شەیتان، جا هەیانبوو کە دەگەیشتە مینا، کاتی نوێژی بەیانی بوو، هەیان بوو کە دەگەیشتنە ئەوێ کاتی

---

(٨١٤) بخاري. حج: ١٦٧٧ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧١٩ - ٣١١٣ شيحا.

(٨١٥) بخاري: ١٦٧٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٢٠ = ٣١١٧.

نوێژی بەیانی نەمابوو، کە دەگەیشتنە جێ ڕەجمی شەیتانیان دەکرد، گەڵێ جار لەپێش خۆرکەوتنا ڕەجمی شەیتانیان دەکرد).

ئیبنو عومەر دەیفەرموو: پێغەمبەر خۆی، (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم جۆرە کەسانە مۆڵەتی ئەمەی داوە).

**ڕوونکردنەوە:**

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب، تابیعییە، لە پەیڕەوانە، لەچینی دووەمی موسوڵمانانە، دایکی کچی یەزدەجورد بوو، کە پاشای ئێران بووە، ناسراوە بە (أبو عبدالله المدني الفقيه) گێڕانەوەی زۆری ئەنجام داوە: لە عەبدوڵڵای باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، لە کەسانی ترەوە، قورئان خوێنێکی جوان بوو، ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەسەردەمی سالمدا، مانەندی سالم، لەپیاو چاکیو خواناسیو زوهدو بەرێزیدا کەم بوو). ئیبنو موبارەك دەفەرموێ: سالم یەکێکە لە حەوت شەرعزانەکانی مەدینە. کە پرسیارێکیان بۆ دەهات، هەر حەوتیان لێی دەکۆڵینەوە، قازی مەدینە ئەگەر پرسیارێکی بۆ حەل نەکرایە، دەینارد بۆ ئەوان، هەتا وەڵامەکەی ئەوانی وەرنەگرتایەتەوە بڕیاری نەدەدا. سالم سەوداو مامەڵەی بازاڕی دەکرد، هەتا مرد، ئیمامی ئەحمەدو إسحاقی کوڕی راهویە دەفەرموون: (دروستترین ڕشتە (واتە: أَصَحُّ الأَسَانِيد): زوهری لە سالم، لە باوکیەوە. ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: سالم بیستنی لە عائیشەوە نییە. واباوە کە لەمانگی قوربانی ساڵی سەدو شەشی کۆچیدا مردووە، دایکی سالمو دایکی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو دایکی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی، هەرسێکیان خوشك بوونو کچی یەزدجرد بوون، کە ئاخر پاشای

ئێران بووە، لە (٦٥١)ی زاینیدا، لەکاتی ئازادکردنی خۆراساندا لە لایەنی سوپای ئیسلامەوە کوژراوە.

## (٥٠) باب رَمْي جَمْرَةِ العَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الوَادِي وَتَكُونُ مَكَّةُ عَنْ يَسَارِهِ، وَيُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ

## بەرد فڕەدان بۆ کۆڵگا بەردەکەی عەقەبە لەناو شیوەکەوە، مەککە بخاتە لای چەپی خۆیەوە، لەگەڵ هەڵدانی هەموو بەردێکا ئەڵڵاهوئەکبەر دەکا

٨١٦ـ عَنْ عبدالله بن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أنه رَمى مِنْ بَطْنِ الوادي، فقيل له: إِنَّ نَاساً يَرْمُونَهَا مِنْ فَوْقِهَا؟ فَقَالَ: وَالذي لا إلهَ غَيْرُهُ، هذا مَقَامُ الذي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ البَقَرَةِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ١٧٤٧- اطرافه في: ١٧٤٨، ١٧٤٩، ١٧٥٠)[٨١٦].

جارێ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) لەناو شیوەکەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، بەردی فڕەدا بۆ کۆڵگا بەردەکەی عەقەبە، عەرزیان کرد: هەندێ کەس لەلای سەرووی شیوەکەوە بەردی بۆ فڕە دەدەن؟ فەرمووی: (بە تاقە خواکە، ئائێرەکە مـن ڕەجمی شەیتانم لێیەوە کـرد، جێگەی پێغەمبەر خۆیەتی، کە سوورەتی بەقەرەی بۆ هاتۆتە خوارەوە، کە ئەو سوورەتەیە زۆربەی یاساو دەستوورەکانی حەجو عەمرەی واتیادا، پێغەمبەر خۆشی ئا لەمێدا بەردی فڕەدا بۆ ئەم کۆڵگا بەردە).

ئەمە دەقی تەجریدی بوخاری ژمارە (٨١٢)یە، بۆ بەراوردیش، دەقی ژمارە (٧٢٢)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمیش دەنووسین:

عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ بْنَ يُوسُفَ يَقُولُ وَهُوَ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ: أَلِّفُوا الْقُرْآنَ كَمَا أَلَّفَهُ جِبْرِيلُ، السُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ، وَالسُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ

---

[٨١٦] تجريد/٢، ژمارە: ٨١٢ = ١٧٤٧ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٢٢ = ١٢٩٦ = ٣١١٩ شيحا.

فِيهَا النِّسَاءُ، وَالسُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا آلُ عِمْرَانَ، قَالَ: فَلَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِهِ، فَسَبَّهُ، وَقَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَأَتَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَاسْتَبْطَنَ الْوَادِيَ، فَاسْتَعْرَضَهَا فَرَمَاهَا مِنْ بَطْنِ الْوَادِي بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّ النَّاسَ يَرْمُونَهَا مِنْ فَوْقِهَا، فَقَالَ: هَذَا وَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. {الحديث: ٣١١٩ = ٣١٠٧ فم. تجريد/٢، رقم: ٨١٢ = ١٧٤٧، ١٧٤٨، ١٧٤٩، ١٧٥٠. أبو داود. حج: ١٩٧٤. ترمذي. حج: ٩٠١. نسائي. حج: ٣٠٧٠. ابن ماجة. مناسك: ٣٠٣٠ تحفة الأشراف: ٩٣٨٢}:

ئەعمەش (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ حەجاجی کوڕی یوسفی ئەلثەقەفی، وتاری دەدا، گوێم لێ بوو، لەکاتی وتارەکەدا، لەسەر دوانگە دەیگوت: ئایەتەکانی قورئان لەگەڵ یەکتریدا، لەپاڵ یەکا دابنێن، لەسەر شێوەی ڕیزکردنی حەزرەتی جوبرائیل، وەك پێغەمبەر لە ژیانیدا چەسپاندوویەتی، بەلام مەڵێن: سوورەتی بەقەرە، واتە: سوورەتی چێل، بەڵکوو بڵێن: ئەو سوورەتەی کە باسی مانگای تیاکراوە، هەروا مەڵێن: سوورەتی نیساء، واتە: سوورەتی ژنان، بەڵکوو بڵێن: ئەو سوورەتەی کە باسی ژنانی واتیادا، هەروا سوورەتی ئالی عیمران!

ئەعمەش فەرمووی: جا کاتێ بەخزمەتی ئیبراهیمی نەخەعی گەیشتم، قسەکەی حەجاجم بۆی گێڕایەوە، ئەویش جمێنی بە حەجاج دا، چونکە زۆردارو ستەمکار بوو، ئەوجا فەرمووی: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید، قسەی بۆ کردووم، فەرمووی: لەخزمەت عەبدوڵلای کوڕی مەسعووددا چووم بۆ حەج، کاتێ چووین بۆ ڕەجمی کۆگا بەردەکەی عەقەبە، لەناو شیوەکەوە، لە خوارەوە بۆ سەرەوە، لە تەنیشتی کۆگا بەردەکەوە، بەردی فڕێ دەدا بۆی، حەوت بەردی

بەرودوا تێ گرت، لەگەڵ هەموو بەردێکا ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد،، عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەرزی ئیبنو مەسعوودم کرد: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان! هەندێ کەس لەلای سەرووی شیوەکەوە بەردی بۆ فڕێ دەدەن؟ ئەویش فەرمووی: بەخودای تاک‌و تەنیا، ئائەم جێگەیە، کەمن ڕەجمی شەیتانم لێیەوە کرد، ئەو جێگەیەیە کە پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) ڕەجمی شەیتانی لێیەوە کرد، لەکاتی حەجەکەیدا، کە سوورەتی بەقەرەی بۆ هاتووە، کە ئەو سوورەتەیە زوربەی یاساو دەستوورەکانی حەج‌و عەمرەی واتیادا، کەواتە: دروستە بگوترێ: سوورەتی بەقەرە، یا سوورەتی نیساء.... تاد).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٠٧، ژمارە: ١٥٩١} :

٨١٧– حديث عبدالله بن مسعود عن الأَعْمَشُ قَالَ سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ السُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ ، وَالسُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا آلُ عِمْرَانَ ، وَالسُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا النِّسَاءُ . قَالَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لإِبْرَاهِيمَ ، فَقَالَ حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ أَنَّهُ كَانَ مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) حِينَ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ ، فَاسْتَبْطَنَ الْوَادِيَ ، حَتَّى إِذَا حَاذَى بِالشَّجَرَةِ اعْتَرَضَهَا ، فَرَمَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ ، ثُمَّ قَالَ مِنْ هَا هُنَا وَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ قَامَ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ (صلى الله عليه وسلم): [٨١٧]

لەژمارە (٨١٦)دا بەتەواوی ڕابورد.

[٨١٧] تەخریجەکەی لە ژمارە (٨١٦)دا ڕابورد.

## (٥٥) باب تفصيل الحلقِ علَى التقصير وَجَوَاز التقصير

## له كاتى ئيحرام شكاندنا، سەرتاشين باشترە له كورتكردنەوەى مووى سەر

٨١٨- عن ابْنُ عُمَرَ (رضى الله عنهما) يَقُولُ حَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي حَجَّتِهِ: [٨١٨]

ئيبنو عومەر (رەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) له حەجەكەيدا، كه لەسالَى حەجى مالآواييدا ئەنجامى دا، لەپاش تەواوكردنى كردارەكانى حەج، بۆ ئيحرام شكاندن سەرى خۆى تاشى). {تاج/٢/٢١٦، زنجيره: ١١١ بەتايبەتى فەرموودەى ژماره: ٢ = ژماره: ١٦٠٦ له زنجيره ١١١ له بەرگى دووەم، چاپى چوارەم}.

٨١٩- وَعنه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اللهُمَّ ارْحَمِ المحلِقِينَ). قَالُوا: وَالمقصِّرِينَ يَا رَسُولَ الله، قَالَ: (اللهُمَّ أرْحَمِ المحلِقِينَ) قَالُوا: وَالمقصِّرِينَ يارسولَ اللهِ، قَالَ: (وَالمقصِّرِينَ). (الحديث ١٧٢٧): [٨١٩]

ديسان ئيبنوعومەر -رەزاى خوايان لێ بێ- فەرمووى: حەزرەت -دروودى خواى لەسەر بێ- بۆئەوەى مسولْمانان حالَى بكا، كه لەپاش حەج و عەمرە، سەرتاشين باشترە له سەر كورتكردنەوە، فەرمووى: (ڕەحمەتى خودا لەو كەسانەبێ كه لەپاش تەواوكردنى حەج و عەمرە، قژەسەرى خۆيان دەتاشن). يارانيش عەرزيان كرد: قوربان ئەى پێغەمبەرى خوداڕەحمەت بكه لەو كەسانەش كه مووى سەريان كورت دەكەنەوە ؟ بەلآم پێغەمبەر -دروودى خواى لەسەر بێ- ديسان فەرموويەوە: (سۆزو ڕەحمەتى خودا لەو كەسانه بێ، كه

---

[٨١٨] تجريد/٢، ژماره: ٨٠٧ = ١٧٢٦. مسلم. حج: ١٣٠٤ محمد فؤاد عبدالباقى = ٣١٣١ شيحا.

[٨١٩] تجريد/٢، ژماره: ٨٠٨ = ١٧٢٧ مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٧٢٩ = ١٣٠٢ محمد فؤاد - ٣١٣٥.

سەری خۆیان دەتاشن). دیسانەوە یارانی پێغەمبەر عەرزیان کردەوە: ئەی پێغەمبەری خوداڕەحمەت بکە لەوکەسانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە ؟ ئەوجا خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (سۆزو ڕەحمەتی خودا لەوکەسانەش بێ کەمووی سەریان کورتدەکەنەوە). (تاج /٢/ ٢١٧ ف-١ = زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠، ج/٤ - ش/د).

٨٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ، قَالَ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ، قَالَ « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ. قَالَ: « وَلِلْمُقَصِّرِينَ ». {الحديث: ٣١٣٥ = ٣١٢٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٩ = ١٧٢٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٩٠٤}: [٨٢٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆئەوەی موسوڵمانان حاڵی بکا، کە لەپاش حەج و عەمرە، سەرتاشین خێرترە لەسەر کورتکردنەوە، فەرمووی: (خودایە! لەو کەسانە خۆشبە، کە لەپاش تەواوکردنی حەج و عەمرە سەری خۆیان دەتاشن). یارانیش فەرموویان: قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەش کە لەپاش حەج و عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان فەرموویەوە: (خودایە! لەو کەسانە خۆش بە، کە لەپاش حەج و عەمرە سەری خۆیان دەتاشن). دیسانەوە یارانی پێغەمبەر عەرزیان کردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەج و عەمرە، مووی سەریان کورت

---

[٨٢٠] تجرید/٢، ژمارە: ٨٠٩ = ١٧٢٨ مسلم: ١٣٠٢ = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٢٩ = ٣١٣٥ شیحا.

دەکەنەوە؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ بارە فەرموویەوە: (خودایە! لەوکەسانە خۆشبە، کە لەپاش حەج و عەمرە سەری خۆیان دەتاشن).

هەمدیسانەوە عەرزی پێغەمبەریان کردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەج و عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەوانیش کردو فەرمووی: (خودایە! لەو کەسانەیش خۆشبە کە لەپاش حەج و عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٥}.

## (٥٦) باب بيان أنَّ السنة يَوْمَ النحر أنْ يَرْمِيَ ثم ينحر ثم يَحْلِقَ
## سوننەتە لە ڕۆژی جەژنا، لە پێشا ڕەجمی شەیتان، ئەوجا ئاژەڵ سەربڕین، ئەنجا سەرتاشین

٨٢١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا حَلَقَ رَأْسَهُ كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَوَّلَ مَنْ أَخَذ مِنْ شَعَرِهِ). (الحديث ١٧١- طرفه في: ١٧٠)؛ [٨٢١]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی ماڵئاوایی دا سەری خۆی تاشی، یەکەم کەس لەو قژە پیرۆزەی بەرکەوت ئەبو طەلحە بوو). (تاج/٢/ ٢١٦ زنجیرە/ ١١١ز- ١٠٨ ژ-١٥٩٦).

---

[٨٢١] تجرید/١، ژمارە: ١٣١ - ١٧١ مختاصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٣٠ - ١٣٠٥ - ٣١٣٩، ٣١٤١، ١٥٩٦.

**راڤەو ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە دەبێ بەبەڵگە لەسەر چەند بڕیار (حوکم)ێ، وەك پاکیی موو، پاکیی ئەو ئاوەی مووی پێ دەشۆرێ، سەرتاشین سوننەتی پێغەمبەرە، خۆ موفەڕك کردن بە مووی پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوننەتە لەحودەیبییە خێراشی کوڕی ئومەییە سەری پێغەمبەری تاشی لەحەجی ماڵئاوایی دا.

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لە مختصری صەحیحی موسلیمدا، ژمارە (٧٣٠) بەرگی دووەم، چاپی یەکەم:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنـه): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صلى الله عليـه وسلم) رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْبُدْنِ فَنَحَرَهَا، وَالْحَجَّامُ جَالِسٌ، وَقَالَ بِيَدِهِ عَنْ رَأْسِهِ فَحَلَقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَقَسَمَهُ فِيمَنْ يَلِيهِ ثُمَّ قَالَ: « احْلِقِ الشِّقَّ الآخَرَ »، فَقَالَ: « أَيْنَ أَبُو طَلْحَةَ »؟ فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ. {الحديث: ٣١٤١ = ٣١٢٩ فم. تجريد/١، رقم: ١٣١ = ١٧١، ١٧٠. أبو داود. حج: ١٩٨١. ترمذي. حج: ٩١٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجەکەیدا، ڕۆژی یەکەمی جەژن، ڕۆیشت بۆ میناو چوو بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبەو حەوت بەردی بۆ فڕێ داو، ئەوجا هاتەوە بۆ بارەگاکەی خۆی لە میناو، لەوێ وشترە دیارییەکانی خانەی خودای سەربڕی، سەرتاشەکە دانیشتبوو، وە بەدەستی ئاماژەی بۆ سەرتاشەکە کرد، کە لای ڕاستی سەری بتاشێ، ئەویش لای ڕاستی سەری تاشی، فەرمانی فەرموو دابەشیان کرد بەسەر عەشاماتەکەی دەوریدا، ئەوجا پێی فەرموو: (لای چەپی سەریشم بتاشە) ئەویش تاشی، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ)

فەرمووی: (ئەبو طەلحە کوانێ؟) جا قژە سەرە تاشراوەکەی داپێی). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٦ + زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ١٥٩٦}.

لە فەتحولمولهیمدا دەفەرموێ: (ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەلای سەرتاشێ سەرمم تاشی، سەرتاشەکە ئەم سێ هەڵەیەی لێم گرت، کاتێ دانیشتم بەرەو رووگە نەبووم، گوتی: رووەو قیبلە دانیشە، لای چەپم تێ کرد کە بیتاشێ، گوتی: بەلای راست دەست پێ بکە، کاتێ سەری تاشیم ویستم بڕۆم، گوتی: قژە سەرەکەت بنێژەو لە شوێنێکی گونجاودا بیشارەوە، منیش گەڕامەوەو ناشتمو هەرسێ شتەکەم بەگوێ کرد!!).

## (٥٧) باب من حلق قبل النحر أو نحر قبل الرمي
## کەسێ لە پێش سەربڕینی ئاژەڵ سەری بتاشێ، یا لە پێش ڕەجمی شەیتانا ئاژەڵ سەربڕێ

٨٢٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَفَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ فَقَالَ اذْبَحْ وَلَا حَرَجَ فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ قَالَ ارْمِ وَلَا حَرَجَ فَمَا سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلَا أُخِّرَ إِلَّا قَالَ افْعَلْ وَلَا حَرَجَ). (الحديث ٨٣ ـ أطرافه في: ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥): [٨٢٢]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجیماڵئاوایی دا، لەمینا، راوەستا هەتا موسوڵمانان پرسیاری لێ بکەن. پیاوێ هات گوتی: قوربان!

---

[٨٢٢] تجرید/١، ژمارە: ٧٣ - ٨٣ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٣١ = ١٣٠٦ = ٣١٤٤ شیحا.

نەمزانی لەپێش قوربانی کردندا سەرم تاشی؟ فەرمووی: قوربانیەکەت سەر ببڕە قەیناکە. پیاوێکی تر هات گوتی: نەمزانی لەپێش رەجم کردنی شەیتاندا قوربانیم سەربڕیوە؟ فەرمووی: رەجمی شەیتان بکە قەیناکا، ئیتر ئەو رۆژە هەرچی یان لێ ی دەپرسی لەبارەی هەر شتێکەوە بوایە، کەپێش خرابوو بێ، یادوا خرابووبێ، هەر دەیفەرموو: بیکە قەیناکە : (ت-٢ ل-٢١٨ ف-٤ ز-١١١ ژ-١٦٠٦).

ئەمەیش دەقی دوو گێڕانەوەی تری ئەم فەرموودەیە لە مختصر صحیح موسلیمدا، بەرگی دووەم، ژمارە: (٧٣١) وە ژمارە: (٧٣٢):

عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم) عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَطَفِقَ نَاسٌ يَسْأَلُونَهُ: فَيَقُولُ الْقَائِلُ مِنْهُمْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى لَمْ أَكُنْ أَشْعُرُ أَنَّ الرَّمْىَ قَبْلَ النَّحْرِ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ الرَّمْىِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَارْمِ وَلاَ حَرَجَ ». قَالَ وَطَفِقَ آخَرُ يَقُولُ: إِنِّى لَمْ أَشْعُرْ أَنَّ النَّحْرَ قَبْلَ الْحَلْقِ، فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ، فَيَقُولُ: « انْحَرْ وَلاَ حَرَجَ ». قَالَ: فَمَا سَمِعْتُهُ يَسْأَلُ يَوْمَئِذٍ عَنْ أَمْرٍ مِمَّا يَنْسَى الْمَرْءُ وَيَجْهَلُ مِنْ تَقْدِيمِ بَعْضِ الأُمُورِ قَبْلَ بَعْضٍ وَأَشْبَاهِهَا إِلاَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « افْعَلُوا ذَلِكَ وَلاَ حَرَجَ ».

{الحديث: ٣١٤٤ = ٣١٣٢ فـم. تجريد/١، رقم: ٧٣ = ٨٣، ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥. أبو داود. حج: ٢٠١٤. ترمذى. حج: ٩١٦. تحفة الأشراف: ٨٩٠٦} :

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودا لەخۆی‌و باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، لەمینا، بەسواری وشترەکەی ژێری راوەستا، هەتا موسوڵمانان پرسیاری لێ بکەن، لەبارەی رێ‌و رەسمی حەجەوە، پرسیار کەرێ گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من نەمزانی کە رەجمی شەیتان لەپێش ئاژەڵ سەربڕینایە، لەبەرئەوە

ئاژەڵەکەم سەربڕی لەپێش ڕەجمی شەیتانا؟ فەرمووی: (بڕۆ ڕەجمی شەیتان بکە، قەیناکا).

فەرمووی: یەکێ تر گوتی: من نەمزانی کەسەر بڕینی ئاژەڵی دیاری والەپێش سەرتاشینەوە، لەبەرئەوە سەرمم تاشی لەپێش سەربڕینی ئاژەڵەکەدا؟ فەرمووی: (ئاژەڵەکەت سەرببڕە قەیناکا).

عەبدوڵڵا فەرمووی: ئیتر ئەو ڕۆژزە، هەرچییان لێی دەپرسی، سەبارەت بەو شتانە کە مرۆڤ لەبیری چوو بوو، یا نەیزانیبوو، ئایا پێش و پاشی خستبوو، یا شتێ وا، دەمبیست لێی لە وەڵامیانا دەیفەرموو: (بیکەن قەیناکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٦ م}.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَتَاهُ رَجُلٌ يَوْمَ النَّحْرِ وَهُوَ وَاقِفٌ عِنْدَ الْجَمْرَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ فَقَالَ: « ارْمِ وَلاَ حَرَجَ ». وَأَتَاهُ آخَرُ، فَقَالَ: إِنِّي ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، قَالَ: « ارْمِ وَلاَ حَرَجَ »، وَأَتَاهُ آخَرُ فَقَالَ: إِنِّي أَفَضْتُ إِلَى الْبَيْتِ، قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، قَالَ: « ارْمِ وَلاَ حَرَجَ »، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُهُ سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ قَالَ: « افْعَلُوا وَلاَ حَرَجَ». {الحديث: ٣١٥٠ = ٣١٣٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژی جەژن، لەلای جەمرەتول عەقەبە وەستابوو، بۆ وەڵامی پرسیاری حاجیان، گوێم لێ بوو پیاوێ هاتە خزمەتی لێی پرسی، گوتی: قوربان! من لەپێش ئەوەدا ڕەجمی شەیتان بکەم، سەرم تاشی؟ فەرمووی: (قەیناکە بڕۆ ڕەجمی شەیتان بکە) حاجییەکی تر هات بۆ خزمەتی، عەرزی کرد: قوربان! من بەرلەوە بەرد فڕێ بدەم بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە، ئاژەڵەکەم سەربڕی؟ فەرمووی: (قەیناکە بڕۆ بەردی بۆ فڕێ بدە). حاجییەکی

تر هاته خزمەتی، گوتی: قوربان! من بەرلە رەجمی شەیتان رۆیشتم تەوافول ئیفاضەم ئەنجامدا؟ فەرمووی: (قەیناکە برۆ بۆ بەردە باران (رەجمی شەیتان). فەرمووی: ئەوەی کەمن ئەو رۆژە لە پێغەمبەرم بینی ئەمەبوو: پرسیاری هەرچی لێ دەکرا، لەم جۆرە پرسیارانە، هەر دەیفەرموو: (بیکەن قەیناکا).

٨٢٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قِيلَ لَهُ فِي الذَّبْحِ وَالْحَلْقِ وَالرَّمْيِ وَالتَّقْدِيمِ وَالتَّأْخِيرِ فَقَالَ « لاَ حَرَجَ »: [٨٢٣]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی پێش و پاش خستنی ئەم شتانەوە لە یەکتری پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر ئاژەڵ سەربڕین و سەرتاشین و رەجمی شەیتان، لەناو خۆیانا پێش و پاش بخرێن، قەیدی هەیە؟ فەرمووی: (قەیدی نییە، نە گوناهی هەیە و نە فیدیەی هەیە).

## (٥٨) باب إستحباب طواف الإفاضة يوم النحر
## تەوافی ئیفاضە لە رۆژی یەکەمی جەژنا سوننەتە

٨٢٤- عَنْ عَبْدِ العَزيز بن رُفَيْع (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ): سَأَلْتُ أَنَسَ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ: أَخْبِرني بِشَيءٍ عَقَلْتَهُ عَنِ النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيْنَ صَلي الظُّهْرَ وَالعَصْرِ يَومَ التَّروِيَّة؟ قَالَ: بِمِني، قلتُ: فَأَيْنَ صَلَّى العَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بالابْطَحِ، ثُمَّ قَالَ: افْعَلْ كَمَا يَفْعَلُ أُمَرَاؤُكَ). (الحديث ١٦٥٣- طرفاه في: ١٦٥٤، ١٧٦٣): [٨٢٤]

---

[٨٢٣] بخاری. حج: ١٧٣٤ مسلم: ٣١٥١ شيحا.

[٨٢٤] تجريد/٢، ژمارە: ٧٨٧ = ١٦٥٣ مسلم: ١٣٠٩ = ٣١٥٣ شيحا.

عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیع فەرمووی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، گوتم: شتێکم پێ بفەرموو: کە خۆت لەبیرت مابێ‌و لە پێغەمبەرەوە وەرتگرتبێ لەم بارەیەوە: ڕۆژی تەرویە، کە ڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربانە، پێغەمبەرو مسوڵمانانی حەجکار لەکوێ نوێژی نیوەڕۆو عەصریان کرد؟؟ فەرمووی: لەمینا گوتم: ئەی ئەو ڕۆژەی کە ناودارە بەڕۆژی نەفر، کە ڕۆژی سیازدەی مانگی قوربانە، کە حاجیان لە میناوە دەگەڕێنەوە بۆ مەککە، پێغەمبەرو هاوڕێیانی نوێژی عەصریان لەکوێ کرد؟ ئەنەس فەرمووی: لە ئەبطەح (بڕ: ژمارە: ٧٤٨/لە تەجرید، کە یەکسانە بە ژمارە: (١٥٥٩)ی بوخاری) ئەوجا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (گرنگ ئەوەیە لەکاتی ئەنجامدانی حەج‌و عەمرەدا پەیڕەویی فەرمانڕەواکانت بکەی‌و ئەوان چی دەکەن تۆیش وا بکەو بەمەهانەی هەندێ وردەکاری جیاوازی و دووبەرەکی لەناو ڕیزی کۆمەڵەی حاجییاندا بەرپامەکە). (تاج/٢/٢٢٥ز/١١٥ -ش).

## (٥٩) باب إستحباب النزول بالمحصَّب يَوْمَ النفر والصَّلاة بِهِ
## وچانگرتن لە موحەصصەب لە ڕۆژی نەفراو نوێژکردن لەوێ

٨٢٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: نُزُولُ الأَبْطَحِ لَيْسَ بِسُنَّةٍ، إِنَّمَا نَزَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَنَّهُ كَانَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ إِذَا خَرَجَ. {الحديث: ٣١٥٦ = ٣١٤٤ فم}: [٨٢٥]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دابەزین لە ڕۆژی نەفردا، لە ئەبطەح سوننەت نییە، ڕاستە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە

---

[٨٢٥] مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٤٨ - ٣١٥٦ شیحا. بخاری: ١٧٦٥ - (٣٥) حج (١٤٧) باب المحصب.

رۆژی نەفردا لەوێ دابەزی، بەڵام ئەوە لەبەرئەوە نەبوو کە خودی دابەزین لەوێ سوننەتبێ، بەڵکوو ئەوە لەبەرئەوە بوو، کە کۆڵی خۆیان سووك بکەنو بنەو بارگەو شمەکە قورسەکانیان لەوێ دابنێنو لەپاش نوێژی خەوتنان، سەرخەوێ لەوێ بشکێننو ئەوجا بڕۆن بۆ تەوافی بەیتو تەوافی ماڵاوایی بکەنو بگەڕێنەوە بۆلای بنەو بارگەکەیانو باقی شەو لەوێ بمێننەوەو دەمەو بەیان لە ئەبطەحەوە، بە کۆمەڵی پێکەوە بە ئاسانی دەرچن بۆ مەدینەو بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان).

ئەمە پوختەی قسەی شەرحەکانە، بۆ واتای ئەم فەرموودەیە.

٨٢٦- عن ابن عباس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما قَالَ: لَيْسَ التَّحْصِيبُ بِشَيْءٍ إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث: ١٧٦٦)؛ [٨٣٦]

ئیبنو عەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) بۆ مەسەلەی دابەزین لە موحەصصەب، کاتێ حاجی لە مینا ڕەو دەکا بەرەو مەککە، بۆ تەوافی ماڵاوایی فەرمووی ئەو وچان گرتنو سەرخەوشکاندنە لە موحەصصەب، لە یاساو ڕێساکانی حەج نییە، بەڵکوو ئەوە کاتی خۆی هەوارێ بوو، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لەوێ دابەزی و، وچانێکی گرتو سەرخەوێکی شکاند، چونکە ئەوەبوو بەهۆی ئەوە کە دەرچونیان بۆ مەدینە ئاسانتر بکات).

٨٢٧- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قالَ: قَالَ رسُولُ الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أَرادَ قُدُومَ مَكَّةَ: (مَنْزِلُنَا غَداً إنْ شَاءَ اللهُ بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَه، حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الكُفْرِ) يَعْنِي ذَلِكَ المحَصّبَ، وَذلِكَ أَنَّ قَرَيْشاً وَكِنِانَةَ تَحالَفَتْ عَلى بَني هَاشِمٍ وَبَني عَبْدِ المطِّلِبِ، أَوْ بَنى المطَّلِبِ: أَنْ لايُنَاكِحُوهُمْ، وَلا يُبايِعُوهُم، حَتَّى يُسْلِمُواَ إِلَيْهِمَ النَبِيّ صَلَّى

---

[٨٣٦] تجريد/٢، ژمارە: ٨١٧ - ١٧٦٦ مسلم: ١٣١٢ = ٣١٥٩ شيحا.

اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ). (الحـديث ١٥٩٠) أطرافـه فـي: ١٥٨٩،٣٨٨٢،٤٢٨٤، ٤٢٨٥،٧٤٧٩):[٨٣٧]

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: هیٚشتا لە مینا بووین کە حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بیٚ- فەرمووی پیٚمان کاتیٚ ویستی بگەڕیٚتەوە بۆ مەککە: (خوا حەزکا سبەینیٚ لە خەیف، لە قوقزایییەکەی بەنی کینانە قۆناخ دەگرین — واتە: لە موحەصەب — واتە: لەو شویٚنەدا کەکاتی خۆی دوشمنەکانی ئیسلام پەیمانیان بەست لەسەر کوفر).

ئەم ڕووداوەیش ئاوا بووە: کاتی خۆی کافرەکانی قوڕەیش‌و بەنی کینانە، لەو جیٚگایەدا لەدژی بەنی هاشم‌و بەنی موطەلیب -کە پاریٚزگاری پیٚغەمبەریان دەکرد- بووبوون بەیەك‌و سویٚندیان بۆ یەکتری خواردبوو لەسەر ئەمە: (هەتا بەنی هاشم‌و بەنی موطەلیب، پیٚغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیٚ- نەدەن بەدەستیانەوە، بۆ ئەوەی بیکوژن، نە ژن‌و ژنخوازییان لەگەڵ بکەن‌و نە سەوداو مامەڵە !). (تاج/٢/٢٣٧ز — ١١٥ = ژمارە: ١٦٢٣، چ/٤ - ش).

[٨٣٧] تجرید/٢، ژمارە: ٧٦٢ - ١٥٩٠ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٤٩ - ١٣١٤ = ٣٢٦٢ شیحا.

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

لە ژیاننامەی پێغەمبەردا هاتووە: (کاتێ قورەیش‌و بێ باوەڕانی مەککە بیستیانەوە کە پادشای حەبەشە نەجاشی، ڕێزێکی زۆری جەعفەرو هاوڕێکانی پێغەمبەری گرتووە، ئەومیان زۆر پێ ناخۆش بوو، ئاگریان تێبەربوو، لەدڵی خۆیانا گوتیان: وابڕوا کاری موحەممەد سەردەگرێ، ئێمەی تیادەچین، ئیتر بە کۆی ڕا بڕیاریاندا کە پێغەمبەر بکوژن، پەیماننامەیەکیان لەناو خۆیانا نووسی، هەموو کۆمەکی‌و سەوداو مامەڵەیێ لەگەڵ خزمان‌و کەسوکاری پێغەمبەردا ڕابرگن، هەتا ناچاریان بکەن کە پێغەمبەریان تەسلیم بکەن، ئەو تۆمارنامەیان بۆ گرنگی پێدان لەناو ماڵی کابەدا هەڵواسی، وە بۆماوەی سێ ساڵ ئابلۆقەیەکی ئابووری سەختیان سەپان بەسەر بەنی هاشم‌و بەنی عەبدول موطەلیبدا، لەگەڵ گەمارۆیەکی کۆمەڵایەتی، وە لە (شعبی ئەبوطالب)دا عەزڵیان کردن‌و هەموو پەیوەندییەکیان لەگەڵدا بڕین، گەلێ گەلێ لەم ئابلۆقە ئابوورییە سەختتر، کە ئێستا ئەمەریکا خستوویەتیە سەر عێراق! یا عێراق دایناوە لەسەر کوردستان ! خوا تۆڵەی سەخت لە هەموو ناهەقیکارێ بسەنێ بە تایبەتی ئەمریکا. خودا تۆڵەی لە عێراق بەزیادەوە سەندووە، چاوەڕوانین کەخودا تۆڵەی سەختتر لە ئەمریکا بستێنێ ٩/١٢/٢٠١٤.

پاشان پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- بەفەرمانی خودا، هەواڵی پێیاندا، کە بە فەرمانی خودا مۆریانە ئەو شوێنانەی لە تۆمارنامەکە خواردووە، کە زۆرو ناحەقی‌و ستەمی تیادا نووسراوە، بەڵام ئەو شوێنانەی هێشتۆتەوە کە ناوی خوای واتیادا. هەتا لەپاش گوفتوگۆیەکی دوورودرێژ لەساڵی دەی پێغەمبەرایەتیدا ئابلۆقەکە هەڵگیرا. دەڵێن: ئەو کابرایەی کە پەیماننامەکەی نووسی، دەستی تووشی گۆدی بوو، خودا پێی نواند.

## (٦٠) باب وجوب المبيت بمِنىَ لَيَالي أيَّامِ التَشْرِيفِ، والترخيص في تَرْكِهِ لأهْلِ السِقَايَةِ

## شەوەکانی نەییامو تەشریف، بۆ حاجی پێویستە لە مینا بمێنێتەوە، بەڵام لەم شەوانەدا دروستە ئاوگێڕوشوانو نەمانە لە مەککە بمێننەوە

٨٢٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ الْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (رضى الله عنه) اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ فَأَذِنَ لَهُ. {الحديث: ٣١٦٤ = ٣١٥٢ فـم. بخاري. حج: ١٧٤٥. أبو داود. مناسك: ١٩٥٩}: [٨٢٨]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە ڕێگەی بدا شەوەکانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە، لەبەر ئاودان بە حاجیان، ئەویش ڕێگەی مانەوەی دا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ١٥٩٠}.

## (٦١) بابُ في الصَّدَقَةِ بِلُحُومِ الهَدْيِ وَ جُلُودِهَا وجِلاَلِها

## گۆشتو کۆپانو پێستی ئاژەڵی دیاری دەکرێن بە خێر

٨٢٩- عَنْ عَلِيٍّ (رضى الله عنه) قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلَحْمِهَا وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا، وَأَنْ لاَ أُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْهَا، وَقَالَ: « نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا ». {الحديث: ٣١٦٧ = تجريد/٢، رقم: ٨٠١ = ١٧٠٧، ١٧١٦، ١٧١٦م، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩. أبو داود. حج: ١٧٦٩. ابن ماجه. أضاحي: ٣١٥٧. تحفة الأشراف: ١٠٢١٩}: [٨٢٩]

---

[٨٢٨] بخاری. حج: ١٧٤٥ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٠ - ٣١٦٤ شیحا.

[٨٢٩] تجريد/٢، ژمارە: ٨٠١ = ١٧٠٧ مختصر صحيح ممسلم/٢، ژمارە: ٧٤٢ - ٣١٦٧ شیحا.

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم، کە ڕابوەستم بەسەر وشترە دیارییەکانی بەیتیەوە، کە سەد وشتر بوون، سەرپەرشتیان بکەم، وە گۆشتو پێستەو جلو کۆپانەکانیان گشتی ببەخشمەوە، وە هیچیان لێ نەدەم بە قەسابەکە لەباتی قەسابییەکەی، بەڵام لەجیاتی پشکی ئاسایی قەیناکا کە بەشی بدەم، فەرمووی: (خۆمان شتێکی تری دەدەمینێ لەباتی قەسابییەکەی!!). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ١٦٠٢ + زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٥} .

## (٦٣) باب نَحْرِ البُدنِ قِيَاماً مُقَيَدَةً

## وا سوننەتە وشتر بە پێوە سەربڕێو دەستی چەپی بە چەماوەیی ببەسترێ

٨٣٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أنه أَتَى عَلى رَجُلٍ قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ، يَنْحَرُهَا، قَالَ: أبْعَثْها قِيَاماً مُقَيَّدَةً، سُنَّةَ محمدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ١٧١٣): (٨٣٠)

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- پیاوێکی دی، وشترێکی قوربانی پیخ دا بو، خەریکبو سەری دەبڕی دەیکرد بەقوربانی بۆخۆی، ئیبنوعومەر پێی فەرموو: هەڵیسێنە سەر پێو، دەستی چەپی لە ئەژنۆیا بچەمێنەوەو بەپەتێ بیبەستە بە قۆڵیەوە، چونکە یاساو دەستووری پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وابوو، لەسەر ئەو شێوەیە وشتری قوربانی و دیاری بەیتو وشتری تری سەردەبڕی (تاج/٢/٢١٥ = زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ١٦٠٠، چ/٤ - ش/د/ن).

---

(٨٣٠) تجريد/٢، ژمارە: ٨٠٤ = ١٧١٣ مسلم: ١٣٢٠ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٤١ = ٣١٨٠.

**ڕوونکردنەوە:**

لــە عەرەبیــدا (نــەحر) و (زەبــح - زبــح) جیــاوازییــان هەیــە، بــۆ ڕوونکردنــەوەو تێگەیــشتنی تــەواو لــەم بابەتــە، ئــەم دەقــە لــە پــەڕاوی (٣- بڕیارەکـانی سـەربڕینو سـەربڕاوەکان) ڕاگـوێز دەکـەم، لـەزنجیرەی ڕۆشـنبیری تەندروستی، لـە ڕوانگـەی دەسـتوورەکانی ئایینـەوە، کـە ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانی دەری کـردوون بـە عـەرەبی، وەبەنـدە حـەوت ژمارەیـانم وەرگێڕاوەتـە سـەرزمانی شـیرینی کـوردی، وە لەسـاڵی (١٩٩٩) چـاپکراون، لەلایـەن ڕێکخـراوی ناوبراوەوە:

## چەند بنەمایەکی گشتی:

١- حەڵاڵ کردنی ئەو گیانلەبەرانەی کەگۆشتیان دەخورێ، لەسەر شێوەی شـەرعی، جـۆرە خواپەرسـتیـیەکە، بـەلای مـسوڵمانانەوە، وەبەیـەکێ لـەم شـێوە شەرعییانەی دواوە تەواو دەبێ:

أ- سـەربڕین، لـە شـەرعا بڕێتییـە لـەوە کـە قوڕقوڕاچـکەو سووڕێنـچکەو دووشا دەمارەکانی ئەم دیوو ئەو دیوی قوڕقوڕاچکە بەتەواوی ببڕێن، ئەم جۆرە بـەزۆری بـۆ بـزنو مـەڕو ڕەشـەوڵاخو باڵنـدە دەبـێ، بـۆ شـتی تـریش دروسـتە بەکاربهێنرێ.

ب- سـەربڕین لـە بۆتەقـەی مـل دا، لـە دەم سـەرووی سـینگەوە، کـە (ئـەم جۆرەیـان) بەعـەرەبی پێـی دەگـوترێ: (النحـر). شـێوەی (أ) بەعـەرەبی پێـی دەگوترێ: (الذبح). جیاوازی ئەم دوو شێوازە ئەوەیە:

یەکەمیان لەلای سەروی ملەوە ئەنجام دەدرێ (جێگەی سەربڕینەکە لەلای سـەرەوە نزیکـە) دووەمیـان لـەلای خـوارووی ملـەوە ئـەنجام دەدرێ، (واتـە: لەچـەڵەمەی سـینگەوە نزیکـە). ئـەم شـێوەی (ب)یـە، بـەزۆری بـۆ وشـترو شـتی

ملدرێژی وەکوو وشتر بەکاردەهێنرێ، دروستە بۆ ڕەشە وڵاخیش بەکار بهێنرێ..
(بڕوانە: پەڕاوی ناوبراو، لاپەڕە/٦) وەکی تر گوتەی هاوڕێی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کە بفەرموێ: (سوننەتی پێغەمبەر لەم بارەیەوە وا وایە، یا یاساو دەستووری پێغەمبەر، سەبارەت بەم کارە وایە) یان بفەرموێ: (ئەم شتە لە سوننەتدا وایە) ئەم گوتەیە دادەنرێ بە فەرموودەی بەرزەوە بوو، واتە: بە حەدیسی مەرفووع، لەلای هەردوو پیر، کە شێخی بوخاری و شێخی موسیلمن، ڕەحمەتی خودایان لێبێ، چونکە ئەوەتا ئەم دوو زاتە، ئەم فەرموودەیەیان کردووە بەبەڵگە لەسەریەکێ لە سەرباسەکانی صەحیحەینەکەیان.

## (٦٤) باب إستحباب بعث الهدى إلى الحرم لِمَنْ لاَ يُرِيدُ الذهاب بِنَفْسِهِ وَإستحبابُ تَقْليده، وَفَتْلُ القَلائِدِ وَأَنَّ باعِثَهُ لا يَصِيرُ مُحْرِماً وَلا يَحْرُمُ عليه شَئٌ بذالِكَ

## کەسێ بێ ئیحرام بێو نەیش ڕوات بۆ حەج، یا عەمرە، دیاریی دەنێرێ بۆ بەیتو نیشانەی دەکاو پەتی ملیوانەکەی نیشانەکردنەکە بادەدا، ئەو کەسەی کە شتی وا دەکا بەوە نابێ بە ئیحرامدارو بەوەیش هیچی لێ قەدەغە نابێ

٨٣١- عَنْ عاِشَةَ رَضِي اللّهُ عَنْها: أنه بَلَغَهَا: أنَّ عبدالله بنَ عباس رَضِي اللّهُ عَنْهُ قال: مَنْ أَهْلَ هَدْياً، حَرُمَ عَلَيْهِ مَايَحْرُمُ عَلَى الحَاجِ، حَتيَّ يُنْحَرَ هَدْيُهُ، فَقَالَتْ عائِشَةُ رَضِي اللّهُ عَنْها لَيْسَ كَمَا قَالَ ابنُ عباسٍ، أَنَا قَلاَئِلَ هَدْيَ رَسولِ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيدى، ثمَّ قَلَّدَهَا رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيَديه، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أبيض، فلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رِسوُلِ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيئٌ أحَلَّهُ اللهُ حَتيَّ نُحرَ الهَدْى).

(الحــديث ١٧٠٠- اطرافــه فــي: ١٦٩٦، ١٦٩٨، ١٦٩٩، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٣، ١٧٠٤، ١٧٠٥، ٢٣١٧، ٥٥٦٦): [٨٣١]

بۆ روونكردنەوەی ئەو فەرموودەیە، ئەم چەند گێڕانەوەیە دەنووسین:

گەیشتەوە بەعائیشە (رەزای خوای لیّ بیّ) کە عەبدوڵلای کوڕی عەباس (رەزای خوای لیّ بیّ) دەفەرموێ: گوایە هەرکەسیّ ئاژەڵی دیاری بنێریّ بۆ مەککە، ئەوەی لە حاجی لەکاتی حەج کردندا، حەرام دەبیّ لەویش حەرام دەبیّ، هەتا ئاژەڵە دیارییەکەی لە کاتو جێگەی خۆیدا سەردەبڕیّ، ئەوسا چی لیّ قەغەدە بووە، بۆی ڕەوادەبێتەوە. عائیشە (رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: ئەمە وا نییە وەك ئیبنوعەباس دەڵێ، چونکی من بەدەستی خۆم ملوانکەکانی ئاژەڵە دیارییەکانی پێغەمبەرم هۆنیوەتەوە، پێغەمبەریش بەدەستی خۆی ئەو ملوانکانەی کردە مل وشترە دیارییەکانیو، ئەوجا لەو ساڵەدا کەئەبوبەکری باوکم میر حەج بوو، بە باوکما ناردنی بۆ هەژارانی مەککە، وەپێغەمبەر خۆشی لەو ماوەیەدا بەهۆی ناردنی ئەو دیارییەوە، ئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردبوو، لێی قەدەغە نەبوو).

وَعنها رَضِي اللَّهُ عَنْها في رِواية، قالَتْ: أَهْدَى النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّةً غَنَماً. (الحديث ١٧٠١ – اطرافه تقدمت قبله):

لەگێڕانەوەیەکی تریدا عائیشە (رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: ساڵیّ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیّ- ئاژەڵی وردەی بەدیاری نارد بۆ مەککە.

وَفي رِواية عنها رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ القَلائِدَ للنبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُقَلِدُ الغَنَمَ، وَيُقيمُ في أهْلِهِ حَلالاً. (الحديث ١٧٠٢):

---

[٨٣١] تجريد/٢، ژمارە: ٨٠٠ = ١٧٠٠، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٥، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٣٤ = ٣١٨١ شيحا.

لەگێڕانەوەیەکی تریدا: خۆم ملیوانکەم دەهۆنییەوە بۆ پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ دیاریکردنی ئاژەڵی دیاری خانەی خودا، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- بەدەستی خۆی دەیکردە ملی بزن‌و مەڕو دەیناردن بەدیاری بۆ بەیت، وەخۆشی لەناو ماڵ‌و مناڵی خۆیدا دەمایەوەو نەدەچوو بۆ حەج، وە لەو ماوەدا حاڵی حاڵی بێ ئیحرام بوو، نەوەك حاڵی ئیحرامدار) (تاج/٢/٢٥٧ ف/٤+٥ = زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٦، ١٦٥٩، ج/٤).

وَفِي رِوايَة عنها رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قالَتْ: فَتَلْتُ قَلاَئِدَهَا مِنْ عِهْنٍ كَانَ عِنْدِي. (الحديث ١٧٠٥):

لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ملیوانکەی ئاژەڵە دیارییەکانم لەهەندێ خوری بادا، کەهی خۆم بوو.

ئەنجا گێڕانەوەی ژمارە (٧٣٤)ی مختصر صحیح موسلیم:

عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ ابْنَ زِيَادٍ كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ أَهْدَى هَدْيًا حَرُمَ عَلَيْهِ مَا يَحْرُمُ عَلَى الْحَاجِّ حَتَّى يُنْحَرَ الْهَدْيُ، وَقَدْ بَعَثْتُ بِهَدْيِي فَاكْتُبِي إِلَيَّ بِأَمْرِكِ. قَالَتْ عَمْرَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: لَيْسَ كَمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ. أَنَا فَتَلْتُ قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدَيَّ ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِهِ ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أَبِي، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَيْءٌ أَحَلَّهُ اللَّهُ لَهُ حَتَّى نُحِرَ الْهَدْيُ. {الحديث: ٣١٩٢ = ٣١٨١ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٠ = ١٧٠٠، ١٦٩٦، ١٦٩٨، ١٦٩٩، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٣، ١٧٠٤، ١٧٠٥، ٢٣١٧، ٥٥٦٦. نسائي. حج: ٢٧٩٢}:

عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی زیاد، کاغەزی نووسی، بۆ عائیشە: کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرموێ: گوایە هەرکەسێ ئاژەڵی دیاریی بنێرێ بۆ هەژارانی بەستی مەککە، ئیتر ئەوەی کە لەکاتی

حەجکردنا، لە حاجی حەرام دەبیّ، وەك بۆنی خۆش‌و جیماع‌و جلی دووراوو سەرتاشین، لەویش حەرام دەبیّ، هەتا ئاژەڵە دیارییەکەی لە کات‌و جێگەی خۆیدا سەردەبڕێ، ئەوسا چی لیّ قەدەغە بووە، لەو ماوەیەدا، بۆی ڕەوا دەبێتەوە؟ دەی من ئاژەڵی دیاریی خۆمم ناردووە بە حاجیاندا بۆ مەککەو خۆشم نەچووم بۆ حەج، جا تۆ لەم بارەیەوە چی لیّ دەزانی بۆمی بنووسە. عەمرە فەرمووی: عائیشە فەرمووی: ئەمە وانییە وەك ئیبنو عەبباس دەڵیّ، چونکە من بەدەستی خۆم، ملوانکەکانی ئاژەڵە دیارییەکانی پێغەمبەرم هۆندۆتەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) بەدەستی خۆی ئەو ملوانکانەی دەکردە ملی وشترە دیارییەکانی، وە لەو ساڵەدا کە ئەبوبەکری باوکم میر حەج بوو، بە باوکما ناردنی بۆ هەژارانی مەککە، ئیتر لەو ماوەیەدا کە پێغەمبەر خۆی لە مەدینە بوو، ئەوەی کەخوا بۆی حەلاڵ کردبوو، بەهۆی ناردنی ئەو ئاژەڵە دیارییانەوە لێی قەدەغە نەبوو بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٩} .

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم عەبدوڵڵای کوڕی زیادە ئیمامی حوسەینی کوڕی عەلی شەهید کرد، موعاوییە زیادی باوکی ئەم عەبدوڵڵایەی کرد بە برای خۆی‌و کچێکی خۆی لە کوڕێکی ئەم زیادە مارەکردو کردی بە میری سەر کووفەو بەصرە، ئەم زیادە ناسراوە بە زیادی کوڕی باوکی! لەساڵی پەنجاو سێی کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مردووە، ڕاستتر ئەوەیە کە ئەم زیادە لەم بارەیەوە، کاغەزی نووسی بۆ عائیشە نەوەك عەبدوڵڵای کوڕی.

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّةً إِلَى الْبَيْتِ غَنَمًا فَقَلَّدَهَا. {الحديث: ٣١٩٠ = ٣١٧٩. تجريد/٢، رقم: ٨٠٠ - مكرر}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئاژەڵی ورده (بزن‌و مەڕ)ی، بەدیاریی بەیت نارد بۆ هەژارانی مەککەو بۆ نیشانه گوڵەنگێکی کرده ملیان).

٨٣٢- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ ابْنَ زِيَادٍ كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ أَهْدَى هَدْيًا حَرُمَ عَلَيْهِ مَا يَحْرُمُ عَلَى الْحَاجِّ حَتَّى يُنْحَرَ الْهَدْيُ، وَقَدْ بَعَثْتُ بِهَدْيِي فَاكْتُبِي إِلَيَّ بِأَمْرِكِ. قَالَتْ عَمْرَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: لَيْسَ كَمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ. أَنَا فَتَلْتُ قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدَيَّ ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِهِ ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أَبِي، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَيْءٌ أَحَلَّهُ اللَّهُ لَهُ حَتَّى نُحِرَ الْهَدْيُ. {الحديث: ٣١٩٢ = ٣١٨١ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٠ = ١٧٠٠، ١٦٩٦، ١٦٩٨، ١٦٩٩، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٣، ١٧٠٤، ١٧٠٥، ٢٣١٧، ٥٥٦٦. نسائي. حج: ٢٧٩٢}: [٨٣٢]

عەمرەی کچی عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی زیاد، کاغەزی نووسی، بۆ عائیشه: که عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرموێ: گوایه هەرکەسێ ئاژەڵی دیاریی بنێرێ بۆ هەژارانی بەستی مەککە، ئیتر ئەوەی کە لەکاتی حەجکردنا، له حاجی حەرام دەبێ، وەك بۆنی خۆش‌و جیماع‌و جلی دووراوو سەرتاشین، لەویش حەرام دەبێ، هەتا ئاژەڵە دیارییەکەی لە کات‌و جێگەی خۆیدا سەردەبڕرێ، ئەوسا چی لێ قەدەغە بووە، لەو ماوەیەدا، بۆی ڕەوا دەبێتەوە؟ دەی من ئاژەڵی دیاریی خۆمم ناردووە بە حاجیاندا بۆ مەککەو

---

[٨٣٢] تجريد/٢، ژمارە: ٨٠٠ = ١٧٠٠ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٣٢١ = ٣١٩٢ شيحا.

خۆشم نەچووم بۆ حەج، جا تۆ لەم بارەیەوە چی لێ دەزانی بۆمی بنووسە. عەمرە فەرمووی: عائیشە فەرمووی: ئەمە وانییە وەك ئیبنو عەبباس دەڵێ، چونکە من بەدەستی خۆم، ملوانکەکانی ئاژەڵە دیارییەکانی پێغەمبەرم هۆندۆتەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی ئەو ملوانکانەی دەکردە ملی وشترە دیارییەکانی، وە لەو ساڵەدا کە ئەبوبەکری باوکم میر حەج بوو، بە باوکما ناردنی بۆ هەژارانی مەککە، ئیتر لەو ماوەیەدا کە پێغەمبەر خۆی لە مەدینە بوو، ئەوەی کەخوا بۆی حەلاڵ کردبوو، بەهۆی ناردنی ئەو ئاژەڵە دیارییانەوە لێی قەدەغە نەبوو بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٩}.

### روونکردنەوە:

ئەم عەبدوڵڵای کوڕی زیادە ئیمامی حوسەینی کوڕی عەلی شەهید کرد، موعاوییە زیادی باوکی ئەم عەبدوڵڵایەی کرد بە برای خۆیو کچێکی خۆی لە کوڕێکی ئەم زیادە مارەکردو کردی بە میری سەر کووفەو بەصرە، ئەم زیادە ناسراوە بە زیادی کوڕی باوکی! لەساڵی پەنجاو سێی کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مردووە، راستتر ئەوەیە کە ئەم زیادە لەم بارەیەوە، کاغەزی نووسی بۆ عائیشە نەوەك عەبدوڵڵای کوڕی عەباس.

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّةً إِلَى الْبَيْتِ غَنَمًا فَقَلَّدَهَا. {الحديث: ٣١٩٠ = ٣١٧٩. تجريد/٢، رقم: ٨٠٠ - مكرر}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاژەڵی وردە (بزنو مەڕ)ی، بەدیاریی بەیت نارد بۆ هەژارانی مەککەو بۆ نیشانە گوڵەنگێکی کردە ملیان).

## (٦٥) باب جَوَازِ رُكُوبِ البَدَنةِ المُهْداةِ لِمَنِ إحْتاجَ إِلَيْهَا
## وشترى ديارى خانەى خودا، لە رێگە دروستە كەسێ بە پێى پێویست سواریان ببێ

٨٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً فَقَالَ: ارْكَبْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ، فَقَالَ: « ارْكَبْهَا وَيْلَكَ»، فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ. {الحديث: ٣١٩٥ = ٣١٨٤ فم. أبو داود. مناسك: ١٧٦٠. نسائى. حج: ٢٧٩٨} : [٨٣٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێكی دی، وشترى ديارى بەيتی لێ دەخوڕی، فەرمووی: (سواری بە) گوتی: ئاخر چۆن سواری بم ئەمە وشترى دياريى مەككەيە؟ جارێ دووانی تر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمان شتی پێ فەرموو، پیاوەكەیش هەمان وەڵامی دایەوە، جا لەپاش جاری دووەم، یا لەپاش جاری سێیەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خانە خراپ سواری بە، بڕیاری شەرع من دەیزانم یا تۆ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ١٧٠٠}.

٨٣٤- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً ، فَقَالَ « ارْكَبْهَا » . قَالَ إِنَّهَا بَدَنَةٌ . قَالَ « ارْكَبْهَا » . قَالَ إِنَّهَا بَدَنَةٌ . قَالَ « ارْكَبْهَا » . ثَلاَثًا): [٨٣٤]

---

[٨٣٣] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٣٦ - ٣١٩٥، تجريد/٢، ژمارە: ٧٩٧ = ١٦٨٩ بخارى.

[٨٣٤] بخارى. حج: ١٦٩٠، مسلم: ٣١٩٨ — ٣٢٠٠ + مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٣٧ - ٣٢٠١.

لەجێی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە کە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوەیە، گێڕانـەوەی ژمـارە (٧٣٧)ی مختـصر صـحیح موسـلیم دەنووسـین، کـە ئەمـە دەقەکەیەتی، چونکە زیادەی بەسوودی واتیادا:

عَنِ أَبي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضـى الله عنهمـا) سُـئِلَ عَـنْ رُكُـوبِ الْهَـدْيِ فَقَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) يَقُـولُ: « ارْكَبْهَـا بِالْمَعْرُوفِ إِذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا حَتَّـى تَجِـدَ ظَهْـرًا ». {الحـديث: ٣٢٠١ = ٣١٩٠ فـم. أبـو داود. مناسك: ١٧٦١. نسائى. حج: ٢٨٠١. تحفة الأشراف: ٢٨٠٨}:

ئەبو زوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لـێ بێ) لەبارەی سواربوونی وشتری دیـاریی بەیتـەوە، پرسیارکرا، کە ئایا شتی وا دروستە یانا؟ گوێم لێ بوو، جابیر فەرمووی: بـەگوێی خـۆم گـوێم لـە پێغەمبـەر بـوو، لـە وەڵامـی ئـەم جـۆرە پرسـیارەدا، دەیفـەرموو: (ئەگەر ناچار بووی، ئەوا بەشێوەیەکی ڕەوا، سواری ببـە، هـەتا وڵاخـی سـواریی ترت دەست دەکەوێ، ئیتر لـەو دابـەزەو سـواری وڵاخەکـەی تـر بـە کـەهی دیـاری بەستی مەککە نییە).

## (٦٧) باب وجوب طوَاف الوداع وَسقُوطه عَن الحَائض

## هیچ کەس بڵاوەی لێ نەکا هەتا تەوافی ماڵاوایی نەکا بەڵام ژنی بێنوێژ تەوافی ماڵاوایی لەسەر نیە

٨٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَـانَ النَّـاسُ يَنْـصَرِفُونَ فِـى كُـلِّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ، حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْـدِهِ بِالْبَيْـتِ ». {الحـديث: ٣٢٠٦ = ٣١٩٥ فـم. تجريـد/٢، رقـم: ٨١٦ = ٣٢٩، ١٧٦١،

١٧٦٠، ١٧٥٥. أبو داود. مناسك: ٢٠٠٢. ابن ماجة. مناسك: ٣٠٧٠. تحفة الأشراف: ٥٧٠٣}: [٨٣٥]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران موسوڵمانان کە حەج‌و عەمرەیان تەواو دەکرد، ئیتر بەهەر چوارلادا بڵاوەیان لێ دەکرد، تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەس بڵاوەی لێ نەکا تا تەوافی ماڵاوایی لە بەیت نەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ١٦٤٢}.

٨٣٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ قَدْ حَاضت؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّهَا تَحْبِسُنَا أَلَمْ تَكُنْ طافَتْ مَعَكُنَّ؟ فَقَالُوا بَلَى قَالَ فاخْرُجِي). (الحديث ٣٢٨)؛ [٨٣٦]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لەسەر هاوسەرەکانی بێ) دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حوییەی کەوتۆتە بێنوێژییەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گلمان نەداتەوە باشە، یەکی گەڕانەوەمان نەخا باشە، خۆئەو ڕۆژی جەژن لەگەڵ ئێوەدا تەوافی کرد؟) گوتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: (کەواتە: دەرچۆ ئەی صەفییە!) (ت/ ٢/ ٢٢٧/ ٦ = ز-١١٥ ژ-١٦٢٤ = ش/ د/ ت/ ن).

لەتاجا ئەم فەرموودەیە ئاوایە: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوی نەفر - واتە: شەوی گەڕانەوەی حاجی بۆ وڵاتی خۆی - صەفییەی

---

[٨٣٥] تجرید/٢، ژمارە: ٨١٦ = ١٧٦١ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٣ = ٣٢٠٦ شیحا.

[٨٣٦] تجرید/١، ژمارە: ٢١٣ = ٣٢٨ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٤ = ١٢١١ = ٣٢٠٩ شیحا.

هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: وادەزانم گلتـان دەدەمەوە، چونکە کەوتوومەتـە بێنوێژییـەوە، هێشتا تـەوافی ماڵئـاوایی (تـەوافی ویداع) یشم نـەکردووە. پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: لەش بەبارو دەم بـەئازار بێ، بۆخێر بـەدەمیا نـایێ! ئـەی رۆژی جـەژن تـەوافی نـەکردووە؟ گـوترا: بـا، کردوویـەتی. فـەرمووی: (دەبـا بکەوێتـە ڕێو لەگـەڵمان بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، مادام تەوافی فەرزی بەجێ هێناوە، کەناوداره بـە (طواف الإفاضة) یابه (طواف الزيارة) کـەبنیات (روکـن) ی حەجـە، تـەوافی ماڵئـاوایی بـۆ ئەو و بۆ وێنەی ئەو مەرج نییە، نەشی کەن قەیناکات).

٨٣٧– عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ حَاضَتْ صَفِيَّةُ لَيْلَةَ النَّفْرِ ، فَقَالَتْ مَا أُرَانِي إِلاَّ حَابِسَتَكُمْ . قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « عَقْرَى حَلْقَى أَطَافَتْ يَوْمَ النَّحْرِ » . قِيلَ نَعَمْ . قَالَ « فَانْفِرِى »: [٨٣٧]

بڕوانـە ژمـارە (٨٣٨) گێڕانەوەکـەی تـاجول ئوصـول، دەقـی ئـەم فەرموودەیە. ئەمـەیش گێڕانەوەیـەکی تـری ئـەم فەرموودەیـە، لـەژمارە (٧٥٤)ی مختصر صحیح موسلیمدا:

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: حَاضَتْ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ بَعْدَ مَا أَفَاضَتْ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَذَكَرْتُ حِيضَتَهَا لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟ ». قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَفَاضَتْ وَطَافَتْ بِالْبَيْتِ ثُمَّ حَاضَتْ بَعْدَ الإِفَاضَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « فَلْتَنْفِرْ ». {الحديث: ٣٢٠٩ = ٣١٩٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٢١٣ = ٣٢٨، ٣١٩، ٣١٧، ٣١٦، ٣٠٥، ٤٤٠١}:

---

[٨٣٧] تجريد/١، ژمارە: ٢١٣ = ٣٢٨ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٤ - ١٣١١ - ٣٢٠٩ شيحا.

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: صەفییەی کچی حویەی، شەوی نەفر، کە حاجیان بڵاوەی لێ دەکەن‌و هەرکەسەیان دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، ئەو بێنوێژ بوو، منیش عەرزی پێغەمبەرم کرد: صەفییە بێنوێژەو تەوافی وەداعی نەکردووە، چارچییە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خوا بکا ماتڵمان نەکا باشە، یەکی گەڕانەوەمان نەخا باشە؟) منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تەوافول ئیفازەی کردووە، کە روکنی حەجەو پێشی دەگوترێ (طواف الزيارة) ئەوسا کەوتۆتە سەر بێنوێژی؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەبا بکەوێتە رێ لەگەڵمان، مادام تەوافی فەرزی بەجێ هێناوە، تەوافیماڵئاوایی بۆ ئەو نەشی کات قەیناکات). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦٢٤}.

## (٦٨) باب إستحباب دخول الكَعْبَة للحاج وَغَيْرِه، والصَّلاةُ فيها، والدُّعاءُ في نَواحِيها كُلِّها

## چوونە ناو ماڵی خانەی خوداو نوێژکردن‌و نزاکردن لەناویدا، چی بۆ حاجی، چی بۆ کەسانی تر سوننەتە

٨٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ الْكَعْبَةَ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلاَلٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ وَمَكَثَ فِيهَا ، فَسَأَلْتُ بِلاَلاً حِينَ خَرَجَ مَا صَنَعَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ جَعَلَ عَمُودًا عَنْ يَسَارِهِ ، وَعَمُودًا عَنْ يَمِينِهِ ، وَثَلاَثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ ، وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ ، ثُمَّ صَلَّى . وَقَالَ لَنَا إِسْمَاعِيلُ حَدَّثَنِي مَالِكٌ وَقَالَ عَمُودَيْنِ عَنْ يَمِينِهِ. وَثَلاَثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ . وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ ، ثُمَّ صَلَّى): [٨٣٨]

[٨٣٨] تجرید/١، ژمارە: ٢٨٨ = ٤٦٨ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٠٥ = ١٣٢٩ = ٣٢١٨.

بـۆ روونکردنـەوە، وەرگـەڕاوی ژمـارە (٧٠٥)ی مختـصر صـحیح مـسلم، دەنووسین:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووەدی خـودای لەسـەر بـێ) سـاڵی ئـازادکردنی مەککـە، تەشـریفی هـات، لـە حەوشـەی مزگـەوت دابـەزی، نـاردی بەشـوێن عوثمـانی کـوڕی طـەلحـەدا، کـە کلیلداری کەعبە بوو، کلیلەکانی بۆ هێنـاو فـەرمانی پێکـرد، دەرگاکـەی کەعبـەی کردەوە بۆی، ئەوجا پێغەمبەرو بیلال‌و ئوسامەی کوڕی زەیـدو عوثمـانی کـوڕی طەلحە چوونە ناو ژووری کابەوە، ئـەوجا فـەرمانی کـرد، دەرگاکـە داخـرا، تـاوێ لەناویـدا مانـەوە، ئـەوجا دەرگاکـە کرایـەوەو هاتنـە دەرەوە. عەبـدوڵلای کـوڕی عومەر فەرمووی: من خۆم گـورج لـەپێش خەڵکەکـەدا، کـە هاتنـە دەرەوە چـووم بەپیریانـەوە، لەپێـشا پێغەمبـەر (درووەدی خـودای لەسـەر بـێ) هاتـە دەرەوە، دوا بەدوای ئەو بیلال هاتە دەرەوە، لـە بـیلالم پرسـی: ئایـا پێغەمبـەر نوێـژی لـەناو ماڵی کەعبەدا کـرد؟ فـەرمووی: ئـا، نوێـژی تیـاکرد. گـوتم: لەکوێـدا؟ فـەرمووی: لـەنێوانی دوو کۆڵەکـە یەمانیەکانـدا، دەرگاکـەی خـستە پـشتیەوەو رووی کـردە دیوارەکەی بەرابەری، بەینی خۆی‌و دیوارەکە سێ باڵ (ذراع) بوو.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لـێ بێ) دەیفەرموو: لەدەستم چوو، لە بیلال بپرسـم کـە چـەند رکـاتی تیـادا کـرد). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٣٥، ژمـارە: ١٧١٨، ١٧١٧، ١٧١٩}.

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (٢٨٨)ی تەجریدی بوخارییە، بـۆ بـەهرەی پـتر دەینووسین:

عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِمَ مَكَّةَ فَدَعَا عُثْمَانَ بْنَ طَلْحَةَ فَفَتَحَ الْبَابَ فَدَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِلَالٌ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ

وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ ثُمَّ أَغْلَقَ الْبَابَ فَلَبِث فِيهِ سَاعَةً ثُمَّ خَرَجُوا قَالَ ابْنُ عُمَرَ فَبَدَرْتُ فَسَأَلْتُ بِلَالًا فَقَالَ صَلَّى فِيهِ فَقُلْتُ فِي أَيٍّ؟ قَالَ بَيْنَ الْأُسْطوَانَتَيْنِ قَالَ ابْنُ عُمَرَ فَذَهَبَ عَلَيَّ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى). (الحديث: ٤٦٨ طرفه في: ٣٩٧).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ساڵی ئازادکردنی مەککە، عوثمانی کوڕی طەلحەی بانگکرد، کەکلیلداری کەعبە بوو، فەرمانی پێ کرد عوثمان دەرگاکەی کردەوە ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)و بیلالو ئوسامەی کوڕی زەیدو عوثمانی کوڕی طەلحە چوونە ناوکابەوە، ئەوجا دەرگاکە داخرا، تاوێ لەناویدا مانەوە، ئەوجا هاتنەدەرەوە، من گورج لەبیلالم پرسی: ئایا پێغەمبەر نوێژی تیاکرد؟ فەرمووی: ئا نوێژی تیا کرد. گوتم: لەکوێدا؟ فەرمووی: لەنێوانی دوو کۆڵەکە یەمەنیەکاندا. ئیبنوعومەر دەیفەرموو: لەدەستم چوو لێی بپرسم چەند رکاتی تیادا کرد). (ت/٢/٣٧٢/ ٢+٥ ز-١٣٥ ژ-١٧١٨ چ-٤).

**ڕوونکردنەوە:**

١- بیلالی کوڕی رەباحی حەبەشی (رەزای خودای لێ بێ) ناودارەو ناسراوە بە (مُؤَذِنُ الرَسولِ: بانگبێژی پێغەمبەری خودا) یەکێکە لە موسوڵمانە هەرەپێشینەکان، دەڵێن: حەوتەم کەس بووە کە ئیسلام بووە، دایکی ناوی حەمامە بووە، برایەکی هەبووە ناوی خالید بوو، خوشکێکی هەبوو ناوی غەفرە یا غوفەیرە بوو، حەمامە لەپێناوی ئیسلاما ئێشو ئازارو ئەشکەنجەی زۆری چەشت، هەتا ئەبوبکری صدیق کڕیو ئازادی کرد، لە ئیستیعابا دەفەرموێ: خالیدی کوڕی رەباحی ئەلحەبەشی برای بیلالی کوڕی رەباحە، کە بیلال بانگدەری پێغەمبەر بوو، خالید لەهاوەڵانی پێغەمبەرە.

له (إصابة)دا دهفهرمویّ: غوفهیرهی کچی رهباح خوشکی بیلالی بانگدهری پێغهمبهره. بیلال پیاوێکی کهڵهگهتی لاواز بوو، رهنگی سهوزه بوو، زۆر دڵپاكو دڵساف بوو، زۆر موسوڵمانێکی جوانو ڕاستو دروست بوو، بتپهرستهکان لهسهر ئیسلامهتی ئازارو ئهشکهنجهیهکی زۆریاندا، ئومهییهی کوڕی خهلهف لهقرچهی گهرمای نیوهڕۆدا، لهسهر زیخو لمو چهوی زیخهڵانهکهی مهککه، لهسهر گازهری پشت، تهخت ڕای دهکێشاو تاوێری گهورهی گهرمی دهخسته سهر سکیو پێی دهگوت: یاکافر دهبی به موحهممهد، یا ئهمه حاڵته تادهمری!

بیلالیش لهسهر ئهوحاڵه، ههر دهیگوت: (ئهحهد، ئهحهد: خودا یهکه، خودا یهکه) لهسهر ئهم حاڵه ئهبوبکر لهم کاتهدا بینی، کڕیو ڕزگاری کردو ئازادی کرد.

بیلال لهههموو شهڕگاو نهبهردو مهڵبهندهکانی جهنگهکاندا، لهخزمهتی پێغهمبهردا ئامادهی جهنگهکان بووه، ههمیشه لهخزمهت پێغهمبهردا بووه، لێی جیانهدهبۆوه مهگهر لهکاتی تایبهتدا، لهکاتی پهیمانبهستنی برایهتیدا، لهنێوانی موسوڵماناندا، پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) بیلالی کرد بهبرای ئهبو عوبهیدهی جهرراح، لهپاش وهفاتی پێغهمبهریش (دروودی خودای لهسهر بێ) بیلال دهچوو بۆ غهزا کردن، پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) بیلالی زۆر خۆشدهویست، ئهوانهی کهبۆ یهکهمجار ئیسلامبوونیان ئاشکرا کرد ئهم حهوت کهسه بوون: پێغهمبهرو ئهبوبکرو عهممارو سومهییهی دایکی عهممارو صوههیبو بیلالو میقداد بوون. بیلال لهسهردهمی پێغهمبهر خۆیو لهسهر دهمی جێنشینی ئهبوبکردا، بانگی دهدا، ئیتر بانگی نهدا، بهڵام کاتێ پێشهوا عومهری کوڕی خهتاب، داخڵی شام بوو بانگی دا، عومهرو ههموو خهڵکهکهی کرده گریان. بیلال فهرموودهی له کوتوبی سیتته (شهش پهڕاوهکه)دا ههیه.

لەژمارە (٦٣٦و ژمارە ٣٢١٧)ەی صەحیحی موسلیمدا، تەخریجو تەرقیمی شێخ خلیل مەئموون شیحادا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئیمامی بیلال، سەرەڕای موسلیم، بوخاریو ئەبوداوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەیش گێڕانەوەیان لەبیلالەوە ئەنجام داوە، ئەم زاتانە گێڕانەوەیان لە بیلالەوە کردوووە:

ئەبوبکری صەدیقو ئیمامی عومەرو ئوسامەو عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصو کەسانی تریش. بیلال خودا بۆی دەرەخسێنێ ئومەییەی کوڕی خەلەف، کەزۆر ئازاری بیلال دەدا دەکوژێ، ئەبوبکری صەدیق بەم هۆنراوەیە پیرۆزباییو دەستخۆشی لێ دەکا (وافر):

هَنِيئـــاً، زَادَكَ الـــرَّحْمنُ خَيْـــراً

فَقَـدْ أدْرَكْــتَ، ثَــأرَكَ يَــا بِــلالُ!

واتە:

بیلال! دەستت خۆش پیرۆز بێ یاخوا

تۆڵەی خۆتت سەند لەدوشمنی خوا

بیلال لەسەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەردا، لەشام، لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا گیانی پاکی سپارد {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٤١ = ٦٣٦ ترقیم شیحا} + {تەجریدی بوخاری/٣ ژمارە: ١٠١٧} + {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥ لاپەڕە: ٦٤٨ ج/٤، ژمارە: ٣٣٩٤ - ٣٣٩٦}.

ئایا بڕیاری شەرعی لەخەون وەردەگیرێ؟

بۆ یادی پیرۆزی دوو بانگدەرە ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمە ڕاگوێز دەکەین لە ژمارە: (١٩٠)ی شەرحی بلوغ المرام/١ لە دواوە:

عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {طَافَ بِي -وَأَنَا نَائِمٌ- رَجُلٌ فَقَالَ: تَقُولُ: "اَللَّهُ أَكْبَرَ اَللَّهِ أَكْبَرُ، فَذَكَرَ اَلْآذَانَ - بِتَرْبِيعِ اَلتَّكْبِيرِ بِغَيْرِ تَرْجِيعٍ، وَالْإِقَامَةَ فُرَادَى، إِلَّا قَدْ قَامَتِ اَلصَّلَاةُ - قَالَ: فَلَمَّا أَصْبَحْتُ أَتَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: "إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌ..." } اَلْحَدِيثَ. أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ. {أحمد ٤٣/٤ رقم: ١٦٥٢٥. ترمذى رقم: ١٨٩. أبوداود رقم: ٤٩٩. ابن خزيمة ٣٧٠. ابن حِبان ١٦٧٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبدورەببیهی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ خەوتبووم لەخەوما پیاوێ هاتە خەوم، بۆڵ (ناقووس)ێکی بەدەستەوە بوو، پێیم گوت: ئەی بەندەی باشی خودا! ئەم ناقووسە نافرۆشیت؟

گوتی: بۆچیتە؟ گوتم: خەڵکەکەی پێ کۆدەکەینەوە بۆکاتی نوێژ، گوتی: ئەی بۆچی شتێکت پێ نیشان نەدەم کە گەلێ لەم ناقووسە باشتر بێ بۆ بانگەواز بۆ کاتی نوێژ؟ گوتم: بفەرموو ئەوە چییە؟ فەرمووی: کاتێ بانگ دەڵێی بلێ: الله أكبر الله أكبر، تاکۆتایی بانگ، لەسەرەتاوە چوار جار (الله أكبر)ی کرد، بەلام بەبێ تەرجیع، وە قامەتیشی فێرکردم، وشەکانو گوتەکانی قامەتیشی پێم گوت، هەموویان یەك جار یەکجار بوون، دووبارەیان تیادا نەبوو، رستەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) نەبێ، کە دووبارە بوو ئاوا: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ).

عەبدوڵڵای کوڕی زەید فەرمووی: جا بۆ بەیانی چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئەم خەوەم گێڕایەوە بۆی، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەم خەونەی کەتۆ دیوتە لەم بارەیەوە، خەونێکی ڕاستو دروستە...تاکۆتایی فەرموودەکە).

(ئەحمەدو ئەبوداوود دەریانهێناوە، تەرمەزیو ئیبنو خوزەیمە بە صەحیحیان داناوە).

**روونكردنەوە:**

١- عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی كوڕی عەبدورەببیهی كوڕی ثەعلەبە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، هاوەڵی پێغەمبەرە، ئامادەی پەیمانی عەقەبەو بەدرو هەموو نەبەردگاكانی تر بووە، لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا، ناسراوە بە خەوبینینی بانگ، كە ئەم خەونەی دی، كە لەم فەرموودەیەدا خۆی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كرد، كەبچێ بۆ لای بیلال‌و وشەكانی بانگی فێر بكا، هەتا بیلال بانگەكە بڵێ، چونكە بیلال دەنگی زوڵاڵترە.

ئەم خەونەی لەساڵی یەكی كۆچیدا بوو، لەپاش دروستكردنی مزگەوتەكەی پێغەمبەر بوو، كەڕاوێژیان بەیەكتری دەكرد: كە چۆن چۆنی نوێژخوێنەكان كۆبكەینەوە بۆ كردنی نوێژە فەرزەكان، یەكێ دەیگوت: با زەنگێ دابنێین وەك هی نەصرانییەكان، وەك ئەوان لەكاتی كۆبوونەوە بۆ نوێژ، ناقووس لێ بدەین، هەندێ دەیانگوت: باوەك جوولەكەكان كەڕنایەك دروست بكەین‌و لەكاتی نوێژدا فووی پیابكەین، تا نوێژخوێنەكان كۆببنەوە، جا ئەم عەبدوڵڵایە ئەم خەونەی بینی‌و پێغەمبەر پەسەندی كرد.

لەمەدینە مردووە، لەساڵی (٣٢) سیی‌و دووی كۆچیدا، لە تەمەنی (٦٤) شەست‌و چوار ساڵیدا، پێشەوا عوثمان نوێژی مردووی لەسەر تەرمەكەی كرد.

ئەم زاتانە فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە: سەعیدی كوڕی موسەییەب‌و عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەبو لەیلا‌و كوڕەكەی خۆی كەناوی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی زەید بوو.

٢- بۆ ئەوەی كە بەباشی لەم وشانە حاڵی ببین، واتای (تەربیع)و (تەرجیع)و (تەثویب) دەكەین.

١- **تەربيع** رستەكە چوارجار بگوترێ، وەك رستەی (الله أكبر) لەسەرەتای بانگەوە چوارجار دەگوترێ.

٢- **تەرجيع** سوننەتە، ئەوەیە كەبانگبێژ لەپێش ئەوەدا كە بەدەنگی بەرز دوو وشەی شەهادەت بڵێ، لەژێر لێوەوە بە پەنامەكی ئەم دوو وشەیە بڵێ ئاوا: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله».

ئەوجا بەدەنگی بەرز بیانڵێتەوە، ئاوا: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله».

٣- **تەثویبیش** سوننەتە، ئەوەیە كە لەبانگی بەیانیدا، بانگدەر لەپاش (حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ) دووجار بڵێ (الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ). واتە: نوێژ باشترە لەخەو، بۆیە تەثویب بەس لەبانگی بەیانید دەگوترێ، چونكە زۆرینەی نوێژكاران لەوكاتەدا نووستوون.

٤- **تەرجيع** واتە: دووبارەكردنەوەو تێهەڵچوونەوە.

٥- **تەثویب** لەوەوە هاتووە كە پیاو لەدوورەوە بەهاوار هاوارەوە بێت، بە (ثَوْبَ)ەكەی، واتە: بەجلەكانی ئاماژە بكا، هەتا خەڵك ببیینن‌و لێی حاڵی ببن، جا بانگبێژیش وەك چاو لەو هاواركەرە بكا وایە. هەندێ تر دەفەرموون: (تَثْوِيب مِنْ ثَابَ يَثُوبُ إِذَا رَجَعَ).

واتە: تەثویب بەواتا تێهەڵچوونەوەیە، چونكە بانگبێژ لەپێشدا بە (حَيَّ عَلَى الصلاةِ)و بە (حَيَّ عَلَى الفَلاَّحِ) هانی خەڵكەكەی داوە، كە بەزوویی بێن بۆ نوێژ، كە دەڵێ (الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ) دیسان تێهەڵدەچێتەوە لەهاندانی خەڵك كەبێن بۆ نوێژ، یان بەزوویی نوێژەكەیان بكەن.

وَزَادَ أَحْمَدُ فِي آخِرِهِ قِصَّةَ قَوْلِ بِلَالٍ فِي آذَانِ اَلْفَجْرِ: {اَلصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ اَلنَّوْمِ}. {أخرجهُ أحمد في المسند (٤/٤٢)}:

**واتــه: ئیمــامی ئەحمــەد (ڕەحمــەتی خــودای لێ بــێ) فەرموودەكــەی عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی ڕاگوێز كردووە، كە لە ژمارە (١٩٠)دا رابورد، ئەوجا فەرموودەكەی بیلالی لكاندووە بەكۆتاكەیەوە، كە ئەمەیە:**

**بــیلال (ڕەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بێ) فەرمووی: (ئەی بیلال! كەبانگی یەكەمی بەیانی دەدەیت، بڵێ: الصَّلاَةُ خَيْرُ مِنَ النَّوْمِ).**

**وەڵام: زاناكان دەفەرموون: دروستە خەون بكری بەسەرە داوێ، وە لەو ڕووەوە كاری پێ بكرێ، بەڵام بەخەونی ڕووت بڕیاری شەرعی پێ دروست نابێ، ئەم خەونە بۆیە كراوە بە سەرچاوەی بانگ چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەسەندی كردووە.**

**لە (فتح ذی الجلال والإكرام بشرح بلوغ المرام)دا، دەفەرمووێ: (جارێ شێخ عەبدولقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەخەونـدا، نوورێكی گەورەی بێ وێنە دەبینێ، لەناو ئەو نوورەوە بانگدەرێ بانگی دەكا: ئەی عەبدولقادر! فەرزی نوێژ لەسەر تۆ هەڵگیراوە، ئیتر پێویست ناكا كە نوێژ بكەیت؟!!**

**شێخ عەبدولقادر پێی دەڵێ: درۆدەكەی، تۆ شەیتانیت، دەنا چۆن نوێژ لەسەر موسوڵمان لادەبرێ، ئیتر نوورەكە نامێنێ).**

**كەواتــە: هەرخــەونێ بەپێـچەوانەی یاسـانامەی خـوداوە بـێ پووچـەو درۆیــەو، لەشــەیتانەوەیە، لــەخودای میهرەبانــەوە نییــە. لــەكتێبو پــەڕاوە بایەخــدارەكانی ئاییـنـدا، بایــەخی بــاش بەخــەون دراوە، وەزۆر جــار بــووە، بەرێخۆشكەرو نیشانەو بەڵگە بۆ زۆر شتی باش.**

( **خەونێکی دروست** ):

جارێ، دووجار، لەگەڵ برادەرانا، ناوی (مامۆستا شێخ کەمالی شێخ نوری شێخ باباعەلی تەکییەیی)مان بەخراپە هێنا، کەشێخ کەمال خەتیبی مزگەوتی گەورە بوو (خودا لێی خۆش بێو پڕ گۆڕەکەی لە رەحمەتی خودا بێ).

شەوێ لەخەوما مامۆستا شێخ نوریم بینی، وەك سەردەمی ژیانی ریشێکی جوانی هەبوو، مێزەری بەسەرەوە بوو، جبەکەی دابوو بەسەر شانەکانیداو لەهەیوانی مزگەوتەکەی خۆیان، بەهێمنی چوارمەشقی دانیشتبوو، منیش وەك جاران چووم دەستی ماچ بکەم بەڵام دەستی نەدا پێمو دەستی خستە پشت خۆیەوەو فەرمووی: (لاچۆ ئێمە سەیدین، نەوەی پێغەمبەرین، بۆچی دەچی غەیبەتمان دەکەی؟!).

لەنزیکترین هەلی رەخساودا، چووم بۆ خزمەتی مامۆستا شێخ کەمال، لەهۆدەکەی خۆی، لەمزگەوتی گەورەی شاری سلێمانی، دەستم ماچ کردو خەونەکەم گێڕایەوە بۆیو تکام لێ کرد کە گەردنم ئازاد بکا، دەستی کردە ملمو دەستی کرد بەگریانو فەرمووی:

(نوری! وام دەزانی تۆ پیاوێکی خراپی، بەڵام بەپێچەوانەوە پیاوی باشی).

منیش دڵم گەرم بوو لەگەڵیا دەستم کرد بەگریان!!

٨٣٩ـ عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (لَمَّا دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْبَيْتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا وَلَمْ يُصَلِّ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الْكَعْبَةِ وَقَالَ هَذِهِ الْقِبْلَةُ). (الحديث: ٣٩٨ أطرافه في: ١٦٠١، ٣٣٥١، ٣٣٥٢، ٤٢٨٨)[٨٣٩]:

---

[٨٣٩] تجريد/١ ژمارە: ٢٥١ = ٣٩٨ مسلم: ٣٢٢٤ شيحا.

ئیبنوعـەبباس (ڕەزای خوایـان لــێ بــێ) فـەرمووی: ڕۆژی ئـازاد کردنـی مەککە، کـەناوداره بەفـەتحی مەککـە، کەپێغەمبـەرو کۆمـەڵێ لـەیارانی چوونە ناوماڵی کابەوه، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو هەموو لایەکی نـاو کابەدا نـزای کـردو لـەخودا پاڕایـەوه، بـەڵام بـەپێی ئاگاداری مـن کەلەئوسامەی کوڕی زەیدم وەرگرتووه، نوێژی لەناویـدا نـەکردووه، هـەتا دێتـەدەرەوه، کەدێتـە دەرەوه بەرەوڕووی ڕووگە (موقابیلی قیبلە) دوورکات نوێـژی سـوننەت دەکا، وه دەفەرموێ: (ئەمە ڕووگەی موسوڵمانانە، ئەو قیبلە یەیە کە لەنوێـژدا ڕووی تـێ دەکەن). (ت/٢/٢٧٢/٢ ژ-١٧٢٠ ز-١٣٥).

## ڕوونکردنەوه:

ئیمـامی بوخـاری (ڕەزای خـوای لـــێ بــێ) گـەلێ جـار بەگێڕانــەوەی فەرموودەیێ، ئاماژەی بۆ مەبەستێکی تریش کردووه، کەلەڕۆژگاری ئەودا قسەی لێ کراوەو، لەناو کۆڕی زاناکانـدا قسەی جیاجیای لێ کراوەو، جاروباریش ڕاجیایی لەومەسەلەیەدا بەهۆی جیاوازیی شێوازی چـەند فەرموودەیەکـەوه پەیـدا بـووه. جاپێشەوا بوخاری بۆبەرپەرچدانەوه، یاوەڵامی ئەوجۆره پرسـیارو ڕاجیاجیانـە، بەگێڕانـەوەی فـەرموودەیێ لەبارەیـەوه ئامـاژەی کـردووه، گـەلێ جـاریش بڕیـاره شــەرعیەکانی لــەئاماژەی فــەرموودەکان وەرگرتــووەو، فەرموودەکـەی کــردووه بەبەڵگــە لەســەری، هــەتا ئــەوجۆره ئامــاژەو ووردەکارییــەی بوخــاری بــووه بەسەرچاوه بۆ زۆر لەبڕیاره شەرعی یەکانو گوتراوه (فقه البخاري في تراجمه). جالەسەر ئەم بنیاتە دەبێ فەرموودەکانی بوخاری ڕەچاو بکرێن.

٨٤٠ـ عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَطافَ بالبَيْتِ، وَصَلَّ خَلْفَ المَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَـهُ مَـنْ يَـسْتُرُهُ مِـنَ النَّـاسِ،

فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَدخَلَ رَسُـولُ اللهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ الكعبـةَ؟ قَـالَ: لاَ. الحـديث ١٦٠٠– أطرافه في: ١٧٩١، ٤١٨٨، ٤٢٥٥): [٨٤٠]

عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەبوئـەوفا (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: لەسـاڵی حەوتی کۆچیدا، لە پێش ئازادکردنی مەککەدا، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە عـەمرەتول قـەضادا، کـە عـەمرەی کـرد، تـەوافی بـەیتی کـرد، دوو ڕکات نوێـژی سـوننەتی لـە پـشت مـەقامی ئیبراهیمـەوە کـرد، کەسـانێ لـە خزمەتیـدا بـوون، بـەریان لـە خـەڵك دەگـرت، نـەبادا نوێژەکـەی پـێ بـبڕن، یـا ئـازارێکی بـۆ دروست بکەن. پیاوێ پێی گوت: ئایا لـەم عەمرەیـەدا پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسەر بێ- چووە ناو ژوری کەعبەوە؟ فەرمووی: نەء).

## (٦٩) باب نَقْض الكعبة وبِنائها
## هەڵوەشاندنی کەعبەو دروستکردنەوەی

٨٤١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قالَتْ: سأَلْتُ النَبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ عَـنِ الجَدْرِ اَمِنَ البَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَمْ) قُلْتُ: فَمَالَهُمْ لَمْ يُدْخلوهُ في البَيْتِ؟ قَالَ: (إنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمْ النَّفَقَةُ). قلتُ: فَما شَأنُ بابِهِ مُرْتَفِعاً؟ قَالَ: (فَعَلَ ذلَكَ قَوْمُكِ، لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاؤُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاؤوا، ولَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَديثٌ عَهْدَهُمْ بِالجاهِلِيَّةِ فَأخَافُ أَنْ تُنكِـرَ قُلُوبُهُمْ، أَنْ أُدخِلَ الجَدْرَ في البَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بالأَرْضِ) (الحديث: ١٥٨٤): [٨٤١]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لەحەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- ئایا حیجری ئیسماعیل لەبنەڕەتدا بەشێکە لەماڵی بەیت یا نا ؟ فەرمووی: (بـەڵێ بەشێکە لـە مـاڵی بـەیت) عـەرزیم کـرد: ئـەی بۆچی ئێستا

---

[٨٤٠] تجرید/٢، ژمارە: ٧٦٨ = ١٦٠٠ مسلم: ٣٢٢٦.

[٨٤١] بخاری. حج: ١٥٨٥. مسلم: ٣٢٢٧ شیحا.

نەخراوەتەوە سەر بەیت؟ فەرمووی: (چونکە گەلی تۆ کاتێ کەکابەیان دروست کردەوە دەستیان کورت بوو). گوتم: ئەی بۆچی دەرگای بەیت بەرزە؟ فەرمووی: (گەلی تۆ کە هۆزی قورەیشە، بۆیە وا لەبەرزی دەرگای بەیتیان دروست کردووە، هەتا بەئارەزوی خۆیان کێیان ویست کە بچێتە ناوی، ڕێگەی پێ بدەن‌و، کێیان نەویست نەهێڵن بچێتە ناوی، لەبەرئەوە نەبێ کە گەلی تۆ هێشتا نوێ مسوڵمانن‌و، دەترسم لەدڵەوە پێیان ناخۆش بێ، دەنا حیجرم دەخستەوە سەر بەیت‌و دەرگاکەیشم لەسەر زەوییەکە دادەنا، نەوەك وەك ئێستای ئاوا بە بەرزەوە) (تاج/٢/٢٧٣ز– ١٣٥- ش/ت) بەیت واتە: کەعبە.

**ڕوونکردنەوە:**

مەککەو مەدینەو مەسجیدولحەرام‌و کەعبەو بەیت‌و قیبلەو حەرەم‌و حەرەمی مەککی‌و حەرەمی مەدەنی‌و مەسجیدولئەقصاو خاکی پیرۆزو زۆر ناوی تری شوێنە پیرۆزەکانی دیاری موقەددەسە، وەك کێوی عەرەفەو جەبەلو ڕەحمەو میناو موزدەلیفەو مەشعەرولحەرام و تەنعیم‌و.. تاد، ئەم جۆرە شوێنانە هەر یەکێکیان بگریت، نەخشەو ڕێگەو سنوورو نەخشەی تایبەتی خۆی هەیە، لەکتێبە گەورەکاندا بەڕوونی ڕونکراونەتەوە، ئەوەیشی پەیوەندی بە مەساجیدو چۆنێتی و جوغرافیاوە هەبێ لەشوێنی خۆیان زۆر بەجوانی ڕوون کراونەتەوە.

**ئەوەی کە زۆر مەبەستمە کە لەم شوێنەدا ئاماژەی بۆ بکەم ئەمەیە:**

١- (خاڵێکی زۆر گرنگ لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ، کە ئەویش ئەمەیە: دڵی کۆمەڵەی مسوڵمانان ڕابگیرێ، کەئێستا پێی دەگوترێ: ڕێز گرتنی هەستی جەماوەر، ئەوەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی

دەگوترا: أسْتِصلاحي قُلُوبي مؤلَّفه، گەرچی عومەر لەکاتی خۆیدا فەرمووی: ئێستا ئیسلام عەزیزو بەهێزە، کارمان بەمانە نەماوە، بەڵام بەڕاستی ئێستا کاتی ئەوە هاتۆتەوە..).

ئینجا ئـەم گێڕانـەوەی تـری تەجریـدی بوخـاری بـۆ روونکردنـەوەی پـتر دەنووسین، وەرگەڕاوی ژمارە (٧٦٠)ی تەجریدی بوخارییە:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرمووم: هۆزی تۆ نۆ مسوڵمانن لەبەرئەوە دەترسم کە لەدڵەوە پێیـان نـاخۆش بـێ، ئـەگینا کەعبـە (بـەیت) م دەڕوخـانو لەئاستی زەوی مزگەوتەکـە تەختی بنەکەیم دادەناو، دەرگەکەیـشم لەسـەر تـەختی زەویەکـە دادەنـا، وە دوو دەرگایــشم بــۆ دروســت دەکــرد: دەرگایــێ لــە خۆرهەڵاتیــەوەو دەرگایــێ لــە خۆرنــشێنیەوە، تـا لـە دەرگایەکیانــەوە خــەڵك بـچنە ژورەوەو، لـەو دەرگاکـەی تریانەوە بڕۆنە دەرەوە، وەشەش باڵیشم لە حیجری ئیسماعیل دەخـستە سـەری، چونکە قورەیش کە کابەیان دروست کردووە – لەبـەر دەست کـورتی– کورتیـان کردەوەو، لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروستیان نەکردەوە. (تا/٢/٢٧٣- ش/ت).

٨٤٢– عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عـنهم) زَوْجِ النَّبِـىِّ (صـلى الله عليـه وسـلم) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: لَهَا « أَلَـمْ تَـرَىْ أَنَّ قَوْمَـكِ لَمَّـا بَنَـوُا الْكَعْبَـةَ اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ » . فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِـدِ إِبْـرَاهِيمَ . قَالَ « لَوْلاَ حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَفَعَلْتُ » . فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ (رضى الله عنه) لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ (رضى الله عنها) سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) مَـا أُرَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تَرَكَ اسْتِلاَمَ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَـانِ الْحِجْـرَ ، إِلاَّ أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ): [٨٤٢]

---

[٨٤٢] بخاری. حج: ١٥٨٣، مسلم: ٣٢٢٩ شیحا.




عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (گەلی قوڕەیشی تۆ، کاتێ کەعبەیان دروست کردەوە، دەستیان کورت بوو، نەیانتوانی کە ماڵی کەعبە لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروست بکەنەوە). منیش عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی تۆ بۆ نایڕووخێنیو لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروستی بکەیتەوە؟ فەرمووی: (ئەگەر گەلی قوڕەیشی تۆ نۆ موسوڵمان نەبوونایە ئەوەم دەکرد!).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر فەرمووی: لەبەرئەمەیە کە عائیشە بەگوێی خۆی ئەمەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، بۆیە لەکاتی تەوافی بەیتدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو دوو گۆشەیەی کە لەحیجرەوە نزیکن ماچ نەدەکردو دەستی پیادا نەدەهێنان، چونکە بەیت لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروست نەکراوەتەوە.

ئێستایش ژمارە (٧٦٠)ی تەجریدی بوخاری بۆ راڤەو روونکردنەوە دەنووسین:

عَنْ عِائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ النَبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهاَ: (يَا عَائِشَةُ لَولاَ أنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَةٍ، لأَمَرْتُ بِالبَيْتِ فَهُدِمَ، فَأَدْخَلْتُ فِيهِ مَا أُخْرِجَ مِنْهُ، وَأَلْزَقْتُهُ بالأَرْضِ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ بَاباً شَرْقِياً وَبَاباً غَرْبِياً، فَبَلَغْتُ بِهِ أَسَاسَ إِبْراهِيمَ) (الحديث ١٥٨٦):

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرمووم: هۆزی تۆ نۆ مسوڵمانن لەبەرئەوە دەترسم کە لەدڵەوە پێیان ناخۆش بێ، ئەگینا کەعبە (بەیت) م دەڕوخان و لەئاستی زەوی مزگەوتەکە تەختی بنەکەیم دادەناو، دەرگەکەیشم لەسەر تەختی زەویەکە دادەنا، وە دوو

دەرگایــشم بــۆ دروســت دەکــرد: دەرگایــێ لــە خۆرهەڵاتیــەوەو دەرگایــێ لــە خۆرنــشێنیەوە، تــا لــە دەرگایەکیانــەوە خــەڵك بــچنە ژوورەوەو، لــەو دەرگاکــەی تریانەوە بڕۆنە دەرەوە، وەشەش باڵیشم لە حیجری ئیسماعیل دەخستە سەری، چونکە قوڕەیش کە کابەیان دروست کردووە – لەبەر دەست کورتی– کورتیان کردەوەو، لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروستیان نەکردەوە. (تا/٢/٢٧٣- ش/ت).

## (٧٠) باب جُدُرُ الكعبة وبَابُها
## حیجری ئیسماعیلو دەرگای کابە

٨٤٣- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قالَتْ: سأَلْتُ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الجَدْرِ امِنَ البَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَمْ) قُلْتُ: فَمَالَهُمْ لَمْ يُدْخلوهُ فِي البَيْتِ؟ قَالَ: (إنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمْ النَّفَقَةُ). قلتُ: فَما شَأنُ بابِهِ مُرْتَفِعاً؟ قَالَ: (فَعَلَ ذلَكَ قَوْمُكِ، لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاؤُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاؤوا، ولَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَديثٌ عَهْدَهُمْ بِالجاهِلِيَّةِ فَأخَافُ أَنْ تُنكِرَ قُلُوبُهُمْ، أَنْ أُدخِلَ الجَدْرَ فِي البَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بالأَرْضِ) (الحديث: ١٥٨٤)[٨٤٣].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لەحەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- ئایا حیجری ئیسماعیل لەبنەڕەتدا بەشێکە لەماڵی بەیت یا نا ؟ فەرمووی: (بەڵێ بەشێکە لە ماڵی بەیت) عەرزیم کرد: ئەی بۆچی ئێستا نەخراوەتەوە سەر بەیت؟ فەرمووی: (چونکە گەلی تۆ کاتێ کەکابەیان دروست کردەوە دەستیان کورت بوو). گوتم: ئەی بۆچی دەرگای بەیت بەرزە؟ فەرمووی: (گەلی تۆ کە هۆزی قوڕەیشە، بۆیە وا لەبەرزی دەرگای بەیتیان دروست کردووە، هەتا بەئارەزوی خۆیان کێیان ویست کە بچێتە ناوی، ڕێگەی پێ بدەنو، کێیان نەویست نەهێڵن بچێتە ناوی، لەبەرئەوە نەبێ کە گەلی تۆ هێشتا نۆ مسوڵمانانن

---

[٨٤٣] تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٩ = ١٥٨٤، مسلم: ١٣٣٣ ترقيم محمد فؤاد - ٣٢٢٩ شيحا.

و، دەترسم لەدڵەوە پێیان نـاخۆش بـێ، دەنـا حیجـرم دەخـستەوە سـەر بـەیتو دەرگاکەیـشم لەسـەر زەوییەکـە دادەنـا، نـەوەك وەك ئێـستای ئـاوا بـە بـەرزەوە) (تاج/٢/٢٧٣ز– ١٣٥- ش/ت) بەیت واتە: کەعبە.

## ڕوونکردنەوە:

مەککـەو مەدینـەو مەسـجیدولحەرامو کەعبـەو بـەیتو قیبلـەو حـەرەمو حەرەمی مەککیو حەرەمی مەدەنیو مەسجیدولئەقصاو خاکی پیرۆزو زۆر ناوی تـری شـوێنە پیرۆزەکـانی دیـاری موقەددەسـە، وەك کێـوی عەرەفـەو جەبـەلو ڕەحمـەو مینـاو موزدەلیفـەو مەشـعەرولحەرام و تـەنعیمو.. تـاد، ئـەم جـۆرە شوێنانە هەر یەکێکیان بگریت، نەخشەو ڕێگەو سنوورو نەخشەی تایبەتی خۆی هەیـە، لەکتێبـە گەورەکانـدا بـەڕوونی ڕونکراونەتـەوە، ئەوەیـشی پەیوەنـدی بـە مەساجیدو چۆنێتی و جوغرافیاوە هـەبێ لەشـوێنی خۆیـان زۆر بـەجوانی ڕوون کراونەتەوە.

### ئەوەی کە زۆر مەبەستمە کە لەم شوێنەدا ئاماژەی بۆ بکەم ئەمەیە:

١- (خاڵێکی زۆر گرنگ لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ، کـە ئـەویش ئەمەیـە: دڵی کۆمەڵەی مسوڵمانان ڕابگیرێ، کەئێستا پێـی دەگـوترێ: ڕێـز گرتنـی هەسـتی جەماوەر، ئەوەی کـە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- پێـی دەگوترا: أسْتِصلاحي قُلُوبي مؤلّفه، گەرچی عومەر لەکاتی خۆیدا فەرمووی: ئێستا ئیسلام عەزیزو بەهێزە، کارمان بەمانە نەماوە، بەڵام بەڕاستی ئێستا کاتی ئەوە هاتۆتەوە..).

## (٧١) باب الحج عن العاجزِ لزمانةٍ وهَرَمٍ ونحوهما أو للموت

## نا توانا (لەبەر هەر هۆیەکی ڕەوا، وەك نەخۆشی درێژخایەن‌و پیری‌و مردن‌و شتی تری وەك ئەمانە، حەجیان چۆن بۆ بکرێ

٨٤٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ. أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: « نَعَمْ ». وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. {الحديث: ٣٢٣٨ = ٣٢٢٧ ف‌م. تجريد/٢/١٥٧، ژماره: ٧١٨ = ١٥١٣، ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨. أبو اود. منا سك: ١٨٠٩. نسائي. حج: ٢٦٣٣. تحفة: ٥٦٧٠} : [٨٤٤]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، فەضلی برام لە پاشکۆی پێغەمبەردا بوو، لەوکاتەدا، ژنێ لە هۆزی خەثعەم هات، پرسیاری هەبوو، فەزڵ دەستی کرد بە تەماشا کردنی ژنەکە، ژنەکەیش دەستی کرد بە تەماشاکردنی فەزڵ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی نا بەڕووی فەزڵەوەو بەرچاوی گرت، تا ڕێگەی تەماشا کردنی بگرێ، ژنەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج کە فەرزی خودایە لەسەر بەندەکانی، کەوتۆتە سەر باوکم، لە حاڵێکا کە پیرە مێردێکی ئیختیاری وایە، خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، جا ئایا مرۆڤی پەککەوتووی وا حەجی لەسەر دەمێنێ؟ وە ئاشکرایە، ئەگەر حەجی لەسەر دەمێنێ، کەخۆی ناتوانێ حەج بکا، ائایا دەبێ کە من لەباتی خۆی حەجی بۆ بکەم؟ پێغەمبەر (دروودی

---

[٨٤٤] تجريد/٢، ژمارە: ٧١٨ = ١٥١٣ بخاری مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٤٩ - ٣٢٣٨ شيحا.

خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئا، حەجی لەسەر دەمێنێ، وە دەیشبێ کە تۆ حەجی بۆ بکەی، یا کەسێ تر حەجی بۆ بکا). ئەم پرسیارو وەڵامەیش لەکاتی حەجی ماڵاواییدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥}.

**روونکردنەوە:**

**ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

١. حەج فەرزە.

٢. کاتێ حەج لەسەر کەسێ پێویست بوو، ئەگەر لەبەر هۆیەکی رەوا خۆی نەیدەتوانی حەج بکا، دەبێ وەکیل حەجێ بگرێ، حەجی بۆ بکا، وەکیل حەج دروستە پیاو بێ یا ژن بێ، ئەگەر خۆی نەیکرد کەسوکاری هەڵ دەستن بەهەمان شت.

فەزڵی کوڕی عەباس، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، برای هەقی ئیبنو عەباسە، لەیەك باوك‌و دایکن، کوڕی گەورەی ئیمامی عەباسە، لە غەزای مەککەو غەزای حونەینا لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ رێز لینان لە پاشکۆی خۆیەوە سواری کردبوو، لەکاتی شۆردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەردا، عەلی‌و فەزڵ‌و ئوسامەی کوڕی زەید شۆردیان، هەر ئەوانیش تەرمەکەیان داهێڵایە ناو گۆڕەکەوە، عەلی تەرمەکەی دەشۆردو فەزڵ ئاوەکەی دەکرد بە دەستیدا، فەزڵ پیاوێکی جوانی، قژ جوانی سپیلکەی قۆز بوو، زۆر کەس فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، وەك عەبدوڵڵای برای‌و ئەبو هورەیرەو تەنانەت عەباسی باوکیشی یەك فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ژنی بۆ هێناو، خۆی مارەیەکەیشی دا، یەك کچی لەدوا بەجێ ما، ناوی ئوم کولثووم بوو، شووی کرد بە حەسەنی کوڕی عەلی، لەپاش ئەو شووی کرد بە ئەبو مووسای ئەشعەری،

راجیاییەکی زۆر هەیە لەبارەی مێژووی مەرگیەوە، وا دەردەکەوێ کە ئیبنو عەبباسی برای، ئەم فەرموودەیەی لە فەزڵی برایەوە وەرگرتووە). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥}.

٨٤٥ـ وَعَنْهُ قَالَ: {كَانَ اَلْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) . فَجَاءَتِ اِمْرَأَةٌ مَنْ خَثْعَمَ، فَجعَلَ اَلْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَصْرِفُ وَجْهَ اَلْفَضْلِ إِلَى اَلشِّقِّ اَلْآخَرِ. فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اَللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي اَلْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لَا يَثْبُتُ عَلَى اَلرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: " نَعَمْ " وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ اَلْوَدَاعِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. {تجريدی بوخاری/١٥٧/٢، ژمارە: ٧١٨ = ١٥١٣، ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨ بوخاری. أبوداود: مناسك/١٨٠٩. نسائي. حج/٢٦٣٣. تحفة الأشراف: ٥٦٧٠ پوختەی موسلیم: ٦٤٩ = شيحا ٣٢٣٨ = مسلم ١٣٣٤}: [٨٤٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵڵاوایدا، فەضلی برام لەپاشکۆی پێغەمبەردا سوار بوو بوو، لەوکاتەدا، ژنێ لەهۆزی خەثعەم هات، پرسیاری هەبوو، فەزڵ دەستی کرد بەتەماشاکردنی ژنەکە، ژنەکەیش دەستی کرد بەتەماشاکردنی فەضل، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی نابەڕووی فەزڵەوەو بەرچاوی گرت، هەتا ڕێگەی تەماشاکردنی بگرێ، ژنەکە گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! حەج کەفەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی خۆی، کەوتۆتە سەر باوکم، لەحاڵێکا کەپیرە مێردێکی ئیختیاری وایە، خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، جا ئایا مرۆڤی پەککەوتووی وەها،

---

[٨٤٥] تجريد/٢، ژمارە: ٧١٨ = ١٥١٣ بوخاری. پوختەی موسلیم: ٦٤٩ = شيحا ٣٢٣٨ = مسلم/محمد فؤاد/ ١٣٣٤.

حەجی لەسەر دەمێنێ؟ وەئاشكرایە، ئەگەر حەجی لەسەر دەمێنێ، كەخۆی ناتوانێ حەج بكا، جا ئایا دەبێ كەمن لەباتی خۆی حەجی بۆ بكەم؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ، حەجی لەسەر دەمێنێ، وە دروستە كەتۆ حەجی بۆ بكەی، یان كەسێ تر حەجی بۆ بكا). ئەم پرسیارو وەڵامەیش لەكاتی حەجی ماڵاوایدا بوو). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥} .

**روونكردنەوە:**

١- حەج فەرزە.

٢- كاتێ لەسەر كەسێ پێویست بوو، ئەگەر لەبەر هەر هۆیەكی ڕەوا خۆی نەیدەتوانی حەج بكا، دەبێ وەكیل حەجێ بگرێ، حەجی بۆ بكا، وەكیل حەج دروستە پیاو بێ یان ژن بێ، ئەگەر خۆی نەی كرد هەتا مرد، ئەوا كەسوكاری دروستە بەوە هەڵسن، خۆیان حەجی بۆ بكەن، یان وەكیل حەجی بۆ بگرن.

٣- فەزڵی كوڕی عەبباس، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، برای هەقی ئیبنو عەبباسە، لەیەك باوكو لەیەك دایكن، كوڕی گەورەی ئیمامی عەبباسە، كە مامەی پێغەمبەرە، لەغەزای مەككەو لەغەزای حونەینا، لەخزمەت پێغەمبەر دا بوو، لەحەجی ماڵئاوایدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕێز لێنان لەپاشكۆی خۆیەوە سواری كردبوو، لەكاتی شۆردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەردا، عەلیو فەضلو ئوسامەی كوڕی زەید شۆردیان، هەر ئەوانیش تەرمەكەیان داهێڵایە ناو گۆڕەكەیەوە، عەلی تەرمەكەی دەشۆردو فەضل ئاوەكەی دەكرد بەدەستیدا، فەضل پیاوێكی جوانی، قژجوانی، سپیلكەی قۆز بوو، زۆركەس فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك عەبدوڵڵای برایو ئەبو هورەیرەو

تەنانەت عەباسی باوکیشی، یەك فەرموودەی لە فەزڵەوە گێڕاوەتەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ژنی بۆهێناو خۆی مارەیی پێدا. {بڕوانە: ژمارە: ٦٦٥ ی شەرحی بلوغ المرام} .

یەك کچی لەدوا بەجێماوە، ناوی ئوم کولثوم بوو، شووی کرد بەحەسەنی کوڕی عەلی، لەپاش ئەو شووی کرد بە ئەبو موسای ئەشعەری، ڕاجیایەکی زۆر هەیە لەبارەی مێژووی مەرگیەوە، وا دەردەکەوێ کەئیبنو عەبباسی برای، ئەم فەرموودەیەی لە فەزڵی برایەوە وەرگرتووە. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥} .

## (٧٣) باب فرض الحج مَرَّةً في العُمْرَ
## حەج لە تەمەنا یەك جار فەرزە

٨٤٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَحُجُّوا»، فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ»، ثُمَّ قَالَ: ذَرُونِى مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَىْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَىْءٍ فَدَعُوهُ ». {الحديث: ٣٢٤٤ = ٣٢٣٣ ف.م = فم = فتح الملهم. نسائي. مناسك الحج: ٢٦٤٤. تحفة الأشراف: ٢٦٤٥} : [٨٤٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی بۆماندا، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! خودای گەورە حەجی داناوە لەسەرتان، دەی حەج بکەن). پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا

[٨٤٦] پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٣٩ = شیحا: ٣٢٤٤. بخاری (٩٦) کتاب الاعصام (٢).

هەموو ساڵێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەنگی نەکرد، تا سێ جار پیاوەکە ئەم پرسیارەی کردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بڵێم بەڵێ: ئەوا هەموو ساڵێ حەج فەرز دەبێ لەسەرتان‌و بۆشتان ناکرێ) ئەنجا فەرمووی: (کاتێ من وازم لەئێوە هێنا، ئێوەیش واز لەمن بهێنن‌و کەمن لە شتێکم نەکۆڵییەوە ئێوەیش لێی مەکۆڵنەوە، مەبادا سەربکێشێ بۆ پێچەوانەی مەبەست. چونکە نەتەوەکانی پێش ئێوە، لەبەرئەوە لەناوچوون، چونکە پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکردو زۆر لەدژیان دەوەستان، ئەوەی گوتم بیکەن چەندەی لە تواناتانا هەیە بیکەن، بەڵام ئەوەی کە گوتم مەیکەن توخنی مەکەون!). {ریاض/٣/١٨٦، رقم: ١٣٧٢} + {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٧٩}.

### ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودە پیرۆزەدا یاسایەکی گەورەو گرنگی شەرعی واتیادا، بە هەزاران نموونەی هەیە لە شەرعا، وەك نوێژ کە فەرمان کراوە بەکردنی، بەپێی تەوانا، کاتی‌و ژمارەی‌و ژمارەی ڕکاتەکانی دەگۆڕێ، بۆ نموونە، بۆ نیشتەجێی بێ مەهانە، ئەبێ هەموو ڕۆژێ، لەپێنج کاتی دیاریکراودا حەفدە ڕکات بکات، بەڵام بۆ ڕێبوار، یا بۆ نەخۆش، دەتوانێ لەسێ کاتدا بیکا، یا بە یازدە ڕکات بیکات، وە هەروەها ڕۆژوو، وە هەروەها دەستنوێژ، مەسەلا نەیدەتوانی هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژ بشۆرێ، با چەندیان دەتوانێ با ئەوانە بشۆرێ، هەروەها لەزۆر شتی تردا.

## (٧٤) بابُ سَفَرِ المرْأةِ مَعَ محرم إلى حَجٍ وَغَيْرِهِ
## سەفەری ژن بۆ حەج و بۆ کاری تر، لەگەڵ مرۆڤی خۆییدا دروستە

٨٤٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «لاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ مَعَ ذِى مَحْرَمٍ»: [٨٤٧]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نابێ ژن بچێ بۆ سەفەرێ کە سێ ڕۆژە ڕێ بێ، یا زیاتر بێ، مەگەر خۆیی (مەحرەمی) لەگەڵدا بێ).

٨٤٨- عن أبي سَعِيدٍ - (رَضِي اللهُ عَنْهُ) وَقَدْ غَزَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) ثِنْتَيْ عَشْرَةَ - غَزْوَةً - قَالَ أَرْبَعٌ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَوْ قَالَ يُحَدِّثُهُنَّ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) - فَأَعْجَبْنَنِي وَآنَقْنَنِي « أَنْ لاَ تُسَافِرَ امْرَأَةٌ مَسِيرَةَ يَوْمَيْنِ لَيْسَ مَعَهَا زَوْجُهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ، وَلاَ صَوْمَ يَوْمَيْنِ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ مَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِي، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى ». (الحديث ١٨٦٤): [٨٤٨]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) کە دوازدە غەزای لەخزمەت پێغەمبەردا لەگەڵ دوژمنی ئیسلاما کردبوو، فەرمووی: چوار شتم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی ژنەوتووە، هەرچواریان چوون بەدڵماو زۆر دلگیرن:

**یەکەم:** ژن بەبێ مێردی یا بەبێ کەسێکی خۆیی (محرم) کە لەگەڵیدا بێ نەچێ بۆ سەفەرێ، کە لەدوو ڕۆژە ڕێگە دوور تربێ، کە ماوەی کورتکردنەوەی نوێژە.

---

[٨٤٧] بخاری. مساجد: ١١٩٧ مسلم: ٢٦٦٨، ٣٢٤٨.

[٨٤٨] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥١ = ١٨٦٤ مسلم: ١٣٤٠ = ٣٢٤٨.

**دووەم:** نـەگرتنی رۆژووی ئـەم دوو رۆژە: رۆژی جـەژنی ڕەمـەزانو رۆژووی جەژنی قوربان.

**سـێیەم:** وازهێنـان لەنوێـژکردن لـەپاش کردنـی نوێـژی بـەیانی هـەتا خـۆر دەردەکەوێ.

**چوارەم:** بۆ ئەم سێ مزگەوتە نـەبێ سـەفەر نـاکرێ، بـۆ مەسـجیدول حـەرام لەمەککەو بۆ مزگەوتی پێغەمبـەر لەمەدینـەو بـۆ مەسـجیدی ئەقصا لـەقودس.

(تاج/١/٣٤٩ ف/٢ ز/١١٥) + (فیقهی ئاسان/١/١٩٨ — ١٩٩ ز/٧٠).

## راڤەو شیکردنەوە:

بـۆ تێگەیـشتنی تـەواو لەمەبەسـتی راسـتینەی ئـەم جـۆرە فەرموودەیـە بـە ئیقتیبـاس لەسـەر باسـی (سـفر المـرأة مـع المحـرم) لەکتێبـە ناودارەکـەی دوکتـۆر یوسـف قـەرضـاوی (خـودا سـەربەرزی هـەردوو جیهـانی بفـەرموێ) ئـەم رونکردنەوەیە دەنووسین.

## سەفەرکردنی ژن بەتەنها بەبێ کەسێکی خۆیی

أ- لەصەحیحەین دا حەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: نابـێ ژن بەبێ خۆیی (مەحرەم) بچێت بۆ سەفەر.

ب- دیارە کەبایست (عیللەت)ی ئەم نەهیکردنە لـەو رۆژگـارەدا کـەپڕ لـەدزو جـەردەو پیـاو خـراپ بـووە، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـەرزە، (لەدیـدو بۆچوونـی ئیسلام دا، ناموس‌و گیان‌و سامانی ژنان، زۆر عەزیزو بـەڕێزن، دەبـێ بەهەر نرخێ بێ بپارێزرێن، رێز بۆ ژن وەك نوور وایە بۆ چاو).

دەی لە چەرخێکا کە پیاوی ئازا بـەبێ چەك‌و بەبێ هاوڕێیـەکی دلێـری وەك خۆی نـەتوانێماڵـەو مـاڵ بکـا، چۆن ئـەقڵ دەیگـرێ کە ژنـێ بـەتاقی تـەنیا یا

لەگەڵ پیاوی نەناسدا بـەپێ یـا بەسـواری وشـترێ یـا شـتێ تـر ملـی رێ بگـرێو بکەوێتـە ئـەو دەشـتو دەرو چـۆڵو بیابانـە پـڕ مەترسـیانە، خـۆ ئەگـەر زیـان لـەناموس و سامانیـشی نەکەوتایـە، مـسۆگەر سـەری بەسـەلامەتی دەرنەدەچـوو، خۆ ئەگەر لەسـەر زەنـشتی خـودایش قوتـاری ببوایـە، لەتانـەو بوختـانی خـەڵك رزگاری نەدەبوو، خۆ ئەگەر لـەدزو جـەردەیش دەربـاز ببوایـە، لەدڕنـدەی کێـوی دەرباز نەدەبوو، لـەمارو مێـرو گەزنـدە ئـەمین نـەدەبوو، بـەڵام لـەم سـەردەمەدا بـارودۆخ گـۆڕاوە، سـەفەر بەفڕۆکـەو خۆشـڕۆو شـەمەندەفەر دەکـرێ، ژن لـەماڵ دەردەچـێ هـەتا دەگاتـە جێگـەی مەبەسـت لەگـەڵ کۆمـەڵێ مرۆڤـی رۆشـنبیردا دەڕوا، کە لەسەرو ماڵو ناموسی خـۆی ئـەمین دەبـێ، کـە زیـانی بـۆی نابـێ جـا ئەگەر ئافرەتێکی مەرد، لەباودۆخێکی ئاوادا، سـەفەری دوورو درێـژ بکـا، لـەکوێ بـەر نـەیکردنو قەدەغـەکردنی ئـەم فەرموودەیـە دەکـەوێ؟ کەواتـە ڕاسـتە کەزاناکانی ئوصوول دەفەرموون: بڕیارو حوکم بەبوونو نەبوون لەگەڵ بایستو هۆکەیدا دەسووڕێ، (الحكم يدور مع العلة سلباً وإيجاباً).

ئەمە لـەدێرینیش دا زاناکـان رێگـەی کـاری وایـان داوە، وەك ئـەوە ژن بـەبێ لەگەڵ بوونی مێرد بـچێ بـۆ حـەج، بەمـەرجێ لەگـەڵ چـەند ژنێکـی تـری بـڕوا پێکراودا بچێ، یاخود لەگـەڵ کـاروانێکی ئـەمینا بـڕوا، هـەروەك لـە فـەرموودەدا ئاماژە بۆ ئەوە کـراوە کەلەسـەردەمی حـوکمی ئیـسلامدا دنیـا وا ئـەمینو هـێمن دەبێتەوە، ژنی کەژاوەنشین لەحیرەوەبەبێ هاوڕێتیی مێـردی دەچـێ بـۆ مەککـە بۆ سەردانی کابە، واتە: بەبێ ئەوە کەسێکی خۆیی لەگەڵا بێ.

حەزرەتی عائیشەو چەند کەسێکی تر لە دایکانی موسوڵمانان لـە سـەردەمی عومەردا، لەگەڵ ژنی متمانە پێکراودا، یـا لەگـەڵ کـاروانی ئـەمین دا دەچـون بـۆ حەج، وەك ئەوە لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەفانو عەبـدولڕەحمانی کـوڕی عـەوف

دا دەچوون بۆ سەفەری حەج. (بڕوانە: تاج/٣٦٣/٤ كوردی ج/٣ ص/٢٨٧ عمدة القارئ/١٦ ص/١٣٤ ص/٢٧٣ + فتح الباري الحديث/١٤١٣ وأطرافه: ١٤١٧، ٢٥٩٥، ٦٠٢٣، ٦٥٣٩، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣، ٧٤٤٣، ٧٥١٢).

٨٤٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قال النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ). (الحديث: ١٠٨٨): [٨٤٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوژنەی باوەڕی تەواوی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کەبەبێ کەسێکی خۆیی بچێ بۆسەفەرێ، کەڕۆژەڕێ بێ، یازیاتر دووربێ).

٨٥٠ـ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ وَلا تُسَافِرَنَّ امْرَأَةٌ إِلاَّ وَمَعَهَا مَحْرَمٌ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا وَخَرَجَتْ امْرَأَتِي حَاجَّةً؟ قَالَ: (اذْهَبْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ). (الحديث ٣٠٠٦، أطرافُهُ في: ١٩٦٢، ٣٠٠٦، ٣٠٦١، ٥٢٣٣): [٨٥٠]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم زنەوت دەیفەرموو: (نابێ پیاوو ژنی بیانی بەتەنها، دوو بەدوو، لەشوێنێکا کۆببنەوە، ئافرەتیش نابێ بچێ بۆ سەفەری دوور مەگەر خۆیی (مەحرەم) ی لەگەڵدا بێ). پیاوێ هەستا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم بۆ فیسارە غەزا ناونوس کراومو ژنەکەشم چووە بۆ حەج؟! فەرمووی: (دەی خۆشت بڕۆ لەگەڵ ژنەکەتا

---

[٨٤٩] تجريد/١، ژمارە: ٥٤٩ = ١٠٨٨ مسلم: ١٣٣٩ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٤٦ = ٣٢٤٣.

[٨٥٠] تجريد/٣، ژمارە: ١٣٣١ = ٣٠٠٦ مسلم: ٢١١٥ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٤٧ = ٣٢٥٩.

بۆ حەج) (بڕوانە: تەجرید ژمارە: ٨٥١ بەرگی دووەم باسی سەفەرکردنی ژن بەتەنها بەبێ کەسێکی خۆیی..).

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (١٢٣١)ی پوختەی بوخاری بوو، کە پێشی دەگوترێ: تەجریدی بوخاری، ئەمەیش لەدواوە گێڕانەوەی ژمارە (٦٤٧)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمە، کە پێشی دەگوترێ: پوختەی موسلیم:

عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَخْطُبُ يَقُولُ: « لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ، وَلاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً، وَإِنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: « انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ ». {الحديث: ٣٢٥٩ = صحيح مسلم بشَرْح الإمَامِ النَّوَوِيِّ، تخريج الشيخ خليل مَأْمُون شيحا = ٣٢٤٨ فىم. تجريد/٣/٣٥٥، رقم: ١٢٣١ = ٣٠٠٦، ١٩٦٢، ٣٠٦١، ٥٢٣٣. تحفة الأشراف: ٦٥١٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست وتاری دەدا، دەیفەرموو: (نابێ پیاوو ژنی بیانی بەتەنها، دوو بەدوو، لەشوێنێکا کۆببنەوە، مەگەر ژنەکە خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵدا بێ، ئافرەتیش نابێ بچێ بۆ سەفەری دوور مەگەر خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵدا بێ). پیاوێ هەستا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم بۆ ئەو غەزایە ناونووس کراوم‌و ژنەکەشم چووە بۆ حەج؟! فەرمووی: (دەی خۆشت بڕۆ لەگەڵ ژنەکەتا بۆ حەج). {بڕوانە: تەجرید/٢، ژمارە: ٨٥١ بە کوردی}.

ئەمەیش پوختەیەکی جوانی بابەتی خۆیی‌و مەحرەمبوونە، لە شەرحی بلوغ المرامەوە ڕاگوێزی دەکەم بە پشتی خودا:

وَعَنْهُ: قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَخْطُبُ يَقُولُ: {" لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِاِمْرَأَةٍ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ، وَلَا تُسَافِرُ اَلْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ " فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، إِنَّ اِمْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً، وَإِنِّي اِكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: " اِنْطَلِقْ، فَحُجَّ مَعَ اِمْرَأَتِكَ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/٢/٢٤٦، ژمارە: ٨٥١ = ١٨٦٤ بوخاری + بوخاری: ١٨٦٢، ٣٠٠٦، ٣٠٦١، ٥٢٣٣، پوختەی موسلیم: ٦٤٧ = شیحا ٣٢٥٩ = صحيح مسلم بشرح الإمام النووي، تخريج وترقيم وتحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا = صحيح مسلم ١٣٤١ + تجریدی بوخاری/٣/٣٥٥، ژمارە: ١٢٣١ = ٣٠٠٦، ١٩٦٢، ٣٠٦١، ٥٢٣٣ بوخاری. تحفة الأشراف: ٦٥١٤}. {بڕوانە: پوختەی موسلیم: ٦٤٥}.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست وتاری دەدا، دەیفەرموو: (نابێ پیاوو ژنی بیانی بەتەنها، دوو بەدوو، لەشوێنێکا کۆببنەوە، مەگەر ژنەکە خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵدا بێ، ئافرەتیش نابێ بچێ بۆ سەفەرێ دوور مەگەر خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵدا بێ).

پیاوێ هەستا گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! من خۆم بۆ ئەو غەزایە ناونووس کراوم‌و ژنەکەشم چووە بۆ حەج؟!

فەرمووی: (دەی خۆشت بڕۆ لەگەڵ ژنەکەتا بۆ حەج!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٧ + پوختەی موسلیم ٦٤٥ = ٣٢٥٧ شیحا + ژمارە: ٦٤٦}. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٥١}.

**ڕوونکردنەوە:**

بەهۆی خۆیی‌و مەحرەمییەوە، لەنێوانی دوو کەسدا، ئەم بڕیارە شەرعیانە دەچەسپێ، ئەگەر یەکێکیان نێرو ئەویتریان مێ بوو:

١- هاوسەری لەنێوانیانا قەدەغەیەو نادروستەو حەرامە.

٢- دەسنوێژیان لەیەکتری ناشکێ.

٣- پێکەوە ژیان‌و دانیشتن‌و هاموشۆو سەفەریان بەیەکەوە دروستەو بێ شەرعی نییە، وەك: دایك‌و کوڕ، یان خوشك‌و برا، هۆی دروستبوونی خۆیی‌و مەحرەمی لەنێوانی دوو کەسدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سێ هۆیە:

آ- خزمایەتی.

ب- ژن‌و ژنخوازیی (موصاهەرە).

ج- شیرخواردن.

**یەکەم:** بوون بەخۆیی‌و حەرام بوون لەیەکتری: بەهۆی خزمایەتییەوە:

پیاوی موسوڵمان، بەهۆی خزمایەتییەوە، ئەم چوار جۆرە ژنەی لێ قەدەغە دەبێ‌و ئەو ژن‌و پیاوە دەبن بەخۆیی‌و مەحرەمی یەکتری‌و دەسنوێژیان لەیەکتری ناشکێ‌و مارەو نیکاحیان لەیەکتری دروست نییەو دانیشتن‌و گوزەران‌و سەفەریان بەدوو بەدوو دروستە:

١- هەر ژنێ کەبنەچە بێ بۆ مرۆڤ (بنەچە واتە: ئەصڵ) با بەرەو ژووریش بڕوا، وەك:

آ- دایك.

ب- دایکی دایك بابەرەو ژووریش بڕوا.

ج- دایکی باوك بابەرەو ژووریش بڕوات.

د- دایکی باپیره بابەرەو ژووریش بڕوات، بۆ ئەم مەبەستە باپیرەی باوکیو باپیرەی دایکی جیاوازی نییە.

**کورتو پوخت:** دایکو نەنك خۆیین بۆ منالو منالی منالیان، نەنك دوور بێ یان نزیك، نەنکی باوکی بێ، یان نەنکی دایکی بێ، جیاوازی نییە، هەروا باپیرەی باوکی بێ، یادایکی جیاوازی نییە.

٢- هەر ژنێ کە وەچە بێ بۆ پیاو: با بەرەو خواریش بڕوات، دەبێ بەمەحرەمو خۆیی بۆ ئەو پیاوە. (وەچە واتە: فەرع) وەك:

آ- کچو منالی کچ بابەرەو خواریش بڕوات، وەك کچی کچو کچی کوڕی کچو... تاد.

ب- کچی کوڕو کچی منالی کوڕ، با بەرەو خواریش بڕوات.

**(کورتو پوخت):**

(بنەچەو وەچە واتە: ئەصلو فەرع) نزیك بن وەك دایكو باوكو كچو كوڕی خۆت، یا دووربن، وەك: نەنكو باپیرەی خۆتو نەنكو باپیرەی بنەچەتو منالی منالتو منالی وەچەت، كورتو پوخت بنەچەو وەچەی مرۆڤ مەحرەمە، بنەچەی نزیك باوكە یان دایكە، بنەچەی دوور، لەدایكەوە بێ یان لەباوكەوە بێ، باپیرە یان نەنكە، وەچەی نزیك كوڕو كچە، وەچەی دوور كوڕەزایە، یان كچەزایە. تەنانەت لەلای جەماوەری زانایان (وەچەیێ كە لەئاوی داوێپیسی پەیدا بووبێ، واتە: زۆڵ بێ، هەم ئەو وەچەیە خۆیو هەم وەچەی ئەو وەچەیە، دادەنرێن بەخۆییو بەمەحرەم، بۆ باوكو دایكیانو بۆ باپیرەو نەنكیان!).

٣- هەر مێینەیەك كە وەچە بێ بۆ دایكت، یان وەچە بێ بۆ باوكت، یان وەچە بێ بۆ باوكو دایكت، مەحرەمەو خۆییە بەتۆ.

وەچەی دایکت، خوشکی دایکیتە، یاخوشکەزای دایکیتە، با بەرەو خواریش بڕوات، وەچەی باوکت خوشکی باوکیتە یان خوشکەزای باوکیتە، بابەرەو خواریش بڕوات، وەچەی باوكو دایکت خوشکی هەقتە، لەباوكو دایکتەوە، یان خوشکەزای هەقتە لەباوكو دایکەوە، بابەرەو خواریش بڕوات.

لەسەر ڕای جەماوەری زانایان خوشکی زۆڵو برازای زۆڵ کە کچ بێو خوشکەزای زۆڵو برازای زۆڵ کە کچ بێ مەحرەمەو خۆییە.

وەك ئەوە: باوکی زەید، یان برای زەید، یان خوشکی زەید، یان کوڕی زەید، کچێکی زۆڵی هەبێ، ئەوە لەشێوەی یەکەما خوشکی زەیدە، لەشێوەی دووەما برازای زەیدەو زەید مامیەتی، لەشێوەی سێیەما خوشکەزای زەیدو زەید خاڵیەتی، لەشێوەی چوارەما کوڕەزای زەیدەو زەید باپیرەیەتی.

٤- وەچەی باپیرو وەچەی نەنك، کە لەیەك پلەدا بن:

کەبریتین لەپووری باوکیو لە پووری دایکی مرۆڤ ئیتر چی خوشکی هەقی باوکت، یان خوشکی هەقی دایکت بێ، یان خوشکی باوکی باوکت، یان خوشکی باوکی دایکت بێ، وە چی خوشکی دایکی باوکت، یان خوشکی دایکیی دایکت بێ. هەروەها پووری بنەچەت، چی لەتەرەفی باوکەوە بێ، وەچی لەتەرەفی دایکەوە بێ وەك:

آ- پووری باوکت، یان پووری باپیرت، بابەرەو ژووریش بڕوات، پووری تۆیشەو مەحرەمی شەرعییە.

ب- پووری دایکت، یان پووری نەنکت، بابەرەو ژووریش بڕوات، نەنکەکە لەلای باوکەوە بێ، یان لەلای دایکەوە بێ، پووری تۆیشەو خۆییەو مەحرەمە بەتۆ.

**دووەم:** مەحرەمی شەرعی بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە، کە دەسنوێژیان لەیەکتری ناشکێو مارەیان لەیەکتری نایەتو گوزەرانو پێکەوە ژیانو سەفەرو دانیشتنیان پێکەوە دروستە، ئەم چوار جۆرە کەسەن:

١- ژنی باوك، یاژنی باپیرە، با بەرەو ژوووریش بڕوات، چی باپیرە لەلایەنی باوکەوە بێ، وەچی لەلایەنی دایکەوە بێ جیاوازی نییە. باوەژنی خۆت، یان باوەژنی باوکت، یان باووەژنی باپیرەت، بۆ تۆ مەحرەمەو لەشوێنی دایکتە لەمەحرەمییەتدا.

٢- بنەچەی ژن، کەبریتییە لەدایکی ژنەکەتو لەدایکی دایکی ژنەکەتو لەدایکی باوکیو لەدایکی باپیرەی.

## کورتو پوخت:

دایکی ژنەکەتو هەموو نەنکێکی ژنەکەت، باوکی بێ، یان دایکی، نزیك بێ، یان دوور، خەسووتەو دەسنوێژت لێی ناشکێو مەحرەمە بەتۆ.

٣- وەچەی ژنی تۆ، مەحرەمە بەتۆ، کەبریتین لەکچی ژنو لەکچی کچی ژنو لەکچی کوڕی ژن، بابەرەو خواریش بڕوات، تۆ دەبیت بە باوە پیارەو زڕباب بۆ ئەوانو ئەوانیش دەبن بەزڕکچو هەنەزا بۆ تۆ، هەتا هەتایە دەبن بەمەحرەمی یەکتری.

٤- ژنی وەچەی تۆ، کەبریتین لەژنی کوڕو لەژنی کوڕی کوڕو لەژنی کوڕی کچی تۆ، با دووریش بکەونەوە، ئەمانە هەموویان دادەنرێن بەبووکی تۆو تۆیش دادەنرێیت بە خەزووری ئەوان، لەمەحرەمییەتدا، لەجێگەی باوکیانیتو ئەوان لەحوکمی کچی تۆدان.

**سێیەم:** خۆییو مەحرەمییەت، بەهۆی شیرو شیرخواردنەوە:



**لەتەجریدی بوخاریەوە، لەبەرگی پێنجەمەوە، لەکۆتایی ژمارە (١٧٥٧)وە، ئەم زانیاریو بڕیارە شەرعیانە ڕاگوێز دەکەین:**

**یەکەم:** پوختەیێ لەبڕیارەکانی شیرو مەمکخواردن:

١- هەردوو کەسێ شیرخواردنی شەرعی چەسپا لەنێوانیاندا، هەتاهەتایە، لەیەکتری حەرام دەبن، مارەیان لەیەکتری نایەت، نەزەرو تەماشایان بۆ یەکتری حەرام نییە، خەڵوەتو دانیشتنو پێکەوەژیانیان دوو بەدوو لەگەڵ یەکتردا حەرام نییە، سەفەرییان پێکەوە دوو بەدوو دروستە، دروستە لەگەڵ یەکتری بچن بۆ حەج، دەستنوێژیان لەیەکتری ناشکێ، بەشێوەیەکی گشتی، لەبابەتی خواستنو شووپێکردنو تەماشاکردنو دوو بەدوو پێکەوەبوونو سەفەرکردنو دەستنوێژو تەوقەکردنو ماچکردنو تەوابیعی نیکاحەوە، دادەنرێن بەدوو خزمی خۆییو مەحرەم، بەبێ زیادوکەم، لەجێگەی خوشكو برانو یان لەشوێنی دایكو منداڵن، وەچی بۆ ئەوان دروست نییە، بۆ ئەمانیش دروست نییە، وەچی بۆ ئەوان لەناو خۆیانا دروستە، کە کەسی نەسەبی یەکتر ین، بۆ ئەمانیش دروستە کە کەسی شیری یەکترین، لەرووی مەحرەمییەتەوە.

٢- تەنیا لەم چەند بڕیارەدا، جیاوازی هەیە لەنێوانی کەسی خوێنی (نەسەبی)و کەسی شیریدا:

آ- کەلەپوورو میرات لەیەکتری وەرناگرن.

ب- ژێوارو نەفەقەیان لەسەر یەکتری نییە.

ج- ئەگەر کەسی شیریی، خوشکی شیری خۆی، یان دایکی شیری خۆی، یان باوکی شیری خۆی، یان هەرکەسێکی تری شیری خۆی، بووبە کۆیلەو سامانی، بەوە ئازاد نابێ، بەپێچەوانەوە باوكو دایكو براو خوشكو کەسی نەسەبی، کە لەکاتی وادا یەکسەر ئازاد دەبن.

د- یان شایەتی برای شیری بۆ برای شیری، یان بۆ دایكی شیری قەیدی نییەو وەردەگیرێ.

هـ- یان ئەگەر باوكی شیری، یان باپیرەی شیری، یان دایكی شیری، كەسێكی شیری خۆی كوشت، دەكوژرێتەوە لەباتی ئەو كوژراوە، بەپێچەوانەی منالّو باوكو دایكی خوێنی، واتە: نەسەبی، چونكە ئەوان لەجیاتی منالّی خۆیان ناكوژرێنەوە.

و- یان ئەگەر باوكی شیری كەسێ، یان باپیرەی شیری كەسێ، یان دایكی شیری كەسێ، كەسێكی تری كوشت ئەم كەسە شیرییەی بەعاقلە دانانرێ.

واتە: بەشێ لەخوێنی كوژراوەكە ناكەوێتە ئەستۆی ئەو.

ز- هەروەها براو باوكو مامی شیریو ئەمانە، لەكاتی مارەبڕینو لەكاتی حەددو تۆڵە سەندنو قەصاصو بوختانو قەزفو تەعزیرو ئەمانەدا، دانانرێن بەهەقدارو وەلی ژنە شیرخۆرەكەیان، یان براو باوكو دایكو خوشكو كچە شیرییەكەیان.

٣- بەشێوەیەكی گشتی سیلەی رەحمیان سوننەتە، بەسەركردنەوەو سەرلێدانو دیاری بردن بۆیانو چاكەكردن لەگەڵیاناو باشبوون بۆیان سوننەتە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر زۆر رێزی ئوم ئەیمەنی دەگرت، كەدایكی شیری پێغەمبەر بوو.

٤- شیرخواردن خۆییو مەحرەمییەت لەنێوان شیرەخۆرو ئەم كەسانەی تردا، لەسەر ئەم شێوەیە دادەمەزرێنێ.

١- ژنە شیردەرەكە مەحرەمییەتی، چونكە دایكی شیرییەتی.

٢- مێردەكەی، چونكە خاوەنی شیرەكەیەو ئەو ژنەكەی متوربە كردووەو باوكی شیرییەتی.

٣- ئاغای ژنەکە، ئەگەر ژنەکە کەنیزەك و جاریە بوو، مێردی نەبوو، ئوم وەلەد بوو بۆ خاوەنەکەی چونکە باوکی شیریيەتی.

٤- دایکی ژنە شیردەرەکە، چونکە نەنکی شیریيەتی، بابەرەو ژووریش بڕوات، وەك دایکی نەنکی ژنەشیردەرەکە.

٥- خوشکی ژنە شیردەرەکە، چونکە پووریەتی.

٦- کچی شیردەرەکە، چونکە خوشکی شیریيەتی.

٧- کچی کچی شیردەرەکە، چونکە خوشکەزایەتی، بابەرەو خوواریش بڕوات.

٨- کچی پیاوی خاوەن شیرەکە، بالەژنێکی تریش بێ، چونکە خوشکی شیریيەتی.

٩- کچی کچی خاوەن شیرەکە، کەمێردی ژنە شیردەرەکەیە، یان خاوەنییەتی، ئەگەر شیردەرەکە کۆیلەو کەنیزەك بوو، چونکە خوشکەزای شیریيەتی، بابەرەو خواریش بڕوات.

١٠- دایکی خاوەن شیرەکە، چونکە نەنکی شیریيەتی، بابەرەو ژووریش بڕوات.

١١- خوشکی خاوەن شیرەکە، چونکە پووری شیریيەتی، لەباوکی شیرییەوە.

١٢- برای خاوەن شیرەکە، چونکە مامی شیریيەتی.

١٣- کوڕی خاوەن شیرەکە، چونکە برای شیریيەتی.

١٤- باوك و باپیرەی خاوەن شیرەکە، چونکە باپیرەی شیریيەتی، بابەرەو ژووریش بڕوات.

١٥- کوڕی شیردەرەکە، چونکە برای شیریيەتی.

١٦- برای ژنە شیردەرەکە، چونکە خاڵی شیریيەتی.

١٧- كـورِو كـچى كـورِى شـيردەرەكە، چـونكە بـرازا، يـان خوشـكەزايەتى لەشيرەوە. (نەقڵ لە تجريدى بوخارييەوە تەواو).

١٨- جەماوەرى زانايان دەفـەرموون: (هەركەسىَ بـەهۆى ژنو ژنخوازييـەوە ببـىَ بەمـەحرەم بـۆ كەسـىَ، دەبـىَ بەمـەحرەم بـۆ ئـەو كەسـەيش، كـە بـەهۆى شيرخواردنەوە بووە بەمەحرەم بۆ ئەو كەسى دووەمە). لەژناندا ئەمانەن:

١- دايكى شيرى ژنى تۆ، هەروا دايكى دايكى شيرى ژنى تۆ، بابەرەو ژووريش برِوات، دەبن بەخەسوو بۆ تۆو دەبن بەمەحرەمەت.

٢- كچى شيرى ژنى تۆو كچى كچى شيرى ژنى تۆ، بابەرەو خـواريش بـرِوات، دەبن بەمەحرەم بۆتۆ، چونكە لەجێگەى كچتە لەمەحرەميدا.

٣- ژنـى بـاوكى شـيرىو ژنـى بـاپيرەى شـيرى، بابـەرەو ژووريـش بـرِوات، مەحرەمە بۆتۆو لەجێگەى دايكو نەنكتە.

٤- ژنى كورِى شيرىو ژنى كورِى كورِى شيرى تۆ، بابـەرەو خـواريش بـرِوات، دەبـن بـەبووك بۆتـۆو لەمەحرەميـدا، لەجێگـەى كـچى نەسـەبى تۆيـە. {برِوانـە: پوختەى موسليم ژمارە: ٨٦٩ = ٣٧٣١ شيحا}.

١٩- مايەوە سەر ئەوە كەروونى بكەينەوە، كەژنو مێرد نابىَ مـەحرەم بـن، دەنـا مارەيـان لەيـەكترى نايـەت. بـەلاَم سـەفەرو خـەلْوەو ژيـانو گوزەرانيـان بەيەكەوە دروستەو كارێكى رەواى شەرعييە.

## (٧٦) باب ما يَقُولُ إذَا قَفَلَ مِنْ سَفَرِ الحَجِ وَغَيْرِهِ
## كاتىَ لە حەج دەگەرِيتەوە، يا لە كارى تر دەگەرِيتەوە چى بلێت

٨٥١- عَنْ عَبْدِالله بْنِ عُمَرَ رَضِي اللّهُ عَنْهُ: أنَ رسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ كَانَ إذا قَفلَ مِنْ غزْوٍ أوْ حـجٍ أَوْ عَمْـرَةٍ يكَبّـرُ عَلـى كُـلِ شَـرَفٍ مِـنَ الأرضِ ثَـلاثَ تكبيرات، ثم يَقولُ: (لا إله إلا الله وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُـوَ عَلـى

شيءٍ قَديرٌ آيبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ ساجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِـدُونَ، صَـدَقَ الله وَعْـدَهُ، وَنَـصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزابَ وَحْـدَهُ). (الحـديث ١٧٩٧ – أطرافـه فـي: ٢٩٩٥، ٣٠٨٤، ٤١١٦، ٦٣٨٥): [٨٥١]

عەبـدوڵلاى كـوڕى عومـەر -ڕەزاى خوايـان لێ بـێ- فـەرمووى: پێغەمبـەر -دروودى خواى لەسەر بێ- كاتێ لەغەزا، يا لە حـەج، يـا لـە عـەمرە، دەگەڕايـەوە، لـەڕێ لەسـەر هـەموو بەرزاييـەك‌و قوتكـە و قـۆقزايى و تەپۆڵكـەيێ كـە سـەردەكەوتە سـەرى، بـەدەنگێكى بيـسراو، لەپێـشا سێ جـار ئـەڵلاهو ئەكبـەرى دەكرد، ئەوجا دەيفـەرموو: (لا إله إلا اله وحده لاشريك له، لـه الملـكُ ولَـهُ الحَمْـدُ وَهُوَ عَلى كلِ شيءٍ قَديرُ آيبون تائِبُونَ عابدونَ سـاجدون لربنـا حامـدون، صَـدَقَ الله وَعْدَهُ وَنـصَرَ عَبْـدَهُ وَهَـزَمَ الأَحْـزابَ وَحـدَهُ). (ريـاض/٧٩٦/٣ ف/٣ - زنجـيرە: ١٧١، ژمـارە: ٩٧٧، چ/٣) + (تـاج/٢٢٠/٩ ف/٤ ز/٧٣ - تـاج/٥، زنجـيرە: ٧٣، ژمـارە: ٥٠٨٩، چ/٤).

## (٧٧) باب التعريس بذي الحليفة والصلاة بها إذا صَدَرَ مِنَ الحَجِ أو العَمْرَةِ
## وچانگرتن‌و نوێژكردن لە زولحولەيفە، كاتێ لە حەج، يا لە عەمرە دەگەڕێتەوە

٨٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَـرَ (رضـى الله عنهمـا): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِى بِذِى الْحُلَيْفَةِ فَصَلَّى بِهَا. قَالَ: وَكَـانَ ابْـنُ عُمَـرَ يَفْعَـلُ ذَلِكَ. {الحديث: ٣٢٦٩ = ٣٢٥٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٣٤ = ١٥٣٢} : [٨٥٢]

عەبدوڵلاى كوڕى عومەر (ڕەزاى خودايان لـێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كاتێ گەڕايەوە لەحەجى ماڵاوايى، لـە زيخەڵانەكـەى

[٨٥١] تجريد/٢، ژمارە: ٨٢٨ = ١٧٩٧ بخارى پوختەى موسليم/٢، ژمارە: ٧٦٢ = ٣٢٦٥ شيحا.

[٨٥٢] تجريد/٢، ژمارە: ٧٣٤ = ١٥٣٢ پوختەى موسليم/٢، ژمارە: ٧٦٣ = ٣٢٦٩ شيحا.

وا لـه زولحولەیفـه، كـه نـاوداره بـه (بَطْحَـاءِ مُبَارَكَـةٍ = زیخـەڵانی فـەڕدار) لـەوێ وشترەكەی یـیخ داو وچانێكی گـرتو شـەو لـەوێ مایـەوە هـەتا بـەیانیو نوێـژی بەیانی لەوێ كرد، ئەوجا كەوتەڕێ، بۆ ماڵەوە، بۆ مەدینە، ئەمەی بۆیـە دەكـرد، هەتا لەشەوا لەناكاوا نەكا بەماڵاو بەو شەوە ماڵو منالْ رانەچەنێنێ.

نافیع دەیفەرموو: ئیبنو عومەر خۆشی هەمان شتی دەكرد.

**روونكردنەوە:**

١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی ئیحرام دابەستنیشا هـەمان شتی دەكرد، لەم بەطحایە دەمایەوەو نوێژی لێ دەكـرد بڕوانـه: ئـەم ژمارانـه لـه پوختــەی موسـلیم: ٦٥١، ٦٥٢، ٦٥٨، ٦٦١. جـا دروسـته كـه مەبەسـت هـەم كـاتی چوونو هەم كاتی گەڕانەوەبێ لەسەفەر.

٢- زول حولەیفه، ئێستا ناوی بیری عەلییه، لـەنێوانی مەدینـەو مەككەدایـه، له مەدینەوە نزیكەی پێنج میل دووره، كه نزیكەی بیست هەزار گەزە بە گـەزی ئاسنی ئـەمڕۆ، بـەڵام لـه مەككەوە زۆر دووره (١٩٨) سـەدو نـەوەدو هەشـت میـل دووره، مزگەوتێكی لێیه ناسراوە بە (مسجد الـشجرة). بیرێكـی لێیـه نـاوی بـیری عەلییـه، بـەڵام ئـەم عەلییـه عـەلی كوڕی ئـەبو طـالیب نییـه. {بڕوانـه: تـاج/٢، زنجیره: ٨٧، ژماره: ١٥١٦، ١٥١٨}.

٨٥٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أُتِـيَ وَهُوَ فِي مُعَرَّسِهِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ فِي بَطْنِ الْـوَادِي، فَقِيـلَ: إِنَّـكَ بِبَطْحَـاءَ مُبَارَكَـةٍ. قَـالَ مُوسَى: وَقَدْ أَنَاخَ بِنَا سَالِمٌ بِالْمُنَاخِ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِي كَانَ عَبْدُ اللَّـهِ يُنِـيخُ بِـهِ يَتَحَـرَّى مُعَرَّسَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ أَسْفَلُ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِبَطْنِ الْـوَادِي،

بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ وَسَطًا مِنْ ذَلِكَ. {الحديث: ٣٢٧٣ = ٣٢٦٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٣٧ = ١٥٣٥. أبو داود. مناسك: ٢٠٤٤. نسائي. حج: ٢٦٦٠} : [٨٥٣]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە موعەڕڕەس، لە زولحولەیفە، لەناو شیوی عەقیقا، لە خەوندا، پێی گوترا: تۆ وایت لەناو شیوێکی زیخەڵاناوی پیرۆزدا).

مووسای کوڕی عوقبە، کە ئەم فەرموودەیە لە سالمەوە دەگێڕێتەوە، کە سالمیش لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری باوکیەوە دەگێڕێتەوە، ئەم مووسایە فەرمووی: سالم لەو هەوارەدا وچانی پێمان دەگرت، کەوا لەلای ئەو مزگەوتەدا، کە عەبدوڵڵای باوکی لەوێ وچانی دەگرت، کە ئەو مزگەوتەی ئەو سەردەمە هەبوو، لەناو شیوەکەدا بوو، کە پێی دەگوترێ شیوی عەقیق، جێگە هەوارەکە دەکەوتە نێوانی ئەو مزگەوتەو نێوانی ڕێگەکە لەبەری قیبلەوە، لەناوەڕاستی ئەم دوانەدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ١٥٣٤}.

## ڕوونکردنەوە:

موعەررەس ئەو هەوارگەیە، کە پێغەمبەر خۆی لەوێ دابەزیوە بۆ وچان، چوار میل لە مەدینەوە دوورە، گوتەی هەرە دروست ئەوەیە، کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەهەردوو سەرەوە، کە چووە بۆ مەککەو کە لە مەککە گەڕاوەتەوە، لەو هەوارگەیە وچانی گرتووە.

---

[٨٥٣] تجرید/٢، ژمارە: ٧٣٧ = ١٥٣٥ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٦٥ - ٣٢٧٣.

## (٧٨) باب لا يحج البيتَ مُشْرِكٌ وَلا يَطوفُ بالبَيْتِ عُرْيانٌ وَبَيانُ يَوْمِ الحَجِ الأَكْبَرِ
## حەج بۆ ناموسوڵمان نابێ، ڕووتیش نابێ تەوافی خانەی خودا بکا، باسی ڕۆژی حەجی ئەکبەر

٨٥٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه ) قَالَ: بَعَثَنِى أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ فِى الْحَجَّةِ الَّتِى أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ فِى رَهْطٍ يُؤَذِّنُونَ فِى النَّاسِ يَوْمَ النَّحْرِ: لاَ يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وكَانَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: يَوْمُ النَّحْرِ يَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ مِنْ أَجْلِ حَدِيثِ أَبِى هُرَيْرَةَ. {الحديث: ٣٢٧٤ = ٣٢٦٣ فم = فتح الملهم. تجريد البخارى/١/٢٤٦، رقم: ٢٣٤ = ٣٦٩، ١٦٢٢، ٣١٧٧، ٤٣٦٣، ٤٦٥٥، ٤٦٥٦، ٤٦٥٧ فتح البارى. أبو داود. مناسك: ١٩٤٦. نسائى. حج: ٢٩٥٧. تحفة الأشراف: ٦٦٢٤} : [٨٥٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەو حەجەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کردبوو بەسەرداری حەج، کە بەر لەحەجیماڵئاوایی بوو، لەو حەجەدا ئەبوبەکر منی لەگەڵ دەستەیەکی تردا نارد، ڕۆژی جەژن ئەم جاڕەمان دا: (ئیتر لەمساڵ بەدواوە بت پەرستو هاوبەش پەیداکەر نەیەن بۆ حەج، وە کەسیش نابێ بە ڕووتی تەوافی بەیت بکا). (تاج/٢، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ١٥٥١).

ئیبنو شیهاب (واتە: ئیمامی زوهری) دەفەرموێ: لەبەر ئەم فەرموودەیەی ئەبو هورەیرە، حەمیدی کوڕی عەبدوڕەحمان، کە ئەم فەرموودەیەی بۆ من گێڕاوەتەوە دەیفەرموو: ڕۆژی جەژن، کە یەکەم ڕۆژی هەدیو قوربانی سەربڕینە، ڕۆژی حەجی ئەکبەرە.

[٨٥٤] تجرید/١، ژمارە: ٢٣٤ - ٣٦٩ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٦٤٢ - ٣٢٧٤ شیحا.

**ڕوونکردنەوە:**

**١. بۆ ژیینامەی زوهری بڕوانە فەرموودەی ژمارە (٢٠٢) لە موختەصەری صەحیحی موسلیم.**

**٢. مەبەست لەرۆژی حەجی ئەکبەر چییەو واتای چییە؟ بەدوو واتا، واتاکراوە،**

**یەکەم: بەواتای رۆژە گەورەکەی حەج، لەسەر ئەم واتایە، ئەم چەند رایە هەیە:**

**١. مەبەست یەکەم رۆژی جەژنە، کە یەکەم رۆژی قوربانی سەربڕینو هەدی (دیاری) بەیت سەربڕینە، ئەم فەرمایشتە بەهێزە، لەسەر ئەم فەرمایشتە رۆژە بچکۆلەکەی حەج، رۆژی عەرەفەیە.**

**٢. مەبەست رۆژی عەرەفەیە، کە رۆژی نۆی مانگە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (الحَجُّ عَرَفَةُ = حەج برێتییە لە رۆژی عەرەفە).**

**٣. مەبەست هەموو رۆژەکانی حەجە.**

**دووەم: بەواتای حەجی گەورەترو حەجی هەرە گەورە، لەسەر ئەم واتایەیش ئەم چەند فەرمایشتە هەیە:**

**١. مەبەست لە (يَوْم الحج الأكبر) حەجی ئاساییە، مەبەست لە (الحج الأصغر)یش عەمرەیە.**

**٢. حەجی ئەکبەر ئەو حەجەیە کە لەسەر شێوەی قیران بکرێ، حەجی ئەصغەریش حەجی ئیفرادە.**

**٣. هەندێ دەفەرموون: (حەجی گەورەتر ئەو حەجەیە کە پێغەمبەر کردی).**

هەندێ تر دەفەرموون: ئەو حەجەیە کە ڕۆژی عەرەفەکەی ڕێکەوتی ڕۆژی هەینی بکا. ڕای تریش هەیە.

ئەمەیش لەدواوە گێڕانەوەی ژمارە (٢٣٤)ی تەجریدی بوخارییە، زیادە سوودی واتیادا، لەبەرئەوە دەینووسین:

عَنْ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ رضي قالَ: (أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ فِي تِلْكَ الْحَجَّةِ فِي مُؤَذِّنِينَ يَوْمَ النَّحْرِ نُؤَذِّنُ بِمِنًى أَنْ لَا يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ قَالَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ثُمَّ أَرْدَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيًّا فَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِّنَ بِبَرَاءَةٌ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَأَذَّنَ مَعَنَا عَلِيٌّ فِي أَهْلِ مِنًى يَوْمَ النَّحْرِ لَا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ). (الحديث ٣٦٩ أطرافه في: ١٦٢٢، ٣١٧٧، ٤٣٦٣، ٤٦٥٥، ٤٦٥٦، ٤٦٥٧).

حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەوحەجەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کردبوو بەسەرداری حەج، کەبەر لەحەجیماڵئاوایی بوو، لەو حەجەدا ئەبوبەکر منی لەگەڵ دەستەیێ جاڕدەری تردا نارد، ڕۆژی جەژن دەستمان کرد بەجاڕدان: ئیتر لەم ساڵ بەدواوە بتپەرستو هاوبەشپەیداکەر نەیەن بۆ حەج، وەکەسیش نابێ بەرووتی تەواف بەیت بکا. حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: پاشتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلیش دەنێرێ، وەفەرمانی پێ دەکا کە بانگەواز هەڵ دا بەخوێندنەوەی ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی بەرائەت. ئەبوهورەیرە فەرموویەتی: لەڕۆژی جەژندا عەلی لەگەڵ ئێمەدا لەناو خەڵکی مینادا ئەم بانگەوازەمان پەخشەوە کرد: لەم ساڵ بەدواوە فرەخوا (مشرك) نەیێ بۆ حەج،

وەمرۆڤی رووتیش تەواف خانەی خودا نەکا.(ب/٢/١٨٧/٢+ب/٦/١٩٩/٤/٥ = تاج-٢ ز-٩٦ ژ-١٥٥١ + تاج-٤ ز-١٠ ژ-٣٨٩٤).

لەتاجول ئوصولا، لەتەفسیری سورەتی بەرائەتدا، فەرموودەی پێنجەم دەفەرموێ: لەعەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیارکرا: لەو حەجەدا کە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) تۆی نارد تایەخە هەڵتەکاندنی خوداو پێغەمبەری خودا لەفرە خواکان جاڕ بدەی، چی فەرمانێکت پێ کرابوو، کەلەو رۆژەدا رایبگەیەنی؟ فەرمووی: بەم چوارشتە فەرمانم پێ کرابوو: یەکەم: ئادەمیزادی رووت تەواف کابە نەکا، دوەم: ئەوانەی پەیمانیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەتا ماوەی ئەو پەیمانە تەواو دەبێ مۆڵەت دەدرێن، وە ئەوەی پەیمانی نییە تاچوار مانگ مۆڵەت دەدرێ، سێیەم: ناچێتە بەهەشت مەگەر کەسێ کەئیمانو باوەڕی هەبێ. چوارەم: لەم ساڵ بترازێ ئیتر نابێ هاوبەشپەیدا کەرانو موسوڵمانان پێکەوە حەج بکەن، واتە: ئیتر لەمڕۆ بەدواوە فرەخوانەیەن بۆ حەج (تیرمیزی بەرشتەیەکی جوان گێڕاویەتیەوە. ت/٢٠١/٥ = تاج-٤ ز-١٠ ژ-٣٨٩٥ ج-٤).

## (٧٩) بابُ في فَضْلِ الحَجِ وَالعمرة ويَوْمِ عَرَفَةَ
## خێرو گەورەیی‌و پاداشی حەج‌و عەمرەو رۆژی عارفە

٨٥٥- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وسلم قالَ: (العُمْرَةُ إلى العُمْرةِ كَفَارَةٌ لَما بَيْنَهُمَا، والحَجُّ المَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزاءُ إلاَّ الجَنَّةَ). (الحديث: ١٧٧٣)[٨٥٥]:

[٨٥٥] تجريد/٢، ژمارە: ٨١٩ = ١٧٧٣ مسلم: ١٣٤٩ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٦٤٠ = ٣٢٧٦.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرمووێ: (ئەم عەمرە هەتا ئەو عەمرە بڕێتی گوناهی نێوانی هەردووکیان دەکەوێ، حەجی قەبوولیش هەر بەهەشتە پاداشیو بەس). (تاج/٢/١٤٩ ز/٧٨ + ریاض/٣/٩٣٢ ف/٥ ز/٢٣٣).

٨٥٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـه (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَتَى هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ ». {الحديث: ٣٢٧٨ = ٣٢٦٧ ف.م. تجريد/٢/١٦٠، رقم: ٧٣٢ = ١٥٢١، ١٨١٩، ١٨٢٠ فتح الباري. ترمذي. حج: ٨١١. نسائي. حج: ٢٦٢٦. ابن ماجة. مناسك: ٢٨٨٩. تحفة الأشراف: ١٣٤٣١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (هەرکەسێ بۆ خودا، حەجێ، یا عەمرەیێ بکا، لەکاتی کردنی ئەو حەجە، یا ئەو عەمرەیەدا، پارێز لە کەیف کردن لەگەڵ ژندا بکاو، گورێز لە هەرزەگۆیيو قسەی پڕوپووچ بکاو، گوناه نەکا، ئەوە وەك ئەو ڕۆژە کە لەدایك بووە، ئاوا لە گوناه پاك دەبێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ١٤٧٠ + ریاض/٣/٩٣٣، زنجیرە: ٢٣٣}:

## (٨٠) باب النزول بمكّة للحاج وتوريث دورها

٨٥٧- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: يارَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيْنَ تَنْزِلُ فِي دارِكَ بِمَكَّةَ ؟ فَقَالَ: (وَهَلْ تَرَكَ عَقِيلٌ مِنْ رِباعٍ أَوْ دُورٍ). وَكَانَ عَقِيلُ وَرِثَ أَبا طَالِبٍ، هوَ وَطالِبٌ وَلَمْ يَرِثْهُ جَعْفَرٌ وَلاَعَلِيٌ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ شَيْئاً، لأنهما كَانَا مُسْلِمَيْنِ،

وَكَـانَ عَقِيـلٌ وَطَالِـبٌ كَـافِرَيْنِ. (الحـديث ١٥٨٨– أطرافـه فـي: ٣٠٥٨،٤٢٨٢، ٦٧٦٤):[857]

ئوسـامەی کـوڕی زەیـد (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: لـەکاتی گرتنـی مەککەدا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوداسبەینێ لەکوێ دادەبـەزی، ئایا بارەگاکـەت لە خانووەکەی مەککەت دەخـەیتو ئـەوێ دەکـەی بـەبارەگای خـۆت؟ فـەرمووی: (جا بۆچی عەقیل هیچ خانووبەرەی بۆ ئێمە هێشتۆتەوە، هەتا تیا دابەزین؟).

ئەوجا فەرمووی: (نە مـسوڵمان کەلـەپوور لـە نامـسوڵمانان وەردەگـرێ، وە نە نامسوڵمان کەلەپوور لە مسوڵمان وەردەگرێ، هیچیان کەلەپور لە هیچ کامیان وەرناگرن). بە زوهرییان گوت: ئەی کێ کەلەپورو میراتەکەی ئـەبوطالیبی بـرد بۆ خۆی؟! فەرمووی: عەقیلو طالیب بردیانو تەریکەی باوکیان بوو بە میراتـی ئـەوان، چـونکە ئـەبوطـالیبی باوکیـان لەسـەر دینـی هۆزەکـەی مـرد، عـەقیل و طالیبیش ئەو کاتە نامسوڵمان بوونو لەسەر دینی ئـەو بـوون، بـەڵام جەعفـەری کوڕیو ئیمامی عـەلی کوڕی لەبەرئـەوەی ئەوکاتـە مـسوڵمان بـوون میراتیـان لـە ئەبوطالیبی باوکیان نەبرد). (تاج/٢٣٢/٨ ز/٩٥ ف/٣ = تاج/٤، زنجیرە: ٩٥، ژمـارە: ٤٦٢٥، ج/٤) + (تاج/٢١٣/٦ ز/١٠ ف/٢٢ = تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩١٣، ج/٤).

---

[857] تجرید/٢، ژمارە: ٧٦١ = ١٥٨٨ مسلم: ١٣٥١ = مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٦٩٢ = ٣٢٨٢ شیحا.

## (٨١) باب جواز الإقامةِ بِمكّة للمُهاجر منها بَعْدَ فَرَاغِ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ ثَلاثَةَ أيَّامٍ بِلاَ زِيادَةٍ

## لەپاش تەواوکردنی حەجو عەمرە، لاوەکی مافی سێ ڕۆژی بۆ هەیە کە لەمەککە بمێنێتەوە

٨٥٨ـ عَنْ الْعَلاء بْنَ الْحَضرَمِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثلاث لِلْمُهَاجِرِ بَعْدَ الصَّدَرِ(الحديث: ٣٩٣٣): [٨٥٨]

عەلای کوڕی حەزرەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (لەپاش تەوافی ئیفازە، کە لەپاش گەڕانەوە لە مینا ئەنجام دەدرێ، کۆچەری مافی سێ شەوی هەیەکە لە مەککە بمێنێتەوە).

ئەمەیش دەقی ژمارە (٧٥٢)ی مختصری صحیحی موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَقُولُ لِجُلَسَائِهِ: مَا سَمِعْتُمْ فِي سُكْنَى مَكَّةَ؟ فَقَالَ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ: سَمِعْتُ الْعَلاَءَ - أَوْ قَالَ: الْعَلاَءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ – قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يُقِيمُ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاَثًا ». {الحديث: ٣٢٨٥ = ٣٢٧٣ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٢١ = ٣٩٣٣. ترمذي. حج: ٩٤٩. نسائي. تقصير الصلاة: ١٤٥٢} :

عەبدوڕەحمانی کوڕی حومەید فەرمووی: گوێم لێ بوو، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، بە سائیبی کوڕی یەزیدی فەرموو، کە یەکێ بوو لە دانیشتووانی لای: لەبارەی مانەوە لە مەککەدا، لەپاش تەواوکردنی حەجو عەمرە شتێکت ژنەوتووە؟ فەرمووی: ژنەوتم لە عەلای حەزرەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: لایە (واتە: لاوەکی: کەسێ کە خەڵکی مەککە نەبێ) لەپاش تەواوکردنی

[٨٥٨] تجريد/٢، ژمارە: ١٥٢١ - ٣٩٣٣ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٥٢ - ٣٢٨٥.

کردارەکانی حەج‌و عەمرە، مافی ئەوەی هەیە کە سێ شەوی تر لە مەککە بمێنێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ١٦٤١}.

**ڕوونکردنەوە:**

عەلای حەزرەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عیماد بوو، عەلاء چەند برایەکی هەبوو، یەکێکیان ناوی عەمری حەزرەمی بوو، یەکەم کوژراوی شەڕی ئیسلام‌و ناموسوڵمانان بوو، بە ناموسوڵمانی کوژرا، موسوڵمانێ کوشتی، ماڵەکەی یەکەم تالانی بوو، کە دەست موسوڵمانان کەوت‌و پێنج یەکی لێ دەرکرا، ئەوە بوو بەهۆی شەڕی بەدر، لەناو پەڕاوەکانی فوتوحاتا مەشهوورە: کە عەلا نزا گیرا بووە، چەند وشەو نزای تایبەتی خوێندووەو بەسەر دەریادا بەپێ، وەك سەر زەوی ڕۆیشتووە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلای کرد بە سەرکاری سەر وڵاتی بەحرەین، لەسەردەمی جێنشینیی ئەبوبەکرو عومەردا هەر بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی، تا لەساڵی چواردەدا فەرمانی هەقی بەجێهێنا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا (ڕەزای خوا لە هەموویان بێ).

کاتی عەمرە کەیە، وە ئایا، لە ڕۆژێکا، یا لە حەفتەیەکا، یا لە مانگێکا، یا لە ساڵێکا، دروستە چەند عەمرە بکرێ؟ وە حوکم‌و بڕیاری عەمرە چییە، فەرزە یا سوننەتە؟

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیما، لەباسی (باب: فَضْلُ الحج والعمرة)یدا، لە ڕوونکردنەوەی فەرموودەی ژمارە: (٣٢٧٦ = ٣٢٨٠)دا دەفەرموێ:

١. عەمرە لای شافیعی‌و جەماوەری زانایان فەرزە، بەڵام ئیمامی مالیك‌و ئیمامی ئەبو حەنیفەو کەسانی تریش، دەفەرموون: عەمرە سوننەتە، واجیب نییە.

٢. مەزهەبی شافیعیو رای جەماوەری زانایانی ئیسلام، سەبارەت بە دووبارەکردنەوەی عەمرە، لە لایەنی یەك کەسەوە ئاوایە: دووبارەکردنەوەی عەمرە، چەند جارێ، لەیەك ساڵا سوننەتە.

٣. مەزهەبی ئیمامی مالیك: کردنی زیاتر لەیەك عەمرە لە ساڵێکا، ناباشەو نا پەسەندەو مەکرووهە.

٤. هەندێ دەفەرموون: (لەیەك مانگا دەبێ یەك عەمرە بکا).

٥. ئیمامی عەسقەلانی لە فەتحولباریدا، لەسەرەتای (کتاب العمرة)دا، دەفەرموێ: (وفي حديث الباب دَلاَلَـةٌ عَلَـى اسْـتِحْبَابِ الاِسْـتِكْثَارِ مِـنَ الاِعْتِمَارِ.........مِنْ غَيْرِ تَقْيِيدٍ).

٦. هەروا ئیمامی نەوەوی لە هەمان شوێندا دەفەرموێ: (بزانە کە هەموو رۆژێ لەساڵ کاتە بۆ عەمرەو عەمرەی تیادا دروستە، مەگەر بۆ کەسێ خەریکی کردنی حەج بێ، ئەوە عەمرەی دانامەزرێ، هەتا حەجەکەی تەواو نەکا. لە مەزهەبی ئێمەدا، هەرکاتێو هەر رۆژێ عەمرە بکەی دادەمەزرێو سوننەتەو کەراهەتو ناباشی نییەو جیاوازی لە نێوانی رۆژی عەرەفەو رۆژانی جەژنو باقی مەندەی رۆژەکانی تری ساڵدا نییە، مەگەر بۆ کەسێ خەریکی کارەکانی حەج بێ.

٧. لەپاش ئەمەو وەك لە شوێنەکانی تردا باس کراوە دەڵێم: (دووبارە کردنەوەی عەمرە چەند جارێ، لەیەك رۆژا، یا لەیەك حەفتەدا، یا لەیەك مانگا، یا لەیەك ساڵا، خێرێکی گەورەیەو دەبێ بەهۆی پاداشتی گەورە، تەنانەت ئەگەر لەیەك رۆژدا دە عەمرە بکا، یا کەمتر، یا زیاتر، زۆر باشەو پەسەندەو تاعەتێکی زۆر جوانو پەسەندە).

نێستا لەكاتی حەجدا، یا لەكاتی جێبەجێ كردنی عەمرەدا لە غەیری مانگەكانی حەجدا، لەسەر فەتوای زانا ئاینییەكان، لەیەك رۆژدا، بۆ كەسێ حەلاڵ بێو لە حەجدا نەبێ، چەندین عەمرە، یەك لەدوایەك ئەنجام دەدرێو عەمەل لەسەر ئەمەیە.

## (٨٢) باب تحريم مكة وَصَيْدِهَا وَخَلاَهَا وَشَجَرِهَا وَلُقَطَتِهَا إلاَّ لِمنشدٍ عَلَى الدَوَامِ مەككە بەستو حەرەمەو ڕاوی تیا دروست نیەو گیاو گوژەو دارو درەختی نا بڕرێو شتی ونبووی هەڵنلگیرێتەوە، مەگەر بۆ كەسێ جاڕی بۆ بدا بە بەردەوامی

٨٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ قَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ افْتَتَحَ مَكَّةَ « لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا ، فَإِنَّ هَذَا بَلَدٌ حَرَّمَ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ ، وَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي ، وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، لاَ يُعْضَدُ شَوْكُهُ ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهُ ، وَلاَ يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا ، وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا » . قَالَ الْعَبَّاسُ يَا رَسُولَ اللَّهِ . إِلاَّ الإِذْخِرَ ، فَإِنَّهُ لِقَيْنِهِمْ وَلِبُيُوتِهِمْ . قَالَ قَالَ « إِلاَّ الإِذْخِرَ».[٨٥٩]

لە ڕوونكردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، ئەم چەند فەرموودەیە دەنووسین:

**یەكەم: لە تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، ژمارە (١٧٠٣ و ١٧٠٤ و ١٧٠٥) ئاوا:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: أَنَّ خُزَاعَةَ قَتَلُوا رَجُلاً مِنْ بَنِي لَيْثٍ عَامَ فَتْحِ مَكَّةَ بِقَتِيلٍ مِنْهُمْ قَتَلُوهُ ، فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ ،

---

[٨٥٩] تجريد/٢، ژمارە: ١٤٣ = ١٨٤٣ مسلم: ٣٢٨٩ شيحا.

فَخَطَبَ فَقَالَ « إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْقَتْلَ - أَوِ الْفِيلَ شَكَّ أَبو عَبْدِ اللَّهِ - وَسَلَّطَ عَلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَالْمُؤْمِنِينَ ، أَلاَ وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي ، وَلاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِي أَلاَ وَإِنَّهَا حَلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، أَلاَ وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ ، لاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا ، وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا ، وَلاَ تُلْتَقَطُ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ ، فَمَنْ قُتِلَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ إِمَّا أَنْ يُعْقَلَ ، وَإِمَّا أَنْ يُقَادَ أَهْلُ الْقَتِيلِ » . فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ فَقَالَ اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ . فَقَالَ « اكْتُبُوا لأَبِي فُلاَنٍ » . فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلاَّ الإِذْخِرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا . فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « إِلاَّ الإِذْخِرَ ، إِلاَّ الإِذْخِرَ »:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: ساڵی گرتنی مەککە، هۆزی خوزاعە پیاوێکیان کوشت لە هۆزی بەنی لەیث، لە جیاتی کوژراوێکی خۆیان کە بەنی لەیث لەوەوپێش کوشتبوویان، جا کە ئەمە عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا، سواری وڵاخەکەی بوو، وە وتارێکی دا، فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر مەککەی پاراست لە دەستدرێژی خاوەن فیلەکان، کە ئەبرەهەو لەشکرەکەی بوو، وە بە پشتیوانی خودا پێغەمبەری خوداو موسوڵمانەکان لە ڕۆژی ئازادکردنی (فەتح)ی مەککەدا زاڵبوون بە سەرگرتنی ئەم شارەدا بەڵام باش باش بزانن کە ئەم شارە نە لە پێش مندا، وە نە لە پاش من بۆ کەس ڕەوانەبینراوەو ڕەوانابینرێ کە ڕێزی بشکێنێو شەڕو شۆڕی تیا بکا، ئاگاداربن تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەکی کەم لەو ڕۆژەدا کوشتاری تیا حەڵاڵ بوو، باش ئاگاداربن ئا ئێستا لەم دەمەدا شارێکی بەڕێزو قەدەغەیە، کەوابوو نە درکی پاکۆ دەدرێ وە نە دارودرەختی دادەپاچرێ وە نە کوشتارو شەڕو شۆڕی تیا دەکرێ لەم حەلەوە تا ڕۆژی قیامەت ئەم شتانەی تیا قەدەغەیە.

لــە گێڕانەوەیــەکی تــردا ئەمەیــشی لێ پــتر کــردووە: وە نــە نەچــیری دەرەوێنرێتەوە، وە نـە شتی داکەوتووی هەڵدەگیرێتـەوە، مەگـەر بـۆ کەسێ کـە ناونیشانی هەڵبدا هەتا خاوەنەکەی پەیدا ببێو بیباتەوە.

وە هەرکـەس کەسـێکی کـوژرا، ئـەوا خـۆی لـە یـەکێ لـەم دوو بڕیـارە سەرپــشکە: یــا خــوێن وەربگــرێ، یــاخود تۆڵــەی بــۆ بــسەندرێو بکوژەکــە بکووژرێتەوە.

جا پیـاوێکی یەمـەنی کـە پێیـان دەگـوت ئـەبو شـاه، هەڵسا گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بفەرموو کە ئەم وتارەم بـۆ بنووسـنەوە، حـەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بینووسنەوە بۆ ئەبو شاه!

جـا پیــاوێکی قورەیــشیش گــوتی: ئــەی پێغەمبــەری خــودا! تــەنیا گیــای سوڕناتك (اذخر: زوڕناتـك)ی لێ دەرچـێ، چونکە بـۆ سـووتەمەنی نـاو مـاڵو بـۆ سەرگرتنی سەری گۆڕ بەکاری دێـنن، حـەزرەتیش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: باشە تەنیا گیای سوڕناتیکی لێ دەرچێ، (ش/د/ت/ن = شـەیخان، ئـەبو داوود، تیرمزی، نەسائی (خودایان لێ ڕازی بێ).

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ قَالَ النَّبِىُّ (صـلى الله عليـه وسـلم) يَـوْمَ افْتَتَحَ مَكَّةَ « لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا ، فَإِنَّ هَذَا بَلَـدٌ حَـرَّمَ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ ، وَهُـوَ حَـرَامٌ بِحُرْمَـةِ اللَّـهِ إِلَـى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ. رواه الشيخان وفي رواية: لا يحل لأحدكم أن يحمل بمكة السلاح:

ئیبنــو عــەبباس (خودایــان لێ ڕازی بــێ) گــوتی: ڕۆژی گــرتن (فــەتح)ی مەککە، پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) فــەرمووی: ئــیتر کۆچکردن لـە مەککەوە بۆ مەدینە نەما چونکە مەککەیش وەکی مەدینە بوو بە وڵاتی ئیسلام بەڵام تێکۆشانو خەباتگێڕانو غەزاکردن لـە پێنـاوی ئیـسلاما هـەردەمێنن هـەتا

ڕۆژی ڕەستاخیز، وە هەروەها کۆچکردن لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام هەردەمێنێ هەتا ڕۆژی قیامەت وە هەروەها نیازی پاکیش دەمێنێ وە لەم ڕێگەیەوە دەتوانن بە پایەی پاداشی کۆچکردن بگەن وە هەرکاتێکیش داواکران بۆ غەزاکردن بڕۆن بۆی، وە ئەم شاری مەککەیە خودا قەدەغەو حەرامی کردووە لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە، ئیتر هەتا ڕۆژی قیامەت هەروا بە حەرامیو بە ڕێزداری دەمێنێتەوە بە فەرمانی خودای گەورە

(ش) لە گێڕانەوەیەکا: دروست نیە بۆ کەستان لە مەککەدا چەك هەڵبگرن.

عَنْ أَبِى شُرَيْحٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ وَهْوَ يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ ائْذَنْ لِى أَيُّهَا الأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلاً قَامَ بِهِ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ ، سَمِعَتْهُ أُذُنَاىَ وَوَعَاهُ قَلْبِى ، وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَاىَ ، حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ ، حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ « إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ ، وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ ، فَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا ، وَلاَ يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً ، فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ لِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِيهَا فَقُولُوا إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذِنَ لِرَسُولِهِ ، وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ . وَإِنَّمَا أَذِنَ لِى فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، ثُمَّ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالأَمْسِ ، وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ » . فَقِيلَ لأَبِى شُرَيْحٍ مَا قَالَ عَمْرٌو قَالَ أَنَا أَعْلَمُ مِنْكَ يَا أَبَا شُرَيْحٍ ، لاَ يُعِيذُ عَاصِيًا ، وَلاَ فَارًّا بِدَمٍ ، وَلاَ فَارًّا بِخَرْبَةٍ. رواه الشيخان والترمذى:

عەمری کوڕی سەعید خەریك بوو لەشکری دەنارد بۆ سەر ئیبنو زوبەیر لە مەککە، ئەبو شورەیحی ئەل- عەدەوی پێی گوت: ڕێگەم بدە ئەی ئەمیر! ئەی فەرمانڕەوا! تا فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پاش فەتحی مەککە بە دوو ڕۆژ، پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وتاردا ئەو فەرموودەیەی فەرموو، بە هەردوو گوێی خۆم گوێم لێ بوو، وە بە دڵ دڵم لەلای بوو، وە بە چاوی خۆم سەیریم دەکرد، لەو کاتەدا کە ئەم فەرموودەیەی دەفەرموو، کە

سوپاس‌و ستایشی خودای کردو ئینجا فەرمووی: مەککە خودای گەورە خۆی حەرامی کردووەو کردوویەتی بە حەرەم‌و بەست، وە خەڵك لە خۆیانەوە حەرامیان نەکردووەو نەیانکردووە بە بەست‌و حەرام! جا کەوابوو دروست نیە بۆ کەسێ کە باوەڕو ئیمانی بە خوداو بە ڕۆژی پاشەڕۆژ هەبێ کە خوێنی بە ناهەق تیا بڕێژێ، وە یا دارو درەختی داپاچێ، وە ئەگەر دنیا بوو یەکێ کوشتارەکەی ڕۆژی فەتحی مەککەی پێغەمبەری کرد بە بەهانە بۆ ئەوەی شەڕو شۆڕی تیا بکا، ڕێگەی مەدەن‌و بڵێن: کەوا خودا ڕێگەی پێغەمبەری خۆی دابوو بۆ ئەوە، بەڵام ڕێگەی ئێوەی نەداوە بۆ ئەمە، تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەکی زۆر کەم ڕێگەی دابوو لەو ڕۆژەداو بەس، کە لە بەیانییەکەیەوە بوو تا عەصر، وەلێ ئێستا وەك سەردەمی پێشوو مەککە قەدەغەو حەرام بوومتەوە جا ئەوەی لێرەیەو حازرەو بە دیارەوەیەو بە گوێی خۆی ئەم فەرمایشتانەی من دەبیستێ با رایان بگەیەنێ بەو کەسانەی کە ئێستا لێرە نین!

جا گوترا بە ئەبو شورەیح: ئەدی وەڵامی عەمر چی بوو؟ گوتی: عەمریش گوتی: من ئەوە لە تۆ باشتر دەزانم ئەی ئەبو شورەیح! بەڵام بەست (حەرەم)ی مەککە پەنای پیاوی یاخی‌و پەنای پیاوی خوێن ڕێژی هەڵهاتوو پەنای پیاوی گزیکاری راکردوو نادات! (ش/ت، خودایان لێ ڕازی بێ).

**دووەم: لە تەجرید بەرگی یەکەم، ژمارە ( ٨٨ ) ئاوا:**

عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: سمعت رسول الله (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ) (يَوْمِ الْفَتْحِ يقولُ قولاً سَمِعَتْهُ أُذنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ حَمِـدَ اللَّـهَ تَعالى وَأَثنَى عَلَيْهِ ثمَّ قَالَ إنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ تَعالى وَلَمْ يُحَرِّمْهَـا النَّـاسُ فَلَـا يَحِـلُّ لِـامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا وَلَا يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً فَإِنْ أَحَدٌ تَـرَخَّصَ لِقِتَـالِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا فَقُولُوا إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذِنَ لِرَسُولِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ وَإِنَّمَا

أَذِنَ لِي فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ثُمَّ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالْأَمْسِ وَلْيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ). (الحديث ١٠٤ ـ طرفاه في: ١٨٣٢، ٤٢٩٥):

عەمری کوڕی سەعید خەریك بوو لەشکری دەنارد بۆسەر ئیبنوزوبەیر لەمەککە، ئەبوشورەیحی ئەل ـ عەدەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) پێی فەرموو: ڕێگەم بدە ئەی میر! تافەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کەلەپاش فەتحی مەککە بەدوو رۆژ، لەوتارا لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیم بیست، بەهەردوو گوێی خۆم گوێم لێ ی بوو، وەبەدڵ دڵم لەلای بوو، وەبەچاوی خۆم سەیریم دەکرد، لەوکاتەدا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم فەرموودەیەی دەفەرموو کەسوپاس‌و ستایشی خودای کردو ئنجا فەرمووی: مەککە خودای گەورە خۆی کردوویەتی بەبەست‌و حەرەم‌و ئەم کارانەی تیادا حەرام کردووە، وەخەڵك لەخۆیانەوە نەیان کردووە بەبەست‌و حەرەم‌و ئەو کارانەی تیادا قەدەغە بکەن، جا کەوا بوو دروست نییە بۆکەسێ کەباوەڕی بەخوداو بەرۆژی دوارۆژ هەبێ کەخوێنی بەناهەق تیابڕێژێ، یادارو درەختی داپاچێ، وەئەگەر دنیابوو کەسێ کوشتارەکەی رۆژی فەتحی مەککەی پێغەمبەری کرد بەبەهانە بۆئەوەی شەڕو شۆڕی تیابەرپا بکا، ڕێگەی مەدەن‌و بیانووی ببڕن‌و پێی بڵێن: کەوا خوا ڕێگەی پێغەمبەری خۆی بۆئەوەدا بوو، بەڵام ڕێگەی ئێوەی بۆ ئەمە نەداوە، تەنانەت بۆ منیش لەو رۆژەدا بۆ ماوەیەکی کەم ڕێگەی دا، کەمەوداکەی لەبەیانەکییەوە بوو هەتا عەسر، بەڵام ئێستا وەك سەردەمی پێشوو مەککە قەدەغە بۆتەوەو بۆتەوە بەبەست (حەرەم) کوشتوبڕی تیا ناڕەوایە.

جابا ئەوەی کەئێستا لێرەیەو حازرەو بەدیارەوەیەو بەگوێ ی خۆی ئەم فەرمایشتانە لەخۆم دەبیستێ باڕایان بگەیەنێ بەوکەسانەی کەئێستا لێرەنین!

جا گوترا بەئەبو شورەیح: ئەدی وەڵامی عەمر چی بوو؟ فەرمووی: عەمریش گووتی: من ئەمە لەتۆ باشتر دەزانم ئەی ئەبو شورەیح! بەڵام یەست (حەرەم) ی مەککە پەنای پیاوی یاخیو پەنای پیاوی خوێنرێژی هەڵهاتوو هەروا پەنای کزیکاری دزیکاری راکردوو نادات!). (فەرموودەی شەستو یەك لە تەجریدی بوخاری تەماشا بکە، تاج ـ ٢ل ـ ٢٦٣ = زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ١٧٠٥، چ/٤).

**راڤەو شیکردنەوە:**

بەپێی ئەم فەرموودەیە راگەیاندنی زانست چین بەچین خودفەرزە (فەرزی عەینە) لەسەر خودی زاناو فەرزی کیفایەیە لەسەر نەتەوەی ئیسلام.

ئەبوشورەیح بیست فەرموودەی هەیە، دوانیان پەسەندی هەردوو پیرە، یەك فەرموودەیشی لەبوخاریدا هەیە لەموسلیم دا نییە، یەکێ بووە لەهۆشمەندەکانی شاری مەدینە، ساڵی (٦٨) ك وەفاتی کردووە.

**سێیەم: لە پوختەی موسلیم، بەرگی دووەم، ژمارە ( ٧٦٦ ) ئاوا:**

عَنْ أبى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَّةَ، قَامَ فِى النَّاسِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، وَإِنَّهَا لَنْ تَحِلَّ لأَحَدٍ كَانَ قَبْلِى، وَإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِى سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَإِنَّهَا لَنْ تَحِلَّ لأَحَدٍ بَعْدِى، فَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلاَ تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ، فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يُفْدَى، وَإِمَّا أَنْ يُقْتَلَ، فَقَالَ الْعَبَّاسُ: إِلاَّ الإِذْخِرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِى قُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): إِلاَّ الإِذْخِرَ، فَقَامَ أَبُو شَاهٍ - رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ — فَقَالَ: اكْتُبُوا لِى يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اكْتُبُوا لأَبِى شَاهٍ »، قَالَ الْوَلِيدُ: فَقُلْتُ لِلأَوْزَاعِىِّ: مَا قَوْلُهُ:

اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: هَذِهِ الْخُطْبَةَ الَّتِي سَمِعَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٢٩٢ = ٣٢٨١ فم. تجريد/١، رقم: ٩٢ = ١١٢، ٢٤٣٤، ٦٨٨٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ خودای گەورە، مەککەی ئازادکرد لەسەر دەستی پێغەمبەردا، (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەردومەکەدا هەڵسایەوە وتارێکی فەرموو، سوپاس و ستایشێکی جوانی خودای کرد، ئەوجا فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر، مەککەی پاراست لە دەستدرێژی خاوەن فیلەکان، کە ئەبرەههو لەشکرەکەی بوون، کە هاتبوون بۆ رووخاندنی کەعبە، وەك لە قورئانا لە سوورەتی فیلدا باسکراوە، وە بەپشتیوانی خودا، پێغەمبەری خوداو موسوڵمانەکان لەرۆژی ئازادکردنی (فەتح)ی مەککەدا، زاڵبوون بەسەر گرتنی ئەم شارەدا، بەڵام باش باش بزانن کە ئەم شارە نە لەپێش مندا، وەنە لەپاش من بۆ کەس رەوا نەبینراوەو رەوا نابینرێ، کە رێزی بشکێنێ و شەڕو شوڕی تیابکا، ئاگاداربن تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەکی کەم لەو رۆژەدا کوشتاری تیا رەوا بوو، باش ئاگاداربن ئا ئێستا لەم دەمەدا شارێکی بەرێزو قەدەغەیە، کەوابوو نە نەچێری دەرەوێنرێتەوە، وە نەدرك و داڵ و گیاو گوژەی پاکۆ دەدرێ، وە نەشتی داکەوتووی هەڵدەگیرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ کە ناونیشانی هەڵبدا، هەتا خاوەنەکەی پەیدا ببێ و بیباتەوە، وە هەرکەسێ کەسێکی کوژرا، ئەوا خۆی لەیەکێ لەم دوو بڕیارە سەرپشکە: یا خوێن وەربگرێ، یا تۆڵەی بۆ دەسەندرێ و لەجیاتی کوژراوەکەی بکوژەکە دەکوژێتەوە). عەبباسی مامەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە عەبباس بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! تەنیا گیای سوڕناتك (إِذْخَر)ی لێ دەرچێ، چونکە ئەم گیایە بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕیچەی گۆڕو بۆ پڕکردنەوەی

کون‌و بۆشایی نێوانی خشت‌و تەختە بەردەکانی سەر نەڵحەدو بۆ سووتەمەنی ناو ماڵ‌و بۆ پەردووی سەر دارەڕاو شتی وا بەکاری دەهێنین؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشە، تەنیا گیای سورناتکی لێ دەرچێ).

جا پیاوێکی یەمەنی، کە پێیان دەگوت ئەبو شاه، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بفەرموو بە هاوەڵەکانت کە بۆم بنووسنەوە؟ حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بینووسن بۆ ئەبو شاه).

وەلیدی کوڕی موسلیم، کە کەسی سێیەمە، لە پیاوانی رشتە (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: عەرزی مامۆستاکەی خۆمم کرد، بۆ ئەم فەرموودەیە، کە ئیمامی ئەوزاعییە: ئەبو شاه مەبەستی چییە کە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆم بنووسنەوە؟ فەرمووی: مەبەستی ئەبو شاه ئەوە بووە، کە ئەم وتارەی کە لە پێغەمبەری بیستووە بۆی بنووسنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ١٧٠٣}.

**چوارەم: لە تەجرید بەرگی دووەم ژمارە (٨٤٣) ئاوا:**

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ افْتَتَحَ مَكَّةَ « لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا. (الحديث، ١٨٣٤):

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککە، کەناودارە بەفەتحی مەککە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپاش ئازادکردنی شاری مەککەو ئیسلام بوونی خەڵکەکەی، ئیتر کۆچ کردن لەمەککەوە بۆ مەدینە نەما، چونکە مەککەیش وەك مەدینە بوو بەخاك‌و وڵاتی ئیسلام‌و وەلەژێر ڕکێفی کافرانا دەرچوو، بەڵام کۆشش‌و تێکۆشان‌و جیهادو غەزاکردن‌و نیازی پاك هەرماون‌و هەردەمێنن‌و هەتا هەتایە دەبن بەهۆی سەربەرزی هەردوو جیهان‌و مایەی روو سوریی لەلای خودای

گەورە، جا هەر کاتێ داواتان لێ کرا کەدەربچن بۆ غەزا، دەرچن‌و بڕۆن بۆی.
(تاج/٧٥ ز/١٩ – ش/د/ت/ن).

٨٦٠– عَنْ أَبِى شُرَيْحٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ وَهْوَ يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ ائْذَنْ لِى أَيُّهَا الأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلاً قَامَ بِهِ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ ، سَمِعَتْهُ أُذُنَاىَ وَوَعَاهُ قَلْبِى ، وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَاىَ ، حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ ، حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ « إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ ، وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ ، فَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا ، وَلاَ يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً ، فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ لِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِيهَا فَقُولُوا إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذِنَ لِرَسُولِهِ ، وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ . وَإِنَّمَا أَذِنَ لِى فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، ثُمَّ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالأَمْسِ ، وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ » . فَقِيلَ لأَبِى شُرَيْحٍ مَا قَالَ عَمْرٌو قَالَ أَنَا أَعْلَمُ مِنْكَ يَا أَبَا شُرَيْحٍ ، لاَ يُعِيذُ عَاصِيًا ، وَلاَ فَارًّا بِدَمٍ ، وَلاَ فَارًّا بِخَرْبَةٍ: [٨٦٠]

لەژمارە (٨٥٩)دا بەتەواوی رابورد فەرموودەکەی ئەبو شورەیح.

٨٦١– عن أَبو هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَّةَ قَامَ فِى النَّاسِ ، فَحَمِدَ اللَّهَ ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ « إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ ، وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ ، فَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ كَانَ قَبْلِى ، وَإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِى سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، وَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِى ، فَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا وَلاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا ، وَلاَ تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهْوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ ، إِمَّا أَنْ يُفْدَى ، وَإِمَّا أَنْ يُقِيدَ » . فَقَالَ الْعَبَّاسُ إِلاَّ الإِذْخِرَ ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ لِقُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِلاَّ الإِذْخِرَ » . فَقَامَ أَبُو شَاهٍ – رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ

---

[٨٦٠] تجريد/١، ژمارە: ٨٨ - ١٠٤ مسلم: ١٣٥٤ - ٣٢٩٣.

الْيَمَنِ – فَقَالَ اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « اكْتُبُوا لأَبِي شَاهٍ »: [٨٦١]

لەژمارە (٨٥٩)دا بەتەواوی رابورد، فەرموودەکەی موختەصەری صەحیحی موسلیم (٧٦٦). ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (٩٢)ی تەجریدی بوخارییە:

وَعَنْهُ (رَضي اللهُ عَنْهُ) أنَّ، النَبْيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: (إنَّ اللَّـهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ او القتل وَسَلَّط عَلَيْهِمْ رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ أَلَا وَ إِنَّهَا لَا تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَلَا تَحِلُّ لِأَحَدٍ بَعْدِي أَلَا وَإِنَّها أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ أَلَا وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ لَا يُخْتَلَى شَوْكُهَا وَلَا يُعْضَدُ شَجَرُهَا وَلَا يَلْتَقِط سَاقِطَتَهَا إِلَّا لِمُنْشِدٌ وَمَنْ قُتِلَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ إِمَّا أن يَعْقِلْ وَإِمَّا أَنْ يُقَادُ أهل القتيلِ فَجاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ (يُقَالُ لَهُ أَبُو شَاهٍ) فَقَالَ اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اكْتُبُوا فُلانْ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ: إلاَّ الإذخَرَ يا رسول الله فإنا نَجْعَلَهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا؟ فَقال النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إلا الإذخَر فَقَالَ: إِلَّا الْإِذخِرَ). (الحديث ١١٢ - طرفاه في: ٢٤٣٤، ٦٨٨٠):

دیسان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی گرتنی مەککە هۆزی خوزاعە پیاوێکیان کوشت لەهۆزی بەنی لەیث، لەجیاتی کوژراوێکی خۆیان کەبەنی لەیث لەوەو پێش کوشتبوویان، جا کەئەمە عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا، سواری وڵاخەکەی بوو، وەوتارێکی دا، فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر مەککەی پاراست لەدەستدرێژیی خاوەن فیلەکان کەئەبرەهەو لەشکرەکەی بوون، کەهاتبوون بۆ رووخاندنی کەعبە، وەك لەسوورەتی فیل دا باس کراوە، یا فەرمووی: خودای گەورە کوشتو کوشتاری

---

[٨٦١] تجرید/١، ژمارە: ٩٢ = ١١٢ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٦٦ = ٣٢٩٢ شیحا.

لەناو مەککەدا قەدەغە کردووە، بەڵام بەپشتیوانی خودا پێغەمبەری خواو موسوڵمانەکان لەڕۆژی ئازاد کردنی مەککەدا زاڵبوون بەسەر گرتنی ئەم شارەدا، بەڵام باش باش بزانن کەئەم شارە نەلەپێش مندا وەنەلەپاش من بۆ کەسی تر رەوا نەبینراوەو رەوا نابینرێ کەشەڕو شۆڕی تیابکا، ئاگاداربن هەتا بۆ منیش بۆ ماوەیەکی زۆر کەم لەو رۆژەدا کوشتاری تیادا حەڵاڵ بوو، باش ئاگادار بن تائێستا لەم دەمەدا شارێکی بەڕێزو قەدەغەیە، کەوا بوو نە دڕکی پاکۆ دەدرێو، نەدارو درەختی دادەپاچرێو ، نەکوشتارو شەڕو شۆڕی تیادا دەکرێ لەم حەلەوە هەتا رۆژی قیامەت ئەم شتانەیتیا قەدەغەیە. وەنە نەچیری دەڕەوێنرێتەوە، وەنەشتی داکەوتووی هەڵ دەگێڕێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ کەناوو نیشانی هەڵبدا بۆئەوەی کەخاوەنەکەی پەیدا ببێو بیباتەوە.

وەهەرکەسێ کەسێکی کوژرا ئەوا خۆی لەیەکێ لەم دوو بڕیارە سەر پشکە: یا خوێن وەردەگرێ یاخود تۆڵەی بۆ دەسەندرێو لەجیاتی ی کوژراوەکەی بکوژەکە دەکوژێتەوە. جا پیاوێکی یەمەنی کەپێیان دەگوت: ئەبوشاە هەڵسا گوتی: ئەم ووتارەی خۆتم بۆ بنووسەرەوە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بینووسنەوە بۆ ئەبوشاە. پیاوێکی قورەیشیش (کەعەبباسی مامەی پێغەمبەر بوو) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تەنیا گیای سوڕناتك (ئیزخەر) ی لێ دەرچێ، چوونکە ئەم گیایە بۆ سووتەمەنی ناوماڵو بۆ پەردووی سەردارەڕاو بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕ بەکاری دێنن، حەزرەتیش (درروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: باشە تەنیا گیای سوڕناتکی لێ دەرچێ): (تاج-٢ ل-٢٨٠ ز-١٣٠ ژ-١٧٠٣ چ-٤).

## (٨٤) باب جَوَازِ دُخولِ مكَّةَ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ
## چوون بۆ مەککە بەبێ ئیحرام بەستن دروستە

٨٦٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ فَلَمَّا نَزَعَهُ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: « اقْتُلُوهُ ». {الحديث: ٣٢٩٥ = ٣٢٨٤ فـم. تجريد/٢، رقم: ٨٤٧ = ١٨٤٦، ٣٠٤٤، ٤٢٨٦، ٥٨٠٨}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ رازای بێ) فەرمووی: لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناو شاری مەککەوە، کڵاو زریەیەکی لەسەردا بوو، کە کڵاو زریەکەی داکەند، لەوکاتەدا پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیبنو خەطەل ئەو دوشمنە پیسە، دامێنی کەعبەی گرتووەو پەنای بردۆتە بەربەیت لەترسانا، جا تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (بیکوژن ئامانی مەدەن) جا نەضلەی کوڕی عوبەید، بەهاوکاری سەعیدی کوڕی حورەیث کوشتی، چونکە کاتی خۆی لە ئیسلام وەرگەڕا بوو، وە موسوڵمانێکی بەناڕەوا کوشتبوو، وە خوسپو هەجوی پێغەمبەریشی دەکرد).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ١٧٠٨}.

## (٨٥) باب فَضْلِ المدينة وَدُعَاءُ النبي (ﷺ) فيهَا بالبَرَكَةِ وَبَيَانُ تَحْرِيمِهَا وَتَحْرِيمُ صَيْدِهَا وَشَجَرِهَا وَبيانُ حُدُودُ حَرَمِهَا
## ڕێزی مەدینەو کردنی بە بەستێکی ڕێزداری وا کە ڕاوو شکاری تیا قەدەغە بێو بڕینی دارو درەختی قەدەغە بێو نزاو پاڕانەوەی باشی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆی کە خودا پیتو فەڕی تێ بخاتو دیاریکردنی سنووری شوێنە بەست (حەرەم)ە کانی

٨٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ، وَدَعَا لأَهْلِهَا، وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كَمَا

حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وَإِنِّي دَعَوْتُ فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا بِمِثْلَيْ مَا دَعَا بِهِ إِبْرَاهِيمُ لأَهْلِ مَكَّةَ ». {الحديث: ٣٣٠٠ = ٣٢٨٨ فم} : (٨٦٢)

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەزرەتی ئیبراهیم (سڵاوی خودای لێ بێ) بەفەرمانی خودا مەککەی کردووە بە حەرەمو بەستێکی ئەمینو هێمنو، قەدەغەی کردووە کەکاری ناشایستەی تیادا بەرپابکرێ، وە دووعاو نزای باشیی کردووە بۆ دانیشتوانی، وەمنیش بە فەرمانی خودا مەدینەم حەرام کردووەو کردوومە بە بەستو حەرەم، هەروەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حەرام کردووەو کردوویەتی بە بەستو حەرەم، وە من دووعاو نزای پیتو فەڕم کردووە بۆ مەنو مشتی مەدینە، بۆ عەیارەو ئەندازەی کێشانو پێوانی، دوو قاتی ئەو دووعاو نزایەی کە ئیبراهیم کردوویەتی بۆ مەککە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ١٧٣٢}.

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (٧٧٣)ی پوختەی موسلیم بوو، ئەمەیش گێڕانەوەی (٩٦٥)ی تەجریدی بوخارییە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لَهَا وَحَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ وَدَعَوْتُ لَهَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا مِثْلَ مَا دَعَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلام لِمَكَّةَ) (الحديث ٢١٢٩):

عەبدوڵڵای کوڕی زەید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) بەفەرمانی خودا، مەککەی کردووە بەحەرەمو بەستێکی ئەمینو هێمنو قەدەغەی کردووە کە کاری ناشایستەی تیادا بەرپا بکرێ، وە دوعاو نزای

---

(٨٦٢) تجريد/٣، زمارە: ٩٦٥ = ٢١٢٩ مسلم: ١٣٦٠ = مختصر صحيح مسلم/٢، زمارە: ٧٧٣ - ٣٣٠٠.

باشیو پیرۆزی کردووه بۆ دانیشتوانی، وەمنیش بەفەرمانی خودا مەدینەم حەرام کردووه کردوومە بەبەستو حەرەم، هەروەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حەرام کردووەو کردویەتی بەبەستو حەرەم، وە من دووعاو نزای پیتو فەرم کردووه بۆ مەنو مشتی مەدینە، دووقاتی ئەو دوعاو نزایەی کە ئیبراهیم کردوویەتی بۆ خەڵکی مەککە).

روونکردنەوە:

عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصم، ئەنصارییە، خەزرەجییە، لەبەنی نەججارە ئوحودییە، بەڵام راجیایی هەیە لەبەدرییەتی دا، بەشداری کرد لە کوشتنی موسەیلەمەی کەذذابدا، نۆ فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، سەعیدی کوڕی موسەییبو عەببادی کوڕی تەمیمی ئەنصاریو کەسانی تریش فەقێی بوون، لەرۆژی (الحرة)دا، شەهید بوو، کە ئەم روداوە لەساڵی شەستو سێی کۆچیدا بووه، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٨٦٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لأَبِي طَلْحَةَ « الْتَمِسْ غُلاَمًا مِنْ غِلْمَانِكُمْ يَخْدُمُنِي حَتَّى أَخْرُجَ إِلَى خَيْبَرَ » . فَخَرَجَ بِي أَبُو طَلْحَةَ مُرْدِفِي ، وَأَنَا غُلاَمٌ رَاهَقْتُ الْحُلُمَ ، فَكُنْتُ أَخْدُمُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا نَزَلَ ، فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ كَثِيرًا يَقُولُ « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ » . ثُمَّ قَدِمْنَا خَيْبَرَ ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْحِصْنَ ذُكِرَ لَهُ جَمَالُ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ ، وَقَدْ قُتِلَ زَوْجُهَا وَكَانَتْ عَرُوسًا ، فَاصْطَفَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِنَفْسِهِ ، فَخَرَجَ بِهَا حَتَّى بَلَغْنَا سَدَّ الصَّهْبَاءِ حَلَّتْ ، فَبَنَى بِهَا ، ثُمَّ صَنَعَ حَيْسًا فِي نِطَعٍ صَغِيرٍ ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « آذِنْ مَنْ حَوْلَكَ » . فَكَانَتْ تِلْكَ وَلِيمَةَ رَسُولِ

اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى صَفِيَّةَ . ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ قَالَ فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُحَوِّى لَهَا وَرَاءَهُ بِعَبَاءَةٍ ، ثُمَّ يَجْلِسُ عِنْدَ بَعِيرِهِ فَيَضَعُ رُكْبَتَهُ ، فَتَضَعُ صَفِيَّةُ رِجْلَهَا عَلَى رُكْبَتِهِ حَتَّى تَرْكَبَ ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ نَظَرَ إِلَى أُحُدٍ فَقَالَ «هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ» . ثُمَّ نَظَرَ إِلَى الْمَدِينَةِ فَقَالَ «اللَّهُمَّ إِنِّى أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا بِمِثْلِ مَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ»:[٨٦٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبو تەلحەی زڕبابمی فەرموو: (کوڕێکم بۆ پەیدابکە، لەکوڕەکانی خۆتان کە خزمەتم بکا). ئیتر من خزمەتی پێغەمبەرم دەکرد، چی لەماڵەوەو چی لەدەرەوە، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆ ئازادکردنی خەیبەر، ئەبو تەلحەی مێردی دایکم منی لەپاشکۆی خۆیەوە سوارکردو بۆ خزمەتی پێغەمبەر لەو سەفەرەدا بردمی بۆ ئەو غەزایە، هەموو کاتێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشوێنێ لە ڕێگە وچانێکی دەگرت، خۆم بەردەستیم دەکرد، گوێم لێ بوو بەزۆری ئەم نزایەی دەخوێند، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ» واتە: ئەی خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەتووشبونی خەمو خەفەتو لە نەکارمیی‌و تەمەڵی‌و لە ئێرمیی‌و چرووکی‌و لە ترسنۆکی‌و لەبوون بەژێرباری قەرزاری‌و لەزاڵبوونی پیاوانی ناحەز بە سەرمانا).

ئیتر لەو سەفەرەدا هەر خزمەتو بەردەستیم دەکرد، تا بەسەرکەوتوویی لە ڕزگارکردنی قەڵای خەیبەر گەڕاینەوە، تا دوایی فەرموودەکە، کە لەم فەرموودەیەی ژمارە (٢٣٥)ی تەجریدی بوخاریدا ڕوون دەبێتەوە:

---

[٨٦٤] تجريد/٢، ژمارە: ١١٨٩ = ٢٨٨٩ مسلم: ٣٣٠٨ شيحا.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزَا خَيْبَرَ فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلَاةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ فَرَكِبَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ فَأَجْرَى نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ حَسَرَ الْإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ قَالَهَا ثَلَاثًا قَالَ وَخَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ فَقَالُوا مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ يَعْنِي الْجَيْشَ قَالَ فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً فَجُمِعَ السَّبْيُ فَجَاءَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنْ السَّبْيِ قَالَ اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ لَا تَصْلُحُ إِلَّا لَكَ قَالَ ادْعُوهُ بِهَا فَجَاءَ بِهَا فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ خُذْ جَارِيَةً مِنْ السَّبْيِ غَيْرَهَا قَالَ فَأَعْتَقَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَزَوَّجَهَا فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا قَالَ نَفْسَهَا أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنْ اللَّيْلِ فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرُوسًا فَقَالَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ وَبَسَطَ نِطَعًا فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ قَالَ وَأَحْسِبُهُ قَدْ ذَكَرَ السَّوِيقَ قَالَ فَحَاسُوا حَيْسًا فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٣٧١ أطرافه في: ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٥٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣):

ئیمامی ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپای ئامادە کردو بەرەو خەیبەر کەوتەڕێ، تاریکولێڵەکە لەپاڵ قەڵای خەیبەردا نوێژی بەیانیمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وڵاخەکەی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وڵاخەکەی خۆی بەناو کووچەو کۆڵانەکانی خەیبەردا غار دەدا، منو ئەبوطەلحە لەنزیکی پێغەمبەرەوە بووین، تەنانەت کەشکەژنۆم لەپاشکۆی ئەبوطەلحەوە دەیدا لەڕانی پێغەمبەری خودا (دروودی خوادای لێ بێ): جالەئەنجامی وڵاخ تاو دانو جەنجاڵیو پاڵەپەستۆدا ڕانی پێغەمبەر رووت بوو، تەنانەت من بەچاوی خۆم سپێدەی ڕانی پێغەمبەرم بینی.

کاتێ پێغەمبەرو سوپاکەی هەڵ ڕژانە ناو گوندەکەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذرِينَ): ئەڵلاهوئەکبەر، وێران بوو خەیبەر، لەڕاستی دا ئێمە هەرکاتێ بۆ هۆزێ بچینە مەیدان، ئیتر ئەوتۆقیوانە بەیانی ڕۆژی ڕەشیانە) وەئەم فەرمایشتەی سێ جار دووبارە کردەوە، کەئیقتیباسە لەم ئایەتە پیرۆزە: {فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاء صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ} ١٧٧/٣٧ - واتە: کاتێ تۆڵەی سەختی خودا بەردەرگا بەهۆزی بێبڕوا دەگرێو، لەهەموولاوە گەمارۆیان دەدا، ئیتر ئەو گەلە تۆقیوانە سەرلەبەیانی ڕۆژی ڕەشیانە). فەرمووی: لەولایشەوە جوولەکەکان ئاگایان لەم هەڵمەتە نەبوو، سەرلەبەیانی وەك ڕۆژانی تر وەدەرکەوتن بۆسەر مەزراو ئیشو کاری ڕۆژانەی خۆیان، لەپڕ لووتیان تەقی بەلووتی سوپای ئیسلاما، جاهاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئای! ئەمە موحەممەدو سوپاکەیەتی، هاتوون بۆسەرمان.

ئەنەس فەرمووی: قەڵای خەیبەرمان بەزەبری بازوو لەچنگی دوژمن رزگار کرد. کاتێ ژنە دیلەکان کۆ کرانەوە، دەحیەی کەلبی هاتە خزمەتی حەزرەت عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! لەم ژنە تالآنییانە کەنیزەکێکم پێ بدە، فەرمووی: (برۆ کەنیزەکێ ببە). دەحیە پیاوێکی قۆزی شۆخ بوو، زۆر جاران جوبرائیل لەشێوەی ئەودا دەهات بۆخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و سرووشی بۆ دەهێنا، دەحیە چوو، صەفییەی کچی حویەی برد بۆ خۆی بەڵام پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حویەی، کەخانمی ژنانی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەظیرە، داوتە بەدەحیە، چۆن شتی وا دەگونجێ، ئەوخانمە خانەدانە بۆکەسی تر دەست نادا مەگەر بۆ تۆئەی پێغەمبەری خودا!) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی دەحیە بانگ کەن ئەو ژنە بهێنێ) دەحیە هاتەوەو صەفییەی هێنایەوە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای صەفییەی کرد، بەدەحییەی فەرموو: (برۆ لەو ژنگەلە بەتالآنی گیراوانە کەنیزەکێکی تر بەرە بۆخۆت).

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفییەی ئازاد کردو مارەی کرد بۆخۆی، ثابیتی بەنانی بەئیمامی ئەنەسی فەرموو: ئەی باوکی حەمزە! چی کرد بەمارەیی بۆی؟ فەرمووی: خودی خۆی کرد بەمارەیی بۆی، لەپێشا لەباتی مارەیی ئازادی کردو ئەوسا مارەی کرد لەخۆی، جاکاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەڕێگە شەوێ ئومموسولەیمی دایکم تەدارەکی بووکی بۆ صەفییە خستو جیازی ی بووکی بۆ کردو کردی بەبووكو پێشکەشی کرد بە پێغەمبەر، بۆبەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوا بوو. ئەوسا فەرمووی: (هەرکەسێ خۆراکی هەیە بابچێ بیهێنێ)، نانی شایی یەکەی برێتی بوو لەوە،

كە حەزرەت (دروودی خوای لێ بێ) فەرمانی كرد، سفرەیەكیان راخست، ئیتر هەركەس لەلای خۆیەوە هەنێ خورما، یارۆن، یاقاوت، یاكەشكی هێناو هەڵیان ڕشتە سەری‌و كردیان بەخورماوڕۆن‌و، دەستیان كرد بەنۆش كردنی، ئیتر هەرئەوە نانی شایی یەكەی بوو. (ت/٣/٩٣/٣ = تاج-٢ ز-٤٠ ژ-٢١٢٤ ج-٤ + تاج/٤ ص-٣٦٨، ص-٤٢٢).

**روونكردنەوە:**

خەیبەر قەلایەكی قایم بوو، بەدەستی هۆزی جوولەكەوە بوو، جێگەی هۆزی بەنوقورەیظەو بەنی نەظیر بوو، لەخۆرهەلاتی باكووری مەدینەوەیە، شەش قۆناغ لەمەدینەوە دوورە، باخەخورمای زۆر بوو، ساڵی حەوتی كۆچی ئازادكرا، ئەبوطەلحە مێردی ئومموسولەیمی دایكی ئەنەسی نۆكەری پێغەمبەرە، ناوی زەیدی كوڕی سەهلی ئەنصاری یە، ئامادەی شەوی پەیمانی عەقەبە بووە، یەكێكە لە(نوقەبەكان) ی ئەو پەیمانە، نەوەدو دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری سیانیانی گێڕاوەتەوە، ئەنەس زڕكوڕی بوو. لەپاش مەرگی پێغەمبەر ئەبوطەلحە چل ساڵ لەسەریەك بەڕۆژوو بوو، بەس لەدوو جەژنەكانا رۆژووی دەشكان.

٨٦٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ، مِنْ كَذَا إِلَى كَذَا، لاَ يُقْطَعُ شَجَرُهَا، وَلاَ يُحْدَثُ فِيهَا حَدَثٌ، مَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ». (الحديث ١٨٦٧، طرفه ٧٣٠٦): [٨٦٥]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەدینە لەنێوانی كێوی عەیرەوە هەتا كێوی ثەور، ئەم

---

[٨٦٥] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٤ = ١٨٦٧ مسلم: ٣٣١٠ شیحا.

ماوەیە هەمووی ڕێزدارە، بەستو حەرەمو قەدەغەیە، نابێ ڕێزی بشکێ، دارو درەختی نابڕرێ، نارەوایی تیادا بەرپا ناکرێ دەی هەر کەسێ نارەوایی تیادا بەرپا دەکات نەفرەتو لەعنەتی خوداو فریشتەکانیو مرۆڤەکانی سەرجەم لەسەر بێ.

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەو بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

١- لەعنەت (نەفرەت) لەم شوێنەدا، بەواتا بێ بەشبوونی ئێجگاری نییە لەڕەحمەتی خودا، وەك نەفرەت لەبێباوەڕ واتای وایە، بەلام نیشانەی ئەوەیە کە بەرپاکردنی نارەوایی لەتاوانە گەورەکانە.

٢- نەفرەتکردن لەدەستەی تاوانکاریو خراپەکاران دروستە، بە شێوەیەکی گشتی نەك بەشێوەی تایبەتی.

٣- **کورتو پوخت:** پێغەمبەر دوانزە میلی بەدەوری شاری مەدینەدا داناوە بەحەرەم.

٨٦٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ ، وَبَارِكْ لَهُمْ فِي صَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ». يَعْنِي أَهْلَ الْمَدِينَةِ} : [٨٦٦]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ ، وَبَارِكْ لَهُمْ فِي صَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ». واتە:

---

[٨٦٦] بخاری. بیوع: ٢١٣٠ مسلم: ٣٣١٢ شیحا.

ئەی خودایە! پیتو فەڕ بخەرە ناو پێوانەی خەڵکی مەدینەوە، هەروا پیتو فەڕ بخەرە مەنو مست (موود)یانەوە).

٨٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَىْ مَا بِمَكَّةَ مِنَ الْبَرَكَةِ ». {الحديث: ٣٣١٣ = ٣٣٠١ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٦٩ = ١٨٨٥. تحفة الأشراف: ١٥٥٩} : (٨٦٧)

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودایە! دوو قاتی مەککە پیتو فەڕ بخەرە مەدینەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ١٧٤٢} .

٨٦٨- عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَطَبَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ (رضى الله عنه) فَقَالَ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ عِنْدَنَا شَيْئًا نَقْرَأُهُ إِلاَّ كِتَابَ اللَّهِ وَهَذِهِ الصَّحِيفَةَ، (قَالَ وَصَحِيفَةٌ مُعَلَّقَةٌ فِى قِرَابِ سَيْفِهِ) فَقَدْ كَذَبَ، فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَأَشْيَاءُ مِنَ الْجِرَاحَاتِ، وَفِيهَا: قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً. وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً ». {الحديث: ٣٣١٤ = ٣٣٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٩٥ = ٣٥٠٨، ٦٠٤٥ + تجريد/٢، رقم: ٨٥٦ = ١٨٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٧٣٠٠} : (٨٦٨)

ئیبراهیمی تەمیمی فەرمووی: باوکم فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، وتارێکی بۆماندا، فەرمووی: هەرکەسێ گومانی وابێ، کە ئێمە، کە کەسو کاری

---

(٨٦٧) تجرید/٢، ژمارە: ٨٦٩ = ١٨١٥ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٧٦ - ٣٣١٣ شیحا.

(٨٦٨) تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٦ - ١٨٧٠ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٧٧٧ - ٣٣١٤ شیحا.

پێغەمبەرین، نامەو نووسراوێکی تایبەتیمان لەلا هەیە، کە بەس خۆمان دەیخوێنین‌و لەلای خەڵکی ترنییە، هەرکەسێ گومانی وابکا درۆدەکا، ئێمەش کە ئال‌و بەیتی پێغەمبەرین، وەك سەرجەمی موسوڵمانانی تر بەگشتی، بەس قورئانی پیرۆزمان لەلا هەیە، کە نامەی خودایە، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەر، ئێمەیش وەك موسوڵمانانی تر، هەندێ فەرموودەمان لەلا هەیە، بەڵام بڕیارەکەی بۆ هەموانە نەك هەر بۆ خۆمان، وەك ئەم چەند فەرموودەیە، کە لەم تۆمارەدا نووسیومنەتەوە (فەرمووی: تۆمارێکی پێچراوە بوو، لەناو هەبگەی شمشێرەکەیدا دایناوبوو بۆ پاراستنی، نەبادا بفەوتێ) ئەوجا عەلی فەرمووی: ئەمانە لەم تۆمارەدا نووسراون: تەمەنی ئەو وشترانەی دەدرێن بەخوێنداو چەند شتێ تر سەبارەت بەخوێنی زام‌و زامکاری. وە ئەمەیشی واتیادا: (مەدینە لە نێوانی چیای عەیرەوە هەتا چیای ثەور بەستە) (واتە: حەرەمە، بە فەرمانی شەرع کۆمەڵێ کاری تیا نادروستە کە لەشوێنانی تر، بەپێی مەرجی دیاریکراو دروستن). جا هەرکەسێ کارێکی ناڕەوای تیادا بەرپا بکا، یا پیاو خراپێکی تیادا پەنابدا، یا کارێکی ناشایستەی تازە قەڵای تیادا بکا بەباو، لەعنەت‌و نەفرەتی خوداو نەفرەت‌و لەعنەتی هەموو فریشتەکان‌و لەعنەت‌و نەفرینی هەموو مرۆڤەکانی لێ بێ، لەڕۆژی قیامەتدا خودا نە فەرزو نە سوننەتی لێ قەبووڵ ناکا، لەئەستۆ گرتنی پەیمان بۆ موسوڵمانان وەك یەکە، هەموو موسوڵمانێ مافی ئەوەی هەیە کە پەیمانی ئەمان بەکافران‌و بەبێ بڕوایان، بە پێی یاسا نامەی خودا بدا، هەرە خوارینەکەیان مافی ئەمان پێدانی هەیە، بەهەر کافرێ بیەوێ ئامانی پێبدا، وە هەرکەسێ حاشا لەباوکی خۆی بکاو خۆی بکا بەنەتەوەی پیاوێکی تر، یا حاشا بکا لە ئازادکەرانی خۆی‌و کەسانی تر بکا بە ئاغای ئازادکەری خۆی، لەعنەت‌و نەفرینی خوداو فریشتەکان‌و هەموو مرۆڤەکان لەو

جۆرە کەسانەبێ، لە قیامەتدا نەتەوبەیان لێ قەبووڵ دەکرێ، نە تۆڵەو بریتیو کەفارەتیان لێ وەردەگیرێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١١٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ١٧٣٣}.

٨٦٩- عَنْ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ فَقَالَ مَنْ زَعَمَ أَنَّ عِنْدَنَا شَيْئًا نَقْرَأُهُ إِلاَّ كِتَابَ اللَّهِ وَهَذِهِ الصَّحِيفَةَ – قَالَ وَصحِيفَةٌ مُعَلَّقَةٌ فِى قِرَابِ سَيْفِهِ – فَقَدْ كَذَبَ فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَأَشْيَاءُ مِنَ الْجِرَاحَاتِ وَفِيهَا قَالَ النَّبِىُّ صلى الله تعالى عليه وسلم « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ زاد في رواية: فمن أخفر مسلما فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً ». وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً » رواه ثلاثة: [٨٦٩]

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی: هەرکەسێ گومان بکا کە ئێمە کە کەس‌وکاری پێغەمبەرین نامەیەکی تایبەتیمان لەلا هەیە، کە هەر بۆ ئێمەیەو بۆ خۆمان دەیخوێنین، زیاد لە قورئان هەر کەسێ گومانی وابێ، درۆ دەکا، بەس ئەمەی لێ دەرچێ کە لەم تۆمارەدایە کە لوولدراوەو وا لە ناو هەبگەی ئەم شمشێرەما.

لەم تۆمارەدا باسی تەمەنی ئەو وشترانەی تیایە کە دەدرێن بە تۆڵەی خوێندا، وە هەروەها باسی چەند بابەتێکی زامو زامکاریی (جیراحات)ی تیایە، وە ئەمەیشی تیایە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مەدینە بەستو حەرەمە، لەنێوانی کێوی عەیرەوە هەتا کێوی ثەور، جا

[٨٦٩] بخاری. حج: ١٨٧٣ مسلم: ٣٣١٩ شیحا.

هەرکەسێ کارێکی نارەوای تیا بکا، یا پیاوخراپێکی تیا پەنا بدا لەعنەتو نەفرینی خوداو فریشتەکانو ئەو خەڵکەی هەموو لەسەربێ لە ڕۆژی قیامەتیشا خودا نە فەرزو نە سوننەتی لێ قەبووڵ ناکا.

موسوڵمانان بۆ پەیمانی ئامان دان بە کافران، هەموویان چوون یەکنو هەرە خوارینەکەیان مافی ئامان دانی هەیە بە هەر کافرێ دمیەوێ.

لە گێڕانەوەیەکا: ئەمەیشی پتر کردووە: جا هەر کەس پەیمانی ئامانی موسوڵمانێ تێك بدا، لەعنەتو نەفرینی خوداو فریشتەو ئەو خەڵکەی هەموو لەسەر بێ، لە ڕۆژی قیامەتا خودا نە سوننەتو نە فەرزی لێ گیرا ناکا، وە نەفرینو لەعنەتی خوداو فریشتەو ئادەمیزاد هەموو لەسەر ئەو کەسە بێ کە حاشا لە باوکی خۆی دەکاو خۆی دەکا بە نەتەوەی پیاوێکی تر، وە یا بەندەو کەنیز بێو ئاغا ئازادی کردبێو کەچی حاشا لە ئاغای خۆی بکاو یەکێکی تر بکا بە ئاغای خۆی، ئەم جۆرە کەسە لە ڕۆژی قیامەتا خودا نە فەرزو نە سوننەتیان لێ گیرا ناکا (ش/د).

## (٨٦) باب الترغيب في سُكْنى المَدينَةِ وَالصَبْرُ على لأوائها
## هاندان لەسەر دانیشتنو نیشتەجێ بوون لە شاری مەدینەدا، وە ئارامگرتن لەسەر ئەرکو زەحمەتی

٨٧٠ـ عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْمَدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُـلُّ امْـرِئٍ مُـصَبَّحٌ فِـى أَهْلِـهِ   وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ الْحُمَّى يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ يَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِى هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَـةً   بِـوَادٍ وَحَـوْلِى إِذْخِـرٌ وَجَلِيـلُ

وَهَـلْ أَرِدَنْ يَوْمًـا مِيَـاهَ مَجَنَّـةٍ   وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِى شَـامَةٌ وَطَفِيـلُ

قَالَ اللَّهُمَّ الْعَنْ شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَعُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، كَمَا أَخْرَجُونَا مِنْ أَرْضِنَا إِلَى أَرْضِ الْوَبَاءِ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ ». قَالَتْ وَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، وَهْيَ أَوْبَأُ أَرْضِ اللَّهِ. قَالَتْ فَكَانَ بُطْحَانُ يَجْرِي نَجْلاً. تَعْنِي مَاءً آجِنًا. (الحديث ١٨٨٩، أطرافه ٣٩٢٦، ٥٦٥٤، ٥٦٧٧، ٦٣٧٢):[٨٧٠]

عائیشه هاوسەری پێغەمبەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ خۆیو یارانی تەشریف دەبەن بۆ مەدینە، ئەبو بەکرو بیلال نەخۆش کەوتنو تووشی پەتا بوونو ئاوو هەوای ئەوێیان پێ نەکەوت، جا ئەبو بەکر کە لەرزووتاکە دەیگرت دەیگوت:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ     وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

واتە:

گەرتۆ لەناو کەسو کاری     گەر لەلادێ، گەر لەشاری
کە مردن هات نییە چاری     سەرچاوانە دیاری باری!

فەرمووی: بیلالیش کە تاکەی بەری دەدا، دەستی دەکرد بە لۆرە لۆرو سۆزکردنو دەیگوت:

أَلَا لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً     بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ
وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مَجَنَّةٍ     وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

واتە:

ئای ئەمردمایە، شەوێ لەشەوان     شەوارەم دەگرت لەگردی سەیوان
مەست دەبوم لەبۆی گوڵی ئەرخەوان     لەمن دەردەکەوت چیای بەرانان

---

[٨٧٠] تجرید/٢، ژمارە: ٨٧٠ = ١٨٨٩ مسلم: ١٣٧٦ = ٣٣٢٠.

بیلال دەیشی فەرموو: لەعنەتو نەفرەتی خودا لەشەیبەی کوڕی رەبیعەو لەعوتبـەی کـوڕی رەبیعـەو لەئومەییـەی کـوڕی خەلـەف کەئـەم سـتەمکارانە ئێمەیان لەناو خاكو ولاتی خۆمانەوە وەدەرناو ناچاریان کردین کە کۆچ بکەین بۆ ئەم ولاتە پەتاوییە.

لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: « اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ ».

ئـەی خودایـە! مەدینـەمان لـەلا خۆشەویـست بکـە، وەك مەککـە یـاخود خۆشەویستریش، ئەی خودایە! پیتو فەڕو بەرەکەت بڕێژە بەسەر مەنو مشتو میوەو دانەوێڵەمانا وە تەندروستیو لەشـی ساغ بـدە بـە دانیـشتوانیو بیکـە بـە شـارێ، سـاخلەمو سـازگار بۆمـان، وەناسـازیو ناساغییەکەشـی بگـوێزەرەوە بـۆ جەحفە.

عائیشە دەفـەرموێ: کـە کۆچمان کـرد بـۆ مەدینـە، ئـەو سـاکە ناسـازترین ولاتـی خـودا ئـەوێ بـوو، شـیوی بـوطحـان جمـەی دەهـات لەسـییانو چڵکاو!. (تاج/٢/٢٨٤ ز/١٣٢-١).

## پایانێ

مامۆسـتا عەسـقەلانی لـەپایانی نامـەی فـەضـلو گـەورەیی مەدینـەدا دەفـەرموێ: ئـەم باسـە (٢٦) فـەرموودەی لـەخۆ گرتـووە، چواریان بـێ ڕشـتەن، تـەعلیقن، واتـە: هەڵواسـراو نۆیـان دووبـارەن، پوختەتەکـەیان (٢٦-٩=١٧) حەفـدە فەرموودەیە، شێخی موسلیمیش هەموویانی تەخریج کردووە، جگە لەمانەیان:

١- فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە سەبارەت بەباسی خێڵی نەوەی حاریثە (٨٥٥ ت = ١٨٦٩ ف).

٢- فەرموودەکەی ئەبو بەکرە لەبارەی باسی جەجاڵەوە، (٨٦٤ ت = ١٨٧٩ ف).

هەروا دەفەرموێ: یەك بیسراو (أثر)یشی واتیا، کە بیسراوەکەی عومەرە، کە جارێ بەمەوصوڵی‌و جارێ بەبێ رشتە تەخریج کراوە.

لەتەجریدەکەدا حەڤدە فەرموودە پوختەکە هەیە، کەلەژمارە (٨٥٤)ەوە هەتا (٨٧٠) چونکە (٨٧٠-٨٥٣ = ١٧).

## شیعرەکەی ئیمام ئەبوبەکر بە پەخشان واتە:

هەموو کەسێ سەر لەبەیانی، بەیانی باشی لێ دەکرێ‌و کەسوکاری پێی دەڵێن بەیانیت باش، رۆژ باش، دووریش نییە کەمردن لەپەنا گوێیابێ، لەقەیتانی پێڵاوەکانی لێی نزیکتر بێ.

## شیعرەکانی حەزرەتی بیلالیش بە پەخشان واتە:

خۆزگە دەمزانی کە ئایا جارێ تر، وەك جاران لەشیوێ لەشیوە دڵگیرەکانی مەککەی نیشتمانی خۆم، شەودەکەمەوە.

وە بۆن‌و بەرامەی گیاو گوڵ‌و گوڵزارەکانی ئەوخاکە خۆشە دێتەوە بەسەرما، وەك گیای سرناتك‌و گیای (ثومامە).

ئایا دەبێ جارێ تر رێم بکەوێتەوە سەرکانی‌و کارێزەکەی مەجیننە، کەوا نزیك بازاڕی عوکاظ بوو، ئایا دەبێ چیای شامەو چیای طوفەیل ببینمەوە کەدوو چیان لەچیاکانی مەککە.

## (٨٧) باب صِيَانَةُ المَدينَةِ مِنْ دخُول الطَاعونِ وَالدَّجَّال إلَيهَا
## تاعوونو جەجاڵ ناچنە ناو مەدینە

٨٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ ». {الحديث: ٣٣٣٧ = ٣٣٢٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٦٥ = ١٨٨٠، ٧٣١، ٧١٣٣}: [٨٧١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەسەر هەموو کوچەو شەقامێکی مەدینە فریشتە راوەستاون، ئێشکی دەگرن، لەبەرئەوە نە تاعوونو نە جەجاڵ ناچنە ناوی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨}.

## (٨٨) بابُ المَدينَةِ تَنفي شِرارَهَا
## مەدینە گەندەکانی ناوی رەهەنە دەکا

٨٧٢- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). « أُمِرْتُ بِقَرْيَةٍ تَأْكُلُ الْقُرَى يَقُولُونَ يَثْرِبُ. وَهْيَ الْمَدِينَةُ، تَنْفِي النَّاسَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ ». (الحديث ١٨٧١): [٨٧٢]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: فەرمانم پێ کراوە کە کۆچ بکەم بۆ گوندێ کە گوندان دەبەزێنێ، ناپاکان پێی دەڵێن یەثریب واتە لۆمەو سەرزەنشت بەڵام هەر خۆی سەرکوڵی شارانەو ناوی خۆی وا بەخۆیەوە کە مەدینەیە، ئەم شارە گەندەکانی مەردوم رەهەنە دەکا، وەك چۆن مووشەدەمەو کوورە چڵكو ژەنگی ئاسن لادەبەن!. (تاج/٢/٢٩٠-٣) + (تاج/٢/٢٧٧ ز/١٨٣ س/ف/١-).

---

[٨٧١] تجرید/٢، ژمارە: ٨٦٥ - ١٨٨٠ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٨١ - ٣٣٣٧ شیحا.

[٨٧٢] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٧ = ١٨٧١ مسلم: ١٣٨٢ = ٣٣٤٠ شیحا.

٨٧٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ . أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى الإِسْلاَمِ فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ ، فَأَتَى الأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقِلْنِي بَيْعَتِي ، فَأَبَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ أَقِلْنِي بَيْعَتِي فَأَبَى ، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ أَقِلْنِي بَيْعَتِي فَأَبَى فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَيَنْصَعُ طِيبُهَا »: [٨٧٣]

**له تەجریدی بوخاریدا ژمارە (٨٦٨) ئاوایە:**

عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) جَاءَ أَعْرَابِيٌّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَبَايَعَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَجَاءَ مِنَ الْغَدِ مَحْمُومًا، فَقَالَ أَقِلْنِي، فَأَبَى ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَقَالَ « الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طَيِّبُهَا ». (الحديث ١٨٨٣، أطرافه ٧٢٠٩، ٧٢١١، ٧٢١٦، ٧٣٢٢):

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەیعەت و پەیمانی پێ دا لەسەر ئیسلامەتی، وە بۆ سبەینێ هاتەوە تادار بوو، بەپێغەمبەری گوت: پەیمانەکەم هەڵوەشێنەرەوە، ڕێگەم بدە بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم، ئاوو هەوای ئێرەم پێ ناکەوێ، وە سێ جار ئەم داوایەی لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داواکرد، وە هەرسێ جارەکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داواکەی قەبوڵ نەکرد، لەگەڵ ئەوەیشا کابرای دەشتەکی شاری بەجێ هێشت و پەیمانەکەی شکاند، جا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەدینە وەك مووشەدەمە وایە، چۆن موشەدەمەو کوورە چڵك و ژەنگی ئاسن و زێڕو زیو لادەبەن و جەوهەری کانزاکە دەردەخەن و شەوقی پێ هەڵدەهێنن

---

[٨٧٣] تجرید/٢، ژمارە: ٨٦٨ = ١٨٨٣ مسلم: ٣٣٤٢ شیحا.

مەدینەش ئاوەها پیاوی خراپی ناوی ڕەهەنە دەکاو، پیاو باشانی ناوی پەروەردە دەکاو شەوقیان پێ هەڵدەهێنێ. (تاج/٢/٢٧٧ ز/١٣٨ -٣ = ژمارە: ١٧٢٨، چ/٤ - ش/ت).

٨٧٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّهَا طَيْبَةُ تَنْفِي الذُّنُوبَ كَمَا تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الْفِضَّةِ »:(٨٧٤)

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەدینە تەیبەیە (طیبە - طابە = واتە: شارێکی خۆش‌و باش‌و سازگارو خاوەنی دانیشتوانی باش‌و خاسە) وەك چۆن ئاگری کوورە چڵك‌و ژەنگی ئاسن‌و زێرو زیو لادەباو جەوهەری کانزاکە دەردەخاو شەوقی پێ هەڵ دەهێنێ، مەدینەیش ئاوەها پیاوی خراپی ناوی ڕەهەنە دەکاو، پیاو باشانی ناوی پەروەردە دەکاو شەوقیان پێ هەڵدەهێنێ). {تجرید/٢، ژمارە: ٨٦٨}.

## (٨٩) بابُ مَنْ أرَادَ أهْلَ المَدِينَةِ بِسُوءٍ أذَابَهُ اللهُ
## هەرکەسێ بیەوێ بۆ خەڵکی مەدینە خراپ بێ، خودا وەك خوێی ناو ناو دەیتوێنێتەوە

٨٧٥- عن سَعْد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ « لاَ يَكِيدُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَحَدٌ إِلاَّ انْمَاعَ كَمَا يَنْمَاعُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ ». (الحديث ١٨٧٧):(٨٧٥)

(٨٧٤) بخاری. فضائل المدینە: ١٨٨٤ مسلم: ٣٣٤٣ شیحا.

(٨٧٥) تجرید/٢، ژمارە: ٨٦٢ = ١٨٧٧ مسلم: ١٣٨٧ = ٣٣٤٨ شیحا.

سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی فڕو فێڵ لە خەڵكی مەدینە بكا، وەك خوێ ناو ئاو دەتوێتەوە. (تاج/٢/٢٨٣ ز/١٤١، ژمارە: ١٧٤١، چ/٤).

**خودایە ئەوەی فڕو فێڵ لەخەڵكی ئەم كوردستانە موبارەكەش دەكا وەك خوێی ناو ئاو بەزویی بیتوێنەرەوە، ئامین ) ٢٠٠٣/٧/١٠**

**دیسان: ئامین – ٢٠١٤/٨/٥**

## (٩٠) باب الترغيب في المدينة عند فتح الأمصار
## هاندان لەسەر نیشتەجێ بوون لە مەدینە كاتێ موسوڵمانان وڵاتی زۆر ئازاد دەكەن

٨٧٦- عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « يُفْتَحُ الْيَمَنُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، ثُمَّ يُفْتَحُ الشَّامُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ، وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، ثُمَّ يُفْتَحُ الْعِرَاقُ فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ». {الحديث: ٣٣٥١ = ٣٣٣٩ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٦٠ = ١٨٧٥} :[٨٧٦]

سوفیانی كوڕی ئەبو زوهەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم گوێم لە پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (یەمەن ئازاد دەكرێو دەبێ بە وڵاتی ئیسلام، جا زۆر كەس بەگورجی دێنەوە بۆ مەدینەو كەس‌وكاری خۆیان‌و ئەوانەی كە بەگوێیان بكەن

[٨٧٦] تجريد/٢، ژمارە: ٨٦٠ = ٣٤٣١ = مسلم: ١٣٨٨ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٨٥ = ٣٣٥١ شيحا.

هەڵیان دەگرن‌و دەیانبەن بۆ یەمەن، لەبەر زۆری رزق‌و رۆژی‌و ژیواری خۆش‌و باشی ئەوێ، بەڵام ئەگەر بزانن مەدینەیان گەلێ باشترە، وە شامیش هەروەها، وە عێراقیش هەروەها، کە ئازاد دەکرێن، خەڵك لە مەدینەوە روودەکەنە ئەوێ، ئەگەر بزانن مەدینەیان باشترە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ١٧٤٦}:

**روونکردنەوە:**

سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەرە، لەپیاوانی صەحیحی بوخاری‌و صەحیحی موسلیمە، ئەزدییە، لەهۆزی ئەزدی شەنووئەیە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرو سائیبی کوڕی یەزید، فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە، ئەوەیش نیشانەی ئەوەیە کە سوفیان هاوەڵێکی شکۆمەندی پێغەمبەر بووە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو.

## (٩١) باب في المدينة حينَ يتركُها أهلُها
## ڕۆژێ دەبێ خەڵکی مەدینە چۆڵی دەکەن

٨٧٧- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ « يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لاَ يَغْشَاهَا إلاَّ الْعَوَافِ – يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ – وَآخِرُ مَنْ يُحْشَرُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ، يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا، فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا ». (الحديث ١٨٧٤): [٨٧٧]

---

[٨٧٧] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٩ = ١٨٧٤ مسلم: ١٣٨٩ - پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٧٨٦ - ٣٣٤٢ شیحا.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنە وتم لەپێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: مەدینە لەو پەڕی خۆشیو باشی دا دەبێ، کە دانیشتووەکانی بەجێی دەهێڵن، وا چۆڵو هۆڵ دەبێ کەس سەری پیاناکا، مەگەر مەلو مۆرو جانەوەری مووشەکەر، کە بۆ ملۆمووشو مووشەکردن دەچن بۆ هەوارە کۆنو شوێنی چۆڵ بووا وە دواترین کەسیش کە لەوڵات دەردەکرێنو دەبرێن دوو شوانی موزەینەیی دەبن، دەیانەوێ کە بچن بۆ مەدینە، دەنگ لە ڕانەکەیان دەکەنو پێر کەدەکەن بەناویا، جا کە دەچن تەماشا دەکەن مەدینە چۆڵو هۆڵو سامناكو چۆلەکە بکوژی تیانیە، جا لە مەدینە دەردەچنو دەڕۆن دەگەنە ثەنییەتول وەداع، لەوێ بەسەردەما دەکەون خرپ دەمرن!. (تاج/٢/٢٩٠ ز/١٤٣ ف/٢ — ش = ژمارە: ١٧٤٩ ج/٤).

## (٩٢) باب ما بين القبر والمنبر رَوْضَةٌ مِنْ رِياضِ الجَنَّةِ
## نێوانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرو دوانگەکەی باخێکە لە باخەکانی بەهەشت

٨٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي ». {الحديث: ٣٣٥٥ — ٣٣٤٥ فم} : [٨٧٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەنێوانی گۆڕەکەمو مینبەرەکەما، باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، بارانی رەحمەتی لێ دەبارێ، خۆشی لەو کەسەی کە لەم شوێنە پیرۆزەی مزگەوتەکەما بەتایبەتی، تاعەتو خواپەرستی جوان دەکا، وە

---

[٨٧٨] تجرید/٢، ژمارە: ٥٨٩ = ١١٩٦ مسلم: ١٣٩١ = مختصر صحيح مسلیم/٢، ژمارە: ٧٨٧ = ٣٣٥٥ شیحا.

ئەم دوانگەیەی ئێستاکەشم، کە ئێستا لە بۆنەکانا وتاری لەسەر دەدەم، لەسەر حەوزی کەوثەرم کەوا لەبەهەشتا، وەك ئێستاکەی خۆی دادەنرێتەوە بۆم، لەبەهەشتیشا وەك ئێستام لەسەری دادەنیشمو، پێشوازی لە هاتووانی ئۆمەتم دەکەم، کەبۆ نۆشین لەئاوی حەوزی کەوسەر دێن بۆ سەری). {تاج/١، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٦٩٣ + تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٥٦٧٥} .

٨٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مابَيْنَ بَيْتِي وَ مِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِياضِ الجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي). (الحَديث ١١٩٦ – أطرافُهُ في: ١٨٨٨، ٦٥٨٨، ٧٣٣٥): [٨٧٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (لەنێوانی گۆڕەکەم و مینبەرەکەمدا، باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، بارانی ڕەحمەتی لێ دەبارێت، خۆشی لەو کەسەی کەلەم شوێنە پیرۆزەی مزگەوتەکەما بەتایبەتی، خوداپەرستی جوان دەکا، وەئەم مینبەرەی ئێستاکەیشم، لەسەر حەوزی کەوسەرم، کەوا لە بەهەشتا، وەك خۆی دادەنرێتەوە بۆم و، لە بەهەشتیشا وەك ئێستا لەسەری دادەنیشم و، پێشوازی لەهاتووانی ئۆمەتم دەکەم، کە بۆ نۆشین لەئاوی کەوسەر دێن بۆ سەری). (بڕ: تاج /١/٣٥٠).

---

[٨٧٩] تجرید/٢، ژمارە: ٥٨٩ = ١١٩٦ مسلم: ١٣٩١ = ٣٣٥٧ شیحا.

## (٩٣) باب أُحُدُ جَبَلُ يُحِبنا وَنُحِبهُ

## چیای ئوحود ئەو ئێمەی خۆش دەوێ، ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێ

٨٨٠- عَنْ أَبِى حُمَيْدٍ قَالَ أَقْبَلْنَا مَعَ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ حَتَّى إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ قَالَ «هَذِهِ طَابَةُ ، وَهَذَا أُحُدٌ ، جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ »: (٨٨٠)

**ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا درێژە، لەژمارە (٧١٣)دا ئاوایە:**

عَنْ أبي حُمَيدٍ السَّاعِدِيّ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: غزَوْنَا مَعَ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزْوَة تَبُوكَ، فَلَمَّا جَاءَ وادِيَ القُرى، إذا امْرأةٌ في حَدِيقَةٍ لَهَا، فَقَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأصْحَابِهِ: (أخْرُصُوا) وَخَرَصَ رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةَ أوْسُقٍ، فقَالَ لَهَا: (أَحْصي مَايَخْرُجُ مِنْهَا). فَلَمَّا أتَيْنَا تَبُوكَ قَالَ: (أمَا، إنَّهَا سَتَهُبُّ اللَيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدةٌ، فلايَقُومَنَّ أحَدٌ وَمنْ كَانَ مَعَهُ بَعيرٌ فَلْيَعْقِلْهُ). فَعَقَلْنَاهَا، وَهبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَقَامَ رَجُلٌ فَألْقَتْهُ بِجَبَلِ طَيِءٍ. وَأَهْدَى مَلِكُ أيْلَةَ للنَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بغاةً بَيْضاءَ، وَكَسَاهُ بُرْداً وَكَتَبَ لَهُ بَبَحْرِهِمْ، فَلَمَّا أتى وَاديَ القُرى قَالَ لِلْمَرْأةِ: (كَمْ جَاءَتْ حَدِقَتُكِ) قَالَتْ: عَشَرَةٌ أَوْسُقٍ: خَرَصَ رَسولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إني مُتَعَجِلٌ إلى المدِينَةِ فَمَنْ أرادَ مِنْكُمْ أنْ يَتَعَجَلَ مَعي فَلْيَتَعَجَّلْ)، فلَمَّا – قَالَ الرَّاوي كَلَمةً مَعْناها أشْرَفَ عَلى المدينةِ قالَ: (هذهِ طابَةُ) فَلَمَّا رَأي أُحُداً قالَ: (هذا جَبَلُ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، ألاَ أُخْبِرُكُمْ بخَيرِ دُورِ الانصارِ). قَالُوا: بَلى، قالَ: (دُورُ بَنِيَ النَّحارِ، ثُمَّ دُورُبَني عَبْدِ الأشهَلِ ثُمَّ دُورُ بَنى سَاعِدَةَ، أوْ دُورُ بَني الحارِثِ بْنِ الخَزْرِجِ، وَفي كُلّ دُورِ الأنْصارِ – يَعْنس – خَيْراً). (الحديث ١٤٨١ – أطرافه في: ٣٧٩١،٣١٦١،١٨٧٢، ٤٤٢٢):

(٨٨٠) تجرید/٢، ژمارە: ٧١٣ - ١٤٨١ پوختەی مسلم/٧٨٨ = ٣٣٦٠.

ئـەبو حومەیـدی ئـەل – سـاعیدی (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: لـە خزمــەتی حەزرەتــدا (دروودی خــوای لێ بــێ) چــووین بــۆ غــەزای تــەبووك، کەگەیشتینە وادیلقورا، ژنێ لەناو باخێکی خۆیدا بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەهاورێیانی خۆی فەرمو: (ئادەی ئەم بـەری ئـەم باخـە بخـەمڵێنن) ئێمەش هەرکەسەمان بەجۆرێ خەملاندمان، وەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی خەملاندی بەدە وەسق، وە بەژنەکەشی فەرموو: (تۆ سەرژمێری بکە، بـەری باخەکـە چـەندەبوو ژمارەکـەیمان بـۆ لەبەربکـە). ئـەوجا ڕۆیـشتین هـەتا چووینە تەبووك، پێغەمبەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- فـەرمووی: (ئاگـاداربن! کـە ئەمــشەو بایــەکی ســەخت هەڵــدەکا لێتــان، کەســتان لەوکاتــەدا هەڵمەســن، هەرکەســەش وشــتری هەیــە باتونــد پێوەنــدی بکــا) جائێمــەیش وشــترەکانمان ئەشکێل کرد، جابایەکی سەختی وا هەڵی کـرد، پیـاوێ لەوکاتـەدا هەڵسا بایەکـە هەڵیگرتو لەلای دووکێوەکەی طەیدا، لەوێ تووڕیدا، فروستادەی ئیبنـو عـەلمای شای ئەیلە نامەیەکی لە ئیبنوعەلماوە هێنا بۆ پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بێ- لەگەڵ هێسترە ماچەیەکی سپیدا، بـەدیاریی، پێغەمبـەریش -دروودی خـوای لەسەر بێ- نامەیەکی بۆی ناردو عەبایەکی نایابیـشی بـەدیاری بـۆ نـاردو بـەپێی پەیماننامەیــەکی نووســراو، بەرامبــەر ســەرانەیەکی دیــاریکراو، لەســەر قەڵەمڕەوەکەی خۆی هێشتیەوە، جاکاتێ هاتینـەوە بـۆ وادیلقـورا، پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- بـۆ مەسـەلەی بـەری باخەکـە لەژنەکـەی پرسـی: (بەرەکـەی چـەند وەسـق دەرچـوو ؟).گـوتی: دە وەسـق: دەق بەقـەد ئـەوە کـە پێغەمبەر خەملاندی. ئەوجا پێغەمیبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بێ- فـەرموی: (من بەزوویی دەڕۆمەوە بۆ مەدینە، جا ئەوەی حەز دەکا لەگەڵ مـن دابـێ ئـەوە کەیفی خۆیەتیو ئەوەشی حەزدەکا لێرە بمێنێتـەوە ئـەوە بابمێنێتـەوە). ئەوسا

کەوتینـە ڕێ، کاتـێ لـەدوورەوە مەدینـەمان لـێ دەرکـەوت، پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەمـە طـابەیـە) کـاتێکیش چاوی بەچیای ئوحـود کـەوت فـەرمووی: (ئـەوەیش چـیای ئوحـودە، ئـەم کێـوە ئێمـەی خـۆش دەوێ‌و ئێمـەش ئـەومان خـۆش دەوێ !). لەپاشـدا فـەرمووی: (ئـەدی باپێتـان بڵێم کـە باشترین تیرەکانی یاریـدەدەران (انـصار) کامانـەن). یـاران فـەرموویان بفـەرموو، فەرمووی: (باشترین بنەماڵەی یاریدەدەران، کـە هـەموویان هەرباشـن، بنەماڵـەی بەنی نەجارن، ئەوجا بنەماڵەی بەنی عەبدول ئەشهەل، ئەوجا بنەماڵـەی بـەنی سـاعیدە، ئـەوجا بنەماڵـەی بـەنی حاریـسی کـوڕی خـەزرەج، وەکـی تـریش بەشـێوەیەکی گـشتی تـیرەو بنەماڵـەو گەڕەکـەکانی یاریـدەدەران هـەموویان هەرخێردارو خاسن). (تاج/١/٣٣١/٤ ز/١٠٢ = تاج/٣، ژمارە: ٣١٦٨ ج/٤ - م/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەینی دەفەرموێ: ئـەم فەرموودەیـە موسـلیم اخراجـی کـردووە. مەدینـە لەپێشا ناوی یەثریب بوو، تائەندازەیێ ئاوو هەوای بۆ لاوەکی ناسازبوو، یەثریب واتە: لۆمەو سەرزەنشت. جالەبەر ئەم واتایـە پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بێ- ناوەکەی گۆڕی‌و فەرمووی: (خـودای گـەورە خـۆی مەدینـەی ناونـاوە طابـە) طـابـە وشـەیەکی عەرەبییـە، واتـە: شـارێکی خـۆش‌و بـاش‌و سـازگارو خـاوەنی دانیـشتوانی خـاس‌و بـاش.عەسـقەلانی‌و عـەینی -ڕەحمـەتی خودایـان لـێ بـێ- دەفەرموون: إحصاء بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونکە عەرەبەکان بێ سەواد بـوون، وە نووسینیان باش نەدەزانی، لەبەرئەوە ژمارەیان بە وردە بەردو چەو کۆنترۆڵ دەکـرد، کـەپێیان دەڵـێن (حـصی) بـۆ شـارەزابوونی تـەواو لـەپیرۆزیی مەدینـە بڕوانە: (تاج/٢ ز/١٣٨) تا دوایی.

**ڕوونكردنەوە:**

ئـەبو حومەیـدی ئەلـساعیدی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) هـاوەڵێكی نـاوداری پێغەمبەرە، ناوی عەبدولڕەحمانی كوڕی سەعدە، ئەنصارییە، خەڵكی مەدینەیە، مەنـسووبە بـۆلای (سـاعدە)كـە بابەگـەورەی هـۆزی خەزرەجـە لەمەدینـە، بەكەسناوەكەی ناسراوەو ناوی دەركردووە، ئامادەی جەنگی ئوحـودو مەڵبەنـدو شەڕگاكانی دوای ئوحود بووە، لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا لـە دژی بـێ باوەڕەكـان، لـەپێناوی ئیـسلامدا، لـەپیاوانی صـەحیحەینە، واتـە: لـەو صـەحابانەیە كـە گێڕانـەوەیان لـە صـەحیحی بوخـاریو صـەحیحی موسـلیمدا هەیـە، لـەكۆتایی جێنشینی موعاوییەدا فەوتی كردووە، (ڕەزای خودای لێ بێ).

**(٩٤) باب فضل الصلاة بِمَسْجِدي مكَّةَ والمدينة**

**خێری زۆری نوێژ لە مەسجیدولحەرام لە مەككەو لە مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینەی نازدار**

٨٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : انَّ النَبِـيّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: (صَـلاَةٌ فِي مَـسْجِدِي هَـذا خَيْـرٌ مِـنِ أَلْـفِ صَـلاةٍ فِيمـا سِـواهُ، إلاَّ المَـسجِدالحَرامَ). (الحديث ١١٩٠): [٨٨١]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە -دروودی خـوای لەسەر بێ- دەفـەرموێ: تـەنیا مەسجیدول حـەرامی لێ دەرچـێ، یـەك نوێـژ لـەم مزگەوتەی مندا لە هەزار نوێژ لەشوێنانی تردا خێرترە.

[٨٨١] تجريد/٢، ژمارە: ٥٨٧ = ١١٩٠ مسلم: ١٣٩٤ = مختـصر صـحيح مـسلم/٢، ژمـارە: ٧٩٠ - ٣٣٦٢ شيحا.

لە تاجول ئوصولا دەفەرموێ: بوخاری و موسلیم و تەرمەزی و ئیبنو ماجەیش ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، ئیبنوماجە ئەمەیشی لێ پترکردووە: (وە یەك نوێژ لە مەسجیدولحەرامدا خێرترە لە سەدهەزار نوێژی شوێنانی تر). (بڕوانە: تاج/١ ل/٣٥٠ ز/١١٥، ژمارە: ٦٩٤ چ/٤).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

مامۆستای عەسقەلانی - ڕەحمەتی خودای لێ بێ- لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (مەبەست لەمەسجیدولحەرام هەموو حەرەمی مەککەیە، تەنانەت نوێژکردن لەناو هەموو خانووەکان و بەشەکانی تری خاکی حەرەمدا، لەبارەی چەند بارەوەبوونی پاداشتەوە، دەق وەك نوێژکردن لەناو مەسجیدولحەرامدا وایە.. وە سەفەرکردن بۆ سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر لەمەدینە بەرئەم نەهیە ناکەوێ، بەڵکوو شتێوا پیرۆز لەوکردەوە فرمباشانەیە کەدەبن بەمایەی شاد بوون بەرەزای خودای گەورەو مەزن، وەڕەوایی ئەوە بەبێ کێشەوبەرە ئیجماعی لەسەرە..) وەگلەیی لە ئیبو تەیمیە لەم مەسئەلەیەدا دەکا.

وەدەیش فەرموێ: (ئەمە بەس لەپاداشا وایە، بەڵام بۆ گێڕانەوەو بریتی کەوتن و شتیوا، وانییە، چونکە کەسێ دوو نوێژی لەسەربێ، لەیەکێ لەم دوو مزگەوتەدا نوێژێ بکا هەربرێتی یەکێکیان دەکەوێ.. وەئەم چەند بارەوەبوونی پاداشە جگە لەهی جەماعەتە، کەئەویش بیست و حەوت پلەی پترە..). (بڕ: فەتح شەرحی فەرموودەی ژمارە: ١١٩٠، باسی گەورەیی مزگەوتی مەککەو مەدینە). لەژمارە (٩)دا گوترا: ئەبوهورەیرە لە بوخاری دا (٤١٨) فەرموودەی هەیە لە موقەددمەی فەتحولباری دا دەڵێ: لە بوخاریدا (٤٤٦) هەیە.

## (٩٥) باب لاتُشَدُّ الرِحَالَ إلاَّ إلى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ
## تەنیا بۆ ئەم سێ مزگەوتە سەفەر دەکرێ

٨٨٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ ، عَنِ النَبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قـالَ: (لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلى ثَلاَثَةِ مَساجِد: المَسْجِد الحَرام، وَمَسْجِد الرَّسُولِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، وَمَسْجِد الأَقْصى). (الحَدِيث ١١٨٩)؛ [٨٨٢]

لە ئەبوهورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (تەنیا بۆ ئەم سێ مزگەوتە سەفەر دەکرێ: بۆ مەسجیدولحەرام لەمەککەو، بۆ مزگەوتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە مەدینەو، بۆ مەسجیدولئەقصا لەشاری قودس لە فەلەستین).

## (٩٧) باب فَضْلِ مسجد قباء وَفضل الصَلاَة فيه وَزِيارَتِه
## باسی گەورەیی مزگەوتی قوباو خێری نوێژکردن تیایداو خێری دینیو سەردانی کردنی

٨٨٣ـ(عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ كَانَ لاَيُصَلِّي مِنْ الضُّحَى إِلاَّ فِي يَـوْمَيْنِ يَـوْمَ يَقْدَمُ بِمَكَّةَ فَإِنَّهُ كَانَ يَقْدَمُهَا ضُحًى فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ ثُمَّ يُـصَلِّي رَكْعَتَـيْنِ خَلْـفَ الْمَقَـامِ وَيَوْمَ يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَأْتِيهِ كُلَّ سَبْتٍ فَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ كَرِهَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُ حَتَّى يُصَلِّيَ فِيهِ قَالَ وَكَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَـانَ يَـزُورُهُ رَاكِبًا وَمَاشِـيًا) (الحـديث ١١٩١– أطرافـه فـي:١١٩٣، ١١٩٤، ٧٣٢٦). قَـالَ: وَكَانَ يَقُولُ: (إِنَّمَا أَصْنَعُ كَمَا رَأَيْتُ أَصْحَابِي يَصْنَعُونَ وَلَا أَمْنَعُ أَحَدًا أَنْ يُصَلِّيَ فِـي أَيِّ

---

[٨٨٢] تجريد/٢، ژمارە: ٥٨٦ = ١١٨٩ مسلم ترقيم محمد فؤاد: ١٣٩٧ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٨٩ - ٣٣٦١ شيحا.

سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ غَيْرَ أَنْ لَا تَتَحَرَّوْا طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبَهَا). (الحديث ١١٩٢): [٨٨٣]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، کە ناسراوە بە ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەستووری وابوو تەنها لەم دوو ڕۆژەدا، لەکاتی چێشتەنگاودا نوێژی سوننەتی دەکرد: ئەو ڕۆژەی کەدەڕۆیشتە ناوشاری مەککە، لەکاتی چێشتەنگاودا دەچووە ناوشار، جا لەپێشا دەچوو تەوافی بەیتی دەکرد، ئەوجا لەپشتی مەقامی ئیبراهیمەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد.

هەروا ئەو ڕۆژەیش کە دەچوو بۆ سەردانی مزگەوتی قوباء دیسان لەکاتی چێشتەنگاودا نوێژی سوننەتی دەکرد، چونکو ئیبنوعومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- هەموو شەممەیێ دەڕۆیشت بۆسەردانی مزگەوتی قوباء، جاکاتێ دەچووە ناو مزگەوتەکەوە حەزی نەدەکرد لێی دەرچێ، هەتا دووڕکات نوێژی سوننەتی تێدا نەکردایێ، فەرمووی: ئیبنوعومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (جاران پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- هەموو شەممەیێ بە پێ، یا بەسواریی وڵاخ دەچوو بۆسەردانی مزگەوتەکەی قوباء).

فەرمووی: ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەشی فەرموو: (ئەی نافیع ! ئەمەی من دەیکەم تەنیا ئەوەیە کە لەهاوڕێکانی خۆمم دیوە کردوویانەو بەس، وەرێگەی نوێژکردنی سوننەتیش لەکەس ناگرم، لەهەر کاتێکی شەودا، یا لەهەرکاتێکی ڕۆژدا، بۆ خۆی نوێژی سوننەت بکا، بەڵام بەمەرجێ لەکاتی خۆرکەوتن و خۆر ئاوابووندا نەبێ).

---

[٨٨٣] تجرید/٢، ژمارە: ٥٨٨ = ١١٩١ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٩٢ = ٣٣٧٦ شیحا.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

عەسقەلانی -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: (.. ئەوەی کە دەفەرموێ:.. لەکاتی چێشتەنگاودا ئیبنوعومەر نوێژی سوونن‌ەتی دەکرد، هەڵدەگرێ کەمەبەست نوێژی سوونن‌ەتی تەواف بێ، یامەبەست نوێژی سوونن‌ەتی تەواف و سوونن‌ەتی چێشتەنگاوبێ پێکەوە، چونکە کردنی ئەو نوێژە بەتایبەتی لەو کاتەدا بەڵگەی ئەوەیە کەمەبەستی کردنی نوێژی چێشتەنگاو بێ. (بڕ: فەتح، فەرموودەی ژمارە ١١٧٦).

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (٥٨٨)ی تەجریدی بوخارییە بۆ ئەم فەرموودەیە، ئەمەیش گێڕانەوەی پوختەی موسلیم ژمارە (٧٩٢) بۆ هەمان فەرموودە:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ، رَاكِبًا وَمَاشِيًا فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ. {الحديث: ٣٣٧٦ = ٣٣٦٥. تجريد/٢، رقم: ٥٨٨ = ١١٩١، ١١٩٣، ١١٩٤، ٧٣٢٦}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جاروبار بە سواریو جاروبار بەپێ دەچوو بۆ مزگەوتی قوباء، دوو ڕکات نوێژی سوونن‌ەتی تیادەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٦٩٧ ج/٤}.

**پوختەی فەرموودەکانی نامەی حەج کە روکنی پێنجەمە:**

١- حەج لەتەمەنا یەکجار فەرزە، هەروا عەمرەیش لەتەمەنا یەکجار فەرزە، بەڵام حەجی زۆرو عەمرەی زۆر، زۆر سونن‌ەتە بۆ هەموو موسوڵمانێ.

٢- حەج یەکێکە لەو پەرستشانەی کە مرۆڤ لەگوناه پاك دەکاتەوە، وەك ئەو ڕۆژەی کە لەدایك دەبێ، بەمەرجێ حەجێکی گیرا بێ.

٣- حەج کاتی تایبەتی هەیە، بەڵام عەمرە کاتی تایبەتی نییە.

٤- ئەو حەجەی کە حاجی لەگوناه پاك دەکاتەوە، وەك منالّی ساوا، حەجی گیرا بووە، نیشانەی حەجی گیرا بوو ئەوەیە: کە رەفتاری حاجی لەپاش حەجەکەی بەرەو باشیو خواپەرستی بڕوات، نەوەك بەرەو خراپی.

٥- ڕۆژی عەرەفە ڕۆژی لێبووردنی گشتییە، ڕۆژووەکەی سوننەتە. {بڕوانە: پوختەی موسلیم کۆتایی بابەتی حەج کە لەپاش ژمارە: ٧٩٣وە روونکراوەتەوە لە پوختەی موسلیمدا} .

٦- کەسێ لەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ حەج دروستە، یا لەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ عەمرە دروستە، ئایا بەخۆڕایی بچێ پارەی نەوێ، وەك ئەوە کەسێ لەجیاتی باوکی یا دایکی، یا منالّی، یا هاوسەری خۆی حەج، یا عەمرە بکا، یان کەسێ بەپارە بچێ لەباتی کەسێکی تر بچێ بۆ حەج یان بۆ عەمرە، لەکاتی وادا واباشە ئەم شتانە ڕەچاو بکرێ:

١- وەکیل حەج هەم حەجو هەم عەمرە بۆ کەسەکە بکات، چونکە عەمرەیش پێویستە وەك حەج، ئەگەر کاتەکە کاتی حەج بوو.

٢- ئەو کەسەی لەجیاتی کەسێکی تر دەچێ بۆ حەج دەبێ خۆی حەجی فەرزی کردبێ، وە خۆی حەججەتول ئیسلامی لەسەر نەبێ، وە هەروەها ئەگەر لەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ عەمرە دەبێ خۆی عەمرەتول ئیسلامی لەسەر نەبێ، وە هەروەها ئەو کەسەی کە حەجی فەرز، یان عەمرەی فەرزی بۆ دەکرێ دەبێ خۆی لەبەر مەهانەی شەرعی نەتوانێ بچێ بۆ حەج یان بۆ عەمرە یان مردبێ.

٣- حەجو عەمرە بۆ مردوو دەکرێ، بەبێ قەیدو مەرج، ئیتر حەجو عەمرەی فەرزبێ یا سوننەت.

٤- دروسته حەج بۆ زیندوو بکرێ، با ئەو زیندووە خۆشی بتوانێ حەج بۆ خۆی بکا، وە هەروەها عەمرە، بەمەرجێ ئەو حەجە یا ئەو عەمرەیە سوننەت بێو حەججەتول ئیسلامو عەمرەتول ئیسلام نەبێ.

٥- بەشێوەی گشتی حاجیو عەمرەکار دەبێ هێمن بێ، هەمیشە لەو سەفەرە پیرۆزەدا دەم بەیادو زیکری خودا بێ، دووربێ لەقسەی پڕو پووچ.

٦- حەج جۆرە گەشتو گوزارێکە، مرۆڤ تادەتوانی سەردانی شوێنە پیرۆزو جێگە دێرینەکان بکاتو پەندو ئامۆژگاری لەم لایەنەوە وەربگرێ وەك ئەشکەوتی حیراو کێوی ثەورو چیای ئوحود.

٧- گوناه لەناو بەست (حەرەم)ی مەککەو مەدینەدا، سزاکەی چەند قاتە، هەر وەك چاکەیش وەهایەو لەو دوو شوێنەدا پاداشەکەی چەند قاتە.

٨- ئەوەندەی دەکرێ حاجیو عەمرەکار، پێنج فەرزەکە، لەمەککە لە مەسجیدولحەرام بکەنو، لەمەدینە لەمزگەوتەکەی پێغەمبەر بیکەن، وە بەپێی توانا بەجەماعەتیش بیانکەن.

٩- بەپێی توانا درێغیو کۆتایی لەبەخشینو خێرکردن نەکەن.

١٠- نموونەو سەرمەشقێ جوان بن بۆ خۆیانو بۆ وڵاتی خۆیان.

١١- مەبەست لەڕۆژی حەجی ئەکبەر لەژمارە (٨٥٤)دا، لەپێشەوە رابورد.

١٢- سەفەری ژن بۆ حەج، یا بۆ عەمرە، یا دەبێ لەگەڵ خۆیی دابێ، یا لەگەڵ مێرددا بێ، یا لەگەڵ کۆمەڵێکا بێ کە لەسەرو ماڵو نامووسی خۆی بێ ترس بێ.

١٣- منداڵ، نێربێ یا مێ، حەجی بۆ هەیە، وە ئەو حەجە خێری هەیە، بەڵام بری حەجی فەرز، یا بری عەمرەی فەرز ناکەوێ، کاتێ گەورەبوو، توانای هەبوو، حەج یا عەمرەی لەسەرە.

**١٤- بۆنی خۆش بۆ حاجیو عەمرەکار، لەکاتی کردنیاندا نادروستە.**

**١٥- سەربڕینی ئاژەڵی دیاری خانەی خودا، خێرێکی گەورەیە. بڕوانە: ژمارە (٨٢٩ و ٨٣٠ و ٨٣١ و ٨٣٢).**

**١٦- عەمرە لەکاتی حەجدا دروستە، بەمەرجێ لە ئیحرامی حەجدا نەبێ، بەڵام ئیحرامداری حەج، بەس (قارن = جووتکار) بۆی هەیە کە عەمرە بکا لەگەڵ حەجەکەیدا.**

**١٧- ڕاو حەرامە بۆ حاجیو عەمرەکار، لەکاتی ئەنجامدانیاندا.**

**١٨- هەندێ جانەوەری زیانەخرۆ، بۆ هەموو کەسێ دروستە، لەهەموو کاتو لەهەموو شوێنێکا بیانکوژێت.**

**١٩- خۆ تیمارکردنو خۆ دەرمانکردنو خۆشۆردن لەکاتی حەجا دروستە، لەبەر پێویستی، بەڵام نابێ بە سابوونی بۆنخۆش خۆی بشۆرێ.**

**٢٠- خۆشۆردنو جلو بەرگ شۆردن دروستە.**

**٢١- گەورەیی عەمرە لەمانگی رەمەزانا.**

**٢٢- پێغەمبەر چەند حەجو چەند عەمرەی کردووە. (بڕوانە: ژمارە: ٧٥٨ و ٧٥٩) لە پوختەی موسلیم بەرگی دووەم + (ژمارە: ٧٨٢ و ٧٨٣ و ٧٨٤) لەم کتێبە.**

**٢٣- ڕێزی دوو بەستە پیرۆزەکە مەککەو مەدینە.**

**٢٤- چوونە ناو مەککە بەبێ ئیحرام دروستە.**

**٢٥- نیشتەجێبوون لەناو شاری مەدینە زۆر پەسەندە.**

**٢٦- چەند شتێ کە تایبەتن بە مەککەو مەدینەو کابەو مینبەرەکەی پێغەمبەرو مزگەوتی قوباو چیای ئوحودو سێ مزگەوتەکەو حیجری ئیسماعیلو بەردە ڕەشو چیای عەرەفەو میناو موزدەلیفە...تاد.**

٢٧- بەرگی ئیحرام چییەو چۆنە بۆ پیاو، بەڵام بۆ ژن هەموو بەرگێکی ڕەوای ئاسایی بۆ ئیحرام دەبێ. گەرچی واباشە بەرگێکی سادەی ئاسایی لەبەربکا.

٢٨- ئەگەر ئیحرامدار مرد چی لێ دەکرێ بڕوانە ژمارە (٧٥٣).

٢٩- ماچکردنو دەستهێنان بە بەردە ڕەشەکەدا سوننەتێکی گەورەیە. (ژمارە: ٧٩٩).

٣٠- بۆ ئیحرام شکاندن سەرتاشین خێرترە، لە کورت کردنەوەی مووی سەر.

٣١- سواربوونی وڵاخی دیاری بەیت، وەك حوشترو گا دروستە.

٣٢- چوونە ناو کابەوە سوننەتە، نوێژکردنو نزاکردن لەناویدا سوننەتە.

٣٣- کاتێ لەحەج، یا لەعەمرە، یا لەسەفەرو گەشتو گوزاری ڕەوا دەگەڕێتەوە چی نزایێ بخوێنێ باشە (ژمارە: ٨٥١).

٣٤- کۆمەڵێ شت لەبارەی ڕێزی مەککەو مەدینەوە لەژمارە (٨٥٢) هەتا ژمارە (٨٨٣).

٣٥- هەندێ لەوشتانەی کەبەهۆی ئیحرامی حەج، یا عەمرە بەستنەوە لە حاجیو عەمرەکار قەدەغە دەبن:

١- بۆنی خۆش بەکارهێنانو قژچەور کردنو موو بۆیە کردن.

٢- جوتبوون، بەهەر شێوەیێ بێ، تەنانەت لەگەڵ ئاژاڵیشدا، لەکاتی ئیحرامدا، وەك جوتبوون لەگەڵ مرۆڤدا وایەو حەرامە، ئیتر بەپێش بێ یان بەپاش جیاوازی نییە.

٣- پۆشینی جلوبەگی ئاسایی.

٤- تاشینی سەرو ریش‌و مووی تری لەش، یان هەڵكەندنی، یان بڕین‌و كورتكردنەوەی.

٥- ژن‌و ژنخوازی‌و ژن بەشوودان‌و ژن هێنان.

٦- لەزەت وەرگرتن لەژن، یان لەپیاو، یا لەئاژەڵ، كەم‌و زۆری بەمەرجێ لەزەتی نێرو مێی بێ، یا نەیشگاتە ئەندازەی ڕەحەتبوون‌و ئاوهاتنەوەیش.

٧- ئەو شتانەی كەبەهۆی ئیحرام بەستنەوە، لەخاوەن ئیحرام حەرام دەبن، ئەوەی كە لەپێش ئیحرام بەستندا حەڵاڵ بێ، لەپاش ئیحرام شكاندن حەڵاڵ دەبێتەوە، ئەوەی كە لەپێش ئیحرام بەوستندا، ناڕەوا بووە لەپاش ئیحرام شكاندنیش هەر ناڕەوایە، بەڵام لەكاتی ئیحرامدا ناڕەواترەو زیان لەحەج‌و عەمرەكەیشی دەدات.

٣٦- بۆ فەرزبوونی حەج‌و حەجی منداڵ‌و حەجی كۆیلە بڕوانە (بلوغ المرام/٢، ژمارە: ٧٣١ روونكردنەوە).

٣٧- بۆ باسی حەج‌و عەمرە، بۆ زانیاری پێویست: {بڕوانە: پوختەی موسلیم زنجیرە: ٥٠٩ هەتا زنجیرە: ٦٢١ لە ژمارە: ٦٣٩ هەتا ژمارە: ٧٩٣ + تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٧٨ هەتا زنجیرە: ١٤٤ لە ژمارە: ١٤٧٠ هەتا ژمارە: ١٧٥٥ + تجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٢ هەتا زنجیرە: ٣٥ لە ژمارە: ٧٢٨ هەتا ژمارە: ٨٧٠ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەكەم، لە زنجیرە: ١٥٨ هەتا زنجیرە: ١٨٦ لەلاپەڕە: ٣٨٩ هەتا ٤٧٠ + شەرحی بلوغ المرام/٢، لاپەڕە: ١٩٤ لە زنجیرە: ٣٣ هەتا زنجیرە: ٣٨ لەژمارە: ٧٢٦ هەتا ژمارە: ٧٩٩}.

# ١٦- كِتَابُ النِّكَاحِ
# نامەی ژنهێنان

{بڕوانــە: التــاج الجــامع للأصـول فــی أحاديـث الرسـول، بــەرگی دووەم، وەرگەڕاوە کوردییەکەی، زنجیرە: ٢٢ هەتا زنجیرە: ٨٠، لە ژمارە: ٢٠٣٤ هەتا ژمارە: ٣٢٨٥ + تجریدی بوخاری/٥ لـە ژمـارە: ١٧٤٣ هـەتا ژمـارە: ١٧٨٥ + فیقهـی ئاسـان/٢ زنجیرە: ٢٥٥ لاپەڕە: ٦٧٢ هەتا زنجیرە: ٣٠١، لاپەڕە: ٨٢٦ + مختـصر صـحيح مـسلم، بەرگی دووەم، زنجیرە: ١١، لاپـەڕە: ٢٩٠ لـە ژمـارە: ٧٩٤ هـەتا ٨٤٧ + بلـوغ المـرام/٢، زنجیرە: ٨، لاپەڕە: ٤٦١ چ/٤}.

٨٨٤- عَنْ عَلْقَمَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بِمِنًـى فَلَقِيَـهُ عُثْمَانُ (رضى الله عنهما)، فَقَامَ مَعَهُ يُحَدِّثُهُ فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: يَا أَبَا عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ: أَلاَ نُزَوِّجُكَ جَارِيَةً شَابَّةً؟ لَعَلَّهَا تُذَكِّرُكَ بَعْضَ مَا مَضَى مِنْ زَمَانِكَ، قَـالَ: فَقَـالَ عَبْـدُ اللَّـهِ: لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ، لَقَدْ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَـا مَعْـشَرَ الـشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ ». {الحديث: ٣٣٨٤ = ٣٣٧٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٧٨ = ١٩٠٥، ٥٠٦٥، ٥٠٦٦. أبـو داود. نكـاح: ٢٠٦٤. ترمـذی. نكـاح: ١٠٨١. نـسائی. صيام: ٢٢٣٩. تحفة الأشراف: ٩٤١٧}: [٨٨٤]

عەلقەمـە (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لـە مینـا، لـە خزمـەتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعووددا دەڕۆیشتم، عوسمانی کـوڕی عـەففانی پـێ گەیـشت (ڕەزای خودایان لـێ بێ) لەگەڵیدا ڕاوەسـتا، دەسـتیان کـرد بـە گفتوگۆ، عوسمـان کەبینی ئیبنو مەسعوود پەڕپووتە پێی فەرموو: ئـەی بـاوکی عەبـدوڕەحمان! بـا

(٨٨٤) تجريد/٢، ژمارە: ٨٧٨ = ١٩٠٥ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٩٤ - ٣٣٨٤ شيحا.

کچێکی گەنجت بۆ بهێنین؟ بەشکم سەردەمی لاوی خۆتت بۆ نوێ بکاتەوە! فەرمووی: ئیبنو مەسعوودیش بە ئیمامی عوسمانی فەرموو: ئەمەی تۆ فەرمووت تەواوە، ڕێکی ڕێنماییەکانی پێغەمبەرە، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە ئێمەی دەفەرموو: (ئەی دەستەی لاوان! ئەی گەلی جوانان! هەرکەسەتان تەوانایی سەرجێیی‌و ژنداریی‌و هاوسەرگیریی هەیە، باژن بهێنێ، چونکە هاوسەرگرتن چاوی مرۆڤ تێردەکاو داوێنی لە تاوان دەپارێزێ‌و دەبێ بەهۆی داوێنپاکی.

ئەو کەسەیشی کەلە کێشیا نییە هاوسەر بگرێ، با بەڕۆژووبێ، چونکە ڕۆژوو دەیخەسێنێ‌و دڵی دەمرێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. ئەم ڕشتەیە: ئیمامی ئەعمەش لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، لە عەلقەمەوە، لە ئیبنو مەسعوودەوە، یەکێکە لە ڕشتە (سەنەدە) هەرە ساخ‌و دروستەکان.

٢. ئەم فەرموودەیە موتتەفەقو عەلەیهییە، شێخی بوخاریش گێڕاویەتەوە، ژمارەکانی فەرموودەکە لەسەرەتای فەرموودەکەوە نووسراون، کە یەکەم ژمارەیان لە بوخاریدا (١٩٠٥)ە.

٣. ئیمامی ئەعمەش، ناوی سولەیمانی کوڕی میهرانە، کەسناوی (واتە: کونیەی) ئەبو موحەممەدە، لە بنەڕەتدا خەڵکی (طبرستان)ە، لە گوندێکی ئەوێ لەدایك بووە کە ناوی (دوباوەند)ە، چوار هەزار فەرموودەی هەیە، کتێبی نەبوو، هەمووی لەبەربوو، زۆر فەصیح‌و ڕەوانبێژ بوو، هەرگیز لەحنی نەدەکرد، لەحن ئەوەیە کەقسە بەغەیری عەرەبیی فەصیح بکەی، یا هەڵەی زمانەوانی لە گفتوگۆدا بکەی!

ئەعمەش ئیمامی ئەنەسی دیوە، لە مەککەو لە واسیط، بەڵام راجیایی هەیە لەوەدا، کە فەرموودەی ئەوی گێڕابێتەوە یانا. کەواتە تابیعییە، تابیعی موسوڵمانێکە لەچینی دووەمی گەلی ئیسلام بێ، پێغەمبەری نەدیبێ، بەڵام هاوەڵی پێغەمبەری دیبێ. بەکوردی بە تابیعین دەگوترێ: شوێنکەوتوان، یا پەیڕەوان.

ئەعمەش ئەم زاتانە مامۆستای بوون، واتە: شێخی بوون، شێخی راوی، یا موحەددیث، ئەو کەسەیە کە فەرموودەی لێ وەردەگیرێو کەسێ تر لەنێوانی ئەوو شاگردەکەدا نییە، وەك ئەم نموونەیە لەم رشتەیەدا: ١- بوخاری. ٢- ئەبو وەلید. ٣- شوعبە. ٤- ئەعمەش. ٥- ئیبراهیم. ٦- عەلقەمە. ٧- ئیبنو مەسعوود، لەم رشتە حەوتینەیەدا: بوخاری شاگردو فەقێی ئەبو وەلیدە، ئەبو وەلید شێخو مامۆستای بوخارییە، شوعبە مامۆستای مامۆستاکەی بوخارییە، واتە: شێخی شێخەکەیەتی، وە هەروەها پیاوانی تری رشتەکە هەتا سەر ئیبنو مەسعوود. ئەعمەش فەرموودەی لەم زاتانە وەرگرتووە: ئەبو وائیلو مەعروورو موجاهیدو ئیبراهیمی نەخەعیو تەیمیو شەعبی، ئەم زاتانەو خەڵکێکی زۆری تر شێخی ئەعمەش بوونو مامۆستای راستەوخۆی بوون. کۆمەڵێ مامۆستاو فەرموودەزانی گەورە گەورەیش فەقێو شاگردی ئیمامی ئەعمەش بوون، راستەوخۆ فەرموودەیان لە ئەعمەش وەرگرتووە، وەك: سوبەیعیو سوفیانی کوڕی عویەینە.

یەحیای کوڕی قەططان دەفەرموێ: (ئەعمەش سۆفیلکەیەکی وابوو، بەردەوام لەڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەتدا ئامادە بوو، زانایەکی پایە بەرزی ئیسلام بوو). وەکیع دەفەرموێ: (ئەعمەش نزیکەی حەفتا ساڵ ئەڵڵاهو ئەکبەری یەکەمی جەماعەتی نەفەوتاوە!). شوعبە پێی دەگوت: موصحەف،

واته: وەك موصحەف راستو بێگەردە، پێیان دەگوت: (سَيِّدُ المحدِّثِين). واتە: گەورەی فەرموودە زانەکان، بۆنی شیعەیی لێ دەهات، جاروبار تەدلیسی دەکرد، ئەعمەش موفتی سەردەمی خۆی بوو، پیاوێکی هەژاری کەمدەستی سابیری زاهیدی واریع بوو، گوێی بەدنیا نەدەدا، قەت دەرماڵی دەوڵەمەندو دەسڵاتدار نەدەچوو، بۆ ئیشی دنیایی، پیاوێکی خاوەن وەرع، زانا بە قورئان، دوورە پارێز لە دەسەڵاتو دەستەڵاتداران بوو، زانایەکی فەرائیز زان بوو.

ئیبنولەدینی دەفەرموێ: (ئەم شەش کەسە، عیلمو زانستیان بۆ ئۆمەتی موحەممەد لە فەوتان پاراست: ١- عەمری کوڕی دینار لە مەککە. ٢- ئیمامی زوهری لەمەدینە. ٣و٤- ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیو ئەعمەش لە کووفە. ٥و٦- قەتادەو یەحیای کوڕی ئەبوبەکر لە بەصرە).

ئیمامی ئەعمەش (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) لەساڵی شەستی کۆچیدا لەدایك بووە، لەسەدو چلو هەشتدا مردووە، هەشتاو هەشت ساڵ ژیاوە، راجیایی هەیە لەساڵی لەدایکبوونیو مردنیدا، مامۆستا فەرموودە زانە گەورەکان، کە ناسراون بە ئەلجەماعە، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، لە پەڕاوی (تهذيب التهذيب)ا، دانراوی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی هێمای (ع - سلیمان)ی بۆ دانراوە، واتە: سولەیمانی کوڕی مەهران، کە ناسراوە بە ئەعمەش لە پیاوانی ئەم شەش پەڕاوەیە، کە ناسراون بە: ١- صحيح البخاری. ٢- صحيح مسلم. ٣- سنن أبی داود. ٤- جامع الترمذي. ٥- المجتبي للنسائي. ٦- ئیبنو ماجە.

خودایە! بە بەرەکەتی ئەم مانگی رەمەزانە، شادمان بفەرموو بە دیداری ئەم پیاوە موبارەکانەو لەگەڵ ئەوانا حەشرو نەشرمان بفەرموو. ٣ رەمەزانی ساڵی/١٤٣٠ك = ٢٠٠٩/٨/٢٤ز، ئامین ٢٠١٤/٨/٥ بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم لاپەڕە:٥٢، ژمارە: ٣٠ = ٣٢ فتح الباری.

٨٨٥- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِي اللّٰه عَنْه قال:جاءَ ثَلَاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلَا أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلَا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي. (الحديث ٥٠٦٣): [٨٨٥]

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی:- سیٚ كەس چوون بۆ ماڵی هاوسەرەكانی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بیٚ) كەنیمامی عەلیو عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاصو عوسمانی كوڕی مەظموون بوون، لەبارەی پەرستشو خوا پەرستی ی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بیٚ) پرسیاریان هەبوو، كەپێیان گوترا عیبادەتی پێغەمەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) چەندە و چۆنە، وەك بڵێی بەكەمی بزانن وابوو، لەبەر ئەوە لەناو خۆیانا گوتیان: ئێمە لەكویٚ و پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بیٚ) لەكویٚ، ئەو خودا بەڕاشكاوی بەدەقی ئایەت لەگوناهی بەرودوای خۆش بووە، ئەوەتانیٚ یەزدانی گەورە مژدەی دەداتیٚو پێی دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا. لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا. سورة الفتح ٤٨/١-٢﴾ جایەكێكیان گووتی: من بەشەو ناخەوم هەر شەو نوێژ دەكەم هەتا هەتایە، یەكێكی تریشیان گوتی: منیش ساڵ دوازدە مانگە هەر بەڕۆژوو دەبم‌و

[٨٨٥] تجريد/٥، ژمارە: ١٧٤٣ = ٥٠٦٣ بخارى. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٩٤ = ٣٣٨٤ شيحا.

یەك ڕۆژی لێ ناخۆم، ئەوی تریشیان گوتی: منیش کەنار دەگرم لەژنو هەتا هەتایە ژن ناهێنمو توخنی ژن ناکەوم. کاتێ پێغەمبەر -دروودی لەسەر-بەمەی زانی، هات بۆ لایانو فەرمووی: ئەوە ئێوە وەها وەها دەڵێنو ئەم جۆرە قسانە دەکەن! دەسا بەو خودایە من لەئێوە زیاتر لەخودا دەترسمو، لەئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا من بەش بەحاڵی خۆم ڕۆژوویش دەگرمو ڕۆژوویش ناگرمو شەو نوێژیش بەشی خۆم دەکەمو بەشی خۆیشم دەخەومو سەرەڕای ئەمانەیش ژنیش دەهێنم، جا ئەمە ڕێگەو رەوشتو رەفتاری منە، ئەوەی لێی لابداو پەیرەوی نەکا لەمن نیەو، بەپەیرەوی تەواوی ئایینی من دانانرێ، گەرچی بەموسوڵمانیش دابنرێ. ( تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی سێیەم لاپەڕە: ٤٨ زنجیرە/٢٢، تاج/٢، ژمارە: ٢٠٣٥ چ/٤).

٨٨٦- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضی الله عنهما) قَالَ: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لاَخْتَصَيْنَا. {الحدیث: ٣٣٩٠ = ٣٣٧٩. تجرید/٥، رقم: ١٧٤٤ = ٥٠٧٤، ٥٠٧٣. نسائی. نکاح: ٣٢١٤. ترمذی. نکاح: ١٠٨٣. ابن ماجة. نکاح: ١٨٤٨. تحفة الأشراف: ٣٨٥٦} : [٨٨٦]

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوسمانی کوڕی مەزعوون ویستی لێ ببڕێ بۆ خوداو، واز لەدنیا بهێنێو بەرەبەنی بژیو ژن نەهێنێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی نەدا، خۆ ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوە ڕێگەی ئەوی بدایە، ئێمەیش خۆمان دەخەسانو تەرکی دنیاو ژنهێنانمان دەکردو سەرمان دەکردە خواپەرستی هەتا مردن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٩، چ/٤} .

---

[٨٨٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٤٤ = ٥٠٧٤ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٩٤ = ٣٣٩٠ شیحا.

## (٢) باب نِكَاحِ المتعة وبيان أنهُ أبيح ثم نسخ واستقر تحريمه إلى يوم القيامة

## سیغەکردن لە پێشا دروست بووە، لە دوایی‌دا نادروست کراوە، وە هەتا ڕۆژی زیندوو نادروستە

٨٨٧- عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْسَ لَنَا نِسَاءٌ، فَقُلْنَا: أَلاَ نَسْتَخْصِي؟ فَنَهَانَا عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ رَخَّصَ لَنَا أَنْ نَنْكِحَ الْمَرْأَةَ بِالثَّوْبِ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ قَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ: ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ). {الحديث: ٣٣٩٦ = ٣٣٨٥ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٥٦ = ٤٦١٥، ٥٠٧١، ٥٠٧٥. تحفة الأشراف/ ٩٥٣٨} : [(٨٨٧)]

قەیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: گەلێ جار وادەبوو، لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچووین بۆ غەزا، ژنمان لەگەڵ خۆمان نەدەبرد، جا بۆئەوەی کە لەم ڕووەوە تووشی تاوان نەبینو دووربین لەداوێنپیسی، عەرزی پێغەمبەرمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێگەمان پێ بدە خۆمان دەخەسێنین، نەبادا شەیتان ختە ختەمان بدا، ئەویش ڕێگەی ئەوەی پێ نەداین، بەڵام لەوەدوا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێماندا، کەبۆ ناچاری ژن سیغە بکەین، لەسەر جلو بەرگو شتی تریش، بۆماوەیەکی ناوبراو، وەك ڕۆژێ، مانگێ، ساڵێ. ئەنجا ئیبنو مەسعوود بۆ پشتیوانی ڕای خۆی، لەبارەی دروست بوونی ژن سیغەکردنەوە، ئەم ئایەتەی بە بەڵگە هێنایەوەو خوێندیەوە، کە دەفەرموێ: {یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ

---

(٨٨٧) تجرید/٤، ژمارە: ١٦٥٦ - ٤٦١٥ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٠٩ - ٣٣٩٦ شیحا.

طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ - سورة المائدة / ٨٧}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! لە یاسای خودای گەورە دەرمەچن، ئەو شتە پاكو خۆشانە، چ خۆراك بن، چ حەڵاڵو هاوسەر، چ شتی تر، كە خودا رەوای دیوە بۆتانو خۆی بۆی حەڵاڵ كردوون، لەخۆتانەوە لەسەر خۆتانی حەرام مەكەن، سنوورەكانی خودا مەبەزێنن، لە راستیدا خودا ئەوانەی خۆش ناوێ، كە بەناڕەوا سنوورەكانی یاسانامەی خودا دەبەزێنن).

٨٨٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ وَسَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رَضِي اللّٰه عَنْهُمْ قَالَا: كُنَّا فِي جَيْشٍ فَأَتَانَا رَسُولُ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا فَاسْتَمْتِعُوا.(الحديثان:٥١١٧-٥١١٨): (٨٨٨)

جابیری كوڕی عەبدوڵڵاو سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: لەناو سوپایەكا بووین، لەغەزایەكا فروستادەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ناومان، فەرمووی: لەلایەنی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ژن سیغەكردنتان دراوە، دەتوانن‌و دروستە بۆتان كەژن سیغە بكەن). (تاج/٣ ز/٦٠ ل/١٤٧ ژ/١، ٢، ٣، ٤ = ژمارە: ٢٢٠٩، ٢٢١٠، ٢٢١١، ٢٢١٢).

## ڕوونكردنەوە:

ئەم بابەتی سیغە كردنە، كەپێشی دەگوترێ: مارە بڕینی كاتی، قسەی زۆری لەسەر كراوە، لەلای شیعەكان دروستە، وەبەزۆریش دەیكەن. بەلام لەلای سوننیەكان: ژنهێنانی كاتی، ماوەیێ ڕەوا بووە، بەلام دوایی پێغەمبەر(دروودی

---

(٨٨٨) تجرید/٥، ژمارە: ١٧٥٩ = ٥١١٧ مسلم: ١٤٠٥ - ٣٤٠٠ شیحا.

خوداى لەسەر بێ) حەرامو نادروستى كردووە هەتا ڕۆژى قيامەت، وەهيچ بايەخێ بەراى پێچەوانەى ئەم ڕايە نادرێ، لێرەدا شتێ هەيە حەز دەكەم روونى بكەمەوە: (لەسەرەتاوە وەك ئێستا ئەم فەرموودەو بڕيارە شەرعى يانە مەشهوورو زانراو نەبوون، بەلكو پوختەو موجمەلێكيان لەبابەتى عيباداتو خواپەرستىو دروشمو شەعائيرەوە سەقامگير بوونو بوون بەپێناسەو دروشمو جياوەكەرى ئايينى پيرۆزى ئيسلام، لەئايينەكانى تر. بەلأم هۆى زۆر هەبوو، بۆ دروستبوونى ڕاى زۆر لەهەندێ بابەتى شەريعەتدا، كەئەو ڕاجياجيا يانە، هەيان بوو لەيەكترەوە نزيك بوون، هەيان بوو بەپێچەوانەى يەكترى بوون، هەيان بوو تەواو كەرى يەكترى بوون، يەكێ لەم هۆ سەرەكييانە ئەوە بوو: كەزۆرينەى كات وەفدو خەلكى زۆرو زۆرينەى سەحابەكان، ناو بەناو بەخزمەت پێغەمبەر دەگەيشتن، وەزۆرينەى كات دادەبڕان لەپێغەمبەر وەئاگايان لەبڕيارى نوێ نەبوو، وە ئەو فەرموودەو بڕيارانەى كەلەو دانيشتنانەدا، لەپێغەمبەر دەبيست، كاريان پێ دەكردو فەتوايان پێ دەداو پەخشيان دەكردەوە، هەتا فەرمانێكى نوێ ى پێغەمبەريان لەو بارەيەوە دەبيست، كەتەعديلى دەكرد، يانەسخى دەكردەوە، ئەوان بەردەوام بوون لەسەر ئەو بڕيارو فەرموودەو زانياريانەى كەكاتى خۆى لەپێغەمبەريان وەرگرتبوو، جائەمەو زۆر هۆى تر بوون بەهۆى ئەم هەموو ڕاجيايى يە).

٨٨٩- عَنْ عَلِيٍّ بْنِ ابِي طالِبٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ)انَّ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاء يَوْمَ خَيْبَرَ وَعَنْ اكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الانْسِيَةِ (الحديث: ٤٢١٦، اطرافه في: ٥١١٥، ٥٥٢٣، ٦٩٦١): [٨٨٩]

[٨٨٩] تجريد/٤، ژمارە: ١٥٧٤ - ٤٢١٦ مسلم: ١٤٠٧ = ٣٤١٧ شيحا.

**ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی غەزای خەیبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ژن سیغەکردنی قەدەغە کرد، هەروا خواردنی گۆشتی کەری ماڵیشی قەدەغە کرد. ( بڕوانە: تاج/٣ ل/١٤٧ ز/٦٠- باسی سیغەکردن حەرامە ف/١+ ٢+ ٣+ ٤ = ژمارە: ٢٢٠٩، ٢٢١٠، ٢٢١١، ٢٢١٢).**

**ڕوونکردنەوە:**

**١- سەبرەی کوڕی مەعبەدی جوهەنی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەذی مەڕە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، ڕەبیعی کوڕی فەرموودەکانی لێوە دەگێڕێتەوە، ئامادەی غەزای خەندەق بووە، لەگەڵ غەزاکانی پاشیدا، بوخاری بەتەعلیق فەرموودەی ئەو ڕاگوێز دەکا، بەڵام موسلیمو خاوەن سونەنەکان بەڕشتەی پەیوەستی خۆیان، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، فروستادەو نوێنەری ئیمامی عەلی بوو، بۆ موعاوییە لەشام، هەتا پەیمان لەخەڵکی شام وەربگرێ بۆ ئیمامی عەلی، کاتێ بوو بەجێنشین.**

**٢- سیغەکردن: واتە: مارە بڕینی کاتی، یەکێکە لەباوو نەریتو بڕیارەکانی سەردەمی نەزانی، (نەفامی - جاهلیة). لەسەرەتاوە ئیسلام ڕێگەی لێ نەدەگرت، بەڵام لەدواییدا، لەکاتی ئازاد کردنی مەککەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نادروستو قەدەغەی کرد، بۆ هەمیشەو هەتا هەتایە.**

**جا لەبەر ئەوەی کە ئەم بابەتە، کاریگەرییەکی زۆری هەیە، لەزۆر ڕووەوە، لەسەر ئاستی ئایینیو کۆمەڵایەتیو نەتەوایەتیو ڕەوشتی، ئەم ڕوونکردنەوەیە لەکۆمەڵێ سەرچاوەی فیقهیو شەرعییەوە تۆمار دەکەین لەسەرچاوەی متمانەداری لای سونییەکانو شیعەکان، تا ڕووی ڕاستی دەربخات:**

**یەکەم:** لەلای سونییەکان، بەتایبەتی لەلای هەرچوار مەزهەبەکە، کە حەنەفیو شافیعیو مالیکیو حەنبەلین، هەروا لەلای جەماوەری زانایانی نەتەوەی ئیسلام، سیغەکردنی ژن، ئێستا نادروستەو ئەنجامدانی دادەنرێ بەتاوانی داوێنپیسیو لەشفرۆشیو ئەنجامدەر سزا دەدرێ.

**دووەم:** لەلای شیعەی ئیمامی، کە گەورەترین کۆمەڵن لەکۆمەڵانی مەزهەبەکانی شیعە، موتعە (واتە: ژن سیغەکردن - مارەکردنی کاتی) دروستە، بەڵکوو وەك ژن هێنانی ئاسایی لەهەندێ کاتا سوننەتە، یا پێویستو واجیبە.

**سێیەم:** جۆری گرێدانەکەیو چۆنێتی ژن سیغەکردن، بەتایبەتی لەلای شیعەی ئیمامی:

(بریتییە لە رێککەوتنی ژنو پیاوێ لەناو خۆیانا، کەموانعی نیکاح لەنێوانیاندا نەبێ، کە هاوسەری کاتی لەناو خۆیاندا ئەنجام بدەن، بەمەرجێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بێ، وەك کاتژێرێ، یان مانگێ، یان زیاتر، یا کەمتر، لەسەر ئەندازەیێ ماڵ کە پیاوەکە بیدات بەژنەکە!).

**چوارەم:** شایەت لە ژن سیغە کردندا مەرج نییە، هەروا وەلێ بۆ ژنی رەسیدەی فامیدە مەرج نییە، خۆی دەتوانێ سیغەکردنەکە ئەنجام بداو قەبووڵی گرێ بەندەکە بکات. (رەسیدە = البالغة العاقلة).

**پێنجەم:** کاتێ کاتە دیاریکراوەکە تەواو بوو، یان مێردەکە لەپێش تەواو بوونی کاتەکەدا مرد، ئەوا تەماشا دەکەین:

آ- ئەگەر ژنەکە نائومێد بوو لەسووڕی مانگانە، عوزری شەرعی بەسەر چوو بوو، ئەوە یەکسەر مارەبڕینو سیغەکە تەواو دەبێو پێویستی بەحەیەو عیددەو پاکبوونەوەی منداڵدان نییە، واتە: ژنێ کەسیغەی کردبێو لەبێنوێژیو

سووڕی مانگانەو منداڵبوون نائومێد بووبێ، لەبەر تەمەن، ئەوا بۆی هەیە دەست بەجێ‌سیغەی تر بکات، یا شوو بکا.

ب- ئەگەر ژنەکە هێشتا سەرو عوزری دەشۆردو نائومێد نەبوو لە بێنوێژیی ژنانەو سووڕی مانگانەی هەبوو، ئەوە لەپاش تەواو بوونی کاتی دیاری کراو، (استبراء الرحم) بکا، واتە: تا دوو مانگ، بەمانگی هەیڤی (قەمەری) نەشوو بکا، نەسیغە ئەنجام بدا.

ج- ئەگەر لەماوەی دیاری کراودا، مێردەکە مرد، واتە: کابرای سیغەکار مرد، ئەوە دەبێ ژنەکە چوار مانگو دە شەو ماتەم بگرێو نەسیغە بکاو نە شوو.

**شەشەم**: لەماوەی بەردەوامی سیغەکردنەکەدا ئەم بڕیارانە ڕەچاو دەکرێن:

١- بێجگە لەو ئەندازە پارە بڕیاردراوە، کە ژنەکە لەپیاوەکەی وەرگرتووە:

آ- مارەیی تری ناکەوێ.

ب- ژیوارو نەفەقەی لەسەر خۆیەتی، لەسەر مێردەکەی نییە.

ج- ئەگەر یەکێکیان مردن، میراتو کەلەپوور لەیەکتری ناگرن. تەنها ئەوەندە هەیە کە ژنەکە دەبێ ماتەم بۆ مێردەکەی بگرێ.

**حەوتەم**: هەندێ بڕیاری هەمیشەیی کە بەهۆی ژن سیغەکردنەوە پەیدا دەبن، لەنێوانیاندا موصاهەرە دروست دەبێو شیر کاریگەری هەیە، لەسەر ئەم شێوەیە:

١- واتە: کچو دایکو نەنکو وەچەی مێینەی ژنەکەو بنەچەی مێینەی ژنەکە لەهەردوو سەرەوە، بۆ هەمیشەو هەتا هەتایە لەپیاوەکە نادروستو حەرام دەبنو دەبن بەکەسی خۆیو یەکتری، لەبابەتی هاوسەریدا.

٢- هەروا بەپێچەوانەیشەوە، کوڕو کوڕەزاو باوكو باپیرەی پیاوەکەیش لەهەردوو لاوە، دەبن بەخۆییو مەحرەم بۆ ژنە سیغە لەگەڵ کراوەکە.

٣- دوو خوشك، یا دوو ژن کە خوشکی شیری بن، دروست نییە، کە بەسیغە کۆبکرێنەوەو لەیەك کاتدا، هەردووکیان ژنی سیغەکراوی یەك پیاو بن.

٤- دایکی شیریو کچی شیری، لەگەڵ هەرکامێکیانا سیغە کرا، ئەوی تریان بۆ هەمیشە لەو پیاوە حەرام دەبێ.

**هەشتەم: کۆمەڵێ بڕیاری تری ژن سیغەکردن:**

١- ئیستبرائی رەحەم، واتە: لەپاش تەواو بوونی ماوەی سیغەکردنەکە، ژنەکە تا ماوەی دوو مانگ نە شووبکا، نەسیغەی تر بکا، هەتا بزانرێ کە منداڵ هەیە لە منداڵدانیدا، یا نییە، ئەمەیش بۆ ژنێ وایە کە ئەگەری سکوزاکردنی مابێ، دەنا ئیستبراء پێویست نییە.

٢- تەڵاقو ئیلاءو لیعان لەنێوانیانا نییە، هەروەها زیهار، بەڵام لە زیهاردا راجیایی هەیە. پیاوەکە هەزارجار ژنەکە تەڵاق بدا، سیغە کردنەکە پووچەڵ نابێتەوە، هەتا ماوەی دیاری کراوی خۆی تەواو دەبێ.

٣- ئەگەر ژنو پیاوێ، لەگەڵ یەکتردا سیغەیان کرد، هەتا ماوەی سیغەکە مابێ بۆیان نییە، کە مارەبڕینی هەمیشەیی ئەنجام بدەن، هەروا بۆیان نییە سیغەکردنێکی تر دابمەزرێنن، بەڵام لەپاش تەواو بوونی ماوەکە هەموو کاتێ بۆیان هەیە کە گرێ بەندێکی هەمیشەیی، یا کاتی ئەنجام بدەنەوە! وە هەروەها!!

٤- بەسیغە نەسەب لەنێوانی مناڵی سیغەو پیاوەکەدا ناچەسپێ، مەگەر بەمەرجێ کە بەمەرجی بگرن، ئەگەر منداڵیان بوو هی هەردووکیان بێتو پیاوەکە دابنرێ بە باوکی.

لەکاتی وادا کە بەمەرجیان نەگرتبێ کە منالّەکە هی هەردووکیان بێ، ئەگەر منالّەکە کچ بوو، وە گەورە بوو دروست نییە کە باوکەکەی مارەی بکا بۆخۆی‌و سیغەی لەگەڵ بکات!!

٥- سیغە کردن ژمارەی بۆ نییە، لەلای قەولی ئەصەحح!! واتە: لە فەرموودەی هەرە ڕاستدا پیاوێ دەتوانێ، لە یەك کاتا، دە ژن، یا سەد ژن، یا هەزار ژن سیغە بکا، یا زیتر یا کەمتر!

٦- ئەندازەی ئەو ماڵەی کە ژن‌و پیاوەکە سیغەی لەسەر دەکەن، دیاری نەکراوە، تەنانەت ژن سیغە کردن لەسەر لالوێچێ گەنم دادەمەزرێ، یا لەسەر درەمێ دادەمەزرێ!

٧- ئەندازە دیاری نەکراوە بۆ ماوەکەی، گەرچی هەندێ دەڵێن: نابێ ماوەی سیغە لەماوەی گزنگی خۆرەوە، هەتا نیوەڕۆ کەمتر نەبێ، واتە: ماوەی سیغەکردن کەم‌و زۆری بۆ نییە، ژن‌و پیاوەکە لەسەر چەندێ ڕێککەوتن، با سێ خولەکیش بێ، دەبێ‌و دروستە، گرنگ ئەوەیە کە ماوەکە دیاری بکرێ‌و بەس.

٨- پیاوو ژنەکە دەتوانن: کە بەمەرجی بگرن کە لەماوەی دیاری کراودا، یەك جار جووت بوون ئەنجام بدەن، یان چەند جارێکی دیاری کراو، یا پیاوەکە هەر بەکۆم بچێتە لای ژنەکەو بەس!

**سەرنجێ:**

لێرەدا ئەم ئێستە دەکەین:

١- جێگەی داخە کە هەندێ لەئاخونەکان‌و پیاوانی سیاسەت، ئەم بابەتی سیغەیەیان کردووە بەفێڵەشەرعانەو وەك تۆڕو داوی راوەسوێسکە، راوی پارەو

پوول‌و كڕینی ویژدان‌و بازرگانی پێوه دەكەن، وه ڕووی جوانی ئیسلامی پێ ناشیرین دەكەن، وەك:

آ- ژنێ كه لەسكوزا وەستابێتەوەو تەمەنی گەیشتبێتە (٥٠) پەنجا ساڵ، یا زیاتر، بۆی هەیە لەڕووی شەرعی شیعەوە، دووكانێكی داوێنپیسی دابنێ، بەناوی بەیتولعەفافەوە (خانەی داوێنپاكی!!). هەر سەعاتەی لەگەڵ كەسێ سیغە بكاو ئەندازەیێ پارەی لێ وەربگرێ، چونكە پێویستی بە ئیستیبرائی رەحەم نییە، بۆی هەیە، كه بەناوی سیغەوە هەر ڕۆژەی، یا هەر ساتەی، لەباوەشی زەلامێكا بێ.

٢- بگرە كار گەیشتووە بەوە، فێڵە شەرعانە بووە بەدەروازەیێ، بۆ داوێنپیسی‌و بەرەڵایی نێرو مێ:

**بۆ نموونە:** ژن ئەگەر لەتەمەنی سكوزادا بوو، واتە: تەمەنی لە (٥٠) پەنجا ساڵ كەمتر بوو، ئەوە دەتوانێ بەم فێڵەی دواوە، هەموو شەوێ لەباخەڵی گانكەرێكا بێ: (بۆ ئەوەی خۆی لە (إسبراء الرحم - عیددەی موتعە) دەرباز بكا: لەگەڵ هەر پیاوێكا كەسیغە دەكات، كاتێ كه كەیف‌و سەفاكەیان تەواو دەبێ، با ژنەكە لەگەڵ ئەو پیاوەدا سیغەیەكی تر بكا، بۆ ماوەی چەند خولەكێ، وه لەم ماوە كەمەدا جووتبوون ئەنجام نەدەن، هەتا ماوەكە تەواو دەبێ، ئیتر ژنەكە بۆ سیغە كردنی تازە، پێویستی بەعیددە نییە، چونكە گوایە: عیددەو حەیەی ژنانەو ئیستیبرائی رەحەم، بۆ سیغەكردن‌و نیكاحێكە، كە ژنەكە مدخول بها بێت، دەی لەپاش ئەم گرێبەندی سیغەی دووەمە، جیماع‌و جووتبوون رووی نەداوە!! كەواتە: پێویست بە (إستبراء الرحم) نییە.

ئێمە قسەمان لەواقیعی حاڵە، دەنا ناو كتێبان پڕە لەقسەی زلی بێ توێكڵ‌و وتی ئەم‌و ئەو.

**بڕوانە : ئەم سەرچاوانە :**

**١- التبيان للطوسى.**

**٢- النهاية فى مجرد الفقه والفتاوى – لشيخ الطائفة أبى جعفر الطوسى.**

**٣- ئەم دەقانە بەعەرەبى لە پەڕاوى (النهاية فى مجرد الفقه والفتاوى – باب المتعة وأحكامها):**

**١- الإشهاد والإعلام فى المتعة فليسا من شرائط المتعة.**

**٢- ولا بأس أن يتمتع بالمجوسية والفاجرة!!**

**٣- ليس على الرجل أن يَسألَهَا: هَلْ لهَا زوج أم لاَ.**

**٤- البالغة العاقلة حد البلوغ وهو تسع سنين، جاز له العقد عليها من غير إذن أبيها.**

**٥- ليس فِي نكاحِ المتعة توارث.**

**٦- لا بَأسَ أن يتزوَّجَ الرجلُ متعةً مَاشاءَ مِن النِّسَاءِ.**

**٧- إذا انقضى أجل المتعة جاز له أن يعقد عليها عقْداً مُستَئنفاً فِي الحال.**

**٨- وَعِدَّةُ الآيسة مِنَ المحيض وَمِثْلهَا لاتحِيضُ فلا عِدَّةَ عَلَيهَا عند أكثر أصحابنا (التبيان للطوسى).**

**٩- حَدُّ الآيسة مِنَ المحبض (٥٠) خمسون سنة (التبيان للطوسى).**

**١٠- وَلا يشترط الشاهدان فِي النكاح الدائم مطلقاً وَلاَ الولى فِي نكاحِ الرشيدةِ.**




## (٣) باب تحريم الجمع بين المرأة وعَمتها أو خالَتها في النكاح
## دروست نيه كه ژن بەسەر پوری خۆی، یان بەسەر میمکی خۆی شو بکات

٨٩٠ـ عَنْ جَابِرِ بن عبدالله رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا.(الحديث ٥١٠٨): [٨٩٠]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری دەکرد لەوە: کەژن شووبکا بەسەر خوشکی باوکی، کەپێ ی دەگوترێ میمك، یاشوو بکات بەسەر خوشکی دایکی کەپێی دەگوترێ پوور، وەهەروا پورو میمکیش نابێ شوو بکەن بەسەر برازاو خوشکەزای خۆیان. (تاج/٣ ل/٦٨ ز/٢٩ ژ/٣ = ژمارە: ٢٠٧٣ تاج/٢، چ/٤ - ش/ د/ ت/ن) لە ئەصڵەکەدا لەئەبو هورمیرەوەیە.

## (٤) باب تحريم نكاح المُحْرِم وكَراهةِ خُطبتَهَ
## کەسێ لە ئیحرامی حەج یا عەمرەدا بێ نە ژن مارە دەبڕێو نە خوازبێنی دەکا

٨٩١ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) مَيْمُونَةَ {وَهُوَ} مُحْرِمٌ. {الحديث: ٣٤٣٨ =٣٤٢٧ فم. تجريد/٢، رقم:٨٤٥ =١٨٣٧، ٤٢٥٨، ٤٢٥٩، ٥١١٤. ترمذى. حج: ٨٤٤. نسائى. حج: ٢٨٣٧. تحفة الأشراف: ٥٣٧٦} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ مەیموونەی هاوسەری مارەکرد بۆ خۆی لە ئیحرامدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥١٠ — ش/د/ت/ن}.

---

[٨٩٠] تجريد/٥، ژمارە: ١٧٥٧ = ٥١٠٨ مسلم: ٣٤٢٢ شيحا.

## (٥) باب تحريم الخطبة على خُطبَةِ أخِيهِ حَتىَ يَأذَنَ أوْ يَترُكَ

## خوازبێنی لەسەر خوازبێنی نادروستە مەگەر پێشین ڕێگەی پاشین بدا، یان خۆی واز بهێنێ

٨٩٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَلَا يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْـرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَو يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ.(الحديث ٥١٤٢ أطرافه في: ٢١٣٩ ، ٢١٦٥ ، ٢١٤٠ ، ٢١٤٨ ، ٢١٥٠ ، ٢١٥١ ، ٢١٦٠ ، ٢١٦٢، ٢٧٢٣ ، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠١):[892]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەودا لەسەر سەودای برای ئایینی خۆتان مەکەن، هەروەها خوازبێنیش لەسەر خوازبێنیی برای ئایینی خۆتان مەکەن، مەگەر خوازبێنی کاری پێش ئەو وازی هێنابێ، یا ئەو ڕێگەتان پێ بدا) . (تاج/٢ ز:١٥٢ ژ/٧ = ژمارە: ١٨١٤ ج/٤، تاج/٢ + تاج/٣ ز/٢٦ ژ/٥ ل/٦١ = ژمارە: ٢٠٦٥ ج/٤) مامۆستای عەینی لەعمدة القاریدا، لەروونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (وشەی برا لەم فەرمودەیەدا، ئەم سێ جۆرە برایە دەگرێتەوە: برای خوێنی- واتە: برای نەسەبی - وبرای ئایینیو برای شیریی).

برای خوێنی موسڵمانو ناموسوڵمانی هەیە، برای شیریش هەروەها، برای ئایینیش خوێنیو شیری و بیانی هەیە، لەم جۆرە بابەتانەدا، کەلەم جۆرە فەرموودانەدا باسکراون، کڕینو فرۆشتنو خوازبێنیو برا، نمونەن. قەیدو مەرج نین، بۆ زیادە روونکردنەوەن، روونترین نمونەن لەبابەتەکەدا، کەلەزاراودا پێی دەگوترێ : (أظهر مثال). کەواتە هەموو مامەڵەو سەودایەك بەسەر مامەڵەو

[892] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٦٥ = ٥١٤٢ مسلم/١٤١٢ = ٣٤٤١ شیحا.

سـەودای بـرای خـۆت نادروسـتە یابەسـەر مامەڵـەو سـەودای خوشـكی خـۆت نادروستە، وەك: ڕەهن بەسەر ڕەهـن، یاسـەلەم بەسـەر سـەلەم، یـاقیراض بەسـەر قـیراض، یاهاوبەشـی بەسـەر هاوبەشـی، یاكەسـێ خوشـكی خـۆی پێـشكەش بكـا بەپیاوێكی باش، كەسێكی تریش پێشبڕی لێ بكاو، بەسەر ئەو خوشـكی خـۆی، یـا كچی خۆی پێشكەش بكابەو پیاوە باشە، وەزۆرشتی تـری لـەم چەشـنە بابەتانـە، وەهەروەها خوشك لەگەڵ خوشكا.

## (٦) باب تحريم نكاح الشغار وبطلانه
## ژن بەژن نادروستەو پووچە

٨٩٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَـى عَنْ الشِّغَارِ وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَـهُ الْـآخَرُ ابْنَتَـهُ لَـيْسَ بَيْنَهُمَـا صَدَاقٌ.(الحديث ٥١١٢ طرفه في: ٦٩٦٠)؛ [٨٩٣]

ئیبنو عومەر(ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ژن بەژنی نەئەدا، ژن بەژنیش ئەوەتانێ كەدوو پیـاو بەكچی خۆیان ژن بەژن بكەن، بـەبێ مـارەیی (تـاج/٣ ل/١٤٧ ز/٥٩ ژ/٢ = ژمـارە: ٢٢٠٧، تـاج/٢، چ/٤ - ش/د/ت/ن = شـەیخان + ئـەبوداوود + تەرمـەزی + نەسـائی - ڕەحمەتی خودا لەهەموویان).

### ڕوونكردنەوە:

ژن بەژن لەسەر ئەم شێوەیەی كەوا لەم فەرموودەیەدا نادروستە، ئیتر كـچ بـەكچ بـێ، یاخوشـك بەخوشـك بـێ، یـاكچ بـە خوشـك بـێ، یـاپوور بـێ، یادایـك

---

[٨٩٣] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٥٨ = ٥١١٢ مسلم/١٤١٥ = ٣٤٥٠ شیحا.

بەخوشك بێ، یاکچ بەکچە زاو کوڕەزا بێ هەروەها. بەڵام ئەگەر ژن بەژنەکە لەسەر ئەم شێوەیەی تر بێ کەئێستا باوە، ئەوە ژنبە ژنەکە دادەمەزرێ، چونکە بەدوو عەقدی صەحیح هەردوو ژنە، هەریەکەیان لەمێردەکەی خۆی مارە دەکرێ، وە مارەیی بۆ هەردوو ژنەکە دادەنرێ، وەتاڕادەیێ بەرژەوەندو ڕەزامەندیی هەردوو ژنەکە ڕەچاو دەکرێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشە ژن بەژن زۆر باش نییە، گەلێ جارکێشەو بەرە دروست دەکا. (بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی/دووەم ل/٦٤١).

بۆ بەهرەی پتر لەم بابەتە، ئەم دەقە لەشەرحی بلوغ المرام/٢، ژمارە: ١٠١٤، لاپەڕە: ٤٨٤ راگوێز دەکەم:

لە نافیعەوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیشگیریی دەکرد لەژن بەژن، ژن بەژنیش وەك ئەوە کە دوو پیاو بەکچی خۆیان، یان بەخوشکی خۆیان ژن بەژن بکەن، بەبێ مارەیی). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٢٢٠٧، ٢٢٠٨ — ش/د/ت/ن = ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی، ڕەحمەتی خودایان لێ بێ} + {بڕوانە: فیقهی ئاسان/ بەرگی ددووەم، لاپەڕە: ٦٤١ چاپی یەکەم = زنجیرە: ٢٦٧، لاپەڕە: ٧١٤ چاپی دووەم ساڵی/٢٠٠٦}.

**(نافیع):**

١- نافیعی کوڕی سەرجیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) تابیعییە، لە پەیڕەوانە، هاوەڵ نییە، بەڵام هاوەڵی زۆری پێغەمبەری دیوە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەسەر هەموو پەیڕەوانو شوێنکەوتوانی هەتا ڕۆژی دوا ڕۆژ).

نـافیع ئـازادکراوی ئیبنـو عومـەر بـوو، فـەقێی بـوو، فـەرموودەی زۆری لـەوەوە گێڕاوەتـەوە، لەبنەڕەتـدا خـەڵکی مەغریبـە، لـە غەزایـەکا دیلکـراو بەرپشكو بەشی ئیبنو عومەر کەوت، لەخزمـەتی ئیبنـو عومـەردا بـوو تـا کـاتی مـەرگی، زانـستو فەرموودەیـەکی زۆری لـەئیبنو عومـەر وەرگرتـووە. عومـەری کوڕی عەبدولعەزیز، کاتێ جێنشین بوو، ناردی بـۆ میـصر، هـەتا خەڵکەکەی لـە یاسانامەی خوداو لەسوننەتی پێغەمبەردا، شارەزابکا، وە لەو مەودایـەدا ڕۆڵێکـی جوانی بینـی، زۆربـەی فـەرموودە شوناسـە گـەورەکان گێڕانـەوەیان لێـوە ئـەنجام داوە، لـەکۆی گێڕانەوەکانیـدا، ئەوەنـدە زەینـی ڕۆشـنبووە هەڵـەی لێ نـەبینـراوە، ناسراوە بە (نافیعی فەقیە) واتە: مامۆستا نافیعی شەرعزانو شارەزا لە ئایین‌دا.

پێـشەوا بوخـاری سـەبارەت بـە تەنـدروسـتترین رشـتە، دەفـەرموێ: (دروستترین رشتەی فەرموودە: مالیکە، لە نافیعەوە، لەئیبنو عومەرەوە!).

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر دەیفـەرموو: (نـافیع بـەهرەو خـەڵاتی خـودای گەورەیە بەخشیوێەتی بە ئێمەی گەلی ئیسلام).

بەهێزترین ڕاو بۆچوون ئەوەیـە کـە سـاڵی (١١٧) سـەدو حەڤـدەی کـۆچی لەشاری مەدینە کۆچی دوایی کردووەو مـەرگی خـودایی بـووە بـەمیوانی. (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای گـەورەو مـەزنی لێ بـێ). {بڕوانـە: مختـصر صـحیح مـسلم، بـەرگی/دووەم، ژمـارە: ٦٥٤ – ڕوونکردنــەوە = ژیـان نامــەی نـافیعی کـوڕی سەرجیس}.

٢- دانەر، پێشەوا ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی، دانـەری پـەڕاوی (بُلُـوغُ المَـرَامِ مِـنْ أَدِلَّـةِ الْأَحْكَـامِ) دەڵـێ: هـەردوو مامۆسـتای مـەزن: بوخـاریو موسـلیم، لەگێڕانەوەیـەکی تـری ئـەم فەرموودەیـەدا، ڕێکـن لەسـەر ئـەوەو بـەکۆی دەنـگ گێڕاویانەتەوە: کە ڕوونکردنەوەی واتای (شغار = ژنبەژن) قسەی نافیع خۆیەتی،

دانەر ئاماژە بۆ فەرموودەی ژمارە (٦٩٦٠)ی صەحیحی بوخاریو ژمارە (٣٤٥١)ی صەحیحی موسلیم تەرقیمی شێخ خەلیل مەئموون شیحا دەكا، كە ئەمە دەقی ئەم گێڕانەوەیە لە بوخاریدا:

عوبەیدوڵڵا فەرمووی: نافیع گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) پێشگیریی دەكرد لە ژن بەژن. عوبەیدوڵڵا دەڵێ: عەرزی نافیعم كرد: ژن بەژن چییەو چۆنە؟ نافیع فەرمووی: (ژن بەژن ئەوەیە كە دوو پیاو بەكچی خۆیان، یا بەخوشكی خۆیان ژن بەژن بكەن بەبێ مارەیی، یەكێكیان بەوی تریان بڵێ: ئەوا كچەكەی خۆم، یا خوشكەكەی خۆم لەتۆ مارەبڕێ، بەمەرجێ تۆیش كچەكەی خۆت، یا خوشكەكەی خۆت لەمن مارە ببڕی، بەمەرجێ هەردووكیان مارەییان نەكەوێ، ئەویش بڵێ: ئەوا قەبووڵم كرد).

٣- لە وڵاتانی موسوڵماناندا، ژن بەژن دەكرێ، بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕەخنەی ئەم فەرموودانە خۆیان ڕزگار بكەن، مارەیی دادەنێن بۆ هەردوو مارەبڕاوەكان، لەكاتی گرێ بەندەكەدا، وە لەپێشدا لەناو خۆیاندا، لەسەر دیاری كردنی هەردوو زاواو هەردوو بووكەكە ڕێ دەكەون، وە مارەیی یەكێ لەبووكەكان، كەمێ زیاترە لەمارەیی ئەوی تریان، وە لەكاتی گرێ دانی مارەبڕینەكەدا، ئەوە بەمەرج ناگرن: كە ئەوا من كچەكەی خۆم، یا خوشكەكەی خۆم لەتۆ مارەبڕی، بەمەرجێ تۆیش كچەكەی خۆت، یا خوشكەكەی خۆت لەمن مارەببڕی. بەڵكوو لەپێشدا مەلاكە بووكێكیان لەمێردەكەی بەشێوەی ئاسایی مارە دەبڕێ، ئەوسا لەپاش پشوودانێ، بۆ ناوبڕ، ئەوی تریشیان بەشێوەیەكی ئاسایی لەمێردەكەی لەجیگەو كۆڕو مەجلیسێكی تردا مارە دەبڕێ، بەبێ ئەوە ئاماژە بكرێ بۆ مارەبڕینی یەكەم. گەلێ جار ژنی دووەم هەرناوزەد دەكرێو دیاری دەكرێ،

لەپاش چەند مانگێ، یان لەپاش چەند ساڵێ مارە دەكرێ جا لەم حاڵانەدا، بەكۆی دەنگ ژن بەژن دروستە، گەرچی لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە هەمیشە ژن بەژن بێ كێشەو بەرە نابێ.

### (٧) باب الوَفاءِ بالشروط في النكاح
### جێبەجێكردنی مەرج لە بابەتی هاوسەریدا

٨٩٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَااسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ) (الحديث ٢٧٢١، طرفه في: ٥١٥١): [٨٩٤]

عوقبەی كوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕەواترین مەرجێ كەشایەنی ئەوەبێ جێبەجێی بكەن، ئەو مەرجانەن كەژنانتان لە خۆتان پێیان حەڵاڵ كردووە، وەك مارەیی و شتیوا).

**ڕاڤەو شیكردنەوە:**

مەبەستی سەرەكی لەم جۆرە مەرجە تەنیا ئەو مەرجە ڕەوایانەیە كە پەیوەندییان بەژنمارەبڕینەوە هەیەو بەس.

**ڕوونكردنەوە:**

١- عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنی، هاوەڵێكی ناوداری پێغەمبەرە، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، كۆمەڵێ لەهاوەڵان و پەیڕەوان

---

[٨٩٤] تجريد/٣، ژمارە: ١١٣١ = ٢٧٢١ بخاری. مسلم/١٤١٨ - پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٠٤ = ٣٤٥٧ شیحا.

(سەحابەو تابعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئەبو سەعیدی کوڕی یونس دەڵێ: عوقبە قورئانخوێنو فەرائیززانو شەرعزانێکی جوان بوو، زمانڕەوانو شاعیرو نووسەر بوو، هەموو قورئانی لەبەر بوو، قورئانێکی بۆخۆی نووسیبوو، لەسەر شێوەی تەئلیفی موصحەفی عوسمان نەبوو، لەئاخیرەوە نووسرا بوو (كَتَبَهُ عُقْبَهُ بن عَامِرٍ بِيَدِهِ = عوقبەی کوڕی عامیر ئەم قورئانەی بەدەستی خۆی نووسیوە) فەرمایشتەکەی ئەبو سەعید تەواو بوو.

عوقبە بەرید بوو، ئەو موژدەی ئازاد کردنی شاری دیمەشقی برد بۆ ئیمامی عومەر، لایەنگیری موعاویە بوو، لەشەڕی صەفیندا لەگەڵ موعاوییە بوو، ماوەیێ موعاویە کردی بەکارمەندی سەر میصر، لەسەردەمی موعاوییەدا عەمری خودایکرد. (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

٢- عومەری کوڕی خەتتاب قوڕەیشییە، عەدەوییە، لەپشتی هەشتەما، ڕەچەڵەك (نژاد - نەسەب)ی لەباوکەوە دەگاتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دایکی ناوی حەنتەمەی کچی هاشمە، کەسناوی (کونیەی) ئەبو حەفصە، نازناوی (لەقەبی) فاروووقە، چونکە ئەو ڕۆژەی کە عومەر ئیسلام بوو، ئیسلام ئاشکرا بوو، وەباوەڕ لەکوفر جیاوە بوو، لەساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتیدا موسوڵمان بووە، لەپێش ئەودا تەنیا چل پیاوو، یازدە ژن ئیسلام بوو بوون، لە عەشەرەی موبەشەرەیە، کە دە کەس بوون پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتی پێیان دابوو، کەناویان لە فەرموودەی ژمارە (٣٨)ی بلوغ المرامدا، لەژیاننامەی ئیمامی عوثماندا، لەشێعرەکانی خانیدا هاتووە.

عومەر جێنشین (خەلیفە)ی دووەمە، لەپێش هاتنی پێغەمبەرایەتیدا، بە (٣٠) سیی ساڵ، یان بە (١٣) سیازدە ساڵ لەدایك بووە، واتە: دە ساڵ، یان (٢٧)

بیستو حەوتساڵ، بەتەمەن لە پێغەمبەر منداڵترە، لەسەردەمی نەزانیدا، پایەی نوێنەری قورەیش بەو سپێردرا بوو، کەشەڕێ، یان هەرایێ، یان کێشەیێ سەری هەڵدەدا، ئەو دەکەوتە نێوانیانەوەو نێوانی ڕێك دەخستنەوە، لەسەرەتای ئیسلامەوە، زۆر توندوتیژ بوو لە دژی موسوڵمانان، بەڵام کاتێ ئیسلام بوو، موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، ئیسلامبوونی دانرا بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ موسوڵمانان، ئیبنو مەسعوود دەیفەرموو: (هەتا عومەر ئیسلام نەبوو، نەماندەوێرا بەئاشکرا خودا بپەرستین).

عومەر یەکێکە لەکۆچکارە پێشینەکان، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودی (بەیعەتی ڕیزوان)و غەزای بەدرو هەموو شەڕگەو مەڵبەندی جەنگەکانی تری پێغەمبەر بووە. یەکێ بووە لەو چەند کەسانە، کە پێغەمبەر وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو، لەپاش مەرگی ئەبو بکر، لەساڵی سیازدەی کۆچیدا بوو بە دووەم جێنشین، ئەم وڵاتانەو چەندین شوێنی تری ئازادکردو لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام بوون: شامو عێراقو ئێرانو میصر، دیوان ئەو داینا، هەر ئەو مووچەی بۆ پیاوانی سوپا، بەپێی خزمەتیان بۆ ئیسلام بڕییەوە، کارە هەرە گرنگەکانی تری: ئەو نوێژی تەراویحی لەسەر ئەم شێوەی ئێستا، لەشەوانی ڕەمەزاندا، دامەزراند، کە بیست ڕکات نوێژی تەراویح، دووڕکات دووڕکات دەکرێ بەجەماعەت لەمزگەوت، وەلە کۆتایدا سێ ڕکاتی وەتریش بەجەماعەت دەکرێ!! کە ئێستا جێگەی داخە، لە وڵاتی خۆمانا، بە دەستتێوەردانی شیعە، تەراویح شێواوە، گوایە ئەمەی هەیە بیدعەی عومەرە، ئەمساڵ مێدیاکان بڵاویانکردەوە کە لەسەر نوێژی تەراویح شیعەکان خەڵکێکی زۆریان لە بەغدادو دیالە کوشتووە، هاکا لە کوردستانیش خەڵك کوژرا لەسەر تەراویحو لەسەر قونووت!!! (٢٠١٤/٨/٧).

هەروا عومەر مێژووی کۆچی دانا، کە ڕۆژی کۆچی پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینـە، بکـری بەسـەرەتای مێـژووی ئیـسلامی، کـە هـەتا ئـەمڕۆ کـە (٢٠١٤/٨/٧)ەی زایینی، بەرامبەر (٩)ی شەشەلانی (١٤٣٥)ی کۆچی بەردەوامە، وە بەپشتی خودا هەتا نزیکی قیامـەت هـەر بـەردەوام دەبێ، عومـەر یەکـەم کـەس بوو، کە ناسناوی (ئەمیرولمؤئمینین: فەرمانڕەوای موسوڵمانان)ی پێ بەخشرا.

سەرەتای صەحیحی بوخاری، لەناوی صەحابەکاندا، بەناوی عومەر دەست پێ دەکا، هەر خۆی لەناو یارانی پێغەمبەردا ناوی (عومـەری کـوڕی خـەططـاب) بـووە، بـەڵام بیـستو چـوار عومـەر نـاوی تریـان لـەناودا بـووە، پێشەوا عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) پیـاوێکی باڵابـەرزی تـەواو کەڵەگـەتی تێکسمڕاوی گڕانـە (أصلع) بوو، قووچێکی وابوو، کـە لـەناو خـەڵکا دەوەسـتا، دەتگـوت: ئـەو سـوارەو ئـەو خەڵکـەی تـر لـەدەوری پیـادەن، لەسـاڵی گرانـیو برسـێتییەکەدا، وازی لەخواردنی گۆشـتو چـەوریو خـواردنی شـتی خـۆش هێنـا، لـەجیاتی ئـەوە بـە خـواردنی ڕۆن زەیتـوون، ئیکتیفـای دەکـرد، هـەتا هەسـت بـەو ئـێشو ئـازارو سـەخڵەتییە بکـا، کـە خـەڵکانی هـەژاری ئـەو ڕۆژگـارە ناهـەموارە هەسـتیان پـێ کردووە، ئەوەندە جەڕەبابەی خۆی دابوو، ڕەنگی هەڵبڕسکا بوو. عومەر پیاوێکی تـوکن بـوو، مـووی خـۆی دەگرتـە خەنـەو وسمـە، عومـەر زۆر دادپـەروەر بـوو، عەدالەتو دادپەروەری عومەر زۆر ئاشکرایە، هـەموو کـەس هەسـتی پـێ دەکا، مەگەر کەسێ چاوی دڵی کوێر بێ. عومـەر بەهـەردوو دەسـتی وەك یـەك کـاری دەکرد، واتە: هەم چەپەوانەو هەم ڕاستەوانە بوو، کە لـە عەرەبیـدا بـەم ڕەوشـە دەگوترێ (أيسر وأعسر). ڕیشی عومەر زۆر پڕ بـوو، لـە فـەرموودەدا لەسوننەتی زۆر دروسـتدا، وەسـپو مـەدحی زۆری عومـەر، لەلایـەنی پێغەمبـەرو یـارانی پێغەمبەرەوە کراوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (گریمـان

لەپاش من پێغەمبەری تر ببوایە، عومەر دەبوو بە پێغەمبەر، بەڵام لەدوای مـن هەتا رۆژی قیامەت پێغەمبەری تر نایەتو نایێ).

عومـەر خـەزووری پێغەمبـەر بـوو، حەفـصەی کـچی عومـەر، هاوسـەری پێغەمبەر بوو، مۆری ئەموستیلەکەی عومەر (كَفَى بِالمَوْتِ وَاعِظًا يَا عُمَرُ!) بـوو، واتە: ئەی عومـەر! بەڕاستی مـردن ئامۆژگـاری چاکە. {بڕوانـە: ژمـارە: ٢٠٩ لـە (شەرحی بلوغ المرام)}.

ئیمامی عومەر یەکەم قازی بوو لە ئیسلاما، ئـەبوبکر کـردی بـەقازی، دە سـاڵو نیـو جێنـشین بـوو، لەتەمـەنی شەسـتو سـێ سـاڵیدا، لەشـاری مەدینـە لـەمانگی قوربـانی سـاڵی بیـستو سێی کۆچیدا، لـەناو میحرابـی مزگەوتەکـەی پێغەمبەردا، لەکاتێکا، کە بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ موسوڵمانان دەکرد، ئـەبو لوئلوئەی فارسی، کەمەجووسی بوو، هەنـدێ دەڵێن: گـاور بـوو، بـەکێردێکی دوو دەم کوشـتی، وەلەگـەڵ عومـەردا، سـیازدە کەسـی تریـشی زامـار کـرد، حـەوتیان مـردن، هـەر لەوێـدا ئـەبو لوئلوئـە، لـەپاش ئـەم دەسـت وەشـاندنە دڕندانەیـە، پیاوێکی موسوڵمان، کەچاوی بەم حاڵە کـەوت، کـەرەکێکی دا بەسـەریداو گرتـی، ئەو زرتە بۆزە زەندیقـەیش کـەدی وا گـیراوە چـارەی نـەما، بەکێردەکـەی خـۆی، خۆی سەربڕیو خۆی کوشت! بەدۆزەخی ئێجگاری شاد بوو.

ئێستا لەئێران مەرقەدێکیان بۆ ئەبو لوئلوئە دروست کردووە، ناویان نـاوە مەرقـەدی ئـەبو ئیـسلام، وەك مەرقـەدو مـەزاری شـێخو مەشـایەخو پیاوچاکان سەردانی دەکەن، بەتایبەتی لەساڵیادی شەهیدد بـوونی ئیمـامی عومـەردا! کـورد گوتەنی: (تەیری گول ئاشق بەداری ژەقنەمووتە!!)

عومەر (٣) سێ شەو بەبرینەکەیەوە ژیا، ئەوسا مـرد، داوای لـە حـەزرەتی عائیـشە کـرد، کـە لەهۆدەکـەی ئـەودا، لەگـەڵ پێغەمبـەرو ئـەبو بکـردا بنێـژرێ،

ئەویش مۆڵەتی ئەوەی دا، صوهەیب نوێـژی تـەرمی لەسـەر کـرد، ئـەوجا لـەپاڵ ئـەبو بکـردا، لەتەنیـشت گۆڕەکـەی پێغەمبـەرەوە نێـژرا، بـۆ شـارەزابوونی تـەواو لەژیانو شانازییەکانی عومەر، {بڕوانە: صەحیحی بوخاری، فضائل الصحابە، لە فەرموودەی ژمارە: ٣٦٨٢ هەتا ٣٦٩٤، هـەروا ئـەم ژمارانـە/ ٣٨٦٣، ٦١٧١، ٧١٥٣، ٦٢٦٤، ٦٦٣٢، ٣٧٠٠. هـەروا بڕوانـە فـضائلی صـەحابە لەصـەحیحی موسـلیمدا، لـە فـەرموودەی ژمـارە: ٦١٣٩وە هـەتا ژمـارە: ٦١٥٨ هـەروا بڕوانـە: تـاج/٣ زنجـیرە: ٤ لەژمارە: ٣٢٤٥وە هـەتا/ ٣٢٥٧. + زنجـیرە: ٥ لـەژمارە: ٣٢٥٨ هـەتا ژمـارە: ٣٢٦٩ + زنجیرە: ٦ لەژمارە: ٣٢٧٠وە هەتا ژمارە: ٣٢٧١ لە زنجیرە/٧ + پوختەی صەحیحی موسـلیم زنجـیرە/ ١٥١ ژمـارە: ١٩٩ + تەجریـدی بوخـاری = پوختـەی صـەحیحی بوخاری/٢ ژمارە: ٧١٦}.

## (٨) باب إستئذَن الثَيّب في النكاح بالنطقِ والبكر بالسُكوتِ
## ڕا وەرگرتنو پرسو ڕا کردن بە بێوەژنو بە کچ لە کاتی شووکردنیاندا

٨٩٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله تعالى عنـه) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) قَالَ: « لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ »، قَالُوا: يَا رَسُـولَ اللَّـهِ: وَكَيْـفَ إِذْنُهَـا؟ قَـالَ: « أَنْ تَـسْكُتَ ». {الحـديث: ٣٤٥٨ = ٣٤٤٨ فـم. تجريد/٥، رقم: ١٧٦٢ = ٥١٣٧، ٦٩٤٩، ٦٩٤٦، ٦٩٦٨. نسائى. نكاح: ٣٢٦٧. تحفة الأشراف: ١٥٤٢٥} : [٨٩٥]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: بێـوەژن مـارە ناکرێـت تـا گفتـی لێ وەرنـەگیرێ، کچیش نادرێ بەشوو تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ) گوتیان: ئەی پێغەمبـەری خـودا!

---

[٨٩٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٦٢ = ٥١٣٧ بخاری. پوختەی مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٢ = ٣٤٥٨ شیحا.

**جا چۆن بزانین کە رازییە یانا، چونکە کچ شەرمنە، رووی نایەت کەباسی مۆڵەتو شتی وابکا؟ فەرمووی: (کە قسەی نەکردو رەخنەی نەبوو، واتای وایە کە قاییلە!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨١، بڕوانە: مختصر صحيح البخاری، بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٧٦٢ بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ناوەڕۆكو مەبەستی ئەم فەرموودەیە} .**

## ڕاڤەو ڕوونكردنەوە:

**ئەم فەرموودەیەو كۆمەڵێ فەرموودەی تری ڕاستو دروست نیشانەو بەڵگەی ئەوەن كەژن، چ كچ بێ، چ بێوەژن، كاتێ دەدرێ بەشوو، دەبێ ڕەزای لەسەر شووكردنەكەی هەبێ، ئیتر ئەو ڕەزابوونو ڕێگە پێدانە، بەپێ ی ڕۆژ دەگۆڕێ، لەشەرعی پیرۆزدا كۆمەڵێك بڕیار هەیە بەپێێ كاتو سات دەگۆڕێ ئەم بابەتەیش لەو جۆرە بڕیارانەیە. من بەخودی خۆم، ئامادەی چەندین مارە بڕین بووم، بەشێوەی هەقدار، بەشێوەی شایەت، بەشێوەی مەلای مارە بڕ، بەشێوەی خزمی ریش سپی، لەكورد، لەعەرەب، لەتوركمان، لە سلێمانی، لەكەركوك، لەبەغا، لەشوێنانی تر، لەكۆمەڵگای جۆراو جۆر، لەلادێو گوند، لەشارو شارۆچكە، لەخەڵكی بەدین، لەخەڵكی مەدەنی، كەپلەی هۆشیاریو زرنگیو ڕۆشنبیریی خەڵكەكەی بەرزونزمی پێوە دیار بێ.**

**جا لەپاش ئەم ڕێخۆشكردنە، ئەوەی كەڕەچاوم كردووەو لەلای هەموو كەسێ كەئاگای لەم بارودۆخە ناسكە بێ، ئەم دیاردە بەڵگە نەویستە یە، كەئەمە پوختەكەیەتی: (زۆرینەی كات، پەیوەندیدارانو عەلاقە مەندان، چ هەقدارو وەلی بن، چ ژنو مێردبن، چ شایەت بن، شەرمو شكۆ دەیانگرێ، سامیان لێ دەنیشێ، گەڵێ جار وا دەپەشۆكێن، شپرزەیی یان پێوە دیارە، زۆر جار**

وادەشڵەژێن قسەکان تێکەڵو پێکەڵ دەکەن، باوکی کچەکە، یاکچەکە، یامێردەکە، زمانی تەتەڵە دەکا، دەمی دەلەرزێ، شەرمو سام وادەیگرێ تفی بۆ قووت نادرێ. جارێ من خۆم مەلای گرێدەری گرێبەندی مارەکردنەکە بووم، باوکی کچەکە کەپیاوێکی کامڵ بوو، پزیشك بوو رۆژێ لە رۆژان رەئیسی صیحەی شاری سلێمانی بوو مێردەکەیش پزیشك بوو، کچەکە دەرچووی کۆلێژ بوو، دایکی کچەکە خانمێکی شاژنی هۆشمەندی ژیرو سەلار بوو، خوێنەوارێکی بەرز بوو، شایەتەکان کۆمەڵێ لەپیاو ماقووڵانی شارەکە بوون، کەناسیاو و دۆستی هەردوولا بوون. دەی باوکەکە واشەرم گرتبووی، زمانی گۆی نەدەکرد، قسەی بۆ نەدەکرا، هەروا کورو کچەکەش، تەنیا دایکی کچەکە نەشڵەژا، وەك ناوەندێ رابەری ئەوانی دەکردو قسەکانی بۆ ڕاست دەکردنەوە، لەبەر ئەوە من کەهەستم بەم شڵۆقی هەلۆێستە کرد، ناچار بووم کەبە باوکی کچەکە بڵێم: تۆ من بکە بەوەکیل بۆ ئەم کارەو ئیتر هەقت نەبێ، ئەویش وایکرد! دەی برا! کەئەمە حاڵی دوکتۆرو ڕۆشنبیرانی سەدەی بیستەم بێ، لەکاتو ساتی وادا، ئیتر دەبێ حاڵی کچە دەوارنشینێکی کورد، یاعەرەب، یاهەر نەتەوەیەکی تر، لەگوندێکی لارێ، یالەکوێرە دێ یەك، یا لەدوورگەیەکی دوورە دەست، یالەزۆنگاوێ لەزۆنگاوەکانی خوارووی عیراق، لەمەوپێشو ئێستایشو لەمەودوایش چۆن بێ و چۆن بتوانێ کەوەك بولبول، بەگوساخی پڕ بەدەم هاوار بکاو بڵێ: من وادەکەم. ئەوەی کەلەم لایەنەوە پێویستە ئەوەیە: کەڕەزابوونی ژنو مێرد بەیەکتری مسۆگەر بێ، ئیتر دەربڕینو ئاشکراکردنی ئەم مەبەستە بەهەر شێوەیێ بێ دروستەو دەبێ. ئەوەی واناڵێ لەحاڵەکە حاڵی نییە یا نەیەوێ حاڵی ببێ.

٨٩٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ الرَّبِيعِ بْنِ طَارِقٍ رَضِي اللَّه عَنَهُ قَالَ: أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنْ أَبِي عَمْرٍو مَوْلَى عَائِشَةَ عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي؟ قَالَ: رِضَاهَا صَمْتُهَا.(الحديث ٥١٣٧ طرفاه في: ٦٩٤٩ – ٦٩٧١):[٨٩٦]

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەكات:ئەی پێغەمبەری خودا! لەكاتی كچ بەشوودانا، كاتێ پرس و ڕاو ڕاوێژ بەكچ دەكرێ شەرم دەكا كەبەڕاشكاوی رەزابوونی خۆی دەربڕێو بڵێ: ئاشوو بەو پیاوە دەكەمو ڕازیم مارەم بكەن لێ ی، دەی لەباروودۆخی ئاوادا چار چییە؟ فەرمووی: (لەكاتی ئاوادا بێ دەنگی ی كچەكە نیشانەی ڕەزامەندییەتی).

## (٩) باب تزوج الأب البكر الصغيرة
## باوك بۆی هەیە كچی بچكۆلە بدا بە شوو

٨٩٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَانَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارث بْنِ خَزْرَجٍ فَوُعِكْتُ فَتَمَرَّقَ شَعَرِي فَوَفَى جُمَيْمَةً فَاتَتْنِي امِّي امُّ رُومَانَ وَانِّي لَفِي ارْجُوحَةٍ وَمَعِي صَوَاحِبُ لِي فَصَرَخَتْ بِي فَاتَيْتُهَا لا ادْرِي مَا تُرِيدُ بِي فَاخَذتْ بِيَدِي حَتَّى اوْقَفَتْنِي عَلَى بَابِ الدَّارِ وَانِّي لانْهجُ حَتَّى سَكَنَ بَعْض نَفَسِي ثمَّ اخَذتْ شَيْئًا مِنْ مَاء فَمَسَحَتْ بِهِ وَجْهِي وَرَاسِي ثمَّ ادْخَلَتْنِي الدَّارَ فَاذا نِسْوَةٌ مِنْ الانْصار فِي الْبَيْتِ فَقُلْنَ عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ وَعَلَى خَيْرِ طائِرٍ فَاسْلَمَتْنِي الَيْهِنَّ فَاصْلَحْنَ مِنْ شَانِي فَلَمْ يَرُعْنِي الا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى

---

[٨٩٦] تجريد/٥، ژمارە: ١٧٦٣ = ٥١٣٧ بخاری. مسلم: ٣٤٦٠ شيحا.

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضحًى فَاسْلَمَتْنِي الَيْهِ وَانَا يَوْمَئِذ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ (الحـديث: ٣٨٩٤، اطرافه في: ٣٨٩٦، ٥١٣٣، ٥١٣٤، ٥١٥٦، ٥١٥٨، ٥١٦٠): [٨٩٧]

عائيشه (رەزای خودای لـێ بێ) فەرمووی: کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) مـارەی کردم،تەمـەنم شـەش سـاڵ بـوو، ئەوکاتـە ماڵمـان لەمەککـەبوو، لەپاشان کۆچمان کـردو چووین بـۆ مەینـە لـەناو خێڵـی نـەوەی حاریـسی کـوڕی خەزرەجا دابەزین، کە تەمەنم بوو بە نۆ ساڵ، ڕۆژێ دایکم هات بۆلام، لەوکاتەدا لـە نەخۆشـینی لـەرزوتا هەڵـسا بوومـەوە، قژەکـەم ڕووتـا بـۆوە، بـەڵام بەشـی پەلکۆڵکەیەکی لێ پەیدا بوو بوو، کەدایکم هات بمبات بـە بـووکی، مـن لەوکاتـەدا لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکما بووم جۆلانێمان دەکرد، جاکە هات ڤاوی کردم و منیش چووم بۆلای دایکم، نەشم دەزانی دایکم چی لێم دەوێ.

جا پەلی گرتم و بردمی هەتا گەیشتینە بـەردەگای مـاڵ، لـەوێ ڕاوەسـتاین، هـەتا پـشووێی بـدەم، چـونکە هەناسـە بـڕکێم بـوو، جـا کەنـەختێ هەناسـەم نیـشتەوە، ئـەو جانـەختێ ئـاوی هـەڵگرت و سـوویی لەدەموچـاو وسـەرم، ئـەنجا بردمیە ژوورەوە بۆ ناو ماڵ کە سەرنجم دا واکۆمەڵێك ژن لەیاریدەدەران وان لـە ماڵەکەدا، چاوەڕوانی من دەکەن کە بمکەن بەبووك، گوتیان: (عَلَى الخير و البركـة وعلى خير طائرٍ)، واتە: لەسەر خێرو خۆشی، خوا پیرۆزی کا، بەبەختی باش).

ئیتر ئـوم ڕۆمـانی دایکـم منـی دایـە دەسـت ژنـە ئەنـصارییەکان، ئـەوانیش نـەختێ ڕێکیـان خـستم، ئـیتر ئاگـام لێ نـەبوو، وەهـەر ئەوەنـدەم زانـی بـەو چێشتەنگاوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لـێ بـێ) دایـچەڵەکانم و هاتـە ژوورەوە بـۆلام، ئـیتر ژنـەکانیش منیـان دایـە دەسـتی و بـەجێیان هێـشتم و پێغەمبـەر

---

[٨٩٧] تجريد/٤، ژمارە: ١٥١٥ = ٣٨٩٤ بخاری. مسلم: ١٤٢٢ = مختصر صحيح مـسلم/٢، ژمـارە: ٨٠٥ = ٣٤٦٤.

(دروودی خودای لێ بێ) بەدەستی گرتم. وە ئەو کاتە تەمەنم نۆ ساڵ بوو) (تاج/٣ ل/٨٨ ز/٣٨ ف/٣ = تاج/٢، ژمارە: ٢١١٢ ج/٤ - باسی: نزاکردن بۆ بووك وزاوا).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (٨٠٥)ی پوختەی موسلیمە، بۆ سوودی زیاتر دەینووسین:

عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِستٍّ سِنِينَ، وَبَنَى بِى وَأَنَا بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. قَالَتْ: فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، فَوُعِكْتُ شَهْرًا فَوَفَى شَعْرِى جُمَيْمَةً، فَأَتَتْنِى أُمُّ رُومَانَ وَأَنَا عَلَى أُرْجُوحَةٍ، وَمَعِى صَوَاحِبِى فَصَرَخَتْ بِى، فَأَتَيْتُهَا وَمَا أَدْرِى مَا تُرِيدُ بِى، فَأَخَذَتْ بِيَدِى فَأَوْقَفَتْنِى عَلَى الْبَابِ، فَقُلْتُ: هَهْ هَهْ. حَتَّى ذَهَبَ نَفَسِى فَأَدْخَلَتْنِى بَيْتًا، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ، فَأَسْلَمَتْنِى إِلَيْهِنَّ، فَغَسَلْنَ رَأْسِى، وَأَصْلَحْنَنِى، فَلَمْ يَرُعْنِى إِلاَّ وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ضُحًى، فَأَسْلَمْنَنِى إِلَيْهِ. {الحديث: ٣٤٦٤ = ٣٤٥٤ فـم. تجريد/٤، رقم: ١٥١٥ = ٣٨٩٤، ٣٨٩٦، ٥١٣٣، ٥١٣٤، ٥١٥٦، ٥١٥٨، ٥١٦٠. تحفة الأشراف: ١٦٨٠٩}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تەمەنم شەش ساڵ بوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مارەی کردم، کاتێ کە گواستمیەوە نۆ ساڵ بووم. فەرمووی: لەپاشا کۆچمان کرد بۆ مەدینە، جارێ تووشی لەرزو تایەکی سەختی وابووم، قژم رووتایەوە، لەپاشا قژەکەم هاتەوەو پەلکۆلەیەکی پەیدا کردەوە دەیدا لەناو شانم، ئەوا جارێ وام لەناو جۆلانەیەکا، لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکی خۆما، گەمەو دیلانێمان دەکرد، هەر ئەوەندەم زانی ئوممو رۆمانی دایکم هاتە لامو بانگی کردم، منیش چووم بۆلای، نەیشم دەزانی چی لێم دەوێو بۆچی بانگم دەکا، ئیتر دەستی گرتمو بردمی، تا گەیشتینە

بەردەرگای ماڵی خۆمان، لەوێدا تۆزێ رایوەستاندم، لەبەر ماندوێتی هەناسەم سوار بوو بوو، هەناسەبڕکێم بوو، تا نەختێ پشووم بەبەردا هاتەوە، لەبەر خۆمەوە دەمگوت: هە، هە، هە. جا دایکم نەختێ ئاوی هەڵگرتو ئاوەکەی هەڵسوی لە دەموچاوو سەرو چاوم، ئینجا بردمیە ماڵەوە، کە چوومە ژوورەوە گوتیان: لەسەر خێرو خۆشی، لەسەر بەختی باش، ئیتر دایکم منی دایە دەستی ئەوان، ئەوانیش سەریان شۆردمو نەختێ رێکیان خستم، ئیتر ئاگام لەهیچ نەبوو، کاتێکم زانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی چێشتەنگاودا خۆی کرد بە ماڵاو دایچەڵەکانم. ئەوسا ژنەکان منیان دایە دەستیو هەر ئەوکاتە لەو شوێنەدا، لە ماڵی خۆمان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی گرتمو لێم بوو بە زاوا، ئەوحەلە تەمەنم نۆ ساڵ بوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٢٤٣٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٠٦٧}.

**(١٢) باب الصداق وجواز كَوْنِه تعليم قرآنٍ وخاتم حديد وغير ذالك من قليلٍ وكثير واستحباب كونه خمسمائة درهم لمن لا يجحف به**

**مارەیی سوننەتە، دروستە بریتی بێ لە فێرکردنی قورئانو شتی تری وای بە سوود، هەروا دروستە ئەمووستیلەیەکی ئاسن بێ، یان هەر شتێ تر بێ وا سوننەتە کە مارەیی لە پێنج سەد درەم کەمتر نەبێ، بۆ کەسێ کە لە بارەیدا بێ**

٨٩٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رضى الله عنهما) قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ أَهَبُ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَصَعَّدَ النَّظَرَ فِيهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَأْسَهُ. فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا، جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا، فَقَالَ: « فَهَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ »؟ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: « اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ

فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا »؟ فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « انْظُرْ وَلَوْ خَاتِمًا مِنْ حَدِيدٍ »، فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ. فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ خَاتِمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي. (قَالَ سَهْلٌ مَا لَهُ رِدَاءٌ ). فَلَهَا نِصْفُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيْءٌ !» فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلِسُهُ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُوَلِّيًا، فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ لَهُ، فَلَمَّا جَاءَ، قَالَ: « مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ »؟ قَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا (عَدَّدَهَا). فَقَالَ: « تَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟ » قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: « اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ ». {الحديث: ٣٤٧٢ = ٣٤٦٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٦٠ = ٥١٢١، ٢٣١٠، ٥٠٢٩، ٥٠٣٠، ٥٠٨٧، ٥١٢٦، ٥١٣٢، ٥١٣٥، ٥١٤١، ٥١٤٩، ٥١٥٠، ٥٨٧١، ٧٤١٧. فتح الباري} : [٨٩٨]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێك هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووم خۆم ببەخشم بەتۆ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرتاپا تەماشای کردو، ئەنجا سەری دانەواندو هیچ قسەی نەکرد. ژنەکەیش کەڕوانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچی نەگوت لەبارەیەوە، دانیشت. جا پیاوێ، کە لەیارانی پێغەمبەر بوو، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر خۆت ناتەوێ لەمنی مارەبکە؟ فەرمووی: (ئایا هیچت هەیە کە بیکەی بە مارەیی بۆی؟ گوتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خودا! هیچم نییە کە بیکەم بە مارەیی. فەرمووی: (دەبڕۆ بۆماڵەوە بۆلای کەسوکارت، بزانە هیچت دەست دەکەوێ کە بیکەی بە مارەیی). پیاوەکە ڕۆیشتو هاتەوە گوتی: بەخوا هیچم

[٨٩٨] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٦٠ - ٥١٢١ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٠ - ٣٤٧٢ شیحا.

دەست نەکەوت، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دە شتێك پەیدا بکە با ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ بیکە بە مارەیی). پیاوەکە دیسان رۆیشتەوەو هاتەوەو گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەنگوستیلەی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام ئەم تاقە بەرکۆشەم هەیە کەوا لەبەرما، نیوەی بۆ منو نیوەی بۆ ئەو لەباتی مارەیی؟ سەهل فەرمووی: پیاوەکە یەك بەرکۆشی هەبوو، ئاڵاندبووی بەلای خوارووی خۆیەوە، پەشتە ماڵی نەبوو کە دەئاڵێنرێ بەلای سەرووی لەشەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە بەوچی، خۆی یەك پارچەیە، هەربەشی بەری یەکێکتان دەکا، ئەگەر لەبەرتۆدا بێ هیچی بەر ئەو ناکەوێ، ئەگەر لەبەر ئەودا بێ هیچی بەرتۆ ناکەوێ، کەواتە ئەوە نابێ).

جا پیاوەکە تاوێکی باش دانیشت، هەڵسا رۆیشت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چاوی لێ بوو، ناردی بەشوێنیدا، بانگی کردەوە، کەهات پێی فەرموو: (چیت لە قورئان لەبەرە؟) گوتی: ئەو سوورەتەو ئەو سوورەتەم لەبەرە، وە سوورەتەکانی ژمارد، فەرمووی: (ئایا ئەم سوورەتانە هەموویان بەباشی لەبەر دەخوێنی؟) گوتی: بەڵێ. فەرمووی: (دەبڕۆ ئەوا لەسەر ئەو قورئانەی کە لەبەرتە ئەم ژنەم کرد بەهی تۆ). لە گێڕانەوەیەکی تاجا: (ئەوا لەسەر ئەوە کە فێری ئەو قورئانەی بکەی، کە خۆت ئێستا لەبەرتە ئەم ژنەم مارەکرد لەتۆ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٢٠٩٩ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٠٧٠}.

٨٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رضى الله عنه) أَثَرَ صُفْرَةٍ. فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ: « فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ

بِشَاةٍ ». {الحديث: ٣٤٧٥ = ٣٤٦٥ فم. بخاري. نكاح: ٥١٥٥، ٦٣٨٦. ترمذي. نكاح: ١٠٩٤. نسائي. نكاح: ٣٣٧٢، ابن ماجة. نكاح: ١٩٠٧. تحفة الأشراف: ٢٨٨} : [٨٩٩]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شوێنەواری زەعفەرانی بەعەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە بینی، فەرمووی: (ئەم زەردییە چییە؟) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە ژنم هێناوە، مارەییەکەی ناوکەیێ زێڕە، کە بایی پێنج درەمی زیوینە. فەرمووی: (دەی خودا پیرۆزی بکا لێت، ئەگەر مەڕێکت سەربڕیوە نانی شایی دروستکە). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٣}.

## (١٣) باب فضيلة إعتاقِه أمَتَهُ ثم يَتَزَوَّجُهَا
## پیاوێ کەنیزی خۆی ئازاد بکاو ئەوجا مارەی بکا بۆ خۆی

٩٠٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزَا خَيْبَرَ فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلَاةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ فَرَكِبَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ فَأَجْرَى نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ حَسَرَ الْإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ قَالَهَا ثَلَاثًا قَالَ وَخَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ فَقَالُوا مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ يَعْنِي الْجَيْشَ قَالَ فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً فَجُمِعَ السَّبْيُ فَجَاءَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنْ السَّبْيِ قَالَ اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ لَا

---

[٨٩٩] بخاری. نکاح/٥١٥٥ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨١٩ = ٣٤٧٥ شيحا.

تَصْلُحُ إِلَّا لَكَ قَالَ ادْعُوهُ بِهَا فَجَاءَ بِهَا فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ خُذ جَارِيَةً مِنْ السَّبْيِ غَيْرَهَا قَالَ فَأَعْتَقَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَزَوَّجَهَا فَقَالَ لَهُ ثابتٌ يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا قَالَ نَفْسَهَا أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا حَتَّى إِذا كَانَ بِالطَّرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنْ اللَّيْلِ فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرُوسًا فَقَالَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ وَبَسَط نِطعًا فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ قَالَ وَأَحْسِبُهُ قَدْ ذَكَرَ السَّوِيقَ قَالَ فَحَاسُوا حَيْسًا فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٣٧١ أطرافه في: ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٥٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣)[٩٠٠]:

ئیمامی ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپای ئامادە کردو بەرەو خەیبەر کەوتەڕێ، تاریکولێڵەکە لەپاڵ قەڵای خەیبەردا نوێژی بەیانیمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وڵاخەکەی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وڵاخەکەی خۆی بەناو کووچەو کۆڵانەکانی خەیبەردا غار دەدا، منو ئەبوطەلحە لەنزیکی پێغەمبەرەوە بووین، تەنانەت کەشکەژنۆم لەپاشکۆی ئەبوطەلحەوە دەیدا لەڕانی پێغەمبەری خودا (دروودی خوادای لێ بێ): جالەئەنجامی وڵاخ تاو دانو جەنجاڵیو پاڵەپەستۆدا ڕانی پێغەمبەر ڕووت بوو، تەنانەت من بەچاوی خۆم سپێدەی ڕانی پێغەمبەرم بینی.

---

[٩٠٠] تجرید/١، زمارە: ٢٣٥ = ٣٧١ مسلم: ١٣٦٥ = ٣٤٨٢ شیحا.

کاتێ پێغەمبەرو سوپاکەی هەڵ رژانە ناو گوندەکەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ): ئەڵلاهوئەکبەر، وێران بوو خەیبەر، لەڕاستی دا ئێمە هەرکاتێ بۆ هۆزێ بچینە مەیدان، ئیتر ئەوتۆقیوانە بەیانی رۆژی ڕەشیانە) وەئەم فەرمایشتەی سێ جار دووبارە کردەوە، کەئیقتیباسە لەم ئایەتە پیرۆزە: {فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاء صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ} ١٧٧/٣٧ - واتە: کاتێ تۆڵەی سەختی خودا بەردەرگا بەهۆزی بێبڕوا دەگرێو، لەهەموولاوە گەمارۆیان دەدا، ئیتر ئەو گەلە تۆقیوانە سەرلەبەیانی رۆژی رەشیانە). فەرمووی: لەولایشەوە جوولەکەکان ئاگایان لەم هەڵمەتە نەبوو، سەرلەبەیانی وەك رۆژانی تر وەدەرکەوتن بۆسەر مەزراو ئیش‌و کاری رۆژانەی خۆیان، لەپڕ لووتیان تەقی بەلووتی سوپای ئیسلاما، جاهاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئای! ئەمە موحەممەدو سوپاکەیەتی، هاتوون بۆسەرمان.

ئەنەس فەرمووی: قەڵای خەیبەرمان بەزەبری بازوو لەچنگی دوژمن رزگار کرد. کاتێ ژنە دیلەکان کۆ کرانەوە، دەحیەی کەلبی هاتە خزمەتی حەزرەت عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! لەم ژنە تالانییانە کەنیزەکێکم پێ بدە، فەرمووی: (بڕۆ کەنیزەکێ ببە). دەحیە پیاوێکی قۆزی شۆخ بوو، زۆر جاران جوبرائیل لەشێوەی ئەودا دەهات بۆخزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) و سرووشی بۆ دەهێنا، دەحیە چوو، صەفییەی کچی حویەی برد بۆ خۆی بەڵام پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حویەی، کەخانمی ژنانی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەظیرە، داوتە بەدەحیە، چۆن شتی وا دەگونجێ، ئەوخانمە خانەدانە بۆکەسی تر دەست نادا مەگەر بۆ تۆئەی پێغەمبەری خودا!) ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:

(ئادەی دەحیە بانگ کەن ئەو ژنە بهێنێ) دەحیە هاتەوەو صەفییەی هێنایەوە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای صەفییەی کرد، بەدەحیەی فەرموو: (برۆ لەو ژنگەلە بەتاڵانی گیراوانە کەنیزەکێکی تر بەرە بۆخۆت).

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفییەی ئازاد کردو مارەی کرد بۆخۆی، ثابیتی بەنانی بەئیمامی ئەنەسی فەرموو: ئەی باوکی حەمزە! چی کرد بەمارەیی بۆی؟ فەرمووی: خودی خۆی کرد بەمارەیی بۆی، لەپێشا لەباتی مارەیی ئازادی کردو ئەوسا مارەی کرد لەخۆی، جاکاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەرێگە شەوێ ئومموسولەیمی دایکم تەدارەکی بووکی بۆ صەفییە خستو جیازی ی بووکی بۆ کردو کردی بەبووکو پێشکەشی کرد بە پێغەمبەر، بۆبەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوا بوو. ئەوسا فەرمووی: (هەرکەسێ خۆراکی هەیە بابچێ بیهێنێ)، نانی شایی یەکەی برێتی بوو لەوە، کە حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمانی کرد، سفرەیەکیان ڕاخست، ئیتر هەرکەس لەلای خۆیەوە هەنێ خورما، یاڕۆن، یاقاوت، یاکەشکی هێناو هەڵیان ڕشتە سەری‌و کردیان بەخورماوڕۆن‌و، دەستیان کرد بەنۆش کردنی، ئیتر هەرئەوە نانی شایی یەکەی بوو. (ت/٣/٩٣/٣ = تاج-٢ ز-٤٠ ژ-٢١٢٤ ج-٤ + تاج/٤ ص-٣٦٨، ص-٤٢٢).

### روونکردنەوە:

خەیبەر قەڵایەکی قایم بوو، بەدەستی هۆزی جوولەکەوە بوو، جێگەی هۆزی بەنوقورەیظەو بەنی نەظیر بوو، لەخۆرهەڵاتی باکووری مەدینەوەیە، شەش قۆناغ لەمەدینەوە دوورە، باخەخورمای زۆر بوو، ساڵی حەوتی کۆچی

ئازادکرا، ئەبوطەلحە مێردی ئوممووسولەیمی دایکی ئەنەسی نۆکەری پێغەمبەرە، ناوی زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری یە، ئامادەی شەوی پەیمانی عەقەبە بووە، یەکێکە لە(نوقەبەکان) ی ئەو پەیمانە، نەوەدو دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری سیانیانی گێڕاوەتەوە، ئەنەس زڕکوڕی بوو. لەپاش مەرگی پێغەمبەر ئەبوطەلحە چل ساڵ لەسەریەك بەڕۆژوو بوو، بەس لەدوو جەژنەکانا رۆژووی دەشکان.

٩٠١- عَنْ أَبِی مُوسَی الأشعري (رضی الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): فِی الَّذِی یُعْتِقُ جَارِیَتَهُ ثُمَّ یَتَزَوَّجُهَا: « لَهُ أَجْرَانِ ». {الحديث: ٣٤٨٤ = ٣٤٧٩ فـم. تجريـد/١، رقـم: ٨٢ = ٩٧، ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٦٤، ٥٠٨٣. أبو داود. ناح: ٢٠٥٣. نسائي. نكاح: ٣٣٤٥. تحفة الأشراف/٩١٠٨} : [٩٠١]

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سەبارەت بە پاداشی ئەو کەسەی کە کەنیزەکێکی وای هەبێ کە دروست بێ مارەی بکا، بەجوانی تەمێی بکاو، فێری خوێندەواریو زانستی بکا، ئینجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆ خۆی، وە مەبەستی لەم کارەیش ساخ رەزامەندی خودابێ، ئەوەی وابکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە). {بڕوانە: ژمارە: (٢١)ی پوختەی موسلیم = ژمارە: ٢٨٥ شیحا}.

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (٨٠٧)ی پوختەی موسلیم بوو، ئەمەیش ژمارە (٨٢)ی تەجریدی بوخارییە، بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ أبي موسى (رَضي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (ثَلَاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذا أَدَّى حَقَّ اللّٰهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ يطؤها، فَأَدَّبَهَا

[٩٠١] تجريد/٢، ژمارە: ٨٢ = ٩٧ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٧ = ٣٤٨٤ شیحا.

فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ). (الحديث ٩٧ ـ أطرافه في: ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٦٤، ٥٠٨٣):

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم سێ کەسە دوو پاداشیان بۆ هەیە:

**یەکەم:** پیاوێ کەلەسەر ئایینی جوولەکە یاگاوربێو پاشان موسوڵمان ببێ،

**دووەم:** کۆیلەیێ کەهەم مافی خوداو مافی ئاغاکانی بەجوانی بەجێ بهێنێ،

**سێیەم:** پیاوێ کەنیزەکێکی وای هەبێ، کەبۆی حەلاڵ بێ، بەجوانی تەمێی بکاو، فێری خوێندەواریو زانستی بکا، ئنجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆخۆی، وەمەبەستی لەم کارەیش ساخ ڕەزامەندی خودابێ!).

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوە کەخوێندنو فێربوونو زانستێ کەشەرعی پیرۆز پەسەندی بکا، برێتی یە لەهەر زانستێ کەبەرژەوەندی رەوای موسوڵمانانی تیابێ: (تاج-٣ل-٨٣ = تاج-٢ ز-٣٤ ژ-٢١٠١چ-٤).

## (١٤) باب زواج زينب بنتِ جَحْشٍ وَنُزُولُ الحِجاب وَإِثْبَاتُ وَلِيمَةِ العُرْسِ
## شووکردنی زەینەبی کچی جەحش بە پێغەمبەرو هاتنی حیجابو چەسپاندنی نانی شاییو شیرینی خواردنەوەو شتی تری لەم بابەتە

٩٠٢- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللّٰه عَنْهُ قَالَ: مَا أَوْلَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا أَوْلَمَ عَلَى زَيْنَبَ: أَوْلَمَ بِشَاةٍ.(الحديث ٥١٦٨- أطرافه في

:٤٧٩١، ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٣٩، ٦٢٧١، ٧٤٢١): [٩٠٢]

**ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەم دیوە کە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ کەسی تر لەژنەکانی، نانی شایی دروست بکا، وەك ئەو نانەی کەبۆ شایی یەکەی زەینەبی ژنی دروستی کردبوو: مەڕێکی کوشتەوەو کردی بەنانی شایی بۆی. (تاج/٣ ز/٤٠ ل/٩٤ فەرموودەی ژمارە/٤ = تاج/٢، ژمارە: ٢١٢٥ ج/٤ - ش/د).**

٩٠٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ لَمَّا تَزَوَّجَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ دَعَا الْقَوْمَ فَطَعِمُوا ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ قَالَ فَأَخَذَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ فَلَمْ يَقُومُوا فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَامَ فَلَمَّا قَامَ قَامَ مَنْ قَامَ مِنَ الْقَوْمِ. زَادَ عَاصِمٌ وَابْنُ عَبْدِ الأَعْلَى فِي حَدِيثِهِمَا قَالَ فَقَعَدَ ثَلاَثَةٌ وَإِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) جَاءَ لِيَدْخُلَ فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ ثُمَّ إِنَّهُمْ قَامُوا فَانْطَلَقُوا قَالَ فَجِئْتُ فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُمْ قَدِ انْطَلَقُوا قَالَ فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ فَأَلْقَى الْحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ قَالَ وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ...) الآيَة: [٩٠٣]

**ئەم فەرموودەیە لە مختصر صحيح موسليم/٢دا، ژمارە: ٨٢٤ لاپەڕە: ٣٢٠ چاپی یەکەم ئاوایە:**

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَدَخَلَ بِأَهْلِهِ فَصَنَعَتْ أُمِّى أُمُّ سُلَيْمٍ حَيْسًا، فَجَعَلَتْهُ فِى تَوْرٍ فَقَالَتْ: يَا أَنَسُ اذْهَبْ بِهَذَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْ: بَعَثَتْ بِهَذَا إِلَيْكَ أُمِّى وَهِىَ تُقْرِئُكَ السَّلاَمَ، وَتَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهَا إِلَى رَسُولِ

---

**[٩٠٢] تجريد/٥، ژمارە: ١٧٦٩ = ٥١٦٨ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٣ = ٣٤٩٠ شيحا.**

**[٩٠٣] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٢١ = ٥٤٦٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٤ = ٣٤٩٣ شيحا.**

اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّى تُقْرِئُكَ السَّلاَمَ. وَتَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ (يَا رَسُولَ اللَّهِ)! فَقَالَ: « ضَعْهُ » ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَادْعُ لِى فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَفُلاَنًا وَمَنْ لَقِيتَ »، وَسَمَّى رِجَالاً، قَالَ: فَدَعَوْتُ مَنْ سَمَّى، وَمَنْ لَقِيتُ. قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: عَدَدَ كَمْ كَانُوا؟ قَالَ: زُهَاءَ ثَلاَثِمِائَةٍ، وَقَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَا أَنَسُ! هَاتِ التَّوْرَ »، قَالَ: فَدَخَلُوا حَتَّى امْتَلأَتِ الصُّفَّةُ وَالْحُجْرَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لِيَتَحَلَّقْ عَشَرَةٌ عَشَرَةٌ، وَلْيَأْكُلْ كُلُّ إِنْسَانٍ مِمَّا يَلِيهِ، قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، قَالَ: فَخَرَجَتْ طَائِفَةٌ، وَدَخَلَتْ طَائِفَةٌ حَتَّى أَكَلُوا كُلُّهُمْ، فَقَالَ لِى: يَا أَنَسُ ارْفَعْ، قَالَ: فَرَفَعْتُ، فَمَا أَدْرِى حِينَ وَضَعْتُ كَانَ أَكْثَرَ أَمْ حِينَ رَفَعْتُ؟ قَالَ: وَجَلَسَ طَوَائِفُ مِنْهُمْ يَتَحَدَّثُونَ فِى بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) جَالِسٌ، وَزَوْجَتُهُ مُوَلِّيَةٌ وَجْهَهَا إِلَى الْحَائِطِ، فَثَقُلُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَلَّمَ عَلَى نِسَائِهِ، ثُمَّ رَجَعَ فَلَمَّا رَأَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ رَجَعَ ظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ ثَقُلُوا عَلَيْهِ، قَالَ: فَابْتَدَرُوا الْبَابَ، فَخَرَجُوا كُلُّهُمْ، وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى أَرْخَى السِّتْرَ، وَدَخَلَ وَأَنَا جَالِسٌ فِى الْحُجْرَةِ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلاَّ يَسِيرًا حَتَّى خَرَجَ عَلَيَّ وَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا، فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلاَ مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ، إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا). قَالَ الْجَعْدُ: قَالَ أَنَسُ: - أَنَا أَحْدَثُ النَّاسِ عَهْدًا بِهَذِهِ الآيَاتِ - وَحُجِبْنَ نِسَاءُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٤٩٣ = ٣٤٨٨ فـم. تجريد/٥، رقم: ١٨٢١ = ٥٤٦٦، ٤٧٩١،

٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٥١٦٨، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٢٨، ٦٢٢٦، ٦٢٧١، ٧٤٢١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە زەینەبەی هێنا، جا شەوی زاوایی، بۆ بەیانی، ئوم سولەیمی دایکم، دۆکەشك‌و ڕۆنی بەخورماو قاوتەوە دروست کردو کردیە قازانگێکەوەو فەرمووی: پێم: ئەی ئەنەس! ئەم خواردەمەنییە بەرە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە پێی بڵێ: ئەم چێشتە دایکم ناردوویەتی بۆ تۆ، دایکم عەرزی سڵاوی هەبوو، عەرزی دەکردی: ئەمە لە ئێمەوە بۆ تۆ کەمە. منیش هەڵیم گرت‌و بردم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە عەرزیم کرد: دایکم عەرزی سڵاوی هەبوو لە خزمەتتا، عەرزیشی دەکردی: کە ئەمە لە ئێمەوە بۆ تۆ کەمە، دەبێ عوزرمان قەبووڵ بکەی! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەوێدا داینێ) کە دامنا فەرمووی: (دە بڕۆ ئەو سێ کەسەم بۆ بانگ بکە) کە ناوی هێنان، وە فەرمووشی: (بەکێی تریش گەیشتی خوڵکیان بکە بۆ نانخواردنی شایی زەینەب). ئەنەس فەرمووی: ئەوانەی کە پێغەمبەر ناوی هێنان‌و ئەوانەی کە پێیان گەیشتم بانگم کردن‌و خوڵکم کردن بۆ نانخواردن دەفەرموێ: عەرزی ئەنەسم کرد: ژمارەیان چەند کەس دەبوو؟ فەرمووی: سێ سەد کەسێ دەبوون. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو: (ئەی ئەنەس! مەنجەڵەکە بێنە). منیش مەنجەڵەکەم هێنا بۆی، جا پیاوەکان هاتنە ژوورەوە هەتا هەیوانەکەو ماڵەکە پڕبوون، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: دە کەس دە کەس ئەڵقە ببەستن، با هەرکەسەیشتان لەبەردەم خۆیەوە بخوات).

ئیتر تاقم تاقم بەرودوا دەهاتن‌و نانیان دەخوارد تا تێردەبوون، ئەنجا ئەوان دەردەچوون‌و تاقمێ تر دەهاتن، هەتا هەموویان نانیان خواردو تێر بوون. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو: (ئەی ئەنەس! نانەکە بەزیادکەو مەنجەڵەکە لابەرە). فەرمووی: منیش وامکردو مەنجەڵەکەم لابرد، ئەوەی جێگەی سەرنج بوو، ڕوودانی ئەم موعجیزەیە بوو: نانە کەمەکە پیت‌و فەڕێکی وای تێ کەوت، نەمزانی کە لەپێشا هێنام زیاتر بوو، یا ئەوکاتەی کە بەزیادم کردو لام برد؟!

فەرمووی: جا کاتێ خەڵکەکە لەپاش نانخواردن بڵاوەیان لێکرد، چەند پیاوێ لەخزمەتی پێغەمبەردا، (دروودی خودای لەسەر بێ) مانەوەو، لەخزمەتیدا، لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتن‌و نەڕۆیشتن، زەینەبەی هاوسەریشی کە بووك بوو، لەوێ دانیشتبوو، ڕووی کردبووە دیوارەکە، جا بەرە بەرە دانیشتنەکەیان پێغەمبەری سەخڵەت کرد، لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵساو دەرچوو کۆڕەکەی چۆڵکرد، وە تەشریفی برد سڵاوی لە هاوسەرەکانی تری کرد، ئەوجا گەڕایەوە، جا پیاوەکان کە چاویان بە پێغەمبەر کەوت وا گەڕایەوە ئەوانیش هێشتا هەر دانیشتوون، هەستیان کرد کە بەم دانیشتنە ناوەختەیان پێغەمبەریان سەخڵەت کردووە، جا پەلاماری دەرگاکەیان داو هەموویان ڕۆیشتن، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوەو پەردەی لەنێوانی من‌و خۆیدا دادایەوە، وەمن لەناو ماڵەکەدا دانیشتبووم، زۆری نەخایاند کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە هۆدەکەی خۆی دەرچوو هات بۆلای من، وە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو بۆناو یارانی‌و ئایەتەکەی بەسەریاندا خوێندەوە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ

إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا – ٣٣/٥٣ - سورة الأحزاب}.

واته: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بەخوداو بە پێغەمبەری خودا! خودسەر خۆتان مەکەن بەناو ماڵەکانی پێغەمبەردا، مەگەر کاتێ کە ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نانخواردنو شتی وا، لەم حاڵەشدا، کاتێ بچن کە نانەکە پێگەیشتبێ، نەوەك لەپێشا بچن لەوێ چاوەنوارِ بکەن تانان پێدەگا، جا کاتێ خولك کران بڕۆن، کاتێ نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن، وە لەوێ کۆڕی قسەی لێ دامەبەستنو زۆر مەمێننەوە، چونکە شتی وا ئازاری پێغەمبەر دەدا، پێغەمبەریش شەرمتان لێ دەکا، بۆیە قسە ناکا، بەڵام خودا لەشتی حەق شەرم ناکا، وە هەرکاتێ داوای شتێ دەکەن لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر لەپشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، چونکە بەو شێوەیە باشترە بۆ دڵپاکی ئێوەیشو بۆ ئەوانیش، نابێ ئێوە ئازاری پێغەمبەر بدەن، یا ببن بەمایەی ئازار بۆی، هەروەك نابێ لەپاش خۆی ژنەکانی مارە بکەنەوە بۆ خۆتان، هەرگیز شتی وا نابێ، شتی وا ئەگەر بیکەن بەتاوانێکی گەورە دادەنرێ لەلای خودا. {تاج/٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٣٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

زەینەبی کچی جەحش، هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ). دایکی ناوی ئومومەی کچی عەبدول موتەلیبی کوڕی هاشیمە، کەواتە: زەینەب پوورزای پێغەمبەرە، لەپێش

دا ژنی زەیدی کوڕی حاریثە بوو، کە زەید لەپێشدا زڕکوڕی پێغەمبەر بوو، کە زەید تەلاقی دا شوویکرد بە پێغەمبەر ناوی (بڕة) بوو، پێغەمبەر ناوی نا زەینەب، لەساڵی پێنجی کۆچیدا شووی کرد بە پێغەمبەر، تەمەنی زەینەب ئەوکاتە سیی‌و پێنج ساڵ بوو، ژنێکی خواناسی خوا پەرستی زۆر باش بوو، شەو نوێژی زۆری دەکرد، ڕۆژووی سوننەتی زۆری دەگرت، خێرکەرێکی گەورە بوو، ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، کەوڵی خۆش دەکرد، مەشکەو کونەدەی دەدووری‌و دەیفرۆشت‌و پارەکەی دەکرد بەخێر، وە دەیدا بەهەژاران، جارێ زەینەب بە سەفییەی هاوسەری پێغەمبەر دەڵێ: کچە جوو، لەسەرئەوە دەوری سێ مانگ پێغەمبەر دەنگی لێ دابڕی، زەینەب کەمێ کورتەباڵا بوو، یەکەم ژنی پێغەمبەر بوو، کە لەدوا مردنی پێغەمبەر دەمرێ، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش، کە برازای بووە، هەروەها ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان‌و زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، زەینەب کفنێکی بۆ خۆی ئامادە کردبوو، کاتێ کەوتە گیانەڵا گوتی: خۆم کفنێکم بۆ خۆم ئامادە کردووە، عومەریش کفنێکم بۆ دەنێرێ، لە یەکێکیانا بمنێژن‌و ئەوی تریان بکەن بەخێر!! ئەگەر دەتوانن کراسەکەی بەریشم بکەن بەخێر!!

داستانی شووکردنەکەی بە پێغەمبەر، وا لە سوورەتی ئەحزابا بە دوورو درێژی، لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، لەساڵی بیستی کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا کۆچی دوایی کرد، کە لەو ساڵەدا میسر ئازادکرا، بۆ زێدە زانیاری تر، سەبارەت بە ژیانی خاتوو زەینەب، بڕوانە ئەم شوێنانە: {فەرموودەی ژمارە: ١١٢١ مختصر صحیح البخاری، بەکوردی، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٢٠٩ - ٢٦٦١ فتح

الباری + فەرموودەی/٣، بەرگی/١، لاپەڕە: ١٢ + ژمارە: ٩٤ بـەرگی/١، لاپـەڕە: ١١٨ + ژمارە: ١٥٤ بەرگی/١، لاپەڕە: ١٧٠ + ژمارە: ٣٥٩ بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٥٦ + ژمـارە: ٦١٤ بـەرگی دووەم لاپــەڕە: ٣٩ + ژمـارە: ٩٣١ بــەرگی/٢، لاپــەڕە: ٣٠٨ + ژمــارە: ٩٣٥، بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٠ + ژمارە: ١٤٩٨ بەرگی/٤، لاپەڕە: ١٨٤ + ژمارە: ١٤٩٩ بـەرگی/٤، لاپــەڕە: ١٨٥ + تــاج/٣، زنجــیرە: ٤٠، ژمــارە: ٣٤٤٣ + زنجــیرە: ٣٥ + زنجـیرە: ٣٦ + زنجیرە: ٣٧ + زنجیرە: ٣٨ + زنجیرە: ٤١ لە ژمارە: ٣٤٢٥ هەتا ٣٤٤٤. چاپی چوارەم}.

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (١٨٢١)ی تەجریدی بوخارییە، بەرگی/٥، لاپەڕە: ٩٥ چاپی دووەم:

عَنْ أَنَس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِالْحِجَابِ كَانَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يَسْأَلُنِي عَنْهُ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرُوسًا بِزَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَكَانَ تَزَوَّجَهَا بِالْمَدِينَةِ فَدَعَا النَّاسَ لِلطَّعَامِ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَلَسَ مَعَهُ رِجَالٌ بَعْدَ مَا قَامَ الْقَوْمُ حَتَّى قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَشَى وَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا فَرَجَعَ فَرَجَعْتُ مَعَهُ فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ مَكَانَهُمْ فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ فَإِذَا هُمْ قَدْ قَامُوا فَضَرَبَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ سِتْرًا وَأُنْزِلَ الْحِجَابُ.

(الحـــديث ٥٤٦٦ أطرافـــه في: ٤٧٩١، ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٥١٦٨، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٢٦، ٦٢٧١، ٧٤٢١):

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من لەهەموو کەسێ باشتر لەبارەی حیجابەوە شارەزاموو ئاگام لێیەتی، ئوبەییەی کوڕی کەعبیش لەبارەی ئایەتی حیجابەوە پرسیاری لێم کرد، هۆی هاتنی ئایەتی حیجاب ئاوا بوو: پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- لەمەدینە زەینەبی کچی جەحشی هێنا، جا شەوی

زاوایی بۆ بەیانی کەخۆر بەرزەوە بوو، پێغەمەر -درورودی خوای لەسەر بێ- نانی شایی دروست کردو بانگهێشتی لەخەڵك کرد بۆ نانخواردن بەم بۆنەیەوە. جا کاتێ خەڵکەکە لەپاش نانخواردن بڵاوەیان لێکرد، چەند پیاوێ لەخزمەتی پێغەمەردا -درورودی خوای لەسەر بێ- دانیشتن و نەڕۆیشتن و هەر دەوریان چۆڵ نەکرد، هەتا پێغەمەر خۆی هەڵساو ڕۆیشت، منیش لەخزمەتیدا ڕۆیشتم هەتا گەیشتە بەردەرگای هۆدەکەی عائیشە، ئەوسا لەوێوە گەڕایەوە منیش لەگەڵیا گەڕامەوە، وە لەپێغەمەر وابوو کە ئێستا پیاوەکان ڕۆیشتوون، کەچی تەماشامان کرد هێشتا هەر لەشوێنی خۆیان دانیشتوون، دیسان پێغەمەر -درورودی خوای لەسەر بێ- گەڕایەوە و ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە بەردەرگای هۆدەکەی عائیشە، منیش دیسان لەگەڵیا چووم کە پێغەمەر گەڕایەوە، منیش لەگەڵیا گەڕامەوە، ئەمجارەیان کەتەماشامان کرد پیاوەکان هەڵسابوون ڕۆیشتبوون. ئیتر پێغەمەر -درورودی خوای لەسەر بێ- پەردەی لەنێوانی منو خۆیدا دادایەوەو خودای گەورە ئایەتی حیجابی ناردە خوارەوە کەدەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا (٣٣/٥٣) سورة الأحزاب﴾ واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بەخوداو بەپێغەمەری خودا، خود سەر خۆتان مەکەن بەناو ماڵەکانی پێغەمەردا، مەگەر کاتێ کەڕێگەتان پێبدرێ بۆ نانخواردنو شتی وا، لەم حاڵەشدا کاتێ بچن کەنانەکە پێگەیشتبێ، نەوەك لەپێشا بچن لەوێ چاوەنواڕبکەن تا نان پێ دەگا، جاکاتێ خوڵك كران

بـرۆن، کاتـێ نانتـان خـوارد بـڵاوەی لـێ بکـەن، وە لـەوێ کـۆڕی قـسەی لێ دامەبەسـتنو زۆر مەمێننـەوە، چونکە شـتی وا ئـازاری پێغەمـەردەدا، پێغەمـەر شەرمتان لێدەکا، بۆیـە قـسەناکا، بـەڵام خـودا لەشـتی حـەق شـەرم ناکـا، وەهـەر کاتێ داوای شـتێ دەکـەن لەهاوسـەرەکانی پێغەمـەر لەپـشتی پـەردەوە داوایـان لێ بکەن، چونکە بەم شێوەیە باشـترە بـۆ دڵپـاکی ئێـوەیش و بـۆ ئـەوانیش. (تـاج/٣ ز/٤٠ ل/٩٤ ژ/٥ = ژمارە: ٢١٢٦ چ/٤ - ش/ت).

٩٠٤- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِالْحِجَابِ لَقَدْ كَانَ أُبَـيُّ بْـنُ كَعْـبٍ يَسْأَلُنِي عَنْهُ. قَالَ أَنَسٌ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَرُوسًـا بِزَيْنَـبَ بِنْـتِ جَحْشٍ - قَالَ - وَكَانَ تَزَوَّجَهَا بِالْمَدِينَةِ فَدَعَا النَّاسَ لِلطَّعَامِ بَعْدَ ارْتِفَـاعِ النَّهَـارِ فَجَلَـسَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَجَلَسَ مَعَهُ رِجَالٌ بَعْدَ مَا قَامَ الْقَوْمُ حَتَّى قَامَ رَسُـولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَمَشَى فَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِـشَةَ ثُـمَّ ظَـنَّ أَنَّهُمْ قَدْ خَرَجُوا فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ مَكَانَهُمْ فَرَجَعَ فَرَجَعْتُ الثَّانِيَةَ حَتَّـى بَلَغَ حُجْرَةَ عَائِشَةَ فَرَجَعَ فَرَجَعْتُ فَإِذَا هُمْ قَدْ قَامُوا فَضَرَبَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ بِالسِّتْرِ وَأَنْزَلَ اللَّـهُ آيَةَ الْحِجَابِ). [٩٠٤]

**لەژمارە (٩٠٣)دا رابورد، گێڕانەوەکەی تەجرید/٢، ژمارە: (١٨٢١).**

٩٠٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا مَرَّ بِجَنَبَـاتِ أُمِّ سُلَيْمٍ دَخَلَ عَلَيْهَا فَسَلَّمَ عَلَيْهَا ، ثُمَّ قَالَ كَانَ النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسـلم) عَرُوسًـا بِزَيْنَبَ فَقَالَتْ لِي أُمُّ سُلَيْمٍ لَوْ أَهْدَيْنَا لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَدِيَّةً فَقُلْـتُ لَهَـا افْعَلِي . فَعَمَدَتْ إِلَى تَمْرٍ وَسَمْنٍ وَأَقِطٍ ، فَاتَّخَذَتْ حَيْسَةً فِي بُرْمَةٍ ، فَأَرْسَلَتْ بِهَا مَعِي إِلَيْهِ ، فَانْطَلَقْتُ بِهَا إِلَيْهِ فَقَالَ لِي «ضَعْهَا». ثُمَّ أَمَرَنِي فَقَـالَ « ادْعُ لِـي رِجَـالاً - سَـمَّاهُمْ -

---

[٩٠٤] بڕوانە: ژمارە: (٩٠٣).

وَادْعُ لِي مَنْ لَقِيتَ » . قَالَ فَفَعَلْتُ الَّذِى أَمَرَنِى فَرَجَعْتُ فَإِذَا الْبَيْتُ غَاصٌّ بِأَهْلِهِ ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى تِلْكَ الْحَيْسَةِ ، وَتَكَلَّمَ بِهَا مَا شَاءَ اللَّهُ ، ثُمَّ جَعَلَ يَدْعُو عَشَرَةً عَشَرَةً ، يَأْكُلُونَ مِنْهُ ، وَيَقُولُ لَهُمْ « اذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ ، وَلْيَأْكُلْ كُلُّ رَجُلٍ مِمَّا يَلِيهِ » . قَالَ حَتَّى تَصَدَّعُوا كُلُّهُمْ عَنْهَا ، فَخَرَجَ مِنْهُمْ مَنْ خَرَجَ ، وَبَقِيَ نَفَرٌ يَتَحَدَّثُونَ قَالَ وَجَعَلْتُ أَغْتَمُّ ، ثُمَّ خَرَجَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) نَحْوَ الْحُجُرَاتِ ، وَخَرَجْتُ فِي إِثْرِهِ فَقُلْتُ إِنَّهُمْ قَدْ ذَهَبُوا . فَرَجَعَ فَدَخَلَ الْبَيْتَ ، وَأَرْخَى السِّتْرَ ، وَإِنِّي لَفِي الْحُجْرَةِ ، وَهْوَ يَقُولُ ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلاَ مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنْكُمْ وَاللَّهُ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ). قال أنس: إنه خدم رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عشر سنين): [٩٠٥]

لەژمارە (٩٠٣)دا رابورد.

## (١٥) باب الأمر بإجابة الداعي إلى دعوة

## وەڵام دانەوەی بانگهێشت کردن بۆ سەر نان خواردنو شتی وا پێویستە

٩٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا.(الحديث ٥١٧٣- طرفه في ٥١٧٩): [٩٠٦]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ کەسێکتان خوڵك کرا بۆ سەر نانی شایی بابچێت).

---

[٩٠٥] بڕوانە: ژمارە: (٩٠٢).

[٩٠٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٧١ - ٥١٧٩ بخاری. مسلم، ترقیم محمد فؤاد: ١٤٢٩ = ٣٥٠٢ شیحا.

٩٠٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ ، وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ (صلى الله عليه وسلم): [٩٠٧]

بۆ روونكردنەوەى ئەم فەرموودەيە، ژمارە (٨٢٥ و ٨٢٦ و ٨٢٧) لە مختصر صحيح موسليم، بەرگى دووەم دەنووسم:

عَنْ نَافِعٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَانَ يَقُولُ عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُجِبْ عُرْسًا كَانَ أَوْ نَحْوَهُ ». {الحديث: ٣٤٩٩ = ٣٤٩٤ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧١ = ٥١٧٣، ٥١٧٩ فتح البارى. أبو داود. أطعمة: ٣٧٣٨ تحفة الأشراف: ٧٥٣٧}:

نافيع (رەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: ئيبنو عومەر (ڕەزاى خوداى لێ بێ) گەلێ جار دەيفەرموو: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ كەسێكتان موسوڵمانێ، كە براى ئايينييەتى، بانگى كرد بۆسەر بۆنەيێ، وەك زەماوەندو شتى وا بابچێت بەدەنگيەوەو خوڵكەكەى قەبووڵ بكا). {تاج/٢، زنجيرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٢٢}.

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا دُعِىَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ، وَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيَطْعَمْ ». {الحديث: ٣٥٠٦ = ٣٥٠١ فم}:

ئەبو هورەيرە (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر يەكێكتان خوڵك كران بۆسەر نانخواردنو شتى وا بابچێ، جا ئەگەر بەڕۆژوو بوو، مەرج نييە كە ڕۆژووەكەى بشكێنێ،

---

[٩٠٧] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٥ (بڕوانە: ٩٠٦).

بەڵکوو نزای باشیان بۆبکا بەسە، ئەگەر بەرۆژوو نەبوو ئەوا با خۆراك بخوا، یا خواردنەوەی حەڵاڵ بخواتەوە).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه)، أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُمْنَعُهَا مَنْ يَأْتِيهَا، وَيُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا، وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ، فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ ». {الحديث: ٣٥١١ = ٣٥٠٥ فم. بخاري. نكاح: ٥١٧٦ (٥١٧٧). أبو داود. أطعمة: ٣٧٤٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەدترین نان نانی شایی‌و شیرینییە، کە بووە بەباو ئەوەی کەخۆی دەیەوێ بچێ بۆی ڕێگەی نادەن، وەك هەژاران، ئەوەی کەخۆی دەعیەی نایبا خولکی دەکەن بۆسەری! ئەو کەسەشی خوڵك بکرێ‌و نەچێ، ئەوە لەخوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٢١١٦ چ/٤}.

## (١٦) باب لا تحل المطلقة ثلاثاً لِمُطَلِّقِهَا حَتَىَّ تَنكِح زَوْجاً غَيْرَهُ وَيَطأهَا ثُمَّ يفارقها وَتنقضي عِدَتَهَا

## ژنی سێ تەڵاقدراو، دروست نیە مێردەکەی کە تەڵاقی داوە، سەرلەنوێ مارەی بکاتەوە بۆ خۆی بەم چوار مەرجە نەبێ

**یەکەم:** ژنەکە لەپاش تەواوبوونی عیددەی لە مێردی پێشووی، شوو بکا بە پیاوێکی تر.

**دووەم:** مێردی دووەم بچێتە لای‌و لەگەڵیا جووت ببێ.

**سێیەم:** بە تەڵاق، یا بە مردن، یا بە هەر هۆیەکی تری یاسایی (شەرعی) لە مێردی دووەمی جیا ببێتەوە.

**چـــــوارەم: لـــە پـــاش جیابوونەوەکـــەیش حەیـــەی هـــەڵبێ‌و عیـــددەی جیابوونەوەکەی تەواو ببێ، بە پێی یاسای حەیەو عیددەی جیابوونەوە لە مێرد**

٩٠٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَأَبَتَّ طَلاَقِي ، فَتَزَوَّجْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ ، إِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ . فَقَالَ « أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ لاَ حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ » . وَأَبُو بَكْرٍ جَالِسٌ عِنْدَهُ وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ بِالْبَابِ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْذَنَ لَهُ ، فَقَالَ يَا أَبَا بَكْرٍ ، أَلاَ تَسْمَعُ إِلَى هَذِهِ مَا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): [٩٠٨]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەکەی ریفاعەی قورەظی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنی ریفاعەی قورەظی بووم، سێ جاری جیاجیا تەڵاقی دام، لەپاش جاری سێیەم کە دواجارە، شووم کردەوە بە ئەورەحمانی کوڕی زەبیری قورەظی، بەڵام بەخودا چووکی ئەوڕحمان وەك پەتك وایە، جیماعی پێ ناکرێ، جا ژنەکە ریشووی کراسەکەی خۆی گرت‌و گوتی وەك ئەمە وایە! فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەردەخەنەیێ گرتی‌و پێکەنی‌و فەرمووی: (رەنگ بێ بتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای ریفاعەی مێردی پێشووت، شتی وانابێ، هەتا ئەوڕەحمان چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ تۆدا نەچێژێ‌و تۆش چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ ئەورەحمان نەچێژێ، چونکە شووی دووەم ئەگەر وانەبێ، دانانرێ بەشووی دووەم، کە لەپاش تەڵاقدانی مێردی دووەم‌و

---

[٩٠٨] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٩ = ٥٢٦٠ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥١ - ١٤٣٣ - ٣٥١٢ شیحا.

تەواوبوونی عیددەی ژنەکە، دەبێ بەهۆی دروستبوونی شووکردنەوە بەمێردی یەکەم).

لەکاتی ئەم گفتوگۆیەدا، ئەبوبەکری صەدیق لەخزمەت پێغەمبەردا، دانیشتبوو، خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، لەدەرگای هۆدەکە دانیشتبوو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە ڕێگەی پێ بدرێ بچێتە ژوورەوە، جا لەوێوە خالید بانگی لە ئەبوبەکر دەکردو دەیگوت: ئەرێ ئەبوبەکر! ئەوە بۆ تەمێی ئەو ژنە ناکەی کە ئاوا بەڕاشکاوی ئەم قسە زەق و شەرماوییانە لەخزمەت پێغەمبەردا ئەکا؟!. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٢٢٣٦}.

٩٠٩- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَجُلاً طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا ، فَتَزَوَّجَتْ فَطَلَّقَ فَسُئِلَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَتَحِلُّ لِلأَوَّلِ قَالَ « لاَ ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا كَمَا ذَاقَ الأَوَّلُ »: (٩٠٩)

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ سێ تەلاقی ژنەکەی خۆی دا، جا ژنەکە شوویکردەوە بە پیاوێ تر، پیاوی دووەم بەرلەوە لاقەی بکاو دروست ببێ لەگەڵیا تەلاقی دا، لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پرسیارکرا: ئایا ئەم ژنە دروستە کە شووبکاتەوە بە مێردی یەکەمی؟ فەرمووی: (نەء، تا هەردوولا خۆشی جوتبوون لەیەکتری نەچێژن).

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٧٨٩)ی تەجریدی بوخارییە، بۆ بەهرەی پترو بۆ روونکردنەوەو شارەزابوون لەم بوارەدا ڕاگوێزی دەکەین:

عَنِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها: أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي وَإِنِّي نَكَحْتُ بَعْدَهُ عَبْدَالرَّحْمَنِ بْنَ الزُّبَيْرِ الْقُرَظِيَّ وَإِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ الْهُدْبَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي

(٩٠٩) بخاری. طلاق: ٥٢٦١، مسلم: ٣٥١٧ شیحا.

عُسَيْلَتَهُ.(الحديث ٥٢٦٠ أطرافه في: ٢٦٣٩، ٥٢٦١، ٥٢٦٥، ٥٣١٧، ٥٧٩٢، ٥٨٢٥، ٦٠٨٤):

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ژنەکەی ڕیفاعەی قوڕەظی هاتە لای پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- گوتی: ئەی پێغەمەری خوا: ڕیفاعەی قوڕەزی بە ئێجگاری تەڵاقی داوەو لەپاش ئەو شووم کردووە بەئەوڕەحمانی کوڕی زەبێری قوڕەزی بەڵام چووکی ئەوڕەحمان وەك پەتك وایەو، جیماعی پێ ناکرێ؟ پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- فەرمووی پێی: ڕەنگ بێ بتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای ڕیفاعەی مێردی پێشووت، شتی وانابێ، هەتا ئەوڕەحمان چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ تۆدا نەچێژێ و تۆش چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ ئەوڕەحماندا نەچێژی، دانانرێ بەشووی دووەم کە دەبێ بەهۆی دروستبونی شووکردنەوە بەمێردی یەکەم، بەمەرجێ مێردی دووەم ژنەکە تەڵاق بداو عیددەی ژنەکە لەمێردی دووەم تەواو بێ، ئەوسا دروستە ئەوژنە بەگرێدانێکی نوێ شووبکاتەوە بەمێردی پێشووی). (تاج/٣ ل/١٥٩ ز/٦٥ ژ/١ - ژمارە: ٢٢٣٦ - ش/د/ت/ن).

## (١٧) باب ما یستحب أن یقوله عند الجماع
## چی گوتەیێ سوننەتە، لە کاتی دروستبوون لەگەڵ حەڵاڵو هاوسەردا

٩١٠- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّه عَنْهُما قَالَ: قَالَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَقُولُ حِينَ يَأْتِي أَهْلَهُ: بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنِي الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، ثُمَّ قُدِّرَ بَيْنَهُمَا فِي ذَلِكَ أَوْ قُضِيَ وَلَدٌ لَمْ يَضُرُّهُ الشَّيْطَانُ أَبَداً.(الحديث ٥١٦٥ أطرافه في : ١٤١، ٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٦٣٨٨، ٧٣٩٦): [٩١٠]

---

[٩١٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٦٨ = ٥١٦٥ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٨ = ٣٥١٩ شیحا = ١٤٣٤ محمد فؤاد.

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ : (کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێ بڕواتـە لای خێزانـی خۆی، ئەگەر بڵێ: باسم الله ... هەتا: مارزقتنا:

بەناوی خودا، ئەی خودا! شەیتانمان لەکۆڵ بکەرەوەوشەیتان دووربخەرەوە لـەم رزق‌و رۆزیـی خۆتـە کەداوتـە بەئێمـە. هـەر کەسـەتان لـەو کاتـەدا ئاوابڵێ، ئەگـەر لـەو جارەدا منـداڵ لەچارەیان نووسـرابێ، هـەرگیز شـەیتان زیـانی بـۆی نابێ). (تاج/٣ ز/٤٣ ل/٩٧ ژ/١).

## ڕوونکردنەوە:

١- لەفەتحولباریـدا دەفـەرموێ: (پرسـیارکراوە لـە ئیمـامی بوخـاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەگەر کەسێ عەرەبی بەجوانی نـەزانێ، دەتـوانی ئـەم نزایە، کەوا لە ژمارە: (١٠٤٩)ی شەرحی بلوغ المرامیش‌دا، بەفارسی بڵێ‌و بخوێنێ؟ دەفەرموێ: (بەڵێ دەتوانێ بیخوێنێ بەفارسی).

منیش کەوەرگێڕم دەڵێم: (ئەمە بۆ هەموو نزاو دۆعایێ هەر وایە، مرۆڤ دەتوانێ بەعەرەبی بیخوێنێ، یا بەزمانی خۆی بیخوێنێ. ئەوەندە هەیە دۆعـای مەئثوور، کەئەو نزاو پاڕانەوەیە کـە گوتـراوەکـەیان، یـا وا لـەقورئانا، وەك {رَبَّنَـا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِـرَةِ حَـسَنَةً وَقِنَـا عَـذَابَ النَّـارِ} یـاوا لـە فـەرموودەی پێغەمبەرو هاوەڵانی‌دا، وەك نزای ژمارە: (١٠٤٩)ی کە ئامـاژە کـرا بـۆی، ئەوەنـدە هەیـە ئـەم جـۆرە نـزا مـەئثـوورە بیـستراوانە واباشـترو پەسـەندترە کـە بەدەقـە عەرەبی‌یەکـە بخـوێنرێن، یـا پـاش خوێنـدنیان بەعـەرەبی، خوێنـەر بـەکوڵی دڵ بەزمانی خۆشی واتاکەیان دووبارە بکاتەوە (وەرگێڕ).

٢- وەكاتێ گوتنی ئەم نزایە سوننەتە، كە دروستبوونەكە ڕەوا بێو، لەنێوانی پیاوو حەڵاڵو هاوسەری خۆیدا بێو لەڕێگەی شەرعیەوە ئەنجام بدرێو نەهێڵی شەرعی نەبێ، وەك ڕۆژووی ڕەمەزانو بێنوێژی ژنانە. تەنانەت ئەگەر نائومێدیش بن لەمناڵبوون ئەم نزایە هەر سوننەتە، چونكە ڕزقو ڕۆژیی گشتی ترە لەمناڵبوونو خودی مناڵبوون بەشێكە لەو ڕزقو ڕۆژییە.

٣- گوتنی ئەم نزایە بۆ ژنەكەیش لەهەمان كاتا سوننەتە.

٤- لە (غایة المأمول – شرح التاج الجامع للأصول)دا، لەسەر باسی دەستووری سەرجێی (آدَابُ الوقـاع)دا، دەفەرموێ: ئەمانە دەستووری شەرعی سەرجێیین.

آ- أعوذُ بِاللهِ كردنو پەناگرتن بەخودا لەشەڕی شەیتان.

ب- بیسمیللا كردن لەپێش دروستبووندا.

ج- خۆ داپۆشینو لەجێگەی دوور لەبەرچاوی خەڵك.

د- نزاكردن واباشە بەنیازی داوێنپاكیو مناڵی باش بێو باشترین كات بۆی، كاتی تێرۆكردنی ئەندامی نێرینەی پیاوە، بەزێی ژنەكەدا.

٥- نەزاكەت لەگەڵ ژنەكەداو مۆڵەتدانی، تا ئەویش كاری خۆی ئەنجام دەداو رەحەت دەبێ، بەتایبەتی ئەگەر پیاوەكە زووتر رەحەت ببێ.

٦- یاریو دەستبازیو سازانو گونجان لەگەڵ دۆخەكەدا بۆ بەردەوامی خۆشەویستی لەنێوانیاندا.

٧- پارێزو دووركەوتنەوە لەچوونەلا بەكۆم، یا خۆپاراستن لەچوونەلای لەكاتی بێنوێژیدا، بەلام پیاوو ژنەكە دەتوانن، لەماوەی سووڕی مانگانەدا، بەیاریو دەستبازیو خۆنووساندن بەیەكەوە، خۆیان ڕەحەت بكەن.

٨- قسەکردن لەکاتی جووتبووندا، ناپەسەندە، مەگەر پەیوەندی بەدروستبوونەکەوە هەبێ، وەك ئەوە ئەو جۆرە قسەیە، زیاتر ئارەزوویان بورووژێنێ، یا لەبەر ناچاری بێ.

٩- دەست کردنە ملو ماچکردنو مەمك گوشینو دەرپێ داکەندنو شتی تری وا، هەمووی کاری پەسەندو داواکراوە، بە تایبەتی خۆڕازاندنەوە لەهەردوولاوەو خۆ بۆنخۆشکردن.

١٠- هەموو کاروکردەوەیێ، یا قسەوگوتەیێ، کە لەم کاتەدا ببێ بەهۆی بەردەوامی خۆشەویستیو دڵی یەکتری ڕاگرتنو خۆشیو لەززەتی حەلاڵ، کردنو گوتنی پەسەندە، چ لەلایەنی پیاوەکەوە، چ لەلایەنی ژنەکەوە، بەتایبەتی پاكو خاوێنی دەسگای زاوزێ.

١١- گەلێ جار ژنەکە قسەی خۆشو کاری ئارەزووو بزوێن، لەگەڵ مێردەکەی دەکا، یا بەپێچەوانەوە، ئەوە نهێنی نێوانی خۆیانە، بلاوکردنەوەی ئەو ڕازو نهێنییە دووبە دوویە، نادروستو ناڕەوایە. قسەی (غاية المأمول) بەکەمێ دەستکارییەوە تەواو بوو.

١٢- سوننەتە ژنو مێرد، بۆ کرداری جووتبوون، سوود لەداودەرمانو هەموو هۆیەکی ڕەوا بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێنن، وەك حەبو دەرزیو شتی تری وا، بەتایبەتی ئەگەر لایەکیان، لەبەر هەر هۆیێ، لەو لایەنەوە لاواز بووبێ وەك دەفەرموێ: {وَيَنْدُبُ التَّقَوِّي لِلْجِمَاعِ بِأَدْوِيَةٍ مُبَاحَةٍ} .

١٣- هەردوولایان پێکەوە لەیەك نوێندا بخەون.

١٤- نادروستە بۆ ژن کە نەهێڵێ پیاوەکەی لەززەتی ڕەوای لێ وەربگرێ، هەروا بۆ پیاوەکە نادروستە شتی وا بکا.

١٥- کرداری جووتبوون لەشەوی هەینیدا، هەروا لەرۆژی هەینیدا، لەپێش نوێژی هەینیدا سوننەتە.

١٦- ئەوەندەی دەکرێ چاوپۆشی لەهەڵەی ژن بکرێ، بەهیچ جۆرێ توندوتیژی لەگەڵدا ئەنجام نەدرێو ڕێزی تەواو لەخۆیو لەکەسوکاری بگیرێ. هەروا ئەمە بۆ ژنیش سوننەتە.

١٧- ئەگەر مەهانەی ڕەوا نەبوو، سوننەتە پیاو کچ بهێنێ، وە ژن شوو بکا بەکوڕ، بەڵام کوڕ بێوەژن بهێنێ، یا بێوەژن شووبکا بەکوڕ، هیچ ناباشییەکی تیادا نییە.

١٨- **کورتو پوخت**: ئەمە لەبارەی (منع الحمل = پێشگیریی لە دروستبوونی سك)ەوە دەنووسین.

(جەماوەری زانایانی نەتەوەی ئیسلام دەفەرموون: دروستە پیاو، بۆ ئەوەی ژنەکەی، لەو جووتبوونەدا، سك نەکاو ئاوەکەی نەگاتە ناو منداڵدان، عەزل بکاو ئاوەکەی لەدەرەوەی شەرمی ژنەکە بڕێژێ، چونکە شتی وا لەسەردەمی پێغەمبەردا بووەو پێغەمبەر ڕێگەی لێ نەگرتووە، کەواتە بەم پێوەرە ژنو پیاو بۆیان هەیە، پێشگیری لە سك بکەنو نەهێڵن منالیان ببێ، ئیتر بەدەرمانو حەب بێ، بە لوولەو لەولەب بێ، بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ ژنو پیاو هەردووکیان ڕەزایان لەسەر ئەوە هەبێ. ئەمە لەبارەی سەرەتاوە لەمناڵبوون، بەڵام سك لەباربردن، ئەگەر بەر لەوە بێ، کە سکەکە ڕۆحی بکرێ بە بەردا، ئەگەر هۆی تر نەبێ، زۆر لەزانایانی مەزهەبەکان ڕێگەی پێ دەدەن — بڕوانە: تاج الأصول/ بەرگی دووەم زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٤٤ ج/٤ = چاپی چوارەم هەتا کۆتایی.

## (١٨) باب جواز جماعه امرأته في قُبلِها من قُدَّامها وَمِنْ وَرَائِها مِنْ غيرِ تعرُّضٍ للدُّبُر

## بۆ هەردوو حەڵاڵو هاوسەر، دروستە کە لەسەر هەر باریٚ دەیانەویٚ: پیٚکەوە دروست ببن، بە مەرجی خۆپاراستن لە جوتبوون بە کۆم

٩١١- عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ سَمِعَ جَابِرًا (رضى الله عنه) يَقُولُ: كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ: إِذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ: فَنَزَلَتْ: ( نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) {الحديث: ٣٥٢١ = ٣٥١٦ فـم. بخاري. تفسير: ٤٥٢٧، ٤٥٢٨}: [٩١١]

ئیبنولمونکەدیر دەفەرمویٚ: بیستم لەجابیر (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) دەیفەرموو: جوولەکەکان دەیانوت: ئەگەر پیاو لەلای پشتەوە بچیٚتە لای ژنی خۆی بەپیٚشی، ئەوە منالەکەی خیٚل دەبیٚ، جابۆ پووچکردنەوەی ئەم بیرو باوەڕە چەوتە. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ – بەقەرە/٢/٢٢٣}:

واتە: ژنەکانتان کیٚلگەن بۆ ئیٚوە، وەکوو زەوییەکی لەبار بۆ تۆم تیاوەشاندن، دەی کیٚلگەی خۆتان بکیٚلن هەرچۆن دەتانەویٚ، لەلاوە، یا لەپیٚشەوە، یا لەلای پشتەوە، بەمەرجیٚ بەپیٚش بیٚ، نەوەك بەکۆم). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٢ چ/٤}

---

[٩١١] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٩ = ٣٥٢١ بخاري. تفسير: ٤٥٢٧، ٤٥٢٨.

## (١٩) باب تحريم إمتناعها عن فِراشِ زَوْجِهَا

## نادروسته كه هاوسەر بەبێ مەهانەی ڕەوا جێ لە هاوسەرەکەی جیا بکاتەوە

٩١٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {إِذَا دَعَا اَلرَّجُلُ اِمْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ فبات غَضْبَانَ لَعَنَتْهَا اَلْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَلِمُسْلِمٍ: {كَانَ اَلَّذِي فِي اَلسَّمَاءِ سَاخِطًا عَلَيْهَا حَتَّى يَرْضَى عَنْهَا} . {تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٣٠٧ = ٣٢٣٧ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٣٠ = شيحا ٣٥٢٤ = ١٧٣٦} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیاو داوای سەرجێیی لە ژنەکەی بکا، وەژنەکەی بەبێ مەهانەیەکی ڕەوا، ملی پێ نەدا، وە پیاوەکە لەسەر ئەوە، ئەو شەوە لێی عاجزو نیگەران بوو، ئەوە ئەو شەوە هەتا بەیانی فریشتەکان لەعنەتو نەفرەت لەو ژنە دەکەن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢١٥٢ چ/٤ = چاپی چوارەم} .

لەگێڕانەوەی (صحيح مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا)دا، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا، ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، کە یەزدانی پاکە، هەر پیاوێ داوا لەژنەکەی بکا، کە لەگەڵیدا بچێتە سەر نوێنی سەرجێیی، ئەویش سەرپێچی لەفەرمانەکەی بکا، بەناڕەوا بەگوێی نەکا، مسۆگەر خودای گەورە لەو ژنە دەڕەنجێ، هەتا دڵی مێردەکەی ڕازی دەکات!). (صحيح مسلم/شيحا: ٣٥٢٥).

## (٢١) باب حكم العزل
## بڕیاری خۆکێشانەوە لە کاتی ناو هاتنەوەدا

٩١٣- عنْ ابَي سَعِيدٍ الخدري (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ بَنِي الْمُصْطَلِقِ فَاصَبْنَا سَبْيًا مِنْ سَبْيِ الْعَرَبِ فَاشْتَهَيْنَا النِّسَاء فَاشْتَدَّتْ عَلَيْنَا الْعُزْبَةُ وَاحْبَبْنَا الْعَزْلَ فاردنا ان نعزِلَ ، وقلنا: نعزِلُ ورسول الله (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بين اظهرنا ، قبلَ ان نساله، فسالناهُ فَقَالَ: مَا عَلَيْكُمْ انْ لا تَفْعَلُوا مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ الَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ الا وَهِيَ كَائِنَةٌ (الحديث: ٤١٣٨، اطرافه في: ٢٥٤٢، ٥٢١٠، ٦٦٠٣، ٧٤٠٩):

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لێ بێ) چووین بۆغەزای بەنی موستەلیق، ژنانی نازدارانی عەرەبمان بەتالانی گرت، وەبێ ژنی و دوور لە هاوسەری زۆری بۆهێنا بووین، وەحەزیشمان لە فرۆشتنی ئەو ژنە تالانی یانە هەبوو، جاویستمان لەگەڵیانا ڕاببوێرین و بچینە لایان، بەڵام خۆمان بکێشینەوە، هەتا ئاوەکە نەگاتەجێی خۆی و نەبێ بە منداڵ، ئەگینا ژنەکان دەبن بە دایکی منداڵمان و ئەوکاتە بۆمان نافرۆشرێن، واتە: هەم حەزمان لە ماڵ بوو، هەم حەزمان لە کەیف و ڕابواردن بوو، ویستمان چارەسەرێ بدۆزینەوە، کە هەردوو لامان بۆ دابین بکا، بەبیری خۆمان عەزل واتە: خۆکێشانەوە ئەو دوو مەبەستەمان بۆ دابین دەکا، دوایی گوتمان: ئێمە ئێستا لەخزمەتی پێغەمبەرداین چۆن دەبێ بەبێ پرسی ئەو (دروودی خودای لێ بێ) شتی وا بکەین، جاکاتێ لێمان پرسی، فەرمووی: (قەیناکەن ئەگەر وانەکەن! چونکە چارەنووسی خودایی ڕەتبوونەوەی نییە، وەهەرکەسێ هەتا ڕۆژی قیامەت، خودای گەورە چی لەچارەی نووسیبێ دەبێ بێتە دی، ئەگەر لە چارەی کەسێکی نووسیبێ کەدەبێ

دروست ببێ ئەوە دروست دەبێ و لەدایك دەبێ و بەعەزل و شتی وا بەری چارەنووسی خودایی ناگیرێ). (تاج/٣ ل/١٠٠ ف/٨ ز/٤٣- دەستووری سەرجێیی).

٩١٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ أَصَبْنَا سَبْيًا فَكُنَّا نَعْزِلُ فَسَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « أَوَإِنَّكُمْ لَتَفْعَلُونَ قَالَهَا ثَلاَثًا مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِلاَّ هِيَ كَائِنَةٌ »: [(٩١٤)]

لەم گێڕانەوەدا، تەنیا ئەم رستەی پترە: سێجار فەرمووی: (دیارە کە ئێوە شتی وا دەکەن؟).

٩١٥- عن جَابِر (رضى الله عنه) قَالَ: (كُنَّا نَعْزِلُ وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ): [(٩١٥)]

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا، کە ئایەتەکانی قورئان، بەرودوا دەهاتنە خوارەوە، ئێمە لەکاتی جوتبوونو سەرجێییدا، خۆمان دەکێشایەوە، لەکاتی رەحەتبووندا، تا تۆماوەکە نەگاتە ناو منداڵدانی ژنەکەو نەبێ بەمناڵ).

ننقل ههنا (من ترجمة التاج الجامع للأصول) شرح المصنف على الحديث الحادي عشر وذلك لأهميته ولعموم البلوى بهذا الأمر في يومنا هذا، قال (رحمه الله تعالى ونور ضريحه): ففي هذا جواز العزل مطلقا، وعليه بعض الصحب، والتابعين والشافعي..... وقال بعض العلماء: إنه حرام مطلقا لتلك الأحاديث... ولكن الذي يظهر وينبغي التعويل عليه الفرق بين الجارية والحرة، فالأولى يجوز العزل عنها مطلقا لأن تلك النصوص وردت فيها، وأما الحرة فلا يجوز العزل عنها إلا بإذنها، وعلى هذا جمهور السلف والخلف ومالك، وأبو حنيفة وأحمد (رضى الله تعالى عنهم).

---

(٩١٤) بڕوانە: (٩١٣).

(٩١٥) بخاری. نكاح: ٥٢٠٨ مسلم: ٣٥٤٤ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا.

(فائدة) حكم العزل هذا يجرى على إستعمال دواء لمنع الحمل مؤقتاً، ويجرى على إسقاط النطفة قبل نفخ الروح فيها فإن الحكمة في الكل واحدة وهي منع الحمل، والله أعلم.

أقول أنا المترجم: وقال الإمام النووى (رضى الله تعالى عنه)فى شرحه على صحيح مسلم لدى شرحه للحديث الوارد في بيان كيفية خلق الجنين في بطن أمه، الذى تقدم في هذا الكتاب المبارك (اى في التاج الجامع) بالرقم: ٤١/٤ في المجلد الأول في مبحث الإيمان بالقدر: قوله (صلى الله عليه وسلم) في هذا الحديث (ثم يرسل الملك) ظاهره ان إرساله (لينفخ فيه الروح) يكون بعد مائة وعشرين يوماً، وقال (عليه الرضوان والرحمة) واتفق العلماء على ان نفخ الروح لايكون إلا بعد أربعة أشهر، انتهى كلام النووى (رضى الله تعالى عنه).

وأقول: وبناء على ما تقدم ونظراً لأن بناء الدين على اليسر والرافة بالإنسان، وأن القواعد الشرعية قد روعى فيها مصلحة البشر المشروعة عامةً وفي المعاملات والأحوال الشخصية خاصة، مع الأخذ بنظر الإعتبار إحترام خالقية الخالق وإجلاله وإعظامه، أقول بناء على ما تقدم: لا بأس في ترجيح رأى العلماء الأجلاء الذين لا يرون بأساً بالعزل أو الذين يبيحون إستعمال وسائل منع الحمل وإسقاط النطفة قبل إكمالها أربعة أشهر لاسيما إذا أوصى بها الطبيب الحاذق المسلم الأمين لأعتبارات صحية كتهديد حياة الأم بالخطر، أو دينية كمنع الحيض والعادة الشهرية مؤقتاً لأداء صوم رمضان كاملا غيرمنقوض في شهره، أو أخلاقية كالستر على أهل الستر بالتخلص من الحمل المشبوه بوسائل منعه قبل تكوينه أو بإجهاضه قبل إتمامه أربعة أشهر كما هو الحال في البغاء وفي المخلوقة من ماء الزنا، فإن هذا أستر وأهون شرا، إذ عرف أن الشر المكتوم يقلله الستر، وأن السر الخفى يُفحِلهُ النشر وقد ينكمش الفساد ويتقلص ضرره وهو في قيد الإسرار وطي الكتمان حتى إذا ذاع وشاع فتفاقم

أمره واستفحل شرره، وليس في قولي هذا شئ من الدعاية للتغطية على الجريمة، فإن ستر العيوب ورتق فتق المؤمنين مأمور به شرعا، وقال الله تعالى في هذا الباب ﴿لا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ﴾ ومن الجهر بالسوء فتق رتق المسلمين.

أما تغطية الجريمة التي تميعُ حقوق الناس وتضيعها فإنها من باب إخفاء الجريمة والإعانة عليها فلا تجوز مطلقاً تحت أي ستار كان، قال تعالى: ﴿لا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنْ الْقَوْلِ إِلاَّ مَنْ ظُلِمَ﴾ يعني إن الله تعالى كما يكره فضح الناس والتعدي عليهم بالقول المشين كذلك يحب كشف الجريمة وقول الحقيقة وأداء الشهادة على وجهها ومقاومة الظلم الذي هو مرتع الجريمة بالقلم واليد واللسان والجنان، ومن لاحظ بإخلاص حال المسلمين في يومهم هذا واهتمامهم الزائد بهذا الأمر وبلبلتهم الروحية وذبذبتهم النفسية واستفتائهم بحرارة في هذا الشأن صوب تطرقنا إليه في هذه الأسطر المتقدمة ولم ير في ذلك خروجاً من الموضوع، والله أعلى وأعلم*. (المترجم)

واته: دانەری تاجول ئوصول (پڕ گۆڕەکەی لەنوور بێ) لە شەرحەکەدا لەکاتی ڕاڤەکردنی فەرموودەی یازدەهەمی ئەم باسەدا دەڵێ: لەم حەدیثەیەوە وا دەردەکەوێ کە ئاگر بڕ (عەزل) بەبێ بەندو مەرج دروستە، وە هەندێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و هەندێ کەس لەچینی دوای یاران (تابیعین) و ئیمامی شافیعی (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) ڕایان لەسەر ئەم ڕایەیە.

وە هەندێ زانایانیش گوتوویانە: ئاگر بڕ (عەزل) بەهیچ جۆرێ ڕەوا نییە، بەڵگەشیان ئەم فەرموودانەی ترە کە لەم باسەدا باسکراون.

وەلێ ئەوەی کە ڕوونو ئاشکرایەو بە کەڵکی ئەوە دێ کە پشتی پێ ببەسترێ ئەوەیە کە دەبێ لەم باسەدا کەنیزو ژنی ئازاد لەیەک جیابکرێنەوە لەسەر ئەم

* هذا ليس حديث لا حاجة إلى تخريجه.

شێوەیە: کەنیز لەهەموو کاتێکدا دروستە ئاگربڕی لێ بکرێ بەڵام ژنی ئازاد دروست نییە ئاگربڕی لێ بکرێ مەگەر بەڕەزای خۆی.

وە جەماوەری زانایانی پێشین و پاشین و ئیمامی مالیك و ئەبو حەنیفەو ئەحمەد (رەزای خودایان لێ بێ) رایان لەسەر ئەم رایەیە.

(مەسەلەیەکی سوود بەخش) ئەم حوکمەی کەبۆ عەزل واتە: بۆ ئاگربڕ هەیە، بۆ بەکارهێنانی هەموو دەرمان و هۆیەك هەیە کە بۆ ماوەیەکی وەختی دەبێ بەهۆی ئاگربڕ (مەنع) لەسك پڕبوون وە هەروەها سك لەباربردنیش هەمان حوکم و بڕیاری هەیە، بەمەرجی ئەوە کە هێشتا رۆحی نەکرابێ بەبەرا چونکە مەبەست لەمانە هەموو ئەوەیە کە بەرگری لەسك پڕبوون بکرێ. وە خودای گەورە هەر بۆخۆی زۆر باشتری لێ دەزانێ قسەی دانەری تاجول ئوصول (رەزای خودای لێ بێ) لێرەدا تەواو.

وە ئیمامی نەوەویش لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، لە راڤەکردنی ئەو حودیثەدا کە باسی چۆنێتی دروستبوونی ئادەمیزاد دەکا لەسکی دایکیا، ئەم حەدیثە لەبەرگی یەکەمی تاجول ئوصولدا لەباسی باوەڕ بە قەزاو قەدەرو چارەنووسدا رۆیشت، دەڵێ: فەرموودەی حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: (ثم يرسل الملك لينفخ فيه الروح): لەپاش ئەوە خودا فەرمان دەکا بە فریشتەکە کە گیانی بکا بەبەردا، وا دەردەکەوێ کە ئەمە لەپاش سەدو بیست رۆژ دەبێ... وەقسەی زانایان لەوەدایە کە لەپاش چوار مانگ گیان دەکرێ بەبەر منداڵ لەسکی دایکیا. قسەی ئیمامی نەوەویش (رەزای خودای لێ بێ) تەواو.

منیش (کە وەرگێڕم) دەڵێم: جا لەبەرئەوەی کە ئەم باسە ئەمڕۆ زۆر باوە، وەگەلێ گرنگە، وە بووە بەکێشەیەکی گشتی، وە موسوڵمانان بەژن و پیاوەوە زۆر بە پەرۆشەوە لە چارەسەرێکی ئەم دیاردەیە دەپرسن، وە لەبەرئەوەی کە بناغەی

دیـنو ئـایین لەســەر ئاسـانكاریو رەحمەتــە، وە دەســتوورو یاسـاكانی شـەریعەت بەگـشتی بەرژەوەنــدی ئــادەمیزاد رەچــاو دەكــەن، بەتایبــەتی لەباســی بــاری كەسـایەتیو حـاڵو بارودۆخـە خۆییەكانـدا، وە لەســەروو هـەموو شتێكەوە رێـزی دروستكاریی خودای دروستكەری كردگار رەچاو دەكەن، جا لەبەر ئەمانـە هـەموو، منی وەرگێڕیش دەڵێم:

قەیدی نیە ئەگەر رای ئەو زانـا بەرێزانـە پەسـەند بكرێ، كـە دەفـەرموون: عـەزلو ئـاگربڕ قەیـدی نیــە، وە هـەروەها بـەكارهێنانی هۆیـەكانی بـەرگرتنی منداڵبوون قەیدی نیە، وەسـك لـەباربردن بـەر لەتـەواوكردنی چوار مـانگ قەیـدی نیە، نەخوازەڵا ئەگەر لەسەر ڕاوێـژو ئامۆژگـاریی پزیـشكێكی موسـوڵمانی لێزانـی ئەمیندار بێ، ئیتر لەبەر هۆی تەنـدروستی بێ، وەك ئەوەی كـە ئـەو سكە ببـێ بـە مایـەی مەترسـی بـۆ دایكەكـەی، یـان لەبـەر هۆیـەكی ئـایینی بـێ، وەك ئـەوەی بـە حەپو دەرمان بـەری بێنوێـژی بگـرێ بـۆ ماوەیـەك، تـا ژنەكـە لـەو ماوەیـەدا سـی ڕۆژەی ڕەمـەزان بـە تـەواوی بـەڕۆژوو بـێ، یـان تـەوافی مـاڵی خـودا بكـا لـە كـاتی حەجدا، یان لەبەر هۆیەكی ڕەوشـتی بـێ وەك سرپۆشـینی خێزانـی بـە نـامووسو خاوەن سیترو پەردە، وەك لەباربردنـی سـكی زۆڵو بـەكارهێنانی داودەرمـانی سـك نەكردن لە كاتی جوتبـوونی بـێ شـەرعیدا، چـونكە وەكـوو زانـراوە شـەڕو خراپـە هەتا لە ژێر پەردەوەن بنو بـە دزییـەوە بكـرێن باشـترە، چـونكە كـە ئاشـكرابوون پەرەدەسێننو دەبن بە سەرمەشق بۆ خەڵكی تریش، سەرەڕای ئەوە گـەڵێ خـەڵكی بێ تاوانی بێ ئاگا لە كەسوكاری هەردوولا تووشـی شـەرمەزاریو سەرشـۆڕی دەبـن بە بەلاش.

وە خوداش خۆی سرپۆشەو سرپۆشینی پێ خۆشە، وە ئەوەتانێ دەفەرموێ: ﴿لا يُحِبُّ اللّٰهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ﴾ واتە: خودا حەزی لەوە نیە كە شتی خراپە ئاشـكرا

بكرێ، چ خراپەیەکیش لەوە خراپترە کە کەسێ پەردەی خودا لەسەر بەندەی خۆی هەڵبداتەوەو ڕیسواو ترۆی بکا تەنیا لەبەر ئابڕوو شکاندنو بەس.

وەڵێ دیارو ئاشکرایە کە مەبەست لە سرپۆشی ئەوە نیە کە تاوان بکرێ بە ژێر لێوەو خەڵك پێ بخشێنن لە تاوانی تاوانبارو چاو بپۆشن لە ستەمی ستەمکار.

نەء ئەمە دروست نیەو ئەمە نارەواییەو هاریکارییە لەگەڵ تاوانکاردا، خودا دەفەرموێ: لەم بارەیەوە ﴿لا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلاَّ مَنْ ظُلِمَ﴾ واتە: خودا حەزی لەوە نیە کە شتی خراپە ئاشکرا بکرێو بەبێ هۆیەکی ڕەوا قسەی لێ بکرێ، مەگەر بۆ کەسێ کە پەردە لەسەر زۆرو ستەمو زوڵمی زۆردار لا بدات، لەمەیشەوەە دەردەکەوێ کە خودای گەورە وەکی پێی ناخۆشە خەڵك بە ناهەق ترۆو ڕیسوا بکرێن پێشی خۆشە کە پەردە لە ڕووی تاوان لابدرێو هەمیشە قسەی هەقو ڕەوابکرێو شایەتی بە هەق بدرێو زوڵمو زۆر (کە بۆگەی تاوانبارییە) ڕیشەکەن بکرێو بە دەستو دەمو زبانو دڵ پاکۆ بدرێ.

لەو باوەڕەدام کە ئەم لاباسە خۆکەرکردن نیە لە باسە سەرەکییەکە، چونکە بە ڕاستی مەردومە موسوڵمانەکە ئەمڕۆ کە زۆر تینوی ئەم باسەن. وە خودای گەورەو مەزن هەر بۆ خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ. (وەرگێڕ)

ڕوونکردنەوە:

## پوختەی بڕیارەکانی ژن هێنانو شووکردن

١- هاندان لەسەر ژن هێنانو شووکردن، کەشتی وا لە سوننەتی پێغەمبەرانو هاوسەرەکانیانە.

٢- هاوسەری باش، چ ژن بێ، چ پیاو بێ، باشترین بەهرەی جیهانە.

٣- كارێكی پەسەندە، كە ژن، یا هەقداری ژن، داوا لەپیاوی باش بكا، كە كچی خۆی، یا خوشكی خۆی پێ بدا، یان ژن داوای لێ بكا كە شووی پێ بكا، وەك پێغەمبەر شوعەیب داوای لە پێغەمبەر مووسا كرد كە كچەكەی بداتێو ئەویش قەبووڵی كرد.

٤- هاوسەری بەدین زۆر پەسەندە.

٥- هێنانی كچ، یا شووكردن بەكوڕ پەسەندە.

٦- خوازبێنی لەسەر خوازبێنی نادروستە.

٧- تەماشاكردنی هاوسەر، بۆ ژن بۆ پیاو، لەپێش گرێدانی هاوسەریدا سوننەتە. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٠٠ لە شەرحی بلوغ المرام}.

٨- هاوسەریی دەبێ، بەڕەزامەندیی هەموولایەك بێ.

٩- چۆن چۆنی ژن بەژن دروستە، وە ژن بەژن چییەو چۆنە. {بڕوانە: ژمارە: ١٠١٤ لە شەرحی بلوغ المرام}.

١٠- سیغە (هاوسەرێتی كاتی) دروست نییە،وە چییەو چی نییە. {بڕوانە ژمارە: ١٠٢٤و ١٠٢٥و ١٠٢٦ لە شەرحی بلوغ المرام}.

١١- ژن هێنانو ژن بەشوودانو شووكردن لەكاتی ئیحرامی حەجو عەمرەدا {بڕوانە: ١٠١٩ لە شەرحی بلوغ المرام}.

١٢- ئەو ژنانەی كە دروست نییە بەیەكەوە ژنی یەك پیاو بن، وەك دوو خوشك، پوورو خوشكەزا، یا پوورو برازا {بڕوانە: ژمارە: ١٠١٨ لە شەرحی بلوغ المرام}.

١٣- بڕیاری مارەیی، چەندە، چی دەبێ، مارەیی بەشێكی زۆر گرنگە لە ژن هێنان. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٠٥و ١٠٠٦ لە شەرحی بلوغ المرام}.

١٤- لەهەموو کاتو ساتێکا دروست کردنی هاوسەری دروستە، لەم ڕووەوە، جیاوازی لەنێوانی ڕۆژو هەفتەو مانگەکاندا نییە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی خاڵی ژمارە (١١) لەم ڕوونکردنەوەدا.

١٥- شایی کردنو نانی شایی، بەبۆنەی زەماوەندەوە، سوننەتە، قەبوولکردنی خوڵكو دەعوەت بۆسەر شاییو بۆنەی خۆشو ڕەوا، سوننەتە، بەڵکوو لەهەندێ کاتدا پێویستە بەمەرجی خۆی، کە بێ شەرعی لێ نەبێ.

١٦- گوتەی تایبەتی کاتی دروست بوونو جووتبوون بۆ هەردوولا.

١٧- سەرپێچی لەداوای مێرد بۆ کاری سەرجێی کارێ ناڕەوایە، هەروا پشتگوێ خستنی ئارەزووی ژن، لەلایەن مێردەوە، لەم لایەنەوە کارێ نابەجایە.

١٨- پۆشینی رازو نهێنی نێوانی ژنو مێرد فەرزو پێویستە.

١٩- هەوڵی پێشگیریی لەدروستبوونی منالّ، بەمەرجی خۆی حەرام نییە، بەمەرجێ لەژێر چاودێری زانایاندا بێ.

٢٠- شەفتەژێو چوونە لای ژنی منالّ بە بەر دروستە لەلایەن مێردەکەیەوە، بەڵام وا باشە دووربینی بکرێ.

٢١- ژنی مێردپەروەرو سکوزاکەر زۆر پەسەندە.

٢٢- نزای کاتی ژن هێنانو شوو کردن {بڕوانە: ژمارە: ٩٩٨ لە شەرحی بلوغ المرام}.

٢٣- وتاری خوازبێنیو شتی وا {بڕوانە: ژمارە: ٩٩٩ لە شەرحی بلوغ المرام}.

٢٤- بەبێ هەقداری ژن، ژن مارەی نایەت.

٢٥- بەهیچ شێوەیێ، نە بە نەصالەت، نە بەوەکالەت، ژن بۆی نییە، کە دەوری گرێدانی هاوسەری ببینێ، یا هاوسەری بۆ خۆی، یا بۆ کەسی تر قەبووڵ

بكا. ئەوە یا ئەرکی مێردە، یا ئەرکی وەکیلیەتی، کە نێرینە بێ، یا ئەرکی هەقدارە، یا ئەرکی وەکیلیەتی بەمەرجێ نێرینە بێ.

٢٦- ژن هەتا حەیەی هەڵ نەیێ، لەکەسێ تر مارەیی نایێ، حەیە واتە: عیددە، حەیەیش جۆری زۆرە، هی مردنە، هی تەڵاقە، هی شتی ترە.

٢٧- ئایا گرێبەندی ژن مارە کردن، کەئێستا لە دادگا فەرمییەکان ئەنجام دەدرێ، بۆ حەڵاڵ بوونی ژنو پیاوەکە بەسە یانا؟ وەچی بکرێ باشە؟

وەڵام: لەلای جەماوەری زانایانو شەرعزانەکان، هەقدار، یا وەکیلی هەقدار، بۆ گرێدانو عەقدی نیکاح روکنو مەرجە، بەبێ ئامادەبوونی ئەو، یا وەکیلی ئەو، گرێدانی هاوسەری عەقدی نیکاح دانامەزرێو پووچە، گەرچی لەلای پێشەوا ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) ژن دەتوانێ خۆی سەربەخۆ گرێبەندو عەقدی نیکاح دابمەزرێنێ.

**جا کورتو پوخت:** (ئەوە شەرعی ترو رەواترە کە مارە برینەکە بەسەرپەرشتی مامۆستایەکی ئایینی ئەنجام بدرێ، بۆ ئەوەی لەهەموو روویەکەوە بێ گەردو دامەزراوو بێ کێشەو بەرە بێ!)

ئەوەندە هەیە وەك لەخەڵکی راستو راستاڵو راستگۆ دەبیستین: گرێدانی مارەبڕینی دادگا، لە زۆر رووەوە کەموکورتی شەرعی هەیە، تەنانەت زۆر لەقازییەکان، نووسراوی فەرمی دەدەن بەژنو مێردەکە کە بچن لەلای مامۆستایەکی ئایینیو لەلای مەلایێ، گرێبەندێکی شەرعی ئەنجام بدەن، وە ئەمەیش کەقازییە بەڕێزەکان دەیکەن لەدوو سەرەوە باشە:

**یەکەم:** گەردنی خۆیان ئازاد دەکەن، لەئۆباڵی کەموکوڕی گرێبەندی مارەبڕینەکە.

دووەم: ژن‌و مێردەكــەیش ئاســوودەیی دەروونــی‌و ئــایینی دەردەســت دەكەن‌و لەكاری گوماناوی ڕزگار دەكەن.

## ١٧- كِتَابُ الرَّضَاع
## نامەی مەمكخواردن‌و شیرخواردن
### (١) باب يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الوِلاَدَةِ
### هەرچی بەهۆی سكوزاوە قەدەغە بێ، بەهۆی مەمكخواردنیشەوە قەدەغە دەبێ

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، لە ژمارە: ٢٠٧٢ وەوە هەتا/٢٠٨٠ + تەجریدی بوخاری/٥، لە ژمارە: ١٧٥٣وە هەتا/١٧٥٦ + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٧٩٦، زنجیرە: ٢٩٣ + مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٦٧٧ نامەی ژمارە/١٥، لە ژمارە: ٨٧٤وە هەتا ژمارە: ٨٨٢} . + {شەرحی بلوغ المرام/٢، لە زنجیرە: ١٧١- ەوە هەتا زنجیرە: ١٨١ لەژمارە: ٩١٦- ەوە هەتا ژمارە: ٩٣٥} .

٩١٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ عِنْدَهَا، وَإِنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أُرَاهُ فُلاَنًا ». - لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ -، قَالَتْ عَائِشَةُ: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَوْ كَانَ فُلاَنٌ حَيًّا - لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ - دَخَلَ عَلَيَّ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلاَدَةُ ». {الحديث: ٣٥٥٣ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيخا لِشَرْحِ صحيح مسلم = الحديث: ٣٥٤٩ حسب ترقيم فتح الملهم شرح صحيح مسلم. تجريد البخارى بالكوردى. مجلد/٥، رقم: ١٧٥٤ = ٥٠٩٩، ٢٦٤٦،

٣١٠٥ = فتح الباری شرح صحیح البخاری. نسائی. نکاح: ٣٣١٣. تحفة الأشراف: ١٧٩٠٠}: [٩١٦]

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای من بوو، گوێم لێبوو کەپیاوێ ڕێخوازیکرد کەبچێ بۆلای حەفصەی کچی عومەر، کەژنی پێغەمبەر بوو، عائیشە فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە پیاوێکە داوای مۆڵەت دەکا، کەبچێ بۆ ماڵی تۆ، واتە: بۆ ماڵی حەفصەی ژنت؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وادەزانم کە فیسارە کەسە، کە مامی شیریی حەفصەیە) کەواتە: خۆییەو بێگانە نییە، بابچێت. عائیشە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەی کەوابێ ئەگەر ئێستا فیسارەکەس بمایێ، کەمامی شیریی عائیشە بوو، دەیتوانی وەك کەسێکی خۆیی‌و مەحرەم، هاموشۆی منی بکردایە!

فەرمووی: (بەڵێ، چونکە هەرچی بەخزمایەتی‌و زاوزێ حەرام ببێ، بەهۆی مەمکخواردنیشەوە حەرام دەبێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٢ — چاپی/٤}.

---

[٩١٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٥٤ = ٥٠٩٩، ٢٦٤٦، ٣١٠٥ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٤ = ٣٥٥٣ شیحا (بخاری/٥٢ - ٧).

## (٢) باب تحريم الرضاعة من ماءِ الفحْل
## كاريگەریی شیریی بەهۆی تۆماوی مێردەوە

٩١٧- عن عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (اسْتَاذنَ عَلَيَ افْلَحُ اخُو ابِي الْقُعَيْسِ بَعْدَمَا انْزِلَ الْحِجَابُ فَقُلْتُ:(لا اذنُ لَهُ حَتَّى اسْتَاذنَ فِيهِ النَّبِيَ (صَلَّىاللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)فَانَّ اخَاهُ اباالْقُعَيْسِ لَيْسَ هُوَ ارْضعَنِي وَلَكِنْ ارْضعَتْنِي امْرَاةُ ابِي الْقُعَيْسِ) فَدَخَلَ عَلَيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ لَهُ: (يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّ افْلَحَ اخَا ابِي الْقُعَيْسِ اسْتَاذنَ فَابَيْتُ انْ اذنَ لَهُ حَتَّى اسْتَاذنَكَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):(وَمَامَنَعَكِ انْ تَاذنِي عَمُّكِ؟ قُلْتُ: (يَا رَسُولَ اللّٰهِ انَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ ارْضعَنِي وَلَكِنْ ارْضعَتْنِي امْرَاةُ ابِي الْقُعَيْسِ) فَقَالَ: (ائْذنِي لَهُ فَانَّهُ عَمُّكِ تَرِبَتْ يَمِينُكِ). (الحديث: ٤٧٩٦- اطرافه في: ٢٦٤٤- ٥١٠٣- ٥١١١- ٥٢٢٩- ٦١٥٦):[٩١٧]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەفلەحی برایئەبول قوعەیس، ڕێگە خوازی کرد کە بێت بۆ سەردانم، ئەمەش ئەو کاتەبوو کە ئایەتی خۆ داپۆشین ولەچك كردن (ئایەتی حیجاب )هاتبوو، وەژنەکانی پێغەمبەر بەپێی ئەو ئایەتە فەرمانیان پێ کرابوو، کەلە پیاوی ناخۆیی وبیانی حیجاب بکەن وپەردەو سەر پۆش ولەچك بپۆشن، منیش گوتم : ڕێگەی دیدارو دێنی پێ نادەم هەتا لە پێغەمبەر (درورودی خودای لێ بێ) نەپرسم، خۆ من ئەبو لقوعەیس خۆی شیری پێم نەداوە، بەڵکو ژنەکەی ئەبولقوعەیس مەمکی پێ داوم، کەواتە ئەم ئەفلەحە چۆن چۆنی دەبێ بەخۆیی ومەحرەمی من.

کاتێ پێغەمبەر (درورودی خودای لێ بێ) تەشریفی هات، پێم گوت : ئەی پێغەمبەری خودا! ئەفلەحی برای ئەبولقوعەیس، ڕێگە خوازی کرد کەبێت بۆ

[٩١٧] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٨٣ = ٤٧٩٢ بخاری مسلم: ٢٥٥٧ شیحا، (بخاری — ٦٥ - ٣٣).

دێنیم، گوایە مامی شیریم بێ، بەڵام من قایل نەبووم، کەڕێگەی پێ بدەم هەتا لەتۆ نەپرسم.پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوە مامی شیریتە، ئەدیی بۆچی ڕێگەی هاتنی مامەتت نەداوە کە بێ بۆ سەردانت؟.

منیش زیاتر ڕوونم کردەوە بۆی وگوتم؟ خۆ ئەی پێغەمبەری خودا ! من شیری ئەوم نەخواردووە، من شیری براژنەکەیم خواردووە، کە ژنی ئەبولقوعەیسە؟ فەرمووی: ( ڕێگەی پێ بدە کە بێت بۆ دیێنیت، چونکە بەپێی شەرع ئەوە مامی شیریتە) کەواتەخۆیی ومەحرەمە وپێویست ناکات کەپەچەو سەر پۆشی بۆ بگریتەوە، ئەی هەژارۆکە !چۆنە شتیوا نازانیت !!

**ڕوونکردنەوە:**

**پوختەی فەرمووده کە ئەمەیە :** ژنی پیاو، شیربدات بەهەر منداڵێ، ژنەکە دەبێ بەدایکی، مێردەکەی دەبێ بە باوکی شیری، برای مێردەکەی دەبێ بەمامی شیری، وەهەروەها، واتە: براژنت شیر بدات بەهەر منداڵێ تۆ دەبیت بەمامی شیری ئەو منداڵە، وە دەست نوێژتان لەیەکتری ناشکێ، پەیوەندی فەرموودە کە بە ئایەتە کەوە لەم ڕووەوەیە: بۆ کەڵ (فحل) شیر دەچەسپێ، وەخۆیەتی(مەحرەمیەت) هەر وەك لەژنی شیردەرەوە دەتەنێتەوە بۆ کەس وکاری وەك دایك و باوك وخوشك وبرا و نەنك و باپیری، لەمێردەکەشیەوە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو خاوەن شیرەکەیە، واتە سکی ژنەکەی پڕ کردووە هەتا هاتووەتە شیر، خۆیەتی لەکەڵیشەوە- واتە: لەمێردی ژنە شیر دەرەکەوە — دەتەنێتەوە بۆ کەس وکاری، وەك کوڕ وکچ وباوك ودایك و براو خوشكو.....هتد.

٩١٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتِ اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ أَفْلَحُ فَلَمْ آذَنْ لَهُ ، فَقَالَ أَتَحْتَجِبِينَ مِنِّى وَأَنَا عَمُّكِ فَقُلْتُ وَكَيْفَ ذَلِكَ قَالَ أَرْضَعَتْكِ امْـرَأَةُ أَخِـى بِلَـبَنِ أَخِـى . فَقَالَتْ سَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسـلم) فَقَـالَ: « صَـدَقَ أَفْلَـحُ ، ائْذَنِى لَهُ»: (٩١٨)

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەفلەح داوای كرد، كە رێگەی پێ بدەم، كەبێت بۆ سەردانم، منیش رێگەم پێ نەدا، ئەویش گوتی: من مامەتم، ئیتر چۆن وەك بیانی حیجابم لێ دەكەیت؟ گوتم: چۆن چۆنی تۆ مامـەمیت؟ گوتی: براژنم شیری پێت داوە، كە خاوەنی ئەو شیرە ئەبول قوعەیسی برای منە، عائیشە فەرمووی: جا لەم بارەیەوە كە پرسیارم لە پێغەمبەر كرد فەرمووی: (ئەفلەح راست دەكا، مامی شیریتە، كەواتە مۆڵەتی پێ بدە كە بێت بۆ دێنیت).

ئێستایش بۆ بەهرەی پترو بۆ تێگەیشتنی تـەواو لـەم باسە، فـەرموودەی ژمارە (٨٧٥)ی پوختەی موسلیم/٢ دەنووسین:

عن عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: جَاءَ عَمِّى مِنَ الرَّضَاعَةِ يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، حَتَّى أَسْتَأْمِرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) قُلْتُ: إِنَّ عَمِّى مِنَ الرَّضَاعَةِ اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَـهُ، فَقَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ عَمُّكِ »، قُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِى الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِى الرَّجُلُ، قَالَ: « إِنَّهُ عَمُّكِ فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ ». {الحديث: ٣٥٦٠ شيحا = ٣٥٥٦ فم = فم = فتح الملهم. ترمذى. رضاع: ١١٤٨. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٦٨٣ = ٤٧٩٦، ٢٦٤٤، ٥١٠٣، ٥١١١، ٥٢٢٩، ٦١٥٦}:

---

(٩١٨) تجريـد/٤، ژمـارە: ١٦٨٣ = ٤٧٩٦ بخـاری. مختـصر صـحيح مـسلم/٢، ژمـارە: ٨٧٥ = ٣٥٦٠ مسلم/شيحا (بخاری – ٧/٥٢).

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەفلەحی برای ئەبول قوعەیس (کە مامی شیریی عائیشە بوو، چونکە عائیشە شیری ژنەکەی ئەبولقوعەیسی خواردبوو، ئەبولقوعەیس باوکی شیریی عائیشە بوو، دیارە کە ئەفلەحی براشی مامی شیریی عائیشەیە) ئەم ئەفلەحە کە مامی شیریم بوو، هات بۆسەردانم، منیش ڕێگەم پێی نەدا، گوتم: هەتا پرس بە پێغەمبەر نەکەم شتی واناکەم، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مامە شیرییەکەم هاتبوو، دەیویست بێ بۆ دێنیم، منیش ڕێگەم پێی نەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (با مامەت بێت بۆ سەردانت). منیش عەرزیم کرد: ئاخر خۆ من شیری براکەی ئەوم نەخواردووە، بەڵکوو من شیری ژنی براکەی ئەوم خواردووە؟ فەرمووی: (ئەوە مامی شیریتە، ڕێگەی پێبدە کە سەردانت بکا).

(نوکتەیێ) گریمان پیاوێ بێتە شیر بۆ منالێ و مەمکی بێتە شیرو مەمك بدا بەمنالێ، بەوە نابێ بە منالی، ئەگەر کچ بێ بەوە لێی حەرام نابێ، مارەی لێی دێ!!

## (٣) باب تحريم إبنَةِ الأخِ مِنْ الرِّضاعَةِ
## کچی برای شیریی بە مرۆڤ ناشێ

٩١٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِي بِنْتِ حَمْزَةَ «لاَ تَحِلُّ لِي ، يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ ، هِيَ بِنْتُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ »: [٩١٩]

[٩١٩] بخاری: ٢٦٤٥ مسلم/شيحا: ٢٥٦٨ (بخاری/ رقم الكتاب/٥٢ رقم الباب/٧ = بخاری – ٧/٥٢).

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەریان کرد، کە کچەکەی حەمزەی مامی بهێنێت بۆ خۆی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو کچەم پێ ناشێ، چونکە برازای شیریمە، هەرچیش بەهۆی سکوزاوە بە مرۆڤ نەشێ، بەهۆی شیرو مەمکخواردنەوە بەمرۆڤ ناشێت).

ئەنجا بۆ راڤەو روونکردنەوەی ئەم داستانە، فەرموودەی ژمارە (٨٧٦)ی پوختەی موسلیم دەنووسین:

عَنْ عَلِيّ (رضى الله عنه) قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا لَكَ تَنَوَّقُ فِى قُرَيْشٍ وَتَدَعُنَا، فَقَالَ: « وَعِنْدَكُمْ شَىْءٌ »؟ قُلْتُ: نَعَمْ، بِنْتُ حَمْزَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِى، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِى مِنَ الرَّضَاعَةِ ». {الحديث: ٣٥٦٦ شيحا = ٣٥٦٢ ف.م = فم = فتح الملهم. نسائى. نكاح: ٣٣٠٤. تجريد/٥، رقم: ١٧٥٣ = ٥١٠٠، ٢٦٤٥ = فتح البارى}:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی هەرژن لە قورەیش هەڵ دەبژێریت، کەچی لە ژنانی بەنی هاشمی خۆمان ژن ناخوازی. فەرمووی: (جاکێ لەخۆتان گومان دەبەی کە من بیخوازم؟). گوتم: بەڵێ شك دەبەم: کچەکەی حەمزە، کە ئامۆزای خۆتە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێم ناشێ، چونکە کچی برای شیریمەو کچی حەمزەیە، حەمزەیش هەم مامی هەقمە، برای باوکمەو هەم برای شیریمە، چونکە ثوومیبە هەم شیری دابوو بە ئیمامی حەمزە، هەم شیری دابوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدوو ساڵ پاش حەمزە شیری دابوو بە پێغەمبەر). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

ثوومیبە دایکی شیریی پێغەمبەرە، یەکەم کەس بووە کە شیر بدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشیری کوڕێکی کەناوی مەسرووح بوو، بەرلەوەی پێغەمبەر، حەلیمەی سەعدییەی دایەنی بیبات بۆلای خۆی چەند ڕۆژێ ثوومیبە مەمکی دەدا پێی، ثوومیبە کارەکەری ئازادکراوی ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەر بوو، ئیبنو مەندە دەفەرموێ ثوومیبە ئیسلام بووە، پێغەمبەر زۆر بۆی باش بووە، هەتا لەمەککە بوو سیلەی ڕەحمی ئەوی بەجێ دەهێنا، خەدیجەیش زۆر ڕێزی لێ دەگرت، چونکە خەسووی شیریی ئەو بووە، لەساڵی حەوتی کۆچیدا لەپاش ئازادکردنی خەیبەر، کۆچی دوایی کردووە، ئەم چوار ژنە مەمکیان بە پێغەمبەر داوە: ئامینەی دایکیو ثوومیبەو حەلیمەی سەعدییەو ئوم ئەیمەن!

ثوومیبە دایکی شیریی ئیمامی حەمزەو پێغەمبەرو ئەبو سەلەمە بووە. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٤ چاپی چوارەم}.

## (٤) باب تحريم الربيبة وأخت المرأة
## زڕ کچو خوشکی ژن مارەییان نایەت

٩٢٠- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِى سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ لَهُ: هَلْ لَكَ فِى أُخْتِى بِنْتِ أَبِى سُفْيَانَ؟ فَقَالَ: « أَفْعَلُ مَاذَا »؟ قُلْتُ: تَنْكِحُهَا، قَالَ: « أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكَ؟». قُلْتُ: لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَرِكَنِى فِى الْخَيْرِ أُخْتِى، قَالَ: « فَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِى ». قُلْتُ: فَإِنِّى أُخْبِرْتُ أَنَّكَ تَخْطُبُ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِى سَلَمَةَ، قَالَ: « بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟ ». قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: « لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِى فِى حَجْرِى مَا حَلَّتْ لِى إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِى مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِى وَأَبَاهَا ثُوَيْبَةُ، فَلاَ تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ، وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ ». {الحديث: ٣٥٧١ شيحا = ٣٥٦٧

فـم تجريـد البخـاری/٥ رقـم: ١٧٥٥ = ٥١٠١، ٥١٠٦، ٥١٠٧، ٥١٢٣، ٥٣٧٢ فـتح الباری. نسائی. نکاح: ٣٢٨٤. تحفة الأشراف: ١٥٨٧٥} : [٩٢٠]

ئوم حەبیبەی کچی ئـەبو سوفیان (رەزای خودایـان لێ بـێ) کە هاوسـەری پێغەمبەرە، فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هات بـۆلام، بـۆ ماڵەوەم، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی عـەززەی خوشـکم کەکچی ئەبو سوفیانە مارەناکەی بۆ خۆت؟ فـەرمووی: (چـی بکـەم؟) گـوتم: مـارەی بکـە لەخۆتو بیکە بەهاوسەری خۆت.

فەرمووی: (جا پێت خۆشە؟). گوتم: بەڵێ، چونکە ئـەوە نـەبێ کـە تـەنیا هـەرمن ژنـت بمو تـۆ تـەنیا هـەر بـۆمن بیـت، خۆشەویـسترین کەسـیش کـە هاوبەشم بێ، لە بەهرەی هاوسەرێتیی تۆدا، ئەو خوشکەمە، کەوابوو حەزدەکەم کە مارەی بکەی، هەتا ئەو شانازیو سەربەرزییە بەویش ببڕێ. فەرمووی: (دەسا ئـەوە بـۆ مـن دروسـت نییـەو پـێم ناشـێ، چـونکە دروسـت نییـە بـۆ پیـاوێ دوو خوشك پێکەوە مارە بکا بۆ خۆی).

منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خـودا! سـا ئێمـە لـەناو خۆمانـا مقـۆ مقـۆی ئەوەمانـە کـەتۆ دەتـەوێ دوڕەی کـچی ئـەبو سـەلەمە مارەبکـەی بـۆ خـۆت، مـن شتێکی وام بیستووە، ئەی ئـەوە چۆنە؟ فـەرمووی: (هەنـەزاکـەی خـۆم کـە کچی ئوم سەلەمەی ژنمە؟). گوتم: بەڵێ ئەو!

فەرمووی: (دەسا بەخودا ئەوە راست نییە، چونکە گریمان ئەوە زڕکچیـشم نەبێو لەکۆشو باوەشی خۆشمـا بـەخێوی نەکـەم، وە بـەربڕیاری ئـەم ئایەتـەش نەکەوێ کە دەفـەرموێ: {وَرَبَـائِبُكُمُ اللاَّتِـي فِـي حُجُـورِكُم} گریمـان ئەگـەر وایـش

[٩٢٠] تجریـد/٥، ژمارە: ١٧٥٥ = ٤١٠١ بخاری مختصر صحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٨٧٧ - ٣٥٧١ تـرقیم خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری/ رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/٣٦).

نەبێ هەرپێم ناشێ، چونکە ئەو برازای شیریمە، لەکاتی خۆیدا ثوومیبە مەمکی داوە هەم بەمنو هەم بە ئەبو سەلەمەی باوکی، جا نەکچی خۆتانو نەخوشکی خۆتانم بۆ هەڵ مەدەنو ئەوانەم پێشکەش مەکەن، ئەی ئێوەی هاوسەرانی من!). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٤ ج/٤}.

## (٨) باب إنّما الرَضاعةُ مِنَ المَجاعَةِ

## مەمکخواردن کاتێ کاریگەری دەبێ، کە لە کاتی ساواییدا بێ، کە کۆرپە لەبەر برسێتی شیر دەخوات

٩٢١- عَنْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قالت: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَعِنْدِي رَجُلٌ قَاعِدٌ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، قَالَتْ: فَقَالَ: « انْظُرْنَ إِخْوَتَكُنَّ مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ ». {الحديث: ٣٥٩١ شيحا = ٣٥٨٧ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ١٧٥٦ = ٥١٠٢، ٢٦٤٧. أبو اود. نكاح: ٢٠٥٨. نسائي. نكاح: ٣٣١٢}: [٩٢١]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ لەلام دانیشتبوو، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا هات بۆلام، کە ئەمەی دی لەبەری گران بوو، تەماشای دەموچاویم کرد تووڕە بوو، جا عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە برای شیریمە، بێگانە نییە، پێت ناخۆش نەبێ. فەرمووی: (باش سەرنج بدەن لە براو خوشکی شیریتان، چونکە مەمك خواردن

---

[٩٢١] مختصر صحيح البخاري = تجريد البخاري/٥، ژمارە: ١٧٥٦ = ٥١٠٢ بخاري. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٢ = ٣٥٩١ شيحا (بخاري: ٧/٥٢).

کاتێ دادەمەزرێو کاریگەری دەبێ، کە لەکاتی ساواییدا بێو منالەکە لەبەر برسێتی ئەو شیرە بخوات!!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٠٧٨ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## (١٠) باب الوَلَدُ للفراش وَتَوَقي الشُبُهَاتِ

## منالْ هی خاوەنی نوێنە، خۆپاراستن لە شتی گوماناوی

٩٢٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلاَمٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ، وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى شَبَهِهِ، فَرَأَى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: « هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ »، قَالَتْ: فَلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قَطُّ. {الحديث: ٣٥٩٨ = ٣٥٩٤ فم. بخاري. بيوع: ٢٢١٨، ٦٧٦٥، ٦٨١٧. نسائي. طلاق: ٣٤٨٤. تحفة الأشراف: ١٦٥٨٤. تاج/٢، زنجيرة: ٧٠، ذمارة: ٢٢٥٢، ض/٤}: [٩٢٢]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصو عەبدی کوڕی زەمعە (خودایان لێ ڕازی بێ) لەسەر خوڵامێ، واتە: کوڕێ، بوو بەهەرایان سەعد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە برازای منەو کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاصی برامەو کاتی خۆی بەپێی باوی سەردەمی نەفامی، داوێنپیسی لەگەڵ دایکیدا کردووە، کە کەنیزەکی زەمعەی کوڕی قەیس بوو، کە بەپارە لەشفرۆشی پێ دەکرد، وە عوتبەی برام کاتی خۆی لەپێش

---

[٩٢٢] بخاری. بیوع: ٢٢١٨ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٢ = ٣٤٩٨ شیحا، (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/ ١٠٠).

مەرگیدا منی راسپاردووە کە ئەمە کوڕی ئەوە، فەرموو تەماشای شێوەیشی بکە، ئەوەتانێ رێك لە عوتبەی برام دەچێو کوتومت لەودەکا.

عەبدی کوڕی زەمعەیش، کەبرای باوکیی سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری پێغەمبەرە، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە باوك برای منەو لەسەر نوێنی باوکم لەدایك بووەو لە کەنیزەکی خۆیەتی.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە سەرنجی شێوەی کوڕەکەیدا روانی شێوەی تەواو لە عوتبە دەچێ، بەڵام بۆ پووچکردنەوەی بڕیاری سەردەمی نەفامی، فەرمووی: (ئەی عەبد! ئەمە هی تۆیەو ئەم کوڕە شەرع دەیدا بەتۆ، چونکە مناڵ هی مێردە، یاهی خاوەنی کەنیزەکە، کەخۆی چووبێتە لای، بەپێی یاسای منداڵ هی خاوەن نوێنە، هەناسە ساردیش بۆ داوێن پیس دەمێنێتەوە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی بەسەودەی هاوسەری خۆی: (ئەی سەودەی کچی زەمعە! حیجابی لێ بگرەوە). عائیشە فەرمووی: ئیتر ئەو کوڕە جارێ تر سەودەی نەبینی.

## روونکردنەوە:

١- لەلای شافیعییەکان رەچەڵەکی ئەم کوڕە کەناوی عەبدورەحمانی کوڕی زەمعە بوو، دامەزراوەو چەسپاوەو ئیسپات بووە کە کوڕی زەمعەیە، ئەم فەمایشتەی پێغەمبەر بەسەودە کە پەردە پۆشی (احتجاب)ی لێ بکات، لەبابەتی دووربینیو ئیحتیاتە.

٢- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، خۆپاراستن لەشتی گوماناوی کارێکی رەواو پەسەندە.

٩٢٣– عن أبي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «الْوَلَـدُ لِـصَاحِبِ الْفِرَاشِ»:[٩٢٣]

واتاكەی لەژمارە (٩٢٢)دا رابورد.

## (١١) باب العَمَلُ بِإلحاقِ القائِفِ

## قسەی رەگەزناس، سەبارەت بە سەلماندنی رەچەڵەكو بنەچەی منداڵ كاری پێ دەكرێ

٩٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُورًا، فَقَالَ: « يَا عَائِشَةُ: أَلَمْ تَرَىْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ، فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْدًا وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا، وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ ». {الحديث: ٣٦٠٢ = ٣٥٩٨ فم، تجريد/٤، رقم: ١٤٦٩ = ٣٧٣١، ٣٥٥٥، ٦٧٧٠، ٦٧٧. أبو داود. طلاق: ٢٢٦٨. ترمذى. وَلاء: ٢١٢٩. نسائى. طلاق: ٣٤٩٣} :[٩٢٤]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلام، زۆر كەیفی خۆش بوو، لەخۆشیانا نوور لەڕووی دەباری، فەرمووی: (ئەی عائیشە! دەزانیت كە موجەززیزی مودلەجی كە شێوە ناسێكی بەناوبانگ بوو هات بۆلام، لەوكاتەدا ئوسامەو زەیدی باوكی ئوسامە، لەژێر پارچەیێ قەدیفەدا راكشابوون، سەری خۆیان داپۆشی بوو، بەلام قاچیان بەدەرەوە بوو، موجەززیز لەسەر ئەم حاڵە كەچاوی پێیان كەوت،

---

[٩٢٣] بڕوانە ژمارە: (٩٢١) (بخاری رقم الكتاب/٨٥ رقم الباب/١٨ - بخاری — ١٠٠/٨٥).

[٩٢٤] تجريد/٤، ژمارە: ١٤٦٩ = ٣٧٣١ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٣ = ٣٦٠٢ ترقيم شيحا لصحيح مسلم، (بخاری — ٣١/٨٥).

یەکسەر گوتی: خاوەنی ئەم قاچانە باوك‌و کوڕن!). {تـاج/٢، زنجیرە: ٧٢، ژمـارە: ٢٢٥٦ – ش/د/ت/ن = ج/٤} .

## (١٢) باب قَدرِ مَا تَستَحِقُّهُ البِكْرُ وَالثَّيِّبُ مِنْ إِقَامَةِ الزَّوجِ عِندَهَا، عَقِبَ الزِّفَافِ ئەندازەی مافی شەو مانەوە لەلای بووك، كچ بێ یان بێوەژن

٩٢٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضی الله عنه) قَـالَ: إِذَا تَـزَوَّجَ الْبِكْـرَ عَلَـى الثَّيِّـبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا. قَالَ خَالِدٌ: وَلَوْ قُلْتُ إِنَّهُ رَفَعَهُ لَصَدَقْتُ، وَلَكِنَّهُ قَالَ: السُّنَّةُ كَذَلِكَ. {الحديث: ٣٦١١ = ٣٦٠٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧٧ = ٥٢١٣، ٥٢١٣. أبو داود: نكـاح: ٢١٢٤. ترمـذی. نكـاح: ١١٣٩. ابـن ماجة. نكاح: ١٩١٦. تحفة الأشراف/٩٤٤} : [٩٢٥]

ئەنەسی کوڕی مالیـك (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: سـوننەت وایـە ئەگەر پیاو کچی هێنـا بەسـەر بێـوەژن، حـەوت شـەو لـەلای بـێ، ئەوسا بەسـەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بـەڵام ئەگـەر بێـوەژنی هێنـا بەسـەر کـچ، سـێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ. خالید فەرمووی: ئەگەر بمەوێ ڕستەی (ئەنەس فەرمووی سـوننەت وایـە ئەگـەر پیـاو کچی هێنـا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ، سێ شەو لەلای بـێ، ئینجـا بـەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ) بە مەعناو واتا ڕیوایەت بکەم، لـەباتی ئـەوەی کە بڵێم ئەنەس فەرمووی: (سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نـۆرە شـەویان وەك یـەك بـۆ دابنـێ، بـەڵام

---

[٩٢٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٧٧ - ٥٢١٣ بخاری. مختصر صحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٨٤٠ - ٣٦١١ شـیحا، (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٠١).

ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ، سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ) دەڵێم: ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر فەرمووی: (ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ، سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ).

چونکە ئەم دوو رستەیە یەك واتایان هەیە: چ بڵێی سوننەت وایە، چ بڵێی پێغەمبەر فەرمووی:، یەك شتە، کەواتە: گوتنی یەکێکیان، لەجێگەی ئەوی تریان، گێڕانەوە بەواتایە!!. {تاج/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٢١٧٧}.

## (١٣) باب القَسْمُ بَيْنَ الزَّوْجَاتِ وَبيان أنَّ السُّنَةَ أنْ تَكُونَ لِكُلِ واحِدَةٍ لَيلَةٌ مَعَ يَومِها

## نۆرە شەوانە (قەسم) لە نێوانی هاوسەراندا، وا پەسەندە هەر ژنەی شەوێك و ڕۆژەکەی بۆ دابنرێ

٩٢٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كُنْتُ أغَارُ عَلَى اللاَّتِى وَهَبْنَ أنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَقُولُ: وَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا؟! فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (تُرْجِى مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِى إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ). قَالَتْ: قُلْتُ: وَاللَّهِ مَا أرَى رَبَّكَ إلاَّ يُسَارِعُ لَكَ فِى هَوَاكَ. {الحديث: ٣٦١٦، ٣٦١٧ = ٣٦١٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٨٠ = ٤٧٨٨، ٤٧٨٧، ٥١١٣. نسائى. نكاح: ٣١٩٩ تحفة الأشراف: ١٦٧٩٩}: [٩٢٦]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕقو قیزم لەو ژنانە دەبۆوە کە دەچوون خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەمگوت:

---

[٩٢٦] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٨٠ - ٤٧٨٨ بخاری، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢١ - ٣٦١٦ شیحا، (بخاری/٦٥ رقم الباب/٣٢).

خۆ نافرمت دیاریو دەسەنەو شمەك نییە، چۆن خۆی دەبەخشیٚ؟! کاتیٚ ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە: {تُرْجِي مَن تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاء وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ – أحزاب/ ٣٣/ ٥١}.

واتە: لەگەڵ ئەوەدا کەمن ئەم ژنانەم بۆ حەڵاڵ کردووی، وە ئێستا حەڵاڵو هاوسەرتن، تۆ خۆت سەرپشك بە، بە ئارەزووی خۆت لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەو، کامیان دوا دەخەیو درەنگ دەچیت بۆلای، گوناهت لەسەر نییە، وە کامیان بانگ دەکەیت بۆلای خۆتو لە نۆرە نووستنی شەوانەدا پێشی دەخەی بە ئارەزووی خۆتە، وە ئەو ژنەی کە کەنارت لیٚ گرتووە، وە لێی دوورکەوتوویتەوە، ئەگەر سەر لەنویٚ ئاشتی کەیتەوە گوناهت ناگات).

عائیشە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: (کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، کە ئەوەی بۆی دابین کردبوو، کە بەکەیفی خۆی، شەوانە لەلای هاوسەرەکانی بمێنێتەوە، نەوەك بەپێی قەسمو نۆرە شەوی خۆیان، کاتیٚ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە گوتم بە پێغەمبەر: وادەزانم، بەزەینم، خودا بە کەیفی دڵی تۆ دەجووڵێتەوەو بیٚ دڵیت ناکاو، زوو زوو هەوەسو ئارەزووت جیٚبەجیٚ دەکات!). {بڕوانە: ئەم ژمارانە لە سوورەتی ئەحزاب، بەرگی چوارەم، لە (تاج الأصول في أحاديث الرسول) بە کوردی چاپی چوارەم، زنجیرە: ١٦، لاپەڕە: ٤١٦، ژمارە: ٤٠٤٨، ٤٠٤١، ٤٠٤٣، ٤٠٤٥، ٤٠٤٦، ٤٠٤٧، ٤٠٤٩، ٤٠٥٠، ٤٠٥٤ + تجريد/٤، لاپەڕە: ٤٧٣، ژمارە: ١٦٨١، ١٦٨٢، ١٦٨٣}.

## (١٤) باب جوَاز هِبَتِهَا نَوْبَتِهَا لِضَرَّتِهَا
## دروسته ژن نۆرەشەوی خۆی ببەخشێ بە هەوێی خۆی

٩٢٧- عَنْ عَطَاءٌ قَالَ: حَضَرْنَا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) جَنَازَةَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِ(سَرِفَ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هَذِهِ زَوْجُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَإِذَا رَفَعْتُمْ نَعْشَهَا فَلاَ تُزَعْزِعُوا وَلاَ تُزَلْزِلُوا وَارْفُقُوا، فَإِنَّهُ كَانَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تِسْعٌ، فَكَانَ يَقْسِمُ لِثَمَانٍ وَلاَ يَقْسِمُ لِوَاحِدَةٍ. قَالَ عَطَاءٌ: الَّتِي لاَ يَقْسِمُ لَهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ. {الحديث: ٣٦١٨ = ٣٦١٤ فم. بخاري. نكاح: ٥٠٦٧. نسائي. نكاح: ٣١٩٦. تحفة الأشراف: ٣٦١٧} : [٩٢٧]

عەتاء فەرمووی: لەگەڵ ئیبنو عەبباسا، ئامادەی سەر تەرمی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر بووین، کە پووری ئیبنو عەبباس بوو، خوشکی دایکی بوو، کە لەسەریف مردبوو، ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەمە تەرمی هاوسەری پێغەمبەرە، قەدری بزانن، کاتێ تەرمەکەی هەڵ دەگرن بەهێواشی هەڵی بگرنو لەقە لەقو جووڵە جووڵی پێ مەکەن، بەهێمنی بیبەن بۆسەر گۆڕستان، ئیبنو عەبباس فەرمووشی: پێغەمبەر نۆ ژنی هەبوو، بەڵام نۆرە شەوی بۆ هەشتیان دانابوو، بۆ یەکێکیان نۆرە شەوی بۆ دانەنابوو. عەطا فەرمووی: ئەو ژنەی کە نۆرە شەوی بۆ دانەنابوو صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب بوو.

---

[٩٢٧] بخاری. نکاح: ٥٠٦٧، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٢ = ٣٦١٨ شیحا، (بخاری رقم الکتاب/٦٧ رقم الباب/٤).

## (١٥) باب إستحباب نِكاحِ ذَاتِ الدِين
## مارەكردنی ژنی دیندار گەلێ پەسەندو شیرینە

٩٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ». {الحديث: ٣٦٢٠ = ٣٦١٦ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٥٠ = ٥٩٠. نسائى. نكاح: ٣١٩٦. تحفة الأشراف: ٥٩١٤} : [٩٢٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (واباوە لەناو خەڵکا، کە ژن، لەبەر ئەم چوارشتە مارە دەکرێو دەخوازرێ: لەبەرئەوە کە ماڵی هەیە، یا لەبەرئەوە کە خانەدانە، یا لەبەرئەوە کەجوانە، یا لەبەرئەوە کە بە ئایینەو بەدینە. جا ئەی ژنخوازی هۆشمەند! تۆ ئافرەتی ئاییندارى بەدین بهێنەو لەکیس خۆتی مەدە، تا دەستە شکێن نەبیت!!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٠}.

بۆئەوەی بەراورد لەنێوان گێڕانەوەی شێخی بوخاریو شێخی موسلیمدا بکەین، دەقی گێڕانەوەی ژمارە (١٧٥٠)ی تەجریدی بوخاریش لێرەدا ڕاگوێز دەکەین:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ.(الحديث ٥٠٩٠):

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (واباوە لەناو خەڵکا، کەژن لەبەر ئەم چوار شتە مارە

---

[٩٢٨] تجريد/٤، ژمارە: ١٧٥٠ = ٥٩٠٠ بخارى مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٩٨ = ٣٦٢٠ شیحا، (بخارى رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٥).

دەگرێ‌و دەخوازرێ: لەبەر ئەوە کەماڵی هەیە، یالە بەر ئەوە کە خانەدانە، یالەبەر ئەوە کەجوانە، یالەبەر ئەوە کە بەئایینەو بەدینەو دیندارە، جائەی ژنخوازی هۆشمەند! تۆ ئافرەتی ئاینداری بەدین بهێنەو لەکیس خۆتی مەدە، هەتا دەستە شکێن نەبیت!). (تاج/٣ ل/٥٤ ز/٢٤ ژ/١).

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ ژنیش هەروا، وەئەم چوار شتە، بەپێی ئەم فەرمودەیە، سوننە تە هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ژن ڕەچاوبکرێن. بەنموونە: ژنێ کوڕێکی دەوڵەمەندی خانەدانی بەدین‌و کوڕێکی هەژاری بەدین داوای بکەن، واباشە شوو بکا بە کوڕە دەوڵەمەندە بەدینەکەیان. مەبەست هەر ئەم چوار شتە نییە، بەڵکوو هەموو شتێکی باش، هاندەرێکە بۆ ژنهێنان‌و شووکردن، بەلأم سەر گولەکەیان دینە.

## (١٦) باب إستحباب نكاح البكر
## کچ هێنان پەسەندە

٩٢٩- عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) يَقُولُ تَزَوَّجْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «مَا تَزَوَّجْتَ» . فَقُلْتُ تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا. فَقَالَ: «مَا لَكَ وَلِلْعَذَارَى وَلِعَابِهَا». فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرِو بْنِ دِينَارٍ فَقَالَ عَمْرٌو سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «هَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ»: (٩٢٩)

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: ژنم هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (چیت

(٩٢٩) بخاری. نکاح: ٥٠٨٠ مسلم: ٣٦٢٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٧ رقم الباب/١٠).

هێناوە؟) گوتم: بێوەژن! فەرمووی: (ئـەی بۆچـی کـچت نـەهێناوە، تێـر نـاودەمی یەکتری بمژن!؟)

موحاریب (کە یەکێکە لەپیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە) گوتی: ئەمـەم گێڕایەوە بۆ عـەمری کـوڕی دینـار، عـەمر فـەرمووی: بیـستم لـە جـابیری کـوڕی عەبدوڵلا دەیفەرموو: پێغەمبەر فەرمووی پێم: «هَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ».

٩٣٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما): أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ وَتَـرَكَ تِـسْعَ بَنَاتٍ أَوْ قَالَ: سَبْعَ بَنَاتٍ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّبًا، فَقَالَ لِى رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): « يَا جَابِرُ تَزَوَّجْتَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: « فَبِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ؟ ». قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّـبٌ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ، قَـالَ: « فَهَـلاَّ جَارِيَـةً تُلاَعِبُهَـا وَتُلاَعِبُـكَ، أَوْ قَـالَ: تُـضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ اللَّـهِ هَلَـكَ وَتَـرَكَ تِـسْعَ بَنَـاتٍ، وَإِنِّـى كَرِهْـتُ أَنْ آتِيَهُنَّ، أَوْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَجِـىءَ بِـامْرَأَةٍ تَقُـومُ عَلَـيْهِنَّ وَتُـصْلِحُهُنَّ. قَـالَ: فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْ قَـالَ لِـى خَيْـرًا». {الحديث: ٣٦٢١ = ٣٦١٧ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ٩٥١ = ٢٠٩٧، ٢٨٦١، ٤٠٥٢، ٢٤٠٦، ٢٣٠٩، ٢٧١٨، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٥، ٥٢٤٩، ٥٢٤٧، ٥٣٦٧}: [٩٣٠]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لـێ بـێ) دەفـەرموێ: عەبـدوڵلای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهیدبوو، کە کوژرا نۆ، یا فەرمووی: حەوت خوشـکی سەرو قنگی منالگاری بەسەردا بەجێهێشتم، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنـا. جـا لـە غەزایـەکا، لەخزمـەتی پێغەمبـەردا بـووم، فـەرمووی پـێم: (ئـەی جـابیر! ژنـت هێنـاوە؟) عـەرزیم کـرد: بـەڵێ، فـەرمووی: (چـیت هێنـاوە: کـچ یـا بێـوەژن؟!) عەرزیم کرد: نەء، کچم نـەهێناوە، بێـوەژنێکم هێنـاوە، ئـەی پێغەمبـەری خـودا!

[٩٣٠] تجريد/٣، ژمارە: ٩٥١ = ٢٠٩٧ بخاری مختصر صحيح مـسلم/٢، ژمـارە: ٧٩٩ - ٣٦٢١ تـرقيم شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٩ رقم الباب/١٢).

فەرمووی: (ئەی بۆچی کچت نەهێنا، پێکەوە گەمەو دەستبازی بکەن) یا فەرمووی: (پێکەوە بەزمو پێکەنین سازبدەن؟) منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی کە عەبدوڵلای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، کەمرد نۆ کچ یا حەوت کچی بەسەردا بەجێهێشتم، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا کە کارامەبێ، ماڵو مێردی دیبێ، وەك خۆیان کوڵیو دەسەوسان نەبێ، هەتا بتوانێ سەرپەرشتییان بکا!!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راو بۆچوونەکەمی پەسەندکرد، لەبەرئەوە نزای باشی بۆم کردو فەرمووی: (دەی خودا لێتی پیرۆز بفەرموێ) یا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قسەی خێری بۆم کرد. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٣ + تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، لاپەڕە: ٧٠١، ژمارە: ٣٤٨٠، ٣٤٨١ + زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٣٤٨٢ + ژمارە: ٨٤٧ کە لەدواوە دێ}.

٩٣١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى غَزَاةٍ، فَلَمَّا أَقْبَلْنَا، تَعَجَّلْتُ عَلَى بَعِيرٍ لِى قَطُوفٍ فَلَحِقَنِى رَاكِبٌ خَلْفِى فَنَخَسَ بَعِيرِى بِعَنَزَةٍ كَانَتْ مَعَهُ، فَانْطَلَقَ بَعِيرِى كَأَجْوَدِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ الإِبِلِ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « مَا يُعْجِلُكَ يَا جَابِرُ »؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ، فَقَالَ: « أَبِكْرًا تَزَوَّجْتَهَا أَمْ ثَيِّبًا »؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّب، قَالَ: « فَهَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ ؟». قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ فَقَالَ: « أَمْهِلُوا حَتَّى نَدْخُلَ لَيْلاً، كَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ »، قَالَ: وَقَالَ: « إِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ ». {الحديث: ٣٦٢٥ = ٣٦٢١ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٨٥ = ٥٢٤٦، ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠،

٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨٧.

أبو داود. جهاد: ٢٧٧٨}:[٩٣١]

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خودایـان لــێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ لەخزمەت پێغەمبەردا چووین بۆ غەزایێ، کاتێ گەڕاینەوە، من وشترێکی سستم لـەژێردا بـوو، پەلـەم لێ دەکـرد، لەپـشتمەوە وشـتر سـوارێکم پـێ گەیـشت، بەنەقیزەکەی ژەنـدی لـە وشترەکەی ژێـرمن، ئـیتر وشترەکەم خێرایـەکی وای لێ دەرچوو چۆنت دەوێ ئاوا، کە ئاوڕم دایەوە سوارەکە پێغەمبـەر بـوو، فـەرمووی: (ئەوە بۆ وا پەلە پەل دەکەی ئەی جابیر!). گوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! تـازە زاوامو تـازە ژنم هێنـاوە، فـەرمووی: (ئایـا کـچت هێنـاوە یـا بێـوەژن؟) گـوتم: بێوەژنێکم هێناوە،، فەرمووی: (ئـەی بۆچی کـچێکت نـەهێناوە، پێکـەوە گەمـەو دەستبازی بکەن؟).

جـابیر فـەرمووی: کاتــێ گەیـشتینە نـاو مەدینـە ویـستمان بـچینەوە بـۆ ماڵـەوەمان، بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کاتــێ لەســەفەر دەگەڕێنــەوە ئەگــەر بەشــەو دەگەیـشتنەجێ، وابکـەن کـە لەپێـشدا ئاگاداریـان بکەنـەوە، هـەتا ژن قـژە ئاڵۆسـکاوەکەی خـۆی شـانە بکـاو دەرمـانی گەرماو بەکاربهێنێ بۆ لابردنی مووی زیـادەی لەشی، کـە لەبـەر دووری لـەمێرد پشتگوێی خستووە).

جابیر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (ئەی جابیر! کە گەیشتیتە ماڵەوە ژیرو وریابەو مەبەستت پێکەوە نانی ماڵو منالْو

---

[٩٣١] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٥ = ٥٢٤٦ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٧ = ٣٦٢٥ تـرقیم الـشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری – ١٣٢/٦٧).

خێزانی ڕەحمەت بێ، نەوەك خۆشی كاتیو بەس!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٦٢، ٢١٦٣، ٢١٦٤، ٢١٦٥ + ژمارە: ٧٩٩ لە پوختەی موسلیم}.

٩٣٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزَاةٍ فَأَبْطَأَ بِي جَمَلِي وَأَعْيَا فَأَتَى عَلَيَّ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ جَابِرٌ. فَقُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (مَا شَأْنُكَ قُلْتُ أَبْطَأَ عَلَيَّ جَمَلِي وَأَعْيَا فَتَخَلَّفْتُ فَنَزَلَ يَحْجُنُهُ بِمِحْجَنِهِ) ثُمَّ قَالَ: (ارْكَبْ) فَرَكِبْتُ فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَكُفُّهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَزَوَّجْتَ) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟) قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا قَالَ: (أَفَلا جَارِيَةً تُلاعِبُهَا وَتُلاعِبُكَ) قُلْتُ: إِنَّ لِي أَخَوَاتٍ فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ امْرَأَةً تَجْمَعُهُنَّ وَتَمْشُطُهُنَّ وَتَقُومُ عَلَيْهِنَّ قَالَ: (أَمَّا إِنَّكَ قَادِمٌ فَإِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ) ثُمَّ قَالَ: (أَتَبِيعُ جَمَلَكَ؟) قُلْتُ: نَعَمْ، فَاشْتَرَاهُ مِنِّي بِأُوقِيَّةٍ ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلِي وَقَدِمْتُ بِالْغَدَاةِ فَجِئْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ قَالَ: (أَالآنَ قَدِمْتَ؟) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (فَدَعْ جَمَلَكَ فَادْخُلْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ) فَدَخَلْتُ فَصَلَّيْتُ فَأَمَرَ بِلالاً أَنْ يَزِنَ لِي أُوقِيَّةً فَوَزَنَ لِي بِلالٌ فَأَرْجَحَ لِي فِي الْمِيزَانِ فَانْطَلَقْتُ حَتَّى وَلَّيْتُ فَقَالَ: (ادْعُ لِي جَابِرًا) قُلْتُ: الآنَ يَرُدُّ عَلَيَّ الْجَمَلَ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْهُ قَالَ: (خُذْ جَمَلَكَ وَلَكَ ثَمَنُهُ) (الحديث ٢٠٩٧): [٩٣٢]

جابیری كوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: لەغەزایەكا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، وشترەكەم لەژێرما وەستاو لەسوپاكە بەجێ مام، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوای سوپاكەوە بوو، تەشریفی هاتو منی گرتەوەو فەرمووی: (جابیر) عەرزم كرد: بەڵێ فەرمووی: (ئەوە چیتە وا جێماوی؟) گوتم: وشترەكەم پەكی كەوتووەو وەستاوە، لەبەر ئەوە بەجێماوم، جا

---

[٩٣٢] تجرید/٣، ژمارە: ٩٥١ - ٢٠٩٧ بخاری مسلم/محمد فؤاد/٧١٥ = ٣٦٢٦ شیحا (بخاری - ٣٤/٣٤).

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەوڵاخەکەی خۆی دابەزیو بەگۆچانەکەی خۆی چەند گۆچانێکی دا لەوشترەکەی من، ئەوجا فەرمووی: (سواربە) منیش سواربوومەوە سەرنجم دا وشترەکە واخێرا بوو، ناچاربووم کە جڵەوی بگرمەوە مەبادا پێش وشترەکەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بکەوێ، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی جابیر! ژنت هێنا؟) گوتم: بەڵێ، فەرمووی: (چیت هێناوە، کچ یا بێوەژن؟) عەرزیم کرد: نەء، بێوەژنێکم هێناوە، فەرمووی: (ئەی بۆچی کچێکت نەهێنا، پێکەوە یاریو دەسبازی بکەن؟!).

گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی کە عەبدوڵڵای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، (بڕ: تاج/٥/١٨٢ف ٢ز ٥١ - تاج/٣، ژمارە: ٣٤٨٢، ج/٤) باوکم کەمرد حەوت خوشك، یا هەشت خوشکی سەروقنگی مناڵکاری بەسەردا بەجێی هێشتم، لەبەر ئەوە بێوەژنێکم هێنا کەکارامە بێ،ماڵو مێردی دیبێ وەك خۆیان کوڵیو دەسەوسان نەبێ، هەتا سەرپەرشتیان بکاو کۆمەڵیان کۆبکاتەوەو، نەهێڵێ سەریان لێ بشێوێو سەریان شانە بکاو سەرەوکاریان بکا..

جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نزای باشی بۆم کردو فەرمووی: (ئەوا دەڕۆیتەوە، کەچویتەوە هۆشیاربە هۆشیار! نەکەی بەهۆی دوورییەوە، بۆسەرجێیی، جڵەوی هۆش لەدەست بدەی!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا وشترەکەت دەفرۆشیت؟!) گوتم: بەڵێ، جا بەئۆقیەیەك کەدەکاتە چل درەمی زیو لێی کڕیم. ئەنجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەپێش منەوە گەیشتە ماڵەوە، منیش بۆ سبەینێ گەیشتمەجێو ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، تەماشام کرد

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەبەردرگای مزگەوت بوو، فەرمووی: (ئێستاکە گەیشتیتەجێ؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دە وشترەکەت بەردەو بچۆرە ناو مزگەوتو دوو رکات نوێژی سوننەتی گەڕانەوە لەسەفەر لەناو مزگەوتدا بکە) منیش چوومە ژوورەوەو نوێژەکەم کرد. ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بەبیلال کرد ئۆقیەیێ زیوی لەباتی وشترەکەم بۆم کێشاو لەکێشانەکەیشا سلاّوی دایەوەو قورس کێشای. منیش پارەکەم وەرگرتو رۆیشتم، تاپشتم هەڵکرد لەوان بەرەو ماڵ کەوتمەڕێ، کەچی گوێم لێی بوو فەرمووی: (ئادەی جابیرم بۆ بانگ بکەرەوە!) منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئای! ئێستا وشترەکەم دەداتەوە بەسەردا وەلەدڵەوە لەوەم پێ ناخۆشتر نەبوو کە وشترەکەم بداتەوە بەسەردا، کەچی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وشترەکەت بەرەوە بۆ خۆتو پارەکەیشی هەر بۆ خۆت) (تاج/٢/٥٥ف ـعز- ٢٥).

## (١٨) باب الوَصِيَّةُ بالنِساء
## ئامۆژگاری خێر سەبارەت بە ژنان

٩٣٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا ، وَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ»: [٩٣٣]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژن وەك پەراسووی چەوت وایە، ئەگەر بتەوێ راستی بکەیتەوە دەیشکێنی، وە ئەگەر بتەوێ لەگەڵی رابوێری‌و خۆشی‌و چێژی

---

[٩٣٣] بخاری. نكاح فی (٦٧) باب (٧٩) مسلم: ٢٦٢٩ ترقیم شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/٧٩).

لێ وەربگری، ئەوا وەك سروشتی خۆی بەلاری‌و خواری لەگەڵیدا رابوێرەو خۆشی لێ وەربگرە).

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٧٧٢) تەجریدی بوخارییە، کە ئەم فەرموودەیە بەتەواوی رووندەکاتەوە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِي جَارَهُ. (الحديث ٥١٨٥ – أطرافه في: ٦٠١٨، ٦١٣٨، ٦٣٣٦، ٦٤٧٥). و اسْتَوْصُوا بالنِّسَاءِ خَيْراً فإنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلْعٍ وإنَّ اعوجَ شيءٍ في الضِلع أَعْلاهُ فإنْ ذَهَبْتَ تُقِمُهُ كَسَرْتَهُ، وَ إنْ تَرَكْتَهُ لم يزل أعوَجَ فَاسْتَوْصَوْا بالنساءِ خيراً). (الحديث ٥١٨٦– طرفاه في : ٣٣٣١، ٥١٨٤):

ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ باوەڕی تەواوی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەبێ، نابێ ئازاری دراوسێی خۆی بدا، ئامۆژگاری بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان، چونکە ژنان، لەبنەڕەتەوە، لەپەراسووی باوە ئادەم دروست کراون، چونکە دایە حەوا لەپەراسووی چەپی باوە حەوا (واتە: باوە ئادەم) دروست کراوە، لەلارترین شوێنی پەراسوو کەنووکە کەیەتی دروست کراوە، واتە : بەسروشت بەچەوتی‌و بەلاری و خواری دروست کراون، جائەگەر بتەوێ راستی بکەیتەوە راست نابێتەوە، بەلاّم دەشکێ، ئەگەر دەستیشی لێ نەدەی ئەوا بەلاری دەمێنێتەوە، هەرچۆنێ بێ بوونی لەنەبوونی باشترە، کەوابوو، با ڕاسپێری‌و وەسێت بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان) لەگێڕانەوەیەکی تاجول ئوصول دا دەفەرموێ: (ژن لەپەراسوو دروست کراوەو چەوتییەکەی بەشێکە لەسروشتی‌و تێکلاّوی خوێن‌و بیرو هۆشی بووە، جا لەبەر ئەوە تاسەر لەسەر یەك بار نامێنێ و زوو زوو دەگۆڕێ و بەسروشت حول حولی یەو لەمەدا تاڕادەیێ بیانووی هەیە، جالەسەر

ئەم بنیاتەئەگەر دەتەوێ لەگەڵیا ڕابوێری، ئەوا دەبێ بەپێ ی سروشتەکەی بەلاریو خواری ڕابوێری لەگەڵی دا، ئەگینائەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە، ئەوسا لەگەڵی ڕابوێری، ئەوە بەتۆ ڕاست نابێتەوە، بەڵکو لەدەستتا دەشکێ، شکاندنەکەیشی بریتیە لەبەرەلاّ کردنیو تەلاّق دانی، ئەومیش بەپێچەوانەی مەبەستە). (تاج/٣ ز/٤٧ ل/١١٦ ژ/١ = تاج/٢، ژمارە: ٢١٥٨، ج/٤ - ش/تیرمیزی) + (ریاض/١ ل/٢٣٦ ز/٣٤ ژ/٢٧٣).

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لەم جۆرە فەرموودانە تانەو تەشەر نییە لەژن، وەك هەندێ مرۆڤی گێلۆکە وایێ ی تێ دەگەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە مەبەست ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی جەستەییو دەروونی ژنە، بەپێ ی سروشتی خوداییی، هەتا تەکلیفی مالایطاقی لێ نەکرێو، ئەرکێکی نەخرێتە سەر شان، کەلەتوانای دا نەبێ، کاری خودایش بێ دانایی نییە، دیارە کەئافرەتی لەسەر ئەو شێوە کەچو خوارە دروست کردووە، سوودی خۆیو سوودی پیاویشی واتیادا، نابینی خودی پەراسوو چەماوەو لارە، ئەگەر ڕاستو ڕەوان بوایە وەك دووخ، ڕۆڵی خۆی نەدەبینی، قەفەزەی سینگ دروست نەدەبوو، کەشوورایەکی قاییمە بۆ هەموو ئەندامە هەناوییەکانی مرۆڤ وەك دڵو جەرگو سییو گورچیلەو ڕیخۆڵەو سپڵ.

٩٣٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ اَلْآخِرِ فَلَا يُؤْذِي جَارَهُ ، وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا ، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي اَلضِّلَعِ أَعْلَاهُ ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمَهُ كَسَرْتَهُ ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَلِمُسْلِمٍ: {فَإِنْ اِسْتَمْتَعْتَ بِهَا اِسْتَمْتَعْتَ وَبِهَا عِوَجٌ ، وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا،

وَكَسْرُهَا طَلَاقُهَا}. {تجريدى بوخارى/٥، ژماره: ١٧٧٢ = ٥١٨٥، ٦٠١٨، ٦٣٣٦، ٦١٣٨، ٦٤٧٥، ٥١٨٦، ٣٣٣١، ٥١٨٤ بوخارى. مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٨٤٤ = شيحا ٣٦٣٢ = مسلم/١٤٦٨}: [٩٣٤]

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (هەركەسێ بەڕاستى باوەڕى بەخوداو بەڕۆژى دوايى هەيە، كە ئامادەى سەركارێ بوو، با يا قسەى خێر بكا، يا بێ دەنگ بێ، كە گوێ نيت، دڕكيش مەبە، كە قسەى خێر نازانى، قسەى شەڕيش مەكە – زيادەى پوختەى موسليم) وە هەركەسێ بەڕاستى باوەڕى بەخوداو بەڕۆژى دوايى هەيە با ئازارى دراوسێى خۆى نەدا، ئامۆژگارى بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان، چونكە ژنان لەبنەڕەتەوە، لەپەراسووى باوە ئادەم (واتە: باوە حەوا) دروست كراون، چونكە دايە حەوا لەبنەڕەتەوە لەپەراسووى چەپى باوە حەوا (واتە: باوە ئادەم) دروست كراوە، لە لارترين شوێنى پەراسوو، كە نووكەكەيەتى دروست كراوە، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستى بكەيتەوە ڕاست نابێتەوە بەڵكوو دەشكێ ئەگەر دەستيشى لێ نەدەى ئەوا پەراسووەكە بەلارى دەمێنێتەوەو سووديشى لێ وەردەگيرێ، كەوابوو ڕاسپێرى بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان!. {تاج/٢، زنجيرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٥٨ ج/٤ + رياض/١، زنجيرە: ٢٤، ژمارە: ٢٧٣}.

لەگێڕانەوەيەكى ترى صەحيحى موسليمدا، كەبەپێى ژمارەبۆدانانى مامۆستا شێخ خەليل مەئموون شيحا، ژمارە: (٣٦٣١)ە، ئاوايە:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژن لەپەراسوو دروست كراوەو چەوتييەكەى

---

[٩٣٤] تجريد/٥، ژمارە: ١٧٧٢ - ٥١٨٥ بخارى پوختەى موسليم/٢، ژمارە: ٨٤٤ - ٣٦٣٢ + شرحى بلوغ المرام/٢، ژمارە: ١٠٤٤ (بخارى – ٨٠/٦٧).

بەشێکە لەسروشتیو تێکلاوی خوێنو بیرو هۆشی بووە، جا لەبەر ئەوە هەتا سەر لەسەر یەك بار نامێنیێو زوو زوو دەگۆڕێو بەسروشت حول حولیەو لەمەدا هەتا ڕادەیێ مەهانەی هەیە، جا لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر دەتەوێ لەگەڵیا ڕابوێرێ، ئەوا دەبێ بەپێی سروشتەکەی بەلاریو خواری ڕابوێرێ لەگەڵیدا، ئەگینا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە، ئەوسا لەگەڵیدا ژابوێری، ئەوە بەتۆ ڕاست نابێتەوە، بەڵکوو لەدەستتا دەشکێ، شکاندەکەیشی بریتییە لەبەرەڵا کردنیو تەڵاق دانی، ئەویش بەپێچەوانەوەی مەبەستە!).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لەم جۆرە فەرموودانە، تانەو تەشەر نییە لە ڕەگەزی مێو سووکایەتی نییە بەژن لەکۆمەڵگادا، وەك هەندێ مرۆڤی گێلۆکە وا لێی تێ دەگەن، یا هەندی لەپێکوڕەکانی صهیونیەتو صەلیبییەت دەیکەن بەمەهانەو بۆنە بۆهێرش بردنە سەر ئایینی ئیسلام. بەڵکوو بەپێچەوانەوە مەبەست ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی جەستەییو دەروونی ڕەگەزی مێیە، بەپێی سروشتی خودایی، هەتا تەکلیفی مالایطاقو کاری نەکردەنی لێ داوانەکرێو، ئەرکێکی نەخرێتە سەرشان، کە لەتواناىدا نەبێ، کاری خودایش بێ دانایی نییە، دیارە کە ژنانی لەسەر ئەو شێوە کەچو لارو خوارە دروست کردووە، سوودی خۆیو سوودی پیاویشو سوودی کۆمەڵیشی واتیادا، نابینی کەخودی پەراسوو چەماوەو لارەو، ئەگەر راستو ڕەوان بوایە وەك دووخ، ڕۆڵی خۆی نەدەبینیو لەنازو بەهرەوە دەبوو بە ژارو ژەهر، چونکە قەفەزەی سینگ دروست نەدەبوو، کە سەندووقێکی پارێزەرو قەڵایەکی قاییمە بۆ هەموو ئەندامە هەناوییەکانی

مرۆڤ بگره بۆ زۆر له ئەندامەکانی تریش، وەك دڵو جەرگو سیىو گورچیلەو سپڵو زراوو ریخۆڵه!

وەك راستییەکی لەبەرچاویش، ئیسلام لەڕووی رەوشتی بەرزو رێنماییە باشەکانی کۆمەڵایەتییەوە، له ئایینەکانی تر پتر، گرنگی بەڕەگەزی مێ داوە، قەدرو ریزی زۆریان بۆ دادەنێ، پایەو پلەی هەرە بەرزی کۆمەڵایەتی بۆیان داناوە. بەڕادەیێ ئەگەر بێتوو کۆمەڵێ ئافرەتی رۆشنبیری رەوشت بەرزی داوێنپاکی داناو زانای بەویژدان، لەهەموو نەتەوەکان کۆببنەوە، وە مافەکانی ژن دیاری بکەن، هیچ مافێ لەو مافانەی که لەقورئانو سوننەتی صەحیحدا بۆ ژن چەسپاوە، یا هەر ئەرکێ لە قورئانو سوننەتدا لەسەر ژن دانراوە، هیچ مافێ لەو مافانەو هیچ ئەرکێ لەو ئەرکانە ئاپەخو ناپەسەند ناکەن!

وەك راستییەکی ئاشکرای لەبەرچاویش، ئیسلام لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، له ئایینەکانی تر، پتر گرنگی بە رەگەزی مێ داوە، ئەوەی کە ئەمرۆ لەبەرچاوە لەبەرەڵایی ژنو لەرووتو قووتی ژنو لەدڕینی پەردەی شەرمو شکۆ لەناو ژنانی رۆژئاواداو لەزۆرینەی وڵاتە ناموسوڵمانەکاندا، ئەوە بەپێی رێنماییەکانی ئایینی خۆیان نییە، هیچ ئایینێ ئەگەر بتپەرستیش بێ ئەوە قەبووڵ ناکا، بۆ نموونە هەتا بزانین کە مەسیحییەت چی داوا دەکا لە ئافرەتان، دەڵێین: ئەوەی کە راهیباتە مەسیحییەکان، لە دیرەکانیاندا ئەنجامی دەدەن، باڵا پۆشی تەواو ئەنجام دەدەنو دوورە پارێزدەبن لەپیاوی نامەحرەمو پابەند دەبن بە رەوشتی بەرزو خۆ دەپارێزن لەڕوانینی نادروستو کۆدەکەنەوە لەداوێنپیسیو خەریکی خواپەرستیو بەندەیی کردنو دووعاو نزاو پاڕانەوەنو سەرقاڵی کاری چاکەن، ئەوە پەیامی مەسیحییەتە بۆ رەگەزی مێ، بەتایبەتی ئەوە فەرمانو پەیامی نامەی پیرۆزی جوولەکەو گاورەکانە، بۆ ژنانی ئەم دوو ئایینە!

چونکه بەپێی تەوراتو ئینجیلیش داوێنپیس دەکوژرێ، رووتوقووتیو بەرەڵلایی رەگەزی قەدەغەیە.

بەڵام ئێستا لایەنە دژە ئیسلامەکان، واپیشانی خەڵکی دەدەنو، وا دەیخەنە مێشکی لاوەکانی ئێمەوە، کە ئەمەی ناویان ناوە سەربەستی ئافرەت لەڕۆژئاوا، لەپیتو فەڕی ئایینەکەیانەوەیە، وەهۆی دواکەوتنی ژنانی ئێمەیش ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

**جا کورتو پوختو بەکوردی پەتی، ئەمە راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، لەئایینی پیرۆزی ئیسلاما:**

**ژن گوڵە بۆ دڵ، نەک تۆپی پێیە**

**تاڕێزی بگری، پتر بەجێیە**

**مەردیو سەربەستیو حەیا، ئەم سێیە**

**تاجی سەرسەری رەگەزی مێیە**

**پیاوی خراپیش رشکو ئەسپێیە**

**کەی ئەوە مێردە؟ لەجێی هەوێیە**

٩٣٥- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَوْلا بَنُو اسْرَائِيلَ لَمْ يَخْنَزِ اللَّحْمُ، وَلَوْلا حَوَّاءُ لَمْ تَخُنَّ انْثَى زَوْجَهَا) (الحديث ٣٣٣٠):[٩٣٥]

---

[٩٣٥] تجريد/٤، ژمارە: ١٣٣٨ = ٣٣٣٠ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٦ - ٣٦٣٦ شيحا - ١٤٧٠ محمد فؤاد. (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/١).

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر لەبنەڕەتا بەهۆی جولەکەکانەوە نەبوایە ، هەرگیز خواردەمەنی نەدەگەنی و گۆشت بۆگەن نەدەبوو، چونکە لەکاتی خۆیا خودا گەزۆو گۆشتی شەلاقەی بۆ ناردن و فەرموویێ لەم گۆشت و گەزۆیە بخۆن، بەلاَم لێیان پاشەکەوت مەکەن ، کەچی ئەوان فەرمانەکەی خودایان شکان و لێیان هەلگرتن بۆ لەوەو پاش، ئیتر گۆشت وگەزۆکە گەنین ،وە لەوەوە گەنین وترشانی خۆراك داکەوت، وهەتا ئەمڕۆ هەروایەو لەمەو پاشیش ئەم حاڵەتە بەردەوام دەبێ، وەئەگەر بەهۆی دایکە حەوایشەوە نەبوایە هەتا هەتایە هیچ ژنێ گزیو ناپاکی لەمێردی خۆی نەدەکرد ، چونکە حەوا لەبەهەشتا ئادەمی فریو داو لەبەری درەختە قەدەغەکراوەکەی دەرخوارد داو، بوو بەهۆی ئەوەی کەلەبەهەشت دەرکران —ش) (تاج/٣ ل/١١٧ ز/٤٧ = ژمارە: ٢١٦ - مافی ژن لەسەر مێردی).

## پوختەی بڕیارەکانی شیرخواردن

١- شیرخواردنو مەمکخواردن یەك شتن.

٢- ئایین — لەباتی شیرو مەمکخواردندا — کاریگەری نیە، کەواتە: ئەگەر منالێ شیری ژنێکی مەسیحی بخوات، دەبێ بەکوڕی شیری ئەو ژنە یا بەپێچەوانەوە.

٣- شیری قوتو ئەگەر هی ژن نەبێ کاریگەری نییە.

٤- هەروا ژنی شیرەخۆرەکە دەبێ بەبووکی شیری باوكو دایكو باپیرو نەنکە شیرییەکانی!!

## ١٨- كِتَابُ الطَّلَاقِ
## نامەی ژن تەڵاقدان

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی دوو، لاپەڕە/٥٦٠ چاپی چوارەم زنجیرە: ٦٣ لە ژمارە: ٢٢٢٧ هەتا ژمارە: ٢٢٤٢ + تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری بەکوردی، بەرگی پێنجەم لاپەڕە/٥٧، زنجیرە: ٧١ لە ژمارە: ١٧٨٦وە هەتا ١٧٩٠ + مختصر صحیحی موسلیم، بەرگی دووەم لە ژمارە: ٨٤٨وە هەتا ٨٥٦ + فیقهی ئاسان بەرگی دووەم زنجیرە: ٢٧٤ – باسی ژن تەڵاقدان هەتا زنجیرە: ٢٨٥} + {شەرحی بلوغ المرام/٢، لە زنجیرە (٦٦)ەوە هەتا زنجیرە (٦٧) لەژمارە (١٠٩٨) هەتا ژمارە: (١١٢٠)}.

### (١) باب تحريم طلاق الحائض بغير رِضاهَا وَأنَهُ لَوْ خَالَفَ وَقَعَ الطَّلَاقُ وَيؤمَرُ بِرَجْعَتِهَا

### ئەگەر کەسێ ژنەکەی بێنوێژ بێ، بەبێ ڕەزامەندی ژنەکە لەو بێنوێژییەدا تەڵاقی بدا، ئەوە کارێ نا دروستی کردووە، بەڵام تەڵاقەکەی دەکەوێ، وە فەرمانی پێ دەکرێ، کە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆی!

٩٣٦- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ

يَمَسَّ فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّـهُ أَنْ تُطَلَّـقَ لَهَـا النِّسَاءُ.(الحـديث ٥٢٥١ أطرافـه في: ٤٩٠٨، ٥٢٥٢، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٢، ٥٣٣٣، ٧١٦٠): [٩٣٦]

ئیبنوعومـەر (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: بەسـەرینی پێغەمـەر — دروودی خودای لەسەر- ژنێکم لەبێنوێژی دابوو تەلاقم دا، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆئـەم مەسـەلەیە لەخۆشەویـست دەپرسـێ —دروودی خـودای لەسـەر- خۆشەویـست —دروودی خـودای لەسـەر- دەفـەرموێ: (پێـی بڵـێ: بـا ژنەكـەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕكێفی خۆی، ئەوسا بیهێڵێتـەوە لـەلای خـۆی تـا لەبێنوێـژی پاك دەبێتەوە و جارێكی تر دەكەوێتەوە سەر بێنوێژی و دیسان پـاك دەبێتـەوە، ئـیتر لـەوە دوا ئەگـەر ئارەزوودەكـا بـا بـەجوانی ڕای بگـرێ لای خـۆیو ژنـی خۆیـەتی، وەكـی تـریش ئەگـەر ئـارەزووش دەكـا بەرلـەوەی كـە بـچێتە لای، بـا تەلاقی بدا. ئەمـە كـەژن لەپاكییـەكا تـەلاق بـدرێ، كـە مێردەكـەی لەوپاكییـەدا نەچووبێتەلای ئـەو حەیـەو عیددەیەیـە كـەخودا لـە قورئانـا فـەرمانی كـردووە كەژنی تیادا تەلاق بدرێ، كە دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْـصُوا الْعِـدَّةَ وَاتَّقُـوا اللَّـهَ رَبَّكُـمْ (٦٥/١) سـورة الطـلاق﴾ واتـە: ئـەی پێغەمەری خۆشەویست: بە موسوڵمانان بفەرموو: هـەركاتی ویـستتان ژن تـەلاق بدەن بالە كاتێكـدا تـەلاقیان بـدەن كـەماوەی عیددەیـە، كـەكاتی پـاكی ژنانـە لـە بێنوێژی و زەیستانی، وە ژمارەی ڕۆژو كـاتی عیددەكـەیان ڕابگـرن، وە بـەردەوام لـەخودا بترسـن). (بـڕ: تـاج/٣ ل/١٥٧ ز/٦٤ ژ/١+٢ = تـاج/٢، ژمـارە: ٢٢٣٢ - س/د/ن).

---

[٩٣٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٦ = ٥٢٥١ بخاری. مختصر صحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٨٤٨ - ٣٦٤١ شـیحا (بخاری — ٦٨ - ١).

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا ژمارە (٨٤٨ = ٣٩٤١ ترقیم شیحا) بۆ بەراوردو زیادە سوودو بەهرە راگوێزی دەکەین، هەتا بەرەبەرە خوێنەری ئازیز هەست بەجیاوازی نێوانی گێرانەوەکان بکات:

عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنهما) طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَمَرَهُ أَنْ يَرْجِعَهَا ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ. فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ يَقُولُ: أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا وَاحِدَةً أَوِ اثْنَتَيْنِ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَمَرَهُ أَنْ يَرْجِعَهَا ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، وَأَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا ثَلاَثًا فَقَدْ عَصَيْتَ رَبَّكَ فِيمَا أَمَرَكَ بِهِ مِنْ طَلاَقِ امْرَأَتِكَ. وَبَانَتْ مِنْكَ. {الحديث: ٣٦٤١ = ٣٦٣٧ فم. تجريد/٥، زنجيرة: ٧١، رقم: ١٧٨٦ = ٥٢٥١، ٥٢٥٢، ٤٩٠٨، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٢، ٥٣٣٣، ٧١٦٠. نسائي. طلاق: ٣٥٥٩}:

نافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێکم لە بێنوێژیدا بوو یەك تەڵاقمدا، سەردەمی پێغەمبەر بوو، جا عومەری باوکم (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ ئەم مەسەلەیە لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەپرسێ، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێی بڵێ باژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی، ئەوسا بیهێڵێتەوە لەلای خۆی تا لە بێنوێژییەکەی پاك دەبێتەوەو جارێکی تر دەکەوێتەوە سەر بێنوێژیو دیسان پاك دەبێتەوە، ئیتر ئەگەر ئارەزوو دەکا بابەجوانی رای بگرێ لای خۆیو ژنی خۆیەتی، ئەگەر ئارەزووش دەکا، بەرلەوەی لەوماوەیەدا بچێتە لای لەپاکی دووەما تەڵاقی بدا، ئەمە کەژن

لە پاکییەکا تەڵاق بدرێ کە مێردەکەی لەو پاکییەدا نەچووبێتە لای، ئەو حەیەو عیددەیەیە کە خودا لە قورئانا فەرمانی کردووە کە ژنی تیادا تەڵاق بدرێ، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ - سورة الطلاق/ ٦٥/١}. واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بە موسوڵمانان بفەرموو: هەرکاتێ ویستتان ژن تەڵاق بدەن، با لەکاتێکدا تەڵاقیان بدەن، کە ماوەی عیددەیە، کەکاتی پاکی ژنانە لە بێنوێژیو زەیستانی، وە ژمارەی رۆژو کاتی عیددەکەیان رابگرن، وە بەردەوام لە خودای خۆتان بترسنو پارێز لەسەرپێچی لە فەرمانەکانی بکەن).

دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، کاتێ پرسیاری لێ دەکرا، لەبارەی پیاوێکەوە کە ژنەکەی خۆی لە بێنوێژیدا تەڵاق داوە، دەیفەرموو: (ئەگەر تۆ ژنەکەتت یەك جار، یا دووجار تەڵاق داوە، ئەوە من خۆم شتی وام بەسەر هاتووەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردووم، کە ژنە لەبێنوێژیدا تەڵاق دراوەکەم بگێڕمەوە بۆ ژێر رکێفی خۆمو ئەوسا مۆڵەتی بدەم تا لەو بێنوێژییەی پاك دەبێتەوەو دیسان دەکەوێتەوە بێنوێژییەکی ترەوەو دیسان لەویش پاك دەبێتەوە، پاش ئەم ماوەیە پێش ئەوەی کە لەم ماوەیەدا بچمەلای، ئەگەر بمەوێ تەڵاقی بدەم، جائەگەر تۆیش یەك تەڵاق، یا دوو تەڵاقی ژنەکەتت لە بێنوێژیدا داوە، ئەوە ئەم فەرمانەی پێغەمبەر بەجێ بهێنەو وەك من بکە، خۆ ئەگەر سێ بەسێ لە بێنوێژیدا تەڵاقت داوە، ئەوە بەراستی بێ فەرمانی پەروەردگاری خۆتت کردووە، سەبارەت بە چۆنێتی تەڵاقدانی ژنەکەتو لەهەمان کاتا ژنەکەشت سێبەسێ تەڵاقی کەوتووە بەیەکجاری لێت جیابووەتەوە.

٩٣٧- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَكَثْتُ عِشْرِينَ سَنَةً يُحَدِّثُنِي مَنْ لاَ أَتَّهِمُ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا وَهْيَ حَائِضٌ فَأُمِرَ أَنْ يُرَاجِعَهَا، فَجَعَلْتُ لاَ أَتَّهِمُهُمْ وَلاَ أَعْرِفُ الْحَدِيثَ، حَتَّى لَقِيتُ أَبَا غَلاَّبٍ يُونُسَ بْنَ جُبَيْرٍ الْبَاهِلِيَّ. وَكَانَ ذَا ثَبَتٍ فَحَدَّثَنِي أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ فَحَدَّثَهُ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ تَطْلِيقَةً وَهْيَ حَائِضٌ فَأُمِرَ أَنْ يَرْجِعَهَا، قَالَ: قُلْتُ: أَفَحُسِبَتْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: فَمَهْ أَوَإِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ؟! {الحديث: ٣٦٤٦ = ٣٦٤٢ فم}: [٩٣٧]

ئیبنو سیرین (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بیست ساڵی رێك مامەوە، کەسانێ کە جێگەی باوەڕم بوون‌و گومانم لە بارەیانەوە نەبوو، قسەیان بۆم دەکرد: کە ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە بێنوێژیدا، ژنەکەی خۆی سێ بەسێ تەڵاق داوەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێی کردووە کە بیگێڕێتەوە بۆلای خۆی، گەرچی لەم ماوەیەدا گومانم بۆ پەیدا نەبوو لە راست‌و دروستیی قسەکەی ئەوان، بەڵام لەوە سەرسام بووم، کە چۆن چۆنی، لەپاش تەڵاقی سێ بەسێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ئیبنو عومەر کردووە کە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر هاوسەریی خۆی؟ سەرم لەم قسەیە دەرنەدەچوو، هەتا رۆژێ گەیشتم بە ئەبو غەللاب، واتە: بە یونسی کوڕی جوبەیری ئەلباهیلی، کە پیاوێکی راست‌و رەوان‌و متمانە پێکراو بوو، ئەو قسەی دۆغری لەم بارەیەوە بۆم کرد، فەرمووی: من لەم لایەنەوە پرسیارم لە ئیبنو عومەر خۆی کرد، فەرمووی پێم: کە یەك تەڵاقی ژنەکەمم لە بێنوێژیدا دابوو، نەوەك سێ تەڵاق، بۆیە پێغەمبەر فەرمانی پێم کرد بە گێڕانەوەی. ئەبو غەللاب فەرمووی: عەرزی ئیبنو عومەرم کرد: ئایا

[٩٣٧] بخاری. طلاق: ٥٢٥٢ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٩ - ٣٦٤٦ (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٤٥).

ئەو تەلاقەی کە لە بێنوێژییەکەدا ئەنجامت دا، دانرا بە تەلاقێ لەسەرت؟ فەرمووی: ئەی چۆن دانانرێ بە تەلاقێ؟ هەر لەبەرئەوەی کەمن خۆم ئەو هەڵەیەم کردو نەمتوانی لەسەر شێوەی شەرعی ژنەکەم تەلاق بدەمو ئەو بێ ئەقڵیەم کرد دانەنرێ لەسەرم بە تەلاقێ، شتی وانییە، بەڵکوو دانرا بە تەلاقێ لەسەرم.

## روونکردنەوە:

ئیبنو سیرین ناوی موحەممەدی کوڕی سیرینی ئەنصارییە، تابیعییە، ناسراوە بە خەوپەرژێنکار، پیشەوای ڕۆژگاری خۆی بووە، گێرانەوەی زۆری هەیە، لەزۆر لە هاوەڵانەوە، پیاوێکی متمانەو راستگۆ بوو، زۆر بە ومرع و بەتەقوا بوو، لە تەمەنی حەفتاو حەوتساڵیدا لە بەصرە مردووە.

## (٣) باب وجوب الكفارةِ عَلَى مَنْ حَرَّمَ إمْرَأتَهُ وَلَمْ يَنْوِ الطَّلاَقَ
## کەفارەت دەکەوێتە سەر کەسێ کە ژنەکەی خۆی لەخۆی نادروست (حەرام) بکا، بەڵام بەمەرجێ نیازی تەلاقی نەبووبێت

٩٣٨- عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ فِي الْحَرَامِ يُكَفِّرُ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ إِسْوَةٌ حَسَنَةٌ ): [(٩٣٨)]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر پیاو ژنی خۆی لەخۆی حەرام بکا، وەك ئەوە پێی بڵێ: (أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ: تۆ لەمن حەرامی) ئەوە لەلای ئیبنو عەبباس، نە دائەنرێ بە تەلاق، نە دائەنرێ بەزیهار، نە دائەنرێ

---

[(٩٣٨)] بخاری. تفسیر: ٤٩١١ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٢ - ٣٦٦٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/١).

به ئیلاء، بەڵكوو دائەنرێ بە سوێندی ئاسایی‌و كەفارەتی سوێندی لەسەرەو بەس، دیارە ئیبنو عەبباس، بەڵگەی لەسەر ئەم راو بۆچوونەی خۆی كرداری پێغەمبەرە، كە لەئایەتی {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ}مدا دیاریكراوە، بۆیە فەرمووی: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ - ٣٣/ ئەحزاب/ ئایەتی: ٢١}. واتە: لەڕاستیدا، پێغەمبەری خودا، رابەرو سەرمەشقێكی جوانە بۆ ئێوە، شایانی ئەوەیە كە لەهەموو كارێكا، كە مەودای پەیڕەوی واتیادا، ئێوە بیكەن بە سەرمەشق‌و چاوی لێ بكەن‌و، هەنگاو بەهەنگاوو بست بەبست شوێنی بكەون!). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٢٢٤٩}.

ئەو سوێندەی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردوویەتی‌و ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: كە دەبێ لەو جۆرە سوێندخواردنەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بكرێ بە پێشەواو سەرمەشق، لە فەرموودەی ژمارە (٨٥٣ و ٨٥٤)ی پوختەی موسلیمدا روونكراوەتەوە، كەبریتین لەژمارە (٩٣٩ و ٩٤٠)ی ئێرە، كەوان لەدوا ئەم ژمارەوە، یەكسەر دێن.

٩٣٩- عن عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، قَالَتْ: فَتَوَاطَأْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ، أَنَّ أَيَّتَنَا مَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ: « بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَلَنْ أَعُودَ لَهُ ». فَنَزَلَ: (لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ) إِلَى قَوْلِهِ تعالى: (إِنْ تَتُوبَا) - لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ -، (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) لِقَوْلِهِ: « بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً ». {الحديث: ٣٦٦٣ = ٣٦٥٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٧٠٩ =

٤٩١٢، ٥٢١٦، ٥٢٦٧، ٥٢٦٨، ٥٤٣١، ٥٥٩٩، ٥٦١٤، ٥٦٨٢، ٦٦٩١، ٦٩٧٢. أبو داود. أشربة: ٣٧١٤. نسائي. طلاق: ٣٤٢١}: [٩٣٩]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: گەلێ جار کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی زەینەبی کچی جەحش، کە هاوسەری بوو، دەمایەوە، شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، جا منو حەفصەی کچی عومەر، کە ئەویش وەك ئێمە هاوسەری پێغەمبەر بوو، قسەمان کرد بەیەكو بڕیارماندا کە فێڵە ژنانەیەکی لێ بکەینو گوتمان: هەرکامێکمان لەپێشدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای با پێی بڵێت: من بێنی گیای مەغافیرت لێ دەکەم، دیارە کە شیلەی مەغافیرت خواردووە، کە شیلەی دارێکە بە عەرەبی پێی دەڵێن (عورفوط) کە تامێکی شیرینو بۆنێکی ناخۆشی هەیە، زۆرجار هەنگ شیلەکەی دەمژێ، دواییش کە تەشریفی هات بۆلای ئەویتریشمان ئەویش هەروای پێ بڵێ.

جا کاتێ ئەم قسەیەمان عەرزی پێغەمبەر کرد، وایزانی کە بەڕاست وادەڵێین، بۆیە فەرمووی: (نەخەیر، مەغافیرم نەخواردووە، بەڵام لەلای زەینەبی کچی جەحشی خێزانم شەربەتی هەنگوینم خواردووە، سوێندم خواردووە ئیتر نایخۆمەوە، ئەم قسەیەی من بەکەس مەڵێ). جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی تەحریم دابەزین:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ∴ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ∴ وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ

---

[٩٣٩] تجريد/٤، ژمارە: ١٧٠٩ = ٤٩١٢ بخاری مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٣ = ٣٦٦٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٨).

وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ ۞ إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ. تحريم/٦٦- ١-٤).

**پوختەی مەبەست لەم ئایەتانە :**

(ئەی پێغەمبەر! شتێ کەخودا بۆ تۆ ڕەوای دیوە، لەخۆتەوە لەخۆتی حەرام مەکە، لەبەر خاتری دڵی هەندێ لە هاوسەرەکانت، خودا کەفارەتی سوێندی بۆ داناون، کەفارەتی سوێندەکەت بدەو حەڵاڵی خودا لەخۆت حەرام مەکە، ئەو گفتوگۆو نهێنییەی کە لەنێوانی تۆو هەندێ لە هاوسەرەکانتا، لەم بارەیەوە ڕوویداو، هەندێ لەو گیروگرفتانەی کە ئەوان دروستیان کرد، کارێکی ناشایستە بوو، خودا تۆی لێی ئاگادار کردەوە، ئەی عائیشەو حەفسە! تەوبە بکەن لەخزمەت خوادا، چونکە ئێوە لەدڵەوە حەزتان لەشتێ بوو کە پێغەمبەری خودا حەزی لەوشتە نەبوو، کە حەرامکردنی هەنگوین بوو، ئەو نهێنییەی کە پێغەمبەر لەلای هەندێ لە ژنەکانی درکاندی، کە ئایەتی: (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) ئاماژەی بۆدەکا، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر بوو کە فەرمووی: (نەخەیر، مەغافیرم نەخواردووە، بەڵام لەلای زەینەبی خێزانم شەربەتی هەنگوینم خواردووە، سوێندم خواردووە ئیتر نایخۆمەوە، ئەم قسەیەی من بەکەس مەڵێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٤١٧٨ ج/٤} + {بۆ زیادە ڕوونکردنەوە، فەرموو بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی، بەرگی پێنجەم، ژمارە/١٧٩٠ = ٥٢٦٨ + تەجرید/١٧٠٩ = ٤٩١٢ بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ٥٠٨}.

٩٤٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى الْعَصْرَ دَارَ عَلَى نِسَائِهِ فَيَدْنُو مِنْهُنَّ،

فَدَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَاحْتَبَسَ عِنْدَهَا أَكْثَرَ مِمَّا كَانَ يَحْتَبِسُ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ فَقِيلَ لِي: أَهْدَتْ لَهَا امْرَأَةٌ مِنْ قَوْمِهَا عُكَّةً مِنْ عَسَلٍ، فَسَقَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْهُ شَرْبَةً. فَقُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَنَحْتَالَنَّ لَهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِسَوْدَةَ، وَقُلْتُ: إِذَا دَخَلَ عَلَيْكِ، فَإِنَّهُ سَيَدْنُو مِنْكِ فَقُولِي لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟. فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: لاَ، فَقُولِي لَهُ: مَا هَذِهِ الرِّيحُ؟ - وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَشْتَدُّ عَلَيْهِ أَنْ يُوجَدَ مِنْهُ الرِّيحُ - فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ، فَقُولِي لَهُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ وَسَأَقُولُ ذَلِكَ لَهُ، وَقُولِيهِ أَنْتِ يَا صَفِيَّةُ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى سَوْدَةَ قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ: وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَقَدْ كِدْتُ أَنْ أُبَادِئَهُ بِالَّذِي قُلْتِ لِي وَإِنَّهُ لَعَلَى الْبَابِ فَرَقًا مِنْكِ، فَلَمَّا دَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، قَالَ: « لاَ ». قَالَتْ: فَمَا هَذِهِ الرِّيحُ؟ قَالَ: « سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ »، قَالَتْ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ. فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيَّ، قُلْتُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى صَفِيَّةَ، فَقَالَتْ بِمِثْلِ ذَلِكَ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ أَسْقِيكَ مِنْهُ؟ قَالَ: « لاَ حَاجَةَ لِي بِهِ »، قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ حَرَمْنَاهُ، قَالَتْ: قُلْتُ لَهَا: اسْكُتِي. {الحديث: ٣٦٦٤ = ٣٦٦٠ فم. أبو داود. أشربة: ٣٧١٥. ترمذي. أطعمة: ١٨٣١. تحفة الأشراف: ١٦٧٩٦} : [٩٤٠]

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لە حەڵواو هەنگوین بوو، گەلێ جار لەپاش کردنی نوێژی عەصر دەچوو بۆلای هاوسەرەکانی، یەکە یەکە هەواڵی دەپرسینو سڵاوی لێ دەکردن، ئەوجا دەچوو بۆلای یەکێکیانو لەلای وچانێکی دەگرتو خۆی لێ نزیك دەکردەوە، ماچو مۆچو شتی وای لەگەڵدا دەکرد، بەڵام بەبێ جووتبوونو

---

[٩٤٠] بخاری. أطعمة: ٥٤٣١ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٤ = ٣٦٦٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٨ رقم الباب/٨).

دروستبوون لەگەڵی. جا جارێ چووە هۆدەکەی حەفسەی هاوسەری، کە کچی عومەری کوڕی خەتاب بوو، زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا لەلای گلی خواردەوە، منیش دەماری هەوێباری گرتمی، کەپرسیم هۆی ئەم زیادە مانەوەی پێغەمبەر لەلای حەپسە چییە، پێیان گوتم: ژنێکی خزمی دووبەرەیێ هەنگوینی بەدیاری بۆ هێناوە، ئەویش شەربەتی لێ دروست دەکاو دەیدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو هۆیەوە کەمێ لەلای دەمێنێتەوە، منیش گوتم: بەخودا دەبێ فێلێکی وای لێ بکەین کەوازبێنێ لەم مانەوەی لای حەپسەیە.

جا بەسەودەی کچی زەمعەم گوت: شتێکی واهەیە، ئەمجارە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلات پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆنی مەغافیرت لێ دێ، دەڵێی مەغافیرت خواردووە؟ ئەویش پێت دەفەرموێ: (نا، مەغافیرم نەخواردووە!) تۆیش پێی بڵێ: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کەلێت دێ؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر پێی زەحمەتە کە بۆنی ناخۆشی لێ بێت، لەبەرئەوە پێت دەڵێ: (ئەوە حەپسە شەربەتی هەنگوینی داوەپێم). تۆیش پێی بڵێ: ئای ئەوە هەنگەکەی جەویی درەختی عورفوتی هەڵمژیوە، کەپێی دەگوترێ مەغافیر، کاتێ هاتیش بۆلای من، منیش هەمان شتی پێ دەڵێم، وە تۆیش ئەی صەفییە! کاتێ لەسەرەی خۆتا پێغەمبەر هات بۆلات، هەمان قسەو پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵ بکە. سەودە (کە یەکەم ژنی پێغەمبەر بوو، لەپاش مردنی خەدیجەی یەکەم هاوسەری) فەرمووی: بەو خوایەی کەهەر خۆی خوایە، لەترسی تۆ ئەی عائیشە! هەرکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، ویستم یەکسەر

قسەکەی تۆ پێت گوتم پێی بڵێم، بەلام کە هاتە ژوورەوەو هاتە پێشەوەو لێم نزیکبۆوە گوتم پێی: ئەی پێغەمبەری خودا! مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کەلێت دێ؟ فەرمووی: (حەفسەی خێزانم شەربەتی هەنگوینی دەرخوارد داوم). گوتم: دیارە کە هەنگەکەی مەغافیری هەڵمژیوەو کردوویەتی بە هەنگوین، کە شیلەی دارێکی دڕکاوییە حوشتر دەیخوات، بە عەرەبی پێی دەگوترێ: عورفوط (رەنگە بەکوردی بەو درەختە بگوترێ: مارگرە).

عائیشە فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەی خۆما هات بۆلام، منیش هەروام پێگوت، کاتێ لەسەرەی سەفییەشدا دەچێ بۆلای، سەفییەش هەروای پێ دەڵێ، کاتێ لەسەرەی حەفصەدا دەچێ بۆلای، حەفصە پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! با شەربەتێکی هەنگوینت بۆ بکەم. دەفەرموێ: (کارم پێی نییە). عائیشە فەرمووی: جا سەودە بەمنی گوت: سبحان الله! کارێکی باشمان نەکرد، هەنگوینمان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغە کردو لێمان حەرام کرد، منیش پێیم گوت: وسبە، با فێڵەکەمان ئاشکرا نەبێ!!

## (٤) باب بَيانِ أنَّ تَخْييرَ إمْرَأتِهِ لايَكُونُ طَلَاقًا إلاَّ بالنِيَّةِ

## مێرد ژنی خۆی بکا بە سەرپشکو خاتر خۆی بکا، ئەگەر دەیەوێ خۆی تەلاق بدا، بە شتی وا تەلاقی ناکەوێ، بە مەرجێ نیازی تەلاقدانی نەبێت

٩٤١- عن عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ لَمَّا أُمِرَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – بِتَخْيِيرِ أَزْوَاجِهِ بَدَأَ بِى فَقَالَ « إِنِّى ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا فَلاَ عَلَيْكِ أَنْ لاَ تَعْجَلِى حَتَّى تَسْتَأْمِرِى أَبَوَيْكِ » . قَالَتْ وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَىَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِى بِفِرَاقِهِ ، قَالَتْ ثُمَّ قَالَ « إِنَّ اللَّهَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ قَالَ ( يَا أَيُّهَا النَّبِىُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا

وَزِينَتَهَا ) إِلَى ( أَجْرًا عَظِيمًا ) » . قَالَتْ فَقُلْتُ فَفِي أَيِّ هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ ، قَالَتْ ثُمَّ فَعَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – مِثْلَ مَا فَعَلْتُ». رواه الشيخان والترمذى[٩٤١]

عائیشه (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ خودا فەرمانی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە هاوسەرەکانی خۆی بکا بە سەرپشك (یا بە ژنێتی حەزرەت ڕازی بن، بە تەمای ڕەزای خوداو شادبوون بە پایەی گەورەی ڕۆژی دوایی، یا ئەگەر حەزیان لە ڕابواردنی ژیانی دنیایە ئەوا پێغەمبەر تەڵاقیان بدا) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پێش پێشدا لە منەوە دەستی کرد بە ڕاگەیاندنی ئەم فەرمانی خودایە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێکت بۆ باس دەکەم، حەزناکەم کە پەلە پەلی تیا بکەی، بڕیاری لەسەر مەدە هەتا پرسو ڕا بە دایكو باوکت نەکەی! عائیشە گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی دەیزانی کە دایكو باوکم حەز بە شتی وا ناکەنو ڕازی نابن کە من لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جیاببمەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە (وەسپو سەناخوانیی ئەو لە زیادیو زۆری بێ) بە من دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ.........﴾ واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو بە هاوسەرەکانت، ئەگەر حەزتان وا لە سەرخۆشیو ڕابواردنی ئەم جیهانە بێ بەقایە، ئەوا شتی وا لەلای من دەست ناکەوێ کەواتە بفەرموون، وەرن هەتا لەسەر شێوەیەکی جوان، بەبێ دڵ ئێشانو ناخۆشی هەقی شەرعی خۆتان بدەمێو تەڵاقتان بدەم هەتا بڕۆن بە ڕێی خۆتانەوە، ئەگەر ئەوەشتان ناوێو حەزتان لەوەیە کە بە ژنێتیو

---

[٩٤١] بخاری. تفسیر: ٤٧٨٥، ٤٧٨٦ مسلم: ٣٦٦٥، ٣٦٧٤ شیحا. تاج/٤، زنجیرە: ١٦ سورة الأحزاب ژمارە: ٤٠٤٦ چاپی چوارەم (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣٣).

حەلاڵو هاوسەری حەزرەت ڕازی بنو بیکەن بەهۆی ڕەزای خوداو پێغەمبەرو بە مایەی بەشی باشی خانەی دوایی، ئەوە کارێکی زۆر جوانە، لەبەر ئەوە خودای گەورە بڕیاری داوە بۆ ئێوە کە هەمووتان ئافرەتی خاسو باشو چاکەکەرو خێرخوازن پاداشتێکی گەورەی واتان بداتێ کە دونیاو چی تیادایە لە چاوی ئەوەدا بە هیچ دەچێ، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتەکەی خوێندەوەو لە مەبەستەکە حاڵی بووم، عەرزیم کرد: بۆ ئەمە پرسو ڕا بە دایكو باوکم بکەم! شتی وا پرسی پێ ناوێ چونکە من خواستم لەسەر ڕەزای خوداو ڕەزای پێغەمبەرەو لەوەیشە مەبەستم پایەی بەرزی ماڵی دوایییە، عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی ئیتر لە پاش منەوە خێزانەکانی تری پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو چاویان لە من کردو من چیم کردبوو ئەوانیش وەك من کردیانو هەمان وەڵامیان دایەوە بە پێغەمبەر (ش/ت ڕەزای خوایان لێ بێ).

٩٤٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): (انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَسْتَاذِنُ فِي يَوْمِ الْمَرْاةِ مِنَّا بَعْدَ انْ انْزِلَتْ هَذِهِ الايَةَ ﴿تُرْجِئُ مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي الَيْكَ مَنْ تَشَاء وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ فَقُلْتُ لَهَا: مَا كُنْتِ تَقُولِينَ؟ قَالَتْ؟ كُنْتُ اقُولُ لَهُ: انْ كَانَ ذاكَ الَيَ فَانِّي لاارِيدُ يَارَسُولَ اللّٰهِ انْ اوثِرَ عَلَيْكَ احَدًا). (الحديث ٤٧٨٩): [٩٤٢]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە : ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاء مِنْهُنَّ﴾ کە ئەوەی تێیدایە کە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) خۆی سەرپشکە وخاتر خۆیە، بۆشەو نوستن لەلای هەر کامێ لەژنەکانی

---

[٩٤٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٨١ = ٤٧٨٩ بخاری. مسلم: ١٤٧٦ = ٣٦٦٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٧/٣٣).

که خۆی بییەوێ، لە گەڵ ئەوەش دا هێشتا پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) بۆ ڕاگرتنی دڵی ئێمە، لەڕۆژی سەرەی خۆماندا، ئەگەر بی ویستایە بچێ بۆلای یەکێکی ترمان پرسی پێ دەکردین، وڕای وەردەگرتین، موعازە گوتی : بەعائیشەم گوت : ئەی لەحاڵەتی وەها دا تۆ دەتگوت چی؟ فەرمووی: منیش پێیم دەگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر شتەکە بەدەستی خۆم بێ، بەش و سەرەی خۆم لەخێر وپیت و فەڕی بوونم لەخزمەتی تۆدا بەکەسی تری نادەم ! (تاج/٧ ز/١٦ ل/٩٩ ژ/١٤ = تاج/٤، ژمارە: ٤٠٤٩ ج/٤ - ش ).

٩٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَاخْتَرْنَا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ، فَلَمْ يَعُدَّ ذَلِكَ عَلَيْنَا شَيْئًا: [٩٤٣]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەی هاوسەرانی کرد بە سەرپشك، کە یا بەهاوسەری پێغەمبەر ڕازی بین، یا لێی جیاببینەوە، ئێمەیش هاوسەریی پێغەمبەرمان هەڵبژاردو جیابوونەوەمان نەویست، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم سەرپشکییەی ئێمەی دانەنا بە تەلاق).

## (٥) باب في الإيلاءِ واعتِزالِ النساءِ وتخييرهنَّ وقولِهِ تعالى: ﴿وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ﴾

٩٤٤- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَنْ آيَةٍ فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجًّا، فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ فَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، عَدَلَ إِلَى الأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ، فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: وَاللَّهِ

---

[٩٤٣] بخاری. طلاق: ٥٢٦٢، مسلم/شیحا: ٣٦٧٢. (بخاری رقم الکتاب/٦٨ رقم الباب/٥).

إنْ كُنْتُ لأُرِيدُ أنْ أسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ، قَالَ: فَلاَ تَفْعَلْ مَا ظَنَنْتَ أنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَسَلْنِي عَنْهُ، فَإِنْ كُنْتُ أَعْلَمُهُ أَخْبَرْتُكَ. قَالَ: وَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ إنْ كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنِّسَاءِ أمْرًا، حَتَّى أنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِنَّ مَا أنْزَلَ، وَقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ، قَالَ: فَبَيْنَمَا أنَا فِي أمْرٍ أأْتَمِرُهُ. إذْ قَالَتْ لِي امْرَأَتِي لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا، فَقُلْتُ لَهَا: وَمَا لَكِ أنْتِ وَلِمَا هَا هُنَا؟ وَمَا تَكَلُّفُكِ فِي أمْرٍ أُرِيدُهُ؟ فَقَالَتْ لِي: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ مَا تُرِيدُ أنْ تُرَاجَعَ أنْتَ، وَإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ، قَالَ عُمَرُ: فَآخُذُ رِدَائِي، ثُمَّ أخْرُجُ مَكَانِي حَتَّى أدْخُلَ عَلَى حَفْصَةَ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا بُنَيَّةُ إنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ؟. فَقَالَتْ حَفْصَةُ: وَاللَّهِ إنَّا لَنُرَاجِعُهُ، فَقُلْتُ: تَعْلَمِينَ أنِّي أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللَّهِ وَغَضَبَ رَسُولِهِ، يَا بُنَيَّةُ! لاَ يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي قَدْ أعْجَبَهَا حُسْنُهَا، وَحُبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إيَّاهَا. ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى أدْخُلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِي مِنْهَا، فَكَلَّمْتُهَا فَقَالَتْ لِي أُمُّ سَلَمَةَ: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ قَدْ دَخَلْتَ فِي كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَبْتَغِي أنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأزْوَاجِهِ؟! قَالَ: فَأَخَذَتْنِي أخْذًا كَسَرَتْنِي عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أجِدُ، فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهَا، وَكَانَ لِي صَاحِبٌ مِنَ الأنْصَارِ إذَا غِبْتُ أتَانِي بِالْخَبَرِ، وَإِذَا غَابَ كُنْتُ أنَا آتِيهِ بِالْخَبَرِ، وَنَحْنُ حِينَئِذٍ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ غَسَّانَ، ذُكِرَ لَنَا أنَّهُ يُرِيدُ أنْ يَسِيرَ إلَيْنَا، فَقَدِ امْتَلأَتْ صُدُورُنَا مِنْهُ. فَأَتَى صَاحِبِي الأنْصَارِيُّ يَدُقُّ الْبَابَ. وَقَالَ: افْتَحِ افْتَحْ، فَقُلْتُ: جَاءَ الْغَسَّانِيُّ؟ قَالَ: أشَدُّ مِنْ ذَلِكَ، اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أزْوَاجَهُ. فَقُلْتُ: رَغِمَ أنْفُ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ، ثُمَّ آخُذُ ثَوْبِي فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ يُرْتَقَى إلَيْهَا بِعَجَلَةٍ وَغُلاَمٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ، فَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ، فَأُذِنَ لِي. قَالَ عُمَرُ: فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَذَا الْحَدِيثَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ حَدِيثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ

رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَإِنَّهُ لَعَلَى حَصِيرٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، وَتَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، وَإِنَّ عِنْدَ رِجْلَيْهِ قَرَظًا مَضْبُورًا وَعِنْدَ رَأْسِهِ أُهُبًا مُعَلَّقَةً، فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصِيرِ فِي جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكَ؟ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِيمَا هُمَا فِيهِ، وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمَا الدُّنْيَا وَلَكَ الآخِرَةُ ». {الحديث: ٣٦٧٦ = ٣٦٧٣ فم. تجريد/١، رقم: ٧٧ = ٨٩، ٢٤٦٨، ٤٩١٣، ٤٩١٤، ٤٩١٥، ٥١٩١، ٥٢١٨، ٥٨٤٣، ٧٢٥٦، ٧٢٦٢. تحفة الأشراف: ١٠٥١٢}:[٩٤٤]

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ماوەی ساڵێ چاوەڕێی هەل بووم، بۆئەوە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب بکەم، لەواتای ئایەتێ، بەڵام بۆم نەکراو لێم نەپرسی، چونکە ئەوەندە سامی هەبوو لەدڵما، هەتا چوو بۆ سەفەری حەجو منیش لەگەڵیا چووم بۆ حەج، کاتێ گەڕاینەوە لەڕێگە لای دار سیواکێکدا لایدا، بۆسەراو، منیش لەسەری وەستام هەتا لێ بوٙوە، جا لەگەڵیدا ڕۆیشتمو گوتم: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەو دوو ژنە کێ بوون کە لەناو ژنەکانی پێغەمبەردا گەلەکۆمە (تەظاهور)یان لە پێغەمبەر کردبوو (وەك خودا باسی ئەم باسە دەکا لەسەرەتای سوورەتی تەحریمەوە)؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە حەفصەی کچی منو عائیشەی کچی ئەبوبەکر بوون. منیش گوتم: بەخودا ساڵێکی ڕەبەقە دەمەوێ بۆ ئەمە پرسیارت لێ بکەم، بەڵام لەبەر سامی تۆ پرکێشیم نەدەکرد. فەرمووی: شتی وا مەکە، ئەگەر بەزەینی خۆت وات دەزانی کە شتێ هەیە کەمن دەیزانمو لەلای من هەیە، پرسیارم لێ بکە شەرم مەکە، ئەگەر بیزانم پێتی دەڵێم، لەپاشدا

---

[٩٤٤] تجريد/١، ژمارە: ٧٧ = ٨٩ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٧ = ٣٦٧٦ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٦٦).

عومەر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: بەخودا ئێمە لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلامدا ئافرەتمان بەهیچ دانەدەناو هیچ حەق‌و حیسابێکمان بۆ ژن نەدەکرد، هەتا خودا ئایەتی قورئانی لەبارەی ژنانەوە ناردە خوارەوەو بەش‌و بارەو مافی بۆ ژنان دیاریکرد. عومەر فەرمووی: ئەوا جارێکیان خەریکی کارێکی خۆمم‌و بیری لێ دەکەمەوە، لەوکاتەدا ژنەکەم پێی گوتم: بۆئاوا نایکەی! پێیم گوت: تۆ حەقت چییە؟ تۆ بۆخۆت لەکاری من هەڵدەقورتێنی؟ ئەویش گوتی پێم: ئەی عومەر! تۆ چەندە سەیریت! تۆ ناتەوێ کە کەسێ قسە لەقسەتا بکا کەچی کچەکەت رۆژ تائێوارێ دەمەدەمێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا مەکاو دەچێتەوە بەگژ دەمیا، رۆژی واهەیە بەم بۆنەیەوە تا ئێوارە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزویری‌و بەقارەوە دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: جا هەستام‌و پۆشاکەکەی سەرشانم هەلگرت‌و چووم بۆلای حەفصەو پێیم گوت: کچم! راستە کەتۆ دەچیتەوە بەگژ دەمی پێغەمبەرداو چەندو چۆنی لەگەڵدا دەکەیت‌و رۆژی واهەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا ئێوارێ بەزیزی‌و زویری دەمێنێتەوە؟ گوتی: ئەرێ بەخودا راست وایە ویڕە ویڕی لەگەڵ دەکەین!

منیش پێیم گوت: تۆ دەزانی کەمن تۆ دەترسێنم لە سزای خودا لەسەر زیزکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کچم! تۆ بەهۆی ئەو ژنەوە (واتە: بەهۆی عائیشەوە) لەخۆت بایی مەبە، ئەو بەجوانی خۆی دەنازێ‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی دەوێ، تۆ خۆت مەبەستە بەوەوە. لەپاشدا رۆیشتم، ئوممو سەلەمەیش خزمم بوو، چووم بۆ ماڵی ئەویش، ئەویش هاوسەری حەزرەت بوو، لەگەڵ ئەویشدا قسەم کرد لەم بارەیەوە، فەرمووی:

ئەی کوڕی خەتتاب! سەیرم لەتۆ دێ، لەهەموو شتێکدا هەڵ دەدەیتێ! تەنانەت ئەوەتا دەتەوێ لەنێوانی پێغەمبەرو ژنەکانیشیا خۆت تێ هەڵبقورتێنی!

عومەر فەرمووی: بەخودا بەڕاستی قسەکانی ئوممو سەلەمە وەها کاریان تێ کردم تۆزێ خاویانکردمەوە! ئینجا لەوێوە ڕۆیشتم هاوڕێیەکی ئەنصاریم هەبوو، منو ئەو بەسەرە دەچووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەواڵ زانینو دەنگوباسی سرووشو شتی وا، ئەگەر من نەچوومایە ئەو هەواڵو باسو خواسی بۆم دەهێنا، ئەگەر ئەویش نەچوایە من دەنگوباسم بۆی دەبرد، وە لەو سەردەمەدا مەترسیمان لەپاشایێ لەپاشاکانی غەسسان هەبوو، وامان بیستبوو کە ئەم پاشایە کەناوی (الحارث بن أبي شمّر) بوو، دەیەوێ بەسوپایەکی گەورەوە هێرش بێنێتە سەرمان، زۆر لێی دەترساین، پڕبەدڵ مەترسیمان لێی هەبوو، ڕۆژێ لەناکاو تەماشام کرد وا ئەو هاوڕێ ئەنصارییەم دەدا لەدەرگاو دەڵێ: بیکەرەوە! لەدڵی خۆما گوتم ببێو نەبێ شتێ قەوماوە پێیم گوت: وا پەرۆشی! دیارە کابرای غەسسانی هاتۆتە سەرمان! گوتی: بەڵکوو لەوە خراپتریش رووی داوە: پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) کەناری لە خێزانەکانی گرتووە!

منیش گوتم: هەی لووتی حەفصەو عائیشە بتەوسێتەوەو لووتیان بەقوڕاچێ، بۆ ئیشێ کردیان! جاجلەکانم هەلگرتو دەرچووم بۆ سۆراخی ئەم هەواڵەو چووم بۆلای پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) تەماشام کرد حەزرەت (درروودی خودای لەسەر بێ) وا لەناو باڵەخانەیەکا بە پەیژە بۆی سەردەکەوێ، خولامێکی رەشی پێغەمبەر هەبوو، ناوی رەباح بوو، لەسەر تەوقەسەری پەیژەکە بوو، مۆڵەتی بۆ هاتوان وەردەگرت، پێم گوت: رەباح! عەرزی حەزرەت بکە، بڵێ کە عومەری کوڕی خەتتاب دەیەوێ بێت بۆ

خزمـەتت. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕێگـەی پـێ دام، عومـەر فەرمووی: کەچوومە خزمەتی باسەکەم لە نووکەوە بۆ حەزرەت گێڕایەوە، هەتا گەیـشتمە سـەر قـسە ڕەقەکـەی ئوممـو سـەلەمە، کـە بـەمنی گـوت، حـەزرەت زەردەخەنەیەکی کرد. حەزرەت (دروودی خودای لەسـەر بێ) لەوکاتـەدا لەسـەر حەسیرێکی ڕووت بـوو، حەسـیرەکە هیـچی تـری بەسـەرەوە نـەبوو، سـەرینێکی بەرگ چەرمینی لەژێر سەردا بوو، ناواخنەکەی ریشاڵ (لیف)ی خورمـا بـوو، لـە پایینیـەوە هەنـدێ بـەرە دارشـیلان کـە کـەوڵی پـێ خۆشـە دەکـرێ هـەڵڕژا بـوو، کۆمەڵکرابوو، لەژوور سەریشیەوە بە بنمیچەکەوە چەن کەوڵێ هەڵواسرابوو، کـە تەماشایم کرد گرێی حەسیرەکە لاقە برغەی حەزرەتی دابڕیبوو، منیش دەسـتم کرد بەگریان. فەرمووی: ئەی عومەر! بۆچی دەگریـت؟ گوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! کیـسراو قەیـسەر، کـە یەکـەمیان شاهنـشاهی ئێرانـەو دووەمیـان پادشـای ڕوومـە، وان لـەو هـەموو نـازو خۆشـییەدا، کـە هـەموو کـەس دەیزانـێ، لەگـەڵ ئەوەشـا کـەبێ بـاوەڕن، کەچـی تـۆیش کـە پێغەمبـەری خـودای ئەمـە حاڵتـە کەدەبینین؟ فەرمووی: (ئەدی تۆ بەوە ڕازی نابی کە دونیا بۆ ئـەوان بـێو پاشـە ڕۆژیش بۆ خۆمان بێ!!). {تـاج/٤، زنجـیرە: ٤٩، ژمـارە: ٤١٨ — تـەفـسیر/ سـوورەتی تەحریم چاپی/٤}.

**کوردو کورت:**

لێرەدا وەك نموونەیەکی ڕاستو دروستو ڕاسـتەقینە، بـە ئیقتیبـاس لـەم ژیانە سەختو دیژوارەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) لـە نامیلکـەی (التركمانُ شَدُّ قُوَى العَرَبِ)ەوە، کە پوختەی ئەو ئەزموونە تاڵانەیـە، کـە لـەماوەی (٣٠) ساڵی نیشتەجێبوونم لە کەرکووك کۆم کردوونەتەوە، لەبارەی ئـەو هـەموو

ناهەقیو زوڵمو زۆرو ستەمەی کە نەتەوەکانی تری کەرکووك لەگەڵ دەوڵەتا لە کوردیان دەکرد، لێرەدا بەم بۆنەیەوە ئەم نموونەیەتان لەو نامیلکەوە بۆ راگوێز ەکەم، بەتایبەتی لەبەرئەوەی کە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەم راستەقینەیە:

(کە سەرۆکانی گەلو رابەرانی بزووتنەوەکان، هەتا ترسی خوایان هەبیو لەگەڵ ملەتی خۆیان بنو سەرقاڵی کۆکردنەوەی پرۆپیتی جیهان نەبنو لە پێناوی پەیامو مەبەستەکەیانا، بەرگەی هەموو ساردیو گەرمییەك بگرنو گووژاڵکیان لەدەما هەنگوین بێ، هەتا وابن براوەنو لەلای خواو بەندەی خوا پەسەندن، با دەربەدەرو ئاوارەو شەهیدیش بن، بەڵام هەرکاتێ سەریان کردە دنیا پەرستیو کۆشكو تەلارو پارەو دینارو دۆلارو بەزمو رەزم، ئیتر ئەوە سەرەتای رۆژی رەشی خۆیانو ملەتیانە، بەدیمەن بۆ گەل رابەرن، بەواتا بۆ دوژمن نۆکەرو نوێنەرن!

(... رێزدار مقدم/ محمد أطروشی، لەماڵی مامۆستا مەلا محمد ئەمین، لەتەپەی مەلا عەبدوڵا، لە کەرکووك گێڕایەوە:

(لەگەرمەی شۆڕشا، لە شەستەکانا، شۆڕشگێڕێکی مەزنی ئێرانی، دەیەوێ سەردانێکی مەلا مستەفای بەرزانی بکا، زۆر بە پەرۆشەوە بەنهێنی، بەسواری ولاخ، دێ بەدێ، بەناوی خوازراوەوە، رۆژێ خۆی دەکا بەمەلا، رۆژێ خۆی دەکا بەشێخ، چەند شەوو رۆژێ، ئاوا بەناو ئەو دەشتو دەرو شاخو داخەدا، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکا، کەجارێ دەڵێ دەرویشی خۆ منو جارێ دەڵێ فەقێی خۆ من، بەپێی شوێن، دەخولێنەوەو قوڕو لیتەی زستان دەشێلنو سەرماو سۆڵە دەچێژن، هەرتاو نەتاوێ لەتاو فڕۆكو تەقەی رەبایاو هێرشی جاشان، هەڵدێنو خۆ لەناو دەوەنو بن بەردێ دەشارنەوە، رۆژانە بەچاوی خۆیان گوندی سووتاوو تەرمی شەهیدو زامار، لەهەموو جۆرێ دەبینن، هەتا بەرە بەرە دەگەنە پەناگەی بەرزانی، هەموو شتێ بە خەیاڵی ئەو مامۆستا ئێرانییەدا دێ ئەمە




نەبێ: دەڕوانێ وا تەختو بارەگا زێڕینەکەی مەلای بەرزان، وا لەچیایەکی سەختو دیژواری وادا، کە ڕێگەی باڵداری نییە، چ جای پادار، وا لەناو ئەشکەوتێکی تاریکی شێداری فانگدراو بەچرە دووکەڵی کۆتەرە داری تەڕو، پڕ لەسەرە بزووتکی کوژاوەو پڕ لەچراووگ، کە بەشەو لەباتی چراو گولۆپو لایت بەکاری دەهێنن، لەپڕ مارێ، یا جانەوەرێ، ئاگری ناو ئەشکەوتەکە گەرمی دەکاتەوەو سرپییەکەی دەردەچێو دووکەڵەکە سەری لێ دەشێوێنێو مەترسیو تۆقانێ لەناو ئەشکەوتەکەدا دروست دەکا، لەمەترسی تۆپو تانكو فڕۆكو جاشو جەیش ناخۆشتر!!

لەلایەکی تریشەوە دەڕوانێ وامەلا مستەفاو نزیکانی بارەگا، ئەوەندە تەپو تۆزو چرە دووکەڵ چووە بەسەرو چاویاناو تەپوتۆز لە جلەکانیان نیشتووەو ئەوەندە بە تەختە بەردی داخ لەناو ئەشکەوتەکەدا کولێرە ئاشییان کردووە، ڕێك دەڵێی ئاشەوانن‌و لەناو ئاشا دەژین!!

گوتی: لەو سەردەمەشدا، بەرەی جاشەکان، بەڕۆشنبیرو بە نارۆشنبیریانەوە، واتە: بەجاش چەكو بەجاش قەڵەمیانەوە، تەنگیان بە بەرزانی هەڵچنی بوو، دژایەتییەکی ماددیو مەعنەوییان دەکرد، بەدەمیان لیژنە، لە ئەمن‌و لە ئیستیخبارات، تانەو تەشەرو درۆو دەلەسەیان، لەدژی شۆڕش دروست دەکردو وەك بەچکە کۆترو بەچکە تووتی دەیانتفانە سەردەمی لایەنە کوردییە نەیارەکانی شۆڕشو ئەوانیش وەك بنێشتو کاویژ شەوو ڕۆژ دەیانجوییەوەو دەیانگوتو دەیانگوتەوە، بەمەلا مستەفایان دەگوت: مەلا چۆنبیو بە شۆڕشیان دەگوت جەیبی عەمیلو بە پێشمەرگەیان دەگوت: شەمشەمە کوێرەو بەسەدامیان دەگوت: زێڕە زێڕەو بە جاشیان دەگوت: سوارەی سەلاحەدین‌و ... تاد.

گـوتی: جـا ئاغـای ئێرانـی کـه ئـهم واقیعـه قێزهونـهی بینـیو ئـهم چهواشهکاریهی رهچاو کردو ئهم ژیانه زبرهی بهرزانیو پیاوانی شۆڕشی بینی، گوتی: (ئاغای بهرزانی! ئـهم ملهتـهی تـۆ ههتـه، ئـهوه ناهێنـێ کـهتۆ ئـاوا خـۆتی بۆبکهی به ئاشهوان، یا خۆتی بۆ بکهی بهقۆچی قوربانی!!).

دهڵـێن قـازی موحهممـهدی (شـههید) کاغـهزێ دهنووسـێ بـۆ شـێخی حیسامهددین، کـه یارمـهتی بـداو پـشتگیری کۆمـاری مـههاباد بکـا ئـهویش بـهم شیعره وهڵامی دهداتهوهو عوزری بۆ دێنێتهوه:

هـــــهر لـــــه خانـــــهقین هــــــهتا ژاوهرۆ

کـورد هــهر کـورت بـووهو هــهر کـورت یـاوهرۆ

٩٤٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ لَمْ أَزَلْ حَرِيصًا عَلَى أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ (رضى الله عنه) عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) اللَّتَيْنِ قَالَ اللَّهُ لَهُمَا (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ) فَحَجَجْتُ مَعَهُ فَعَدَلَ وَعَدَلْتُ مَعَهُ بِالإِدَاوَةِ ، فَتَبَرَّزَ حَتَّى جَاءَ ، فَسَكَبْتُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ ، فَتَوَضَّأَ فَقُلْتُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنِ الْمَرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) اللَّتَانِ قَالَ لَهُمَا ( إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ ) فَقَالَ وَاعَجَبِي لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ عُمَرُ الْحَدِيثَ يَسُوقُهُ ، فَقَالَ إِنِّي كُنْتُ وَجَارٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ ، وَهْيَ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ ، وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَيَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا ، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ مِنْ خَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الأَمْرِ وَغَيْرِهِ ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَهُ ، وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى الأَنْصَارِ إِذَا هُمْ قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَأْخُذْنَ مِنْ أَدَبِ نِسَاءِ الأَنْصَارِ ، فَصِحْتُ عَلَى امْرَأَتِي ، فَرَاجَعَتْنِي ، فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي ، فَقَالَتْ وَلِمَ تُنْكِرُ أَنْ أُرَاجِعَكَ فَوَاللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) لَيُرَاجِعْنَهُ ، وَإِنَّ إِحْدَاهُنَّ لَتَهْجُرُهُ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ .

فَأَفْزَعَنِى ، فَقُلْتُ خَابَتْ مَنْ فَعَلَ مِنْهُنَّ بِعَظِيمٍ . ثُمَّ جَمَعْتُ عَلَىَّ ثِيَابِى ، فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ أَىْ حَفْصَةُ ، أَتُغَاضِبُ إِحْدَاكُنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ فَقَالَتْ نَعَمْ . فَقُلْتُ خَابَتْ وَخَسِرَتْ ، أَفَتَأْمَنُ أَنْ يَغْضَبَ اللَّهُ لِغَضَبِ رَسُولِهِ (صلى الله عليه وسلم) فَتَهْلِكِينَ لاَ تَسْتَكْثِرِى عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَلاَ تُرَاجِعِيهِ فِى شَىْءٍ وَلاَ تَهْجُرِيهِ ، وَاسْأَلِينِى مَا بَدَا لَكِ ، وَلاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ هِىَ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) - يُرِيدُ عَائِشَةَ - وَكُنَّا تَحَدَّثْنَا أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ النِّعَالَ لِغَزْوِنَا ، فَنَزَلَ صَاحِبِى يَوْمَ نَوْبَتِهِ فَرَجَعَ عِشَاءً ، فَضَرَبَ بَابِى ضَرْبًا شَدِيدًا ، وَقَالَ أَنَائِمٌ هُوَ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ . وَقَالَ حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ . قُلْتُ مَا هُوَ أَجَاءَتْ غَسَّانُ قَالَ لاَ ، بَلْ أَعْظَمُ مِنْهُ وَأَطْوَلُ ، طَلَّقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نِسَاءَهُ . قَالَ قَدْ خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ ، كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ هَذَا يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ ، فَجَمَعْتُ عَلَىَّ ثِيَابِى ، فَصَلَّيْتُ صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) فَدَخَلَ مَشْرُبَةً لَهُ فَاعْتَزَلَ فِيهَا ، فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ ، فَإِذَا هِىَ تَبْكِى . قُلْتُ مَا يُبْكِيكِ أَوَلَمْ أَكُنْ حَذَّرْتُكِ أَطَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ لاَ أَدْرِى هُوَ ذَا فِى الْمَشْرُبَةِ . فَخَرَجْتُ ، فَجِئْتُ الْمِنْبَرَ ، فَإِذَا حَوْلَهُ رَهْطٌ يَبْكِى بَعْضُهُمْ ، فَجَلَسْتُ مَعَهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ غَلَبَنِى مَا أَجِدُ ، فَجِئْتُ الْمَشْرُبَةَ الَّتِى هُوَ فِيهَا فَقُلْتُ لِغُلاَمٍ لَهُ أَسْوَدَ اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ . فَدَخَلَ ، فَكَلَّمَ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ خَرَجَ ، فَقَالَ ذَكَرْتُكَ لَهُ ، فَصَمَتَ ، فَانْصَرَفْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ ، ثُمَّ غَلَبَنِى مَا أَجِدُ فَجِئْتُ ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ ، فَجَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ ، ثُمَّ غَلَبَنِى مَا أَجِدُ فَجِئْتُ الْغُلاَمَ . فَقُلْتُ اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ . فَذَكَرَ مِثْلَهُ ، فَلَمَّا وَلَّيْتُ مُنْصَرِفًا ، فَإِذَا الْغُلاَمُ يَدْعُونِى قَالَ أَذِنَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ ، فَإِذَا هُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى رِمَالِ حَصِيرٍ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ ، قَدْ أَثَّرَ الرِّمَالُ بِجَنْبِهِ ، مُتَّكِئٌ عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ، ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ طَلَّقْتَ نِسَاءَكَ

فَرَفَعَ بَصَرَهُ إِلَيَّ ، فَقَالَ « لاَ » . ثُمَّ قُلْتُ – وَأَنَا قَائِمٌ أَسْتَأْنِسُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، لَوْ رَأَيْتَنِي ، وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى قَوْمٍ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ ، فَذَكَرَهُ ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)، ثُمَّ قُلْتُ لَوْ رَأَيْتَنِي ، وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ ، فَقُلْتُ لاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ هِيَ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) – يُرِيدُ عَائِشَةَ – فَتَبَسَّمَ أُخْرَى ، فَجَلَسْتُ حِينَ رَأَيْتُهُ تَبَسَّمَ ، ثُمَّ رَفَعْتُ بَصَرِى فِي بَيْتِهِ ، فَوَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ فِيهِ شَيْئًا يَرُدُّ الْبَصَرَ غَيْرَ أَهَبَةٍ ثَلاَثَةٍ . فَقُلْتُ ادْعُ اللَّهَ فَلْيُوَسِّعْ عَلَى أُمَّتِكَ ، فَإِنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ وُسِّعَ عَلَيْهِمْ وَأُعْطُوا الدُّنْيَا ، وَهُمْ لاَ يَعْبُدُونَ اللَّهَ ، وَكَانَ مُتَّكِئًا . فَقَالَ « أَوَفِي شَكٍّ أَنْتَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلَتْ لَهُمْ طَيِّبَاتُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا » . فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَغْفِرْ لِي . فَاعْتَزَلَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الْحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عَائِشَةَ ، وَكَانَ قَدْ قَالَ « مَا أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْرًا » . مِنْ شِدَّةِ مَوْجَدَتِهِ عَلَيْهِنَّ حِينَ عَاتَبَهُ اللَّهُ . فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ فَبَدَأَ بِهَا ، فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ إِنَّكَ أَقْسَمْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا ، وَإِنَّا أَصْبَحْنَا لِتِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً ، أَعُدُّهَا عَدًّا . فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ » . وَكَانَ ذَلِكَ الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ . قَالَتْ عَائِشَةُ فَأُنْزِلَتْ آيَةُ التَّخْيِيرِ فَبَدَأَ بِي أَوَّلَ امْرَأَةٍ ، فَقَالَ «إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا ، وَلاَ عَلَيْكِ أَنْ لاَ تَعْجَلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ » . قَالَتْ قَدْ أَعْلَمُ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِكَ . ثُمَّ قَالَ « إِنَّ اللَّهَ قَالَ ( يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ ) إِلَى قَوْلِهِ (عَظِيمًا) » . قُلْتُ أَفِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ . ثُمَّ خَيَّرَ نِسَاءَهُ ، فَقُلْنَ مِثْلَ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ: [٩٤٥]

---

[٩٤٥] بخارى. علم: ٨٩، مسلم: ٣٦٧٩ شيحا. (بخارى رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/٨٣).

عەبدوڵڵای کوڕی عـەبباس کـە (نـاوداره بـە ئیبنـو عـەبباس) فـەرمووی: ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانیم کرد، زۆر مەبەستم بوو، کە لەعومەری کوڕی خەتاب بپرسم، لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو دوو ژنەیان کێو کێ بوون، کە خوای گەوره، سەبارەت بەوان دەفەرموێ: { إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا } واتـە: جێگـەی خۆیـەتی، کـە تەوبـە بکـەن، چونکە بـەدڵ حەزتان لەکارێ کردووه، کە پێغەمبەری خودا پێی نـاخۆش بـووه، کـە حـەزتان لەوه بووه: کە ماریەی قیبطیە لەخۆی حەرام بکات، یا مـەیلی ئـەوەتان کـردووه کە نهێنی تایبەت بە ژیانی هاوسەری پێغەمبەر ئاشکار بکەن).

جا دەرفەتم بۆ نەڕەخسا، تـا عومـەر چوو بـۆ حـەج وەمنـیش لەگەڵیـدا چووم بۆ حەج، لەڕێگە لایدا بۆ لاڕێ، منـیش لەگەڵیـدا لامـدا، جەوەنـدەیێ ئـاوم پێ بوو، جا پاش ئەوەی عومەر سەراوەکەی تـەواوکردو هاتـەوه بـۆلای مـن، لـەو جەوەندەیـە ئـاوم کـرد بەدەسـتیدا دەسـتنوێژی گـرت، جـا عـەرزیمکرد: ئـەی فـەرمانڕەوای بـاوەڕداران! ئـەو دوو ژنــە کـێو کـێ بـوون، لـە هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە خـودای گـەوره لەبارەیانـەوه دەفەرموێ: {إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا – ٦٦/التحريم/الآية: ٤}.

جـا کـە ئـەم پرسـیارەم لێـی کـرد، وەك بڵێـی پرسـیارەکەی بـەدڵ نـەبێ، چونکە جۆره نەنگێ بۆ حەفصەی کچی عومەر دەردەکەوێ، لەبەرئـەوه عومـەر فەرمووی: (چەند سەیریت ئەی کوڕی عەبباس!) ئەوجا فەرمووی: ئەو دوو ژنە عائیشەو حەفصە بوون.

ئـەوجا عومـەر بـەدوورو درێـژی ئـەم چیرۆکەی لەنووکـەوه گێڕایـەوه، فـەرمووی: مـنو دراوسـێیەکم، کـە پیـاوێ بـوو لـە یاریـدەدەران (ئەنـصار) لـەناو خێڵی بەنو ئومەییەی کوڕی زەیددا بووین، کـە لەگونـدەکانی ناسـراو بـە عـەوالی

مەدینە نیشتەجێ بوون، بەسەرە ڕۆژێ منو ڕۆژێ ئەو دائەبەزین، ئەچووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ وەرگرتنی دەنگوباس، ئەگەر من دابەزیمایە، هەواڵی ئەو ڕۆژە چی بوایە، بۆیم دەبردەوە، وەك بابەتی سرووشو دەنگوباسی تر، وە ئەگەر ئەویش دابەزیبایە هەروەها، ئەو ڕووداوانەی بۆ من دەهێنایەوە، لەڕاستیدا ئێمەی گەلی قورەیش لەولاتی خۆمان زاڵ بووین بەسەر ژنەکانماندا، بەلام کەهاتین بۆ مەدینەو تێکەلاوی یاریدەدەران (ئەنصار) بووین، روانیمان ئەوان ژنەکانیان زاڵن بەسەریانا!! ئیتر بەرە بەرە ژنەکانی ئێمەیش رەفتاری ژنانی ئەنصاریان گرت، ڕۆژێ لەژنەکەم تووڕە بووم قیژاندم بەسەریدا، ئەویش وەلامی دامەوە، منیش گوتم: ئەوە دەمە دەمێ لەگەڵ من دەکەیت. ئەویش گوتی: ئەی عومەر! تۆ چەندە سەیریت! تۆ ناتەوێ کە کەسێ قسە لەقسەتا بکا، دەی سوێندم بەخودا هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژانە دەمە دەمێی لەگەڵدا دەکەنو دەچنەوە بەگژ دەمیدا، تەنانەت هەیانە ڕۆژ تا ئێوارێ قسەی لێ دائەبڕێو قسەی لەگەڵدا ناکات؟ جا ئەم قسەو باسانە تۆقاندمی، لەبەرئەوە بەژنەکەمم گوت: ئەوەی کەشتی وا لەگەڵ پێغەمبەردا بکا، ماڵ وێران خۆی، نائومێد خۆی!!

ئەوجا جلەکانم لەبەرکردو خۆم پێچایەوەو دابەزیم بۆ ناو شاری مەدینە، چووم بۆلای حەفصەی کچم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، پێیم گوت: ئەی حەفصە! شتی وا هەیە، کە یەکێ لەئێوەی هاوسەرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژ تا ئێوارێ پێغەمبەر تووڕە بکا؟؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: دەی نائومێدو زیانەمەند بیت، چۆن شتی وادەکەیت، ئایا ناترسیت کەخودا لەسەر پێغەمبەرەکەی بکاتەوەو لەسەر تووڕە بوونەکەی هەڵبداتێو بە فەتارەتدا بچیت، چۆن هەڵەی وادەکەی؟ نەکەی داوای شتی زۆر لە پێغەمبەر

بکەی، یا دەمە دەمێی لەگەڵ بکەی لەسەر هیچ شتێ، قسەی لێ دانەبڕیت، ئەگەر پرسیارێ، یا شتێکت دەوێ، لەمنی بکە، یا لەمنی داوابکە، ئەوە دەستە خەڕۆتان نەکا کە عائیشەی دەستە خوشکت لەتۆ نازدارترەو زیاتر پێغەمبەر خۆشی دەوێ، ئەوە وای لێ دەکا، کە نازی زیاتر بەسەر پێغەمبەردا بکات، تۆیش بچیت چاو لەو بکەیت!؟

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مەترسیمان لە پاشایێ لە پاشاکانی غەسسان هەبوو، وامان بیستبوو کە دەیانەوێ بەسوپاوە بێنە سەرمان، وەبۆ ئەم مەبەستە سەرگەرمی نالکردنی ماین و ئەسپەکانیانن، جا هاوڕێ ئەنصارییەکەم لەسەرەی خۆیدا، دادەبەزێ دەچێ بۆناو شاری مەدینە، سەر لەئێوارێ هاتەوە بۆلامان، بەتوندی تەقولبابی کردو زۆر بەتوندی لە دەرگاکەی دا، وە لەوێوە هاواری کرد: ئەرێ کابرا لەوێیە؟ منیش راچڵەکیم و دەرچووم بۆلای، گوتی: کارێکی زۆر گەورە قەوماوە، گوتم: چی بووە، ئایا لەشکری غەسسان هاتوونەتە سەرمان؟ گوتی: نەء، لەشکر نەهاتوونەتە سەرمان، بەڵام لەوە خراپترو سامناکتر روویداوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکانی تەڵاق داوە. منیش گوتم: ئائومێد حەفصە، رەنجەڕۆ حەفصە، هەرخۆم گومانم وابوو کە ئەمە زۆری نەماوە کە رووبدات! جا جلەکانم لەبەرکردو خۆم کۆکردەوەو چووم بۆ مەدینەو نوێژی بەیانیم بەکۆمەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەیژەیەکا، سەرکەوت بۆ باڵەخانەیەکی خۆی، لەوێ کەنارە گیربوو لە هاوسەرەکانی.

منیش چووم بۆلای حەفصەی کچم، کە روانیم وا دەگری، گوتم: ئەوە بۆچی دەگریت؟ چەندم پێت گوت کە ئەمە مەکە، ئایا پێغەمبەر (دروودی

خوداى لەسەر بێ) تەلاقتانى داوە یانا؟ گوتى: نازانم، بەلام ئەوەتا وا لەو باڵەخانەدا، دوورە کەنارە لە هاوسەرەکانى.

جا دەرچووم‌و چووم بۆلاى دوانگەکە، تەماشام کرد وا کۆمەڵێ لەدەورى مینبەرەکەن دەگرین، ماوەیێ لەگەڵیان دانیشتم، بەلام لەپاش کەمێ خۆم پێ رانەگیراو خەمەکەى خۆم زۆرى بۆ هێنام‌و رۆیشتم بۆلاى باڵەخانەکەى کە پێغەمبەرى تیادابوو، خولامێکى رەشى پێغەمبەر لەوێ بوو، پێیم گوت: بچۆ مۆڵەتم بۆ وەربگرە، دەچم بۆلاى پێغەمبەر، خولامەکە چووە ژوورەوەو لەمبارەیەوە قسەى لەگەڵ پێغەمبەر کردو ئەوجا گەڕایەوە بۆ دەرەوەو گوتى پێم: قسەم لەگەڵ پێغەمبەر کرد، وە باسى تۆم بۆیکرد، بەلام قسەى نەکرد، منیش گەڕامەوە، چوومەوە لەلاى کۆمەڵەکەى لەلاى دوانگەکە بوون دانیشتمەوە، بەلام دیسان خەم‌و خەفەت پالى پێوە نامەوەو چوومەوە بۆلاى خولامە رەشەکە لەدەرگاى باڵەخانەکەو داواکەمم تازەکردەوە، تا سێجار ئەم کەین‌و بەینە لەنێوانى من‌و خولامە رەشەکەدا روویداو هەموو جارێ خولامەکە دەیگوت: داواکەتم عەرزى پێغەمبەر کرد، بەلام بێ دەنگ بوو، وەلامى نەبوو، جا لەسەرى جارى سێیەمدا، کە پشتم هەڵکردو ویستم بڕۆم، روانیم وا خولامەکە بانگم دەکا، کە چوومەوە، گوتى: پێغەمبەر مۆڵەتى پێت داوە، فەرموو بچۆ بۆلاى. کە چوومە ژوورەوە بۆلاى، روانیم وا لەسەر حەسیرێکى چنراو راکشاوە، حەسیرەکە رووتە، دۆشەك‌و شتى واى بەسەرەوە نییە، تەڵى چینەکانى حەسیرەکە هەڵچەقیبوونە لاقەبرغەى پێغەمبەرو لاقەبرغەیان چالکردبوو، پشتییەکى چەرمى لەژێر شانا بوو، ناوەخنەکەى ریشاڵى خورمابوو، جا سلاوم لێى کردو هەر بەپێوە گوتم: ئەى پێغەمبەرى

خـودا! ئایـا ژنـەکانت تـەڵاق داوە؟ ئـەویش سـەری هـەڵبڕیو تەماشـای کـردمو فەرمووی: (نەء). منیش لەخۆشییانا بەدەنگی بەرز گوتم: (ئەڵڵاهوئەکبەر).

ئەوجا هەر بـەپێوە ویـستم بـوار تـاقی بکەمـەوەو بـڕوانم کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـوتفی هەیـە، یانـا، گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئێمەی هۆزی قوڕەیش، جاران ئازابووین، زاڵبووین بەسەر ژنەکانمانا، بەڵام کاتێ هاتین بۆ مەدینە، دەڕوانین خەڵکی مەدینـە بـە پێـچەوانەی ئێمـەوە، ژنـەکانیان زاڵە بەسەر ئەوانا، جـا پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) زەردە خەنـەیێ گرتی، ئـەوجا گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! خۆزگـە دەتبینـیم لەوکاتـەدا، کـە چووم بۆلای حەفصەو پێیم گـوت: کـچم! تـۆ بـەهۆی ئـەو ژنـەوە (واتـە: بـەهۆی عائیشەوە) لەخۆت بایی مەبە، ئەو بەجوانی خۆی دەنازێو پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) خۆشـی دەوێ، تـۆ خـۆت مەبەسـتە بـەوەوە جـا دیـسانەوە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) زەردە خەنەیـەکی تریـشی کـرد، جـا کـەبینیم کـەیفی هەیـەو پێدەکـەنێ، منـیش دانیـشتم. جـا چـاوێکم گێـڕا بـە هۆدەکەیدا، سوێندم بەخودا شتێکی وام نەبینی کە دڵ بیگـرێو چـاو پەسـەندی بکا، بەس سێ کەوڵی لێ بوو، لـەژوور سـەریەوە بـە بنمیـچەکەوە هەڵواسـرابوون، جـا گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لـەخودای گـەورە بپـاڕێرەوە، کـە نەتـەوەی ئیسلامی تۆ بکەونە خۆشیو دنیا روویان تێ بکا، ئـەوەتا ملـەتی فـارسو ملـەتی رووم، خودایش ناپەرستن، کەچی خودا خێرو بێری دنیای رژانـدووە بەسـەریانا، کـەوام گـوت، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) راکـشابوو، جـا هەڵـسا دانیشتو فەرمووی: (ئەوە چۆن قسەی وادەکـەیو حـەزت لەدنیایـە، ئـەی کـوڕی خەتتاب! ئەوانە هۆزگەلێکن، خەڵاتی خۆیان لەجیهاندا وەرگرتووەو پەلەیان لـە بەشی باشی خۆیان کردووەو فرپان بەخۆشی ئەو جیهانەوە نەماوە).

منـيش عـەرزيمكرد: دەی ئـەی پێغەمبـەری خـودا نـەمزانی لـەخودا بپارێرەوە بۆم كە لێم خۆش بێو تاوانم ببۆشێ.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەهۆی ئـەو قسە نهێنییـەوە، كـە حەفصە ئاشـكرای دەكـا لـەلای عائیـشە، بیـستو نـۆ شـەو كـەنارەگیر بـوو لەژنەكانی، چونكە كاتێ خودای گەورە گلەیی لە پێغەمبـەر كـرد، لـەم بارەیـەوە، وەك لەسـەرەتای سـوورەتی تەحریمـەوە باسـكراوە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) زۆر دلگـران بـوو، وە فـەرمووی: (یـەك مـانگ هاموشـۆی ژنـەكانم ناكەم!).

جـا كاتـێ بیـستو نـۆ شـەو تـێ پـەڕی، ڕۆیـشت بـۆلای عائیـشەو لـەوەوە دەستی پێ كرد، عائیشەیش پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ تـۆ سـوێندت خوارد كە یەك مانگی رەبەق هاموشۆمان نەكەیت، كەچـی تـۆ لـەدوا بیـستو نـۆ شەو دەستت كردەوە بە هاموشۆمان، بۆ خۆم رۆژ بـەڕۆژ ژماردوومـە، دەی ئەمـە چۆنە؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): مـانگی وادەبـێ، بیـستو نـۆ شـەو دەبێت). ئەو مانگەیش بیستو نۆ شەو دەبێ.

عائیشە فەرمووی: ئەوجا خودای گەورە، بەم بۆنەیەوە، ئایەتی تـەخییرو سەرپشكی نارد، كە ئەم ئایەتە پیرۆزەیـە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً — الأحزاب/٢٨﴾:

واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویـست! بڵـێ بەژنـەكانت، ئەگـەر حـەزتان لەخۆشی ژیـانی دنیایـەو مەبەسـتتان رابواردنی خۆشـی ئـەم جیهانـە نزیكەیـە، ئـەوا وەرنـە پێـشەوە هـەتا مـافی خۆتـان پـێ بـدەمو تـەڵاقتان بـدەمو دەستم

لەدەستتان ببێتەوە لەسەر شێوەیەکی شەرعی جوان، خۆ ئەگەر بەخوداو بە پێغەمبەری خودایش رازین‌و ژیانی نەبڕاوەی پڕ لەخێرو خۆشی‌و نازو بەهرەی ئەو جیهان هەڵ دەبژێرن، ئەوە پاداشی گەورەی خوایی هەیە بۆ باشەکانی ئێوە). عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش هاتنی ئەم ئایەتی سەرپشك‌و تەخییرکردنە، لەمنەوە دەستی پێکرد، منیش جیابوونەوەم نەویست‌و پێغەمبەرم هەڵبژاردو بە هاوسەری ئەو رازیبووم، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکە یەکە هاوسەرەکانی تریشی کرد، بەسەرپشك‌و من چیم گوت ئەوانیش ئەوەیان گوت.

## (٦) باب المُطلَّقَةِ ثلاثاً لاَ نَفَقَةَ لَها

## ژنی سێ بەسێ تەلاقدراو ژیوار (نەفەقە)ی بۆ نییە

٩٤٦ـ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ مَا لِفَاطِمَةَ أَلاَ تَتَّقِي اللَّهَ ، يَعْنِي فِي قَوْلِهَا لاَ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةَ.[٩٤٦]

فاطیمەی کچی قەیس (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: ژنی سێ‌بەسێ تەلاقدراو، نە مافی نشیمەنی هەیە، نە ژیوارو خەرجی دەکەوێ. عائیشەیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوە فاطیمە چییەتی! ئەوە بۆ لەخوا ناترسێ قسەی وادەکاو دەڵێ: گوایە ژنی سێ بەسێ تەلاقدراو، نە مافی نشیمەنی هەیەو نە ژیوارو خەرجی بۆ هەیە).

بۆ تێگەیشتنی تەواوو روونکردنەوەی تەواو، ئەم دوو ژمارەیە: (٨٨٩) و (٨٩٠) لە پوختەی موسلیمەوە راگوێز دەکەین:

---

[٩٤٦] بخاری ق (٦٨ - رقم الكتاب الطلاق) مسلم: ٣٧٠١ - مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٩ + ٨٩٠. (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٤١).

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: مَا لِفَاطِمَةَ خَيْرٌ أَنْ تَذْكُرَ هَذَا. تَعْنِي قَوْلَهَا: لاَ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةَ. {الحديث: ٣٧٠١ = ٣٦٩٩ فم}:

عائیشه (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: ئەمەی کە فاطیمەی کچی قەیس دەیگێڕێتەوە، کە گوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرموویەتی بە فاطیمە، کاتیّ کە مێردەکەی سێبەسیّ تەڵاقی داوە: (نەنشیمەنت بۆ هەیەو نەژیوار. واتە: نەمافی سوکنات بۆ هەیە لەکاتی عیددەکەتا، وەنە نەفەقەت دەکەویّ). عائیشە فەرمووی: گێڕانەوەی ئەمە لەلایەنی فاطیمەوە هیچ سوودی نییە بۆ سەلماندنی داوای فاطیمە کە دەڵیّ: گوایە ژنی سێبەسیّ تەڵاقدراو، نەمافی نشیمەنی هەیە، نە ژیوارو خەرجی دەکەویّ، چونکە ئەم بڕیارە تەنیا بۆ فاطیمە خۆی وابووە، کە لەبەرهۆی تایبەت ماڵی مێردەکەی بەجیّ هێشتووە، ئەگینا بۆ ژنانی تر، کە سێبەسیّ تەڵاقدرابن وانیە، هەم مافی نشیمەنیان هەیەو هەم خەرجی).

عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ الأَعْظَمِ، وَمَعَنَا الشَّعْبِيُّ فَحَدَّثَ الشَّعْبِيُّ بِحَدِيثِ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَجْعَلْ لَهَا سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً. ثُمَّ أَخَذَ الأَسْوَدُ كَفًّا مِنْ حَصًى فَحَصَبَهُ بِهِ، فَقَالَ: وَيْلَكَ تُحَدِّثُ بِمِثْلِ هَذَا، قَالَ عُمَرُ: لاَ نَتْرُكُ كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّنَا (صلى الله عليه وسلم) لِقَوْلِ امْرَأَةٍ لاَ نَدْرِي لَعَلَّهَا حَفِظَتْ أَوْ نَسِيَتْ، لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةُ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ ). {الحديث: ٣٦٩٤ = ٣٦٩٠ فم. ترمذي. نكاح: ١١٣٥. نسائي. طلاق: ٣٤١٨، ٣٥٥٣}:

ئەبو ئیسحاق (رەحمەتی خودای لیّ بیّ) فەرمووی: لەگەڵ ئەسوەدی کوڕی یەزیددا، لە مزگەوتی گەورەی کووفە دانیشتبووین، شەعبیشمان لەگەڵ بوو،

**شەعبی ئەو فەرموودەیەی گێڕایەوە، کە فاطیمەی کچی قەیس دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەجێگەی دانیشتنی پێمداو نەژیوار (نەفەقە)ی بۆ بڕیمەوە، ئەسوەدیش چنگێ چەوی هەڵگرتو چنگە چەوەکەی گرتە شەعبیو پێی گوت: خانە خراپ! ئەمە چییە تۆ دەیگێڕیتەوە؟! ئەی ئەوە نەبوو کە ئەم قسەیە گەیشتەوە بە عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە بەقسەی ژنێ وازناهێنین لەنامەی خوداو یاسا نامەی پێغەمبەری، بەتایبەتی لەکاتێکا کە نازانین ئەو ژنە شتەکەی بەباشی لەیادماوە، یا لەیادی نەماوە، ژنی تەڵاقدراو هەم مافی جێگەی دانیشتنی هەیەو هەم نەفەقەو ژێوارو خەرجیشی دەکەوێ، چونکە ئەوەتا خودای گەورە سەبارەت بەم بابەتە دەفەرموێ:**

**{لَـا تُخْرِجُـوهُنَّ مِـن بُيُـوتِهِنَّ وَلَـا يَخْـرُجْنَ إِلَّـا أَن يَـأْتِينَ بِفَاحِـشَةٍ مُّبَيِّنَـةٍ — الطلاق/٦٥، الآية/١} :**

**واتە: ئەوژنە تەڵاقدراوانە دەرمەکەن، لەهۆدەو ماڵی یاسایی (شەرعی) خۆیانا، وەنابێ خۆشیان لەجێگەی نشیمەنی ئاسایی خۆیان دەربچن، مەگەر کارێکی نابارى ناشیرینیان لێ دەربکەوێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٢، ج/٤} .**

**ئەنجا ئەم فەرموودەی تریش لە (شەرحی بلوغ المرام) ژمارە (١٠٣٣) لە بەرگی دووەم، بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتەو بۆ نووسینی ژیاننامەی فاطیمەی کچی قەیس راگوێز دەکەین:**

**وَعَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ " أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ لَهَا: {اِنْكِحِي أُسَامَةَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. {پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٢. ژمارە: ٨٦٠و ٨٦١و ٨٦٢ = شیحا ٣٧٠٢و ٣٦٨٦و ٣٦٩٦ = صحیح مسلم ١٤٨٠} :**

**ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحیح مسلم)دا، ئاوایە:**

**فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مێردەکەم سێ تەڵاقەی دام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفەقەو ژیوارو نیشتەجێی شەرعی، لەماوەی عیددەدا بۆم دانەنا، وە فەرمووی پێم: (هەرکاتێ حەیەت هەڵهات، واتە: عیددەکەت تەواو بوو ئاگادارم بکەرەوە!). منیش وامکرد، وەعەرزیمکرد: موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (کە قوڕەیشییە)و ئەبو جەهم (کە قوڕەیشییە)و ئوسامەی کوڕی زەید (کە کۆیلەی ئازاد کراوە) خوازبێنیم دەکەن (دیارە کە فاطیمە خۆشی لەخانەدانەکانی قوڕەیشە) جا ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ فەرمانت بەچییە؟**

**فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەرچی موعاوییەیە بۆرە پیاوو بێ ماڵە، هەرچی ئەبو جەهمیشە لێدەرە، لەژن زۆر دەدا، شووبکە بە ئوسامەی کوڕی زەید). منیش بەدەستم ئاوامکردو تێیم گەیاند کە حەزم لە ئوسامە نییە، چونکە هەم ڕەشەو هەم کۆنە نۆکەرەو کۆیلەی ئازاد کراوە.**

**پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (بەگوێی خوداو بەگوێی پێغەمبەری خودا بکەی، ئەوە بۆ تۆ باشترە، کەواتە: شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید).**

**ئیتر لەسەر ڕاوێژو ئاماژەکەی پێغەمبەر، شوومکرد بە ئوسامەو، ئەوەتانێ خودا کردی بەمایەی خۆشیو شادیو سەربەزی بۆمو ژنان خۆزگەم پێ دەخوازن. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠ + تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٢ ج/٤ - چاپی چوارەم}.**

**ڕوونکردنەوە:**

١- بەپێی ئەم فەرموودەیە کە لەصەحیحی موسلیمدایە، هاوشانی (کفائەت) بەس لە ئاییندا دەبێ ڕەچاوبکرێ، هەروەك فەرموودەی ژمارە (١٠٣٤)ی پوختەی موسلیم، هەمان شت دووپات دەکاتەوە، کە سەبارەت بەبابەتی هاوشانیو هاوکوفی، بەس ئایین بایەخدارەو بەس.

٢- فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) لەخانەدانەکانی قورەیشە، لەعەرەبە ڕەسەنەکانە، خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیسە کە والی یەزیدی کوڕی موعاویە بوو لەسەر عێراق، فاطیمە لەکۆچکارە پێشینەکانە، ئافرەتێکی هۆشمەندی شۆخو شەنگ بوو، دە ساڵ لە ضەحاکی برای گەورەترە، لەماڵی فاطیمە ئەهلی شوورا، لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عومەر کۆبوونەوە، بۆ هەڵبژاردنی جێنشینی ئایینده، لەپاش تەڵاقدانی شووی کرد بە ئوسامەی کوڕی زەید {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم بەرگی یەکەم، ژمارە: ٧} + {مختصر صحیح مسلم بەرگی دووەم ژمارە: ٨٦٠}.

٩٤٧- حديث عائشة وفاطمة بنت قيس، قَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ لِعَائِشَةَ أَلَمْ تَرَيْنَ إِلَى فُلاَنَةَ بِنْتِ الْحَكَمِ طَلَّقَهَا زَوْجُهَا الْبَتَّةَ فَخَرَجَتْ . فَقَالَتْ بِئْسَ مَا صَنَعَتْ . قَالَ أَلَمْ تَسْمَعِي فِي قَوْلِ فَاطِمَةَ قَالَتْ أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ لَهَا خَيْرٌ فِي ذِكْرِ هَذَا الْحَدِيثِ: [٩٤٧]

عوروەی کوڕی زوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بە عائیشەی پووری فەرموو: تەماشا ناکەی کە فیسارە ژنی کچی حەکەم، مێردەکەی بە ئێجگاری تەڵاقی داوە، ئەویش لەماڵی شەرعی خۆی دەرچووەو بەجێی هێشتووە؟

عائیشەیش فەرمووی: ئەو ژنە کارێ خراپی کردووە.

---

[٩٤٧] بخاری. طلاق (رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٤١) مسلم: ٣٧٠١، ٣٧٠٢، ٣٧٠٤، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٠ = ٣٧٠٢ شيحا. (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٤١).

عـورەوە فـەرمووی: ئایـا بـە وردی سـەرنجی گوتەکـەی فاطیمـەی کـچی قەیست نەداوە، کە لەم بارەوەیە؟

عائیشە فەرمووی: دەی بەبێ گومـان، فەرموودەکـەی ئـەو لەبەرژەوەنـدی خۆی نییە.

**ڕوونکردنەوە:**

بـۆ تێگەیـشتنی تـەواو لـەم فەرموودەیـە، فـەرموودەی ژمـارە (١١٣٧)ی شەرحی بلوغ المرام، بەرگی دووەم دەنووسین:

وَعَنْ اَلشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رضـى الله عنهـا) {عَـنِ اَلنَّبِـيِّ (صَـلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم) -فِي اَلْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا-: "لَيْسَ لَهَا سُكْنَى وَلَا نَفَقَةٌ"} رَوَاهُ مُـسْلِمٌ. {مـسلم ترقيم وتحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا/٣٦٨٩}:

شەعبی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: فاطیمـەی کـچی قـەیس (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: مێردەکـەم سـێ تەڵاقـەی دام، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماوەی عیددەدا، نەھەقی نشیمەنی پێم دا، وە نـە خـەرجی (نەفەقە)یشی بڕییەوە بۆم، تا عیددەم بەسەر دەچێ. {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجیرە: ٨٠، لاپەڕە: ٥٩٥، ژمارە: ٢٢٧٩و، ٢٢٨٠و، ٢٢٨١ بەتایبەتی بڕوانە: (ژمارە: ٢٢٨٢)}.

**ڕوونکردنەوە:**

شـەعبی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) ناسـراوە بـە (ئـەبو عـەمر، عـامیری کـوڕی شـەراحیلی کـوڕی عەبـدوڵڵای شـەعبی ھەمـەدانی کـووفی، تابیعییـەکی مەزنە، مامۆستایەکی گەورەی شەریعەتزان بـوو. خـۆی دەیفـەرموو: بەخزمـەتی زیاتر لە پێنـج سەد کەس لـەھاوەڵانی پێغەمبـەر گەیشتووم. بەخزمـەتی ئیبنـو

عەبباس گەیشتووە، هەروا ئەوریش لە ڕۆژگاری ئەودا بووە، لەجێنشینی عوسمان شەش سال ڕۆیشتبوو کە شەعبی لەدایك بووە، لەتەمەنی هەشتاو چەند سالێدا، لەسالی سەدو چواری کۆچیدا مردووە، جارێ ئیبنو عومەر گوێی لێ بوو، شەعبی داستانەکانی غەزەواتەکانی دەگێڕایەوە، ئیبنو عومەر گوتی: من خۆم لەزۆر لەم نەبەردو غەزایانەدا بەشداریم کردوە، بەلام شەعبی لەمن باشتر دەیزانێ!!

زوهری دەیفەرموو: لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، زاناکان بریتین لەم چوار کەسە:

**یەکەم:** ئیبنولوسەییەب لەمەدینە.

**دووەم:** شەعبی لەکووفە.

**سێیەم:** حەسەنی بەصری لە بەصرە.

**چوارەم:** مەکحول لە شام.

## (٨) باب إنقضاءِ عِدَّةِ المُتَوفَى عَنهَا زَوجُهَا وَغَيرُهَا بِوَضعِ الحَملِ
## عیددەی ژنی دووگیان بە دانانی سکەکەیەتی، چی ژنی مێرد مردوو بێ، چی ژنی تر بێ

٩٤٨- عَنِ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ أَبَاهُ كَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الأَرْقَمِ الزُّهْرِيِّ يَأْمُرُهُ، أَنْ يَدْخُلَ عَلَى سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ الأَسْلَمِيَّةِ فَيَسْأَلَهَا عَنْ حَدِيثِهَا وَعَمَّا قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ اسْتَفْتَتْهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ يُخْبِرُهُ أَنَّ سُبَيْعَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ ابْنِ خَوْلَةَ وَهُوَ فِى بَنِى عَامِرِ بْنِ لُؤَىٍّ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا فَتُوُفِّىَ عَنْهَا فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهْىَ حَامِلٌ فَلَمْ تَنْشَبْ أَنْ وَضَعَتْ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاتِهِ، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا تَجَمَّلَتْ لِلْخُطَّابِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ - رَجُلٌ مِنْ بَنِى عَبْدِ الدَّارِ - فَقَالَ لَهَا:

مَا لِى أَرَاكِ مُتَجَمِّلَةً لَعَلَّكِ تَرْجِينَ النِّكَاحَ؟ إِنَّكِ وَاللَّهِ مَا أَنْتِ بِنَاكِحٍ حَتَّى تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ، قَالَتْ سُبَيْعَةُ: فَلَمَّا قَالَ لِى ذَلِكَ، جَمَعْتُ عَلَىَّ ثِيَابِى حِينَ أَمْسَيْتُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَفْتَانِى بِأَنِّى قَدْ حَلَلْتُ حِينَ وَضَعْتُ حَمْلِى، وَأَمَرَنِى بِالتَّزَوُّجِ إِنْ بَدَا لِى، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَلاَ أَرَى بَأْسًا أَنْ تَتَزَوَّجَ حِينَ وَضَعَتْ، وَإِنْ كَانَتْ فِى دَمِهَا غَيْرَ أَنْ لاَ يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَطْهُرَ. {الحديث: ٣٧٠٦ = ٣٧٠٢ فم. بخاري. مغازي: ٣٩٩١، ٥٣١٩. أبو داود. طلاق: ٢٣٠٦. نسائي. طلاق: ٣٥١٨} : [٩٤٨]

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە، فەرمووی: عەبدوڵڵای باوکم نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی ئەل-زوهری، فەرمانی پێکرد کەبچێ بۆلای سوبەیعەی کچی حاریثی ئەل-ئەسلەمییە، کە پرسیاری لێبکا، لەبارەی دانانی سکەکەیەوە، لەپاش مردنی مێردەکەی، کە پرسیاری لە پێغەمبەر کردووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چی پێ گوتووە؟

عومەری کوڕی عەبدوڵڵا وەڵامی نووسییەوە بۆ باوکم ئەم هەواڵەی پێ ڕاگەیاند: کە سوبەیعە پێی گوتم: ژنی سەعدی کوڕی خەولە بووم، کە لەخێڵی بەنی عامیری کوڕی لوئەی دەژمێررا، کە یەکێ بوو لەوانەی کە ئامادەی جەنگی بەدر بوو بوون، لە حەجی ماڵاواییدا سەعدی مێردم مرد، لەکاتی مردنیدا من دووگیان بووم، سکم پڕبوو، چەند شەوێ لەپاش مەرگی سەعد، مناڵەکەم بوو، سکەکەم دانا، جاکاتێ سوبەیعە لە زەیستانی پاك دەبێتەوە، خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ خوازبێنیکاران، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەك (کە پیاوێ بوو لەخێڵی بەنی

---

[٩٤٨] بخاری. مغازی: ٣٩٩١، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٨ = ٣٧٠٦ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/١٠).

عەبــدودار) دەچــێ بــۆلای و پێــی دەڵــێ: ســوبەیعە، چــییە دەتبیــنم خــۆت رازاندۆتەوەو بەرگی رەشپۆشی (حیداد)ت داناوە، دەڵێی بەتـەمای شـووکردنی؟ بـەخودا شـتی وانابـێ، تـۆ نـاتوانی شـووبکەیتەوە، هـەتا حەیـەی مێـرد مـردن تەواونەکەی، کە بەپێی ئایەتی قورئان چوار مانگ و دەشەوە، قورئان دەفەرموێ: {وَالَّـذِينَ يُتَوَفَّـوْنَ مِـنكُمْ وَيَـذَرُونَ أَزْوَاجًـا يَتَرَبَّـصْنَ بِأَنفُـسِهِنَّ أَرْبَعَـةَ أَشْـهُرٍ وَعَـشْرًا — بقـرة/٢/٢٣٤} . واتـە: ئـەو پیـاوە موسـوڵمانانە کـەدەمرن و ژنـەکانیان لـەپاش خۆیان بەجێ دەهێڵن، دەبێ ئەو ژنانە تاماوەی چوار مانگ و دەشـەو تازێباربن و چاوەڕوانی بکەن و لەوماوەیەدا شوونەکەنەوە!).

سوبەیعە فەرموویی: کاتێ ئەبو سەنابیل ئاوای پێم گوت، ئێوارێ خۆمم بەجلەکانم کۆکردەوەو چووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـودا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـەبارەت بـەم بابەتـەی خـۆم پرسـیارم لێـی کـرد، فـەتوای بۆمـدا، کەلەدوا دانانی سکەکەم حەیـەم هەڵهاتووەو عیـددەم تـەواو بـووەو هەرچی بـۆ ژنـی بـێ مێـرد دروسـت بـێ بـۆ منـیش دروسـتە، فەرمانیـشی پـێم کـرد ئەگـەر دەمەوێ شووبکەمەوە!

ئیبنو شەهاب (کە یەکێکە لە پیاوانی رشتە (سـەنەد)ی ئـەم فەرموودەیـە، کـە عوبەیـدوڵڵای کـوڕی عەبـدوڵلا، لـەم فەرموودەیـەدا، مامۆسـتایەتی) ئیبنـو شـەهاب دەفـەرموێ: بەلامـەوە قەیـدی نییـە کـەژنی دووگیـان لـەپاش دانـانی سکەکەی، ئایا تەڵاقدراوبێ، یا مێـرد مردووبـێ، کە شووبکاتەوە، با لـەخوێنی زەیستانیش پاك نەبووبێتـەوە، بـەڵام مێـردە تازەکـەی نابـێ نزیکی بکـەوێ تـا لەخوێنی زەیستانییەکەی پاك نەبێتەوە!!. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمـارە: ٢٢٧٤ — ٢٢٧٨ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

سوبەیعەی کچی حاریث، لە صەحیحەیندا فەرموودەی هەیەو ناویشی هەیە، ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا دەفەرموێ: فوقەهای مەدینەو فوقەهای کووفە، ئەم فەرموودەی ئێرەی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێ) دەفەرموێ: سوبەیعە، لەپاش مەرگی مێردەکەی بەنیو مانگ منداڵی بوو، دوو پیاو (یەکێکیان گەنجو ئەویتریان پیر) خوازبێنی ئەویان کرد، ویستی شووبکا بەلاوەکەیان پیرەکەشیان، کە ئەبو سەنابیل بوو، ویستی نەیهێڵێ، بە بیانووی ئەوەی کە حەیەی هەڵ نەهاتووە، لەهەمان کاتا مەبەستی ئەوەیش بوو، کەسوکارەکەی کەلەوێ نەبوون، کە هاتنەوە ئەو هەڵبژێرن و گەنجەکە ئایەخ بکەن، بەلاَم سوبەیعە کارەکەی عەرزی حەزرەت کرد ئەویش ڕێگەی پێدا، کە لەم چرکە ساتەوە بەکێ ئارەزووەکا شووبکاتەوە!

کۆمەڵێ لە پەیڕەوان (تابیعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە بڕوانە (تاج الأصول في أحاديث الرسول) بەکوردی، بەرگی دووەم، چاپی چوارەم، زنجیرەی حەفتاو نۆ بەتەواوی).

٩٤٩- عَنْ أَبُو سَلَمَةَ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ عِنْدَهُ فَقَالَ أَفْتِنِي فِي امْرَأَةٍ وَلَدَتْ بَعْدَ زَوْجِهَا بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً . فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ آخِرُ الأَجَلَيْنِ . قُلْتُ أَنَا ( وَأُولاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ) قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي – يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ – فَأَرْسَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ غُلاَمَهُ كُرَيْبًا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ يَسْأَلُهَا فَقَالَتْ قُتِلَ زَوْجُ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةِ وَهْىَ حُبْلَى ، فَوَضَعَتْ بَعْدَ مَوْتِهِ بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَخُطِبَتْ فَأَنْكَحَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَكَانَ أَبُو السَّنَابِلِ فِيمَنْ خَطَبَهَا. [٩٤٩]

---

[٩٤٩] بخاری. مغازی: ٣٩٩١، ٥٣١٩، مسلم. گلاق: ٣٧٠٦. (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٦٥).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) گـوتی: ئـەبو سـەلەمەو ئیبنـو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لە کۆبوونەوەیەکا، باسی ئەو ژنەیان دەکرد، کە لەپاش مردنی مێردەکەی، بەچەند شەوێ مندالّی ببێ.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: (عیـددەی بـەپێی دوا وادەیە (آخر الأجلَيْنِ: دوا وادە).

ئەبو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەدانانی سکەکەیەتی، کـە منالّەکەی بوو حەیەی هەڵدێو عیددەکەی تـەواو دەبـێو دروسـتە شـووبکاتەوە. جـا لەسـەر ئەمـە، لێیـان بـوو بـە مـشتوومڕ، منـیش گـوتم: مـن لەگـەڵ ئـەبو سەلەمەی کاکەم هاودەنگم، قسەی ئەو تەواوە. جا سوارێکیان نارد بـۆلای ئوممـو سـەلەمە کـە لێـی بپرسـێ کـە سـوارەکە هاتـەوە گـوتی: ئوممـو سـەلەمە گـوتی: سوبەیعەی ئەسلەمییە لەپاش مردنی مێردەکەی بەچەند شەوێ مندالّی بوو، وە ئەمـەی باسـکرد بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێـی فـەرموو: (دەتـوانی شـوو بکەیتـەوە — ش/د/ت/ن).

### (٩) باب وُجُوبُ الإِحْدَادِ في عِدَّةِ الوَفَاةِ وَتَحْرِيمُهُ في غَيْرِ ذالكَ إلاَّ ثلاثَة أيَامٍ تازێباریو ڕەشپۆشیو ماتەمباری بۆ مێردی مردوو چوارمانگو دە شەوە، بۆ کەسی تریش سێ ڕۆژەو بەس

٩٥٠- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِى سَلَمَةَ: أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ هَـذِهِ الأَحَادِيـثَ الثَّلاَثَةَ، قَالَ: قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِـىِّ (صلى الله عليـه وسـلم) حِينَ تُوُفِّىَ أَبُوهَـا أَبُـو سُفْيَانَ، فَـدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَـةَ بِطِيبٍ فِيـهِ صُفْرَةٌ، خَلُـوقٌ أَوْ غَيْـرُهُ، فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِى بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُـولُ عَلَـى الْمِنْبَـرِ: « لاَ يَحِـلُّ لاِمْـرَأَةٍ

تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ». ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ، قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: « لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ». قَالَتْ زَيْنَبُ: سَمِعْتُ أُمِّي أُمَّ سَلَمَةَ تَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنُهَا، أَفَنَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ »، (مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، كُلَّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ)، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ. وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ ». قَالَ حُمَيْدٌ: قُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشًا وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا وَلاَ شَيْئًا حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَيْرٍ فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلاَّ مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ، فَتُعْطَى بَعَرَةً فَتَرْمِي بِهَا، ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ». ١٤٨٩/٥٨ م {الحديث: ٣٧٠٩ = ٣٧٠٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٩٦ = ٥٣٣٨، ٥٧٠٦ + تجريد/٢، رقم: ٦١٤ = ١٢٨١، ١٢٨٠، ١٢٨٢، ٥٣٣٥. أبو داود. طلاق: ٢٢٩٩. ترمذي. طلاق: ١١٩٥. نسائي. طلاق: ٣٥٠٠، تحفة/١٥٨٧٤} : [٩٥٠]

حەمیدی کوڕی نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئەم سێ فەرموودەیەی بۆم گێڕایەوە، فەرمووی:

[٩٥٠] تجريد/٢، ژمارە: ٦١٤ = ١٢٨١ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٣ = ٣٧٠٩ شيحا. (بخارى رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٤٦).

١- كاتێ ئەبو سوفیان مرد، کە باوکی ئوم حەبیبە بوو، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) چووم بۆلای ئوم حەبیبە، بەم بۆنەیەوە، روانیم ئوم حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تیابوو، جا هەردوو دەستی کرد بەناویداو ئینجا دەستی سووی بەهەردوو لاڕوومەتی خۆیاو بۆنی دا لەخۆیو تازێی شکاندو گوتی: بەو خودایەی کەهەر خۆی خودایە، هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەلام لەبەرئەوە بەکاری دەهێنم، چونکە لە پێغەمبەرم بیست لەسەر دوانگە دەیفەرموو: (ئەو ژنەی کەباوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ پتر ماتەم بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد، کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دەشەو تازێباربێ).

٢- زەینەب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای زەینەبی کچی جەحشیش، بەبۆنەی مردنی براکەیەوە، دیم کەئەویش داوای گوڵاوی کردو دای لەخۆیو فەرمووی: بەخودا هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەلام لەبەرئەوە بەکاری دەهێنم، چونکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست لەسەر دوانگە (مینبەر) دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو ژنەی کە ئیمانو باوەڕی بەخوداو بە حسێبو لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ زیاتر تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کەدەبێ بۆئەو چوار مانگو دەشەو تازێباربێ).

٣- زەینەب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ئوم سەلەمەی دایکیشم بیست دەیفەرموو: ژنێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کچەکەم مێردەکەی مردووەو چاویشی دێشێ، ئایا چاوی بڕێژێ؟ فەرمووی: (نەء) دووجار یاسێ جار، لەسەریەك، هەموو جارێ

دەیفەرموو: (نەء) ئینجا فەرمووی: (خۆی تەنیا چوار مانگو دەشەوە، کەچی ئێوە هێشتا پەلەپەلی لێ دەکەنو دەتانەوێ لێی بدزنەوە، بەڵام جاران لەسەردەمی نەزانیدا لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ، ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا.

حومەید (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بەزەینەبم گوت: لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا واتای چی؟ فەرمووی: جاران ژن کەمێردەکەی دەمرد دەچووە ناو کولبەیەکەوەو جلکێکی زۆر خراپی لەبەر دەکرد، وەبۆنی خۆشو گوڵاوو شتی وای لەخۆی نەدەدا، جا تاساڵێ دەڕۆیی ئەمە حاڵی بوو، ئەوجا دەعبایەکیان بۆدەهێنا، کەرێ، یامەڕێ، یا مەلێکیان دەهێنا بۆی، خۆی پێ پاك دەکردەوە، وەلێ بەدەگمەن رێ دەکەوت کە ئەو ژنە خۆی بەشتێ پاك بکاتەوەو ئەوشتە لەبەر ئەو پیسیو پۆخڵییەی نەمرێ، یا مردار نەبێتەوە!

ئینجا ژنەکە لە کولبەکەی دەهاتە دەرەوەو پشقلێکیان دەدایە دەستی، ئەویش پشقلەکەی تووڕ دەدا، ئیتر عیددەی تەواو دەبوو، وەتازێی دەشکاندو ئەوسا ئەگەر ئارەزووی ببوایە وەك جارانی بۆنو گوڵاوو شتی وای بەکاردەهێنایەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٣٧٧ — ش/د/ت/ن}.

٩٥١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (كُنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاث إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا وَلَا نَكْتَحِلَ وَلَا نَتَطَيَّبَ وَلَا نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطهْرِ إِذا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا مِنْ مَحِيضِهَا فِي نُبْذَةٍ مِنْ كُسْتِ أَظفَارٍ وَكُنَّا نُنْهَى عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ): [٩٥١]

[٩٥١] تجرید/١، ژمارە: ٢٠٥ = ٣١٣، مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٤ = ٣٧٢٠ شیحا = ٩٣٨ محمد فؤاد. (بخاری رقم الکتاب/٦ رقم الباب/١٢).

ئوممو عەطییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نەی ی کراوە لەنێمە کەدەستەی ژنانین کەلەسێ رۆژ پتر تازێ بۆ مردوو بگرین، مەگەر بۆ مێرد، کەدەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دە رۆژ تازێ بگرین، وەلەو ماوەیەدا نابێ چاو برێژین، یاخۆمان بۆن خۆش بکەین، یاجلو بەرگی رەنگین لەبەربکەین، مەگەر بەرگێ کەلەپێش دا هەوداکەی رەنگ کرابێو لەپاشا چنرابێ، یاتەنرابێ، کاتێکیش پاك بووینەوە لەبێنوێژیی کەویستمان خۆمان بشۆرین، رێگەی ئەوەمان دراوە کەبەقەد پێویست عوودو گوڵاوو بۆنی خۆش نەختێ بۆ وانێك، بۆ جێگە خوێنەکە بەکاربهێنین! (ت/٣/١٨٩/٥ = تاج-٢ ز-٧٩ ژ-٢٢٧٨ = ش/د/ن).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

کوست، یاقوسط، جۆرە بوخورو بۆنێکی خۆشە، پارچە پارچەیە، هەندێ دەڵێن: رەنگی رەشباوە، لەچەشنی نینۆکی مرۆڤ وایە، هەندێ دەفەرموون: ظیفاری، یا ئەظفار کەنارێکە لەکەنارەکانی عەدەن، لەهیندەوە بۆنی خۆش دەهێنن لەوێ ساخی دەکەنەوە، هەندێ تر دەفەرموون: شارێکە لەیەمەن. هەرچۆن بێ مەبەست لەفەرمووەدکە دووشتە: سوننەتە بۆ ئافرەت بەبۆنی خۆش بێنی ناخۆشی بێنوێژیو زەیستانی لابەرێ، هەتا ئەگەر تازێباریش بێ لەکاتی خۆشۆردنا ئەو مافەی بۆهەیە.

ئوممو عەطییە (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەژنانی هاوڕێیانی پێغەمبەر، هاوڕێیەکی ناوداری پێغەمبەر بووە، زۆر ئازاو دلێر بووە، ئەنصارییە، لەزۆر غەزادا لەگەڵ پێغەمبەردا بووە، دەستی پزیشکی هەبوو، نەخۆشیانی تیمار دەکرد، فەرمووەدیەکی هەیە لەبابەت شۆردنی مردووەوە

دادەنـرێ بەبنـەمای شـۆردنی مـردوو، نـۆ فـەرموودەی لەبەخاریـدا هەیـە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

## پوختەی بڕیارەکانی شیرخواردن

١- شیرخواردنو مەمکخواردن یەك شتن.

٢- ئایین – لەباتی شیرو مەمکخواردندا – کاریگەری نیە، کەواتـە: ئەگـەر منالـێ شـیری ژنێکـی مەسـیحی بخـوات، دەبـێ بـەکوڕی شـیری ئـەو ژنـە یـا بەپێچەوانەوە.

٣- شیری قوتو ئەگەر هی ژن نەبێ کاریگەری نییە.

٤- بۆ پوختەی بڕیارەکانی شـیرخواردن بڕوانـە فیقهـی ئاسـان/٢، لاپـەڕە: ٧٩٦ چـاپی تـەهران زنجـیرە: ٢٩٣ هـەروا تەجریـدی بوخـاری بـەرگی پێنجـەم، فەرموودەی ژمارە: ١٧٥٧ = ٥١٠٨ فەتحولباری.

٥- شـیرخواردنو مـەمکخواردن بابـەتێکی زۆر وردو گـرنگو فـرە قـووڵو فراوانە، زۆر لەکێشەکانی کۆمەڵگای پێ چارەسـەر دەکـرێ، پێویـستە گرنگـی پـێ بدرێ.

٦- باشترین چارەسەر، بۆ منالّی ناخۆیی (نامەحرەم) وەك منالّی تەبەننی کە کەسێ منالێ نامەحرەم بکا بەمنالّی خۆی وەك منالّی زۆلّی شەرعی، باشترین چارەسـەر بـۆ کێـشەی نـاخۆیی ئـەم جـۆرە منالانـە ئەوەیـە کـە لـە ڕێگـەی شـیرپێدانەوە بکـرێ بەمـەحرەمو بـەخۆیی، لـەناو ئـەو خێزانـەدا کـە هـەڵی دەگرنەوەو دەیکەن بەمندالّی خۆیان!.

٧- بـە ئـەزموون دەرکـەوتووە، ئـەو ژنو پیـاوەی کـەگوتراوە شـیرخواردن لەنێوانیاندا هەیە، وە لەبەر ئەوەی کەشیرەکە بەپێی شەرع نەچەسپاوە، ئەگـەر

شوویان کردبێ بەیەکتری، یا وەجاخ کوێر بوون، یاتووشی دەردو بەڵای گەورە گەورە بوون.

٨- سیلەی ڕەحم بەجێهێنان لەنێوان کەسوکاری شیریدا، کارێکی زۆر پەسەندە بەسەرکردنەوەو سەرلێدانو دیاری گۆڕینەوەو باشبوون بۆیان سوننەتێکی گەورەیە.

٩- بۆ ئەوەی کە گومانی بەد دروست نەبێ، بەهۆی دێنیو سەردانو هاموشۆی ئاساییەوە، وەها باشە کەشیرخواردن لەنێوانی دووکەسدا ئاشکرا بکرێو باسی بکرێ (بڕوانە: بڕگەی:١٦).

١٠- شیردانی حەرامکەر ئەم سێ مەرجەی هەیە:

**یەکەم:** شیردەر، کەپێشی دەگوترێ دایەن، مەرجەکەی ئەوەیە کەژن بێو زیندوو بێو تەمەنی لەنۆساڵی هەیڤی کەمتر نەبێ، ئەگەر پیاوێ بێتە شیرو شیربدا بەمناڵێ، بەوە نابێ بەباوکی شیری ئەو منالە، یان بەدایکی، یان ئەگەر دوو منالْ بەشیری یەك ئاژەڵ بژین بەوە نابن بە خوشكو برا، وەئاژەڵەکە نابی بەدایکیان.

**دووەم:** مەرجی شیرەکەیش ئەوەیە شیری ژنی زیندوو بێ، وەمنداڵەکە پێنج جار شیری ئەو ژنەی خوارد بێ.

**سێیەم:** مەرجی شیرەخۆریش ئەوەیە کەزیندوو بێو تەمەنی لەئاخر جارا، لەدوو ساڵ تێ نەپەڕی بێو لەڕێگەی مژینەوە بەدەم، یا لەڕێگەی دۆشینەوە کە بەمەمکییەو شتی وا بیخوات، یا لەڕێگەی لووتەوە، وەك بەتکاندن یا بەسۆندە لەڕێگەی لووتەوە شیرەکەی بدەنێو بگاتە ناو بۆشایی گەدەی.

١١- ئەگەر لەڕێگەی کۆمەوە بەشاف مناڵەکە هەڵی بگرێ، یان بە سۆندەو شتی وا لەکۆمەوە یان لە چووکەوە شیرەکە بکرێتە ناو لەشی، ئەوە کاریگەری نییە، لەلای تێکڕای زانایان.

١٢- نابێ مێرد مەمکی ژنی خۆی بمژێ، شتی وا بێ کێشە نییە گەرچی لەلای جەماوەری زانایان بەشتی وا مارەبڕینەکە هەڵناوەشێتەوە.

١٣- مێردی مناڵ، تەمەنی لەدوو ساڵ کەمتر بێ، شیری ژنی خۆی، یا شیری دایکی ژنی خۆی، یان شیری نەنکی ژنی خۆی بخوات ژنەکەی لێ حەرام دەبێ، چونکە لەیەکەما دەبێ بەکوڕی شیری ژنەکەی، لەدووەما دەبێ بەبرای شیری ژنەکەی، لەسێیەما دەبێ بەخاڵی ژنەکەی.

١٤- ئەگەر گومان لەم شتانەدا هەبوو شیر کاریگەری نابێ:

**یەکەم:** تەمەنی مناڵەکە، کەدڵنیا نەبوون لەوە کە لەکاتی هەر پێنج جارەکەدا، تەمەنی لەدوو ساڵی قەمەری تێ نەپەڕیوە.

**دووەم:** دڵنیا نەبوون کەپێنج جار بووە، یا زیاتر بووە.

**سێیەم:** کە هەر پێنج جارەکە، بەپێی عورف، تێرکەر بووە.

١٥- شیری کچ کەشووی نەکردبێ، یاشیری بێوەژن کەمێردی نەبێ، قەدەغەبوونو حورمەت پەخشەوە دەکاو کاریگەری هەیە.

١٦- لە (تحفە المحتاج فی شرح المنهاج)دا، بەدەق دەفەرموێ: {اَلْواجِبُ عَلَى النِسّاءِ أَنْ لاَيُرْضِعْنَ كُلَّ صَبِي مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ، وَإِذا أَرْضَعْنَ فَلْيَحْفَظْنَ ذالِكَ وَيُشْهِرْنَهُ وَيَكْتُبْنَهُ إِحْتِياطاً} . واتە: پێویستە لەسەر ژنان کە مەمك نەدەن بەهیچ مناڵێ، مەگەر لەبەر پێویستیو ناچاری، کاتێکیش شتی وایان کرد، هەواڵەکە پەخشەوە بکەنو بۆ دووربینی بیشی نووسن.

١٧- کاتێ کەشیردان هاتە جێ:





**یەکەم:** منداڵەکە دەبێ بەمنداڵی شیری ئەو ژن و پیاوە کەشیرەکەیانی خواردووەو لەناو خۆیانا دەبن بەمەحرەمی یەکتری.

**دووەم:** ئەو مەحرەمی و حەرامییەی کەبەهۆی شیرخواردنەوە پەیدا دەبێ، لەژن و پیاوەکەوە دەڕواو دەتەنێتەوە بۆ باوك و دایك و باپیر و نەنکیان (کە بەمانە دەگوترێ: ئوصول، واتە: بنەچەو ڕەسەن) ئەمانە دەبن بەمەحرەم بۆ شیرخۆرەکە.

**سێیەم:** هەروا لەژن و مێردەکەیەوە، مەحرەمی و قەدەغە بوون دەتەنێتەوە بۆ منداڵ و منداڵەزاشیان (کە بەمانە دەگوترێ: وەچەو نەوە) منداڵەکە دەبێ بەخۆی و بەمەحرەم بۆ ئەمانیش.

**چوارەم:** هەروا لەژن و مێردەکەوە دەتەنێتەوە بۆ براو خوشکیشیان (کە بەمانە دەگوترێ دەوروپشت، واتە: حەواشی).

**پێنجەم:** وە لەشیرخۆرەکەوە، مەحرەمی حەرامبوون هەر تەنیا دەڕوا بۆلای منداڵ و منداڵەزای ئەو شیرخۆرەیە، ناڕواو ناتەنێتەوە بۆ بنەچەی و بۆ وەچەی بنەچەی و بۆ دەوروپشی.

**شەشەم:** ئەمەیش لیستی زۆرینەی ئەو کەسانەیە کە بەهۆی مەمکخواردنەوە، مەحرەمی و خۆیی بوون لەنێوانیانا دادەمەزرێ:

١٨- ژنە شیردەرەکە دەبێ بەدایکی شیریی منداڵە شیرخۆرەکە.

١٩- مێردەکەی دەبێ بەباوکی، چونکە ئەو ژنەکەی متوربە کردووە.

٢٠- منداڵی ژنەکە، چی لەمێردی حازری بێ، چی لەمێردێکی تری بێ، ئەگەر کوڕ بێ دەبێ بەبرای شیریی منداڵە شیرخۆرەکە، ئەگەر کچ بێ دەبێ بە خوشکی شیری ئەو.

٢١- منالّی باوکەشیرییەکەیش هەروەها، چی لەژنە شیردەرەکەی بێ، یان لەژنێکی تری بێ، کچ بێ دەبێ بەخوشکی شیرەخۆرەکە، کوڕ بێ دەبێ بەبرای، منالّی ئەوانیش یان دەبن بەبرازای یان خوشکەزای.

٢٢- ئاغای ژنەشیردەرەکە، دەبێ بەباوکی شیرەخۆرەکە، ئەگەر ژنەکە ئوممول وەلەدی بوو، مێردی نەبوو.

٢٣- دایکی ژنە شیردەرەکە دەبێ بە نەنکی شیریی شیرخۆرەکە، با بەرەو ژووریش بڕوات.

٢٤- خوشکی شیردەرەکە دەبی بەپووری شیرەخۆرەکە.

٢٥- کچی کچی شیردەرەکە دەبێ بەخوشکەزای، با بەرەو خواریش بڕوات.

٢٦- کچی کچی خاوەن شیرەکە خوشکەزای شیرییەتی، با بەرەو خواریش بڕوات.

٢٧- دایکی خاوەن شیرەکە دەبی بەنەنکی شیری منالّەکە، با بەرەو ژووریش بڕوات.

٢٨- خوشکی خاوەن شیرەکە پووری شیری منالّەکەیە.

٢٩- برای خاوەن شیرەکە مامی شیرییەتی.

٣٠- کوڕی خاوەن شیرەکە برای شیری منالّەکەیە.

٣١- باوکی خاوەن شیرەکە باپیرەی شیرییەتی.

٣٢- برای شیردەرەکە خالّی شیرەخۆرەکەیە.

٣٣- مەبەست لەخاوەن شیر یا مێردی ژنەشیردەرەکەیە، یان ئاغایەتیو خۆی چووتەلایو سکی پڕکردووەو ژنەکە بووە بەئوم وەلەدی خاوەنەکەی.

٣٤- شــیرو بڕیارەکــانی شــیر لــەنێوانی موســوڵمانو ناموسوڵمانیــشدا دادەمەزرێ، گریمـان شـیردەر مەسـیحی بـوو، منالّـە شـیرخۆرەکە موسـوڵمان بـوو، دەبن بەدایكو كوڕی شیریی یەكتری، وەهەروەها كەسەكانی تریش.

٣٥- شیرەکە بکرێ بەپەنیر، یان بەخامە، یان بەگێمەڕ، یان بەکـەرێ، یـان بەماست، لەلای شافیعی‌ییەکان هـەمان کاریگـەری دەبینـێ، بەمـەرجێ لەدەمـەوە بدرێن بەمنالّەکە، وە مەرجەکانی تریشیان تیادا بێتەجێ، وەك دووساڵو پێـنج جارو.......تاد.

٣٦- باوكو دایكو براو خوشكو كەسـی تـری خـۆیی منالّـە شـیرەخۆرەکە، نـابن بەهیـچی ژنەشـیردەرەکەو نـابن بەهیـچی خـاوەن شـیرەکەو نـابن بەهیـچی منالّو كەسوكاری تریان، ئەگـەر لەلایـەكی تـرەوە مـەحرەمیان نـەبنو نـەبووبن بەخۆییو بەمەحرەمیان.

٣٧- ئێستا بەنكی شیر پەیدا بـووە، ژنـی شـیردار شـیری خـۆی دادەنـێ لـەو بەنكانە، سایا بەفرۆشتن، یان بە بەخشین، لەسەر فەرمایشتەكەی توحفە.

**یەكــەم:** دروسـت نییـە بـۆ ژنـی موسـوڵمان، كەشـیری خـۆی لـەو جـۆرە بەنكانەدا دابنێ، مەگەر بەم مەرجانە:

١- مێردەكەی ڕازی بێ، چونكە شتی وا ئەگـەر بـەپێی شـەرع نـەبێ بـێ شەرعییە، وەخودایش دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا – التحريم – ٦٦ – الآية/٦}؛

٢- ناوی ژنـە شـیردەرەكە لەسـەر دەفـەری شـیرەكە بنووسـرێ، وە هـەروەها ناوی ئەو منالّەی كەشیرەكەی پێ دەدرێ.

٣- كاتێ چەسـپا كەشـیرخواردنی شـەرعی لـەنێوانی منالّەكـەو ئـەو ژنـەدا كەشیرەكەی لەبەنك داناوە چەسپا، ژنەكەو خاوەنی منالّەكە لەوە ئاگادار بكـرێ.

وەلەتۆماری رەسمیو فەرمی ئەو بەنكەدا، ئەم بڕیارە تۆمار بكرێ، بۆ كاتی پرسینەوە لەم بابەتە.

٣٨- پوختەیێ لە نادروستبوونی كۆكردنەوەی دوو ژنی لەناو خۆیانا خۆیی، لەژنێتی یەك پیاودا.

١- حەرامە كۆكردنەوەی دایكو كچ، چی نەژادیو نەسەبی بن، چی شیری بن.

٢- حەرامەو نادروستە كۆكردنەوەی نەنكو نەوەی خۆی، چی نەسەبی، چی شیری.

٣- حەرامەو نادروستە كۆكردنەوەی دووكچ یان دوو ژن، لەژێر ڕكێفی یەك مێردا، ئەگەر گریمان یەكێكیان پیاو بێو یەكێكیان ژن بێ، مارەیان لەیەكتری نەبێ، وەك دوو خوشك پێكەوە لە یەك كاتا ژنی پیاوێ بن، یان ژن لەگەڵ برازای خۆیدا، یان لەگەڵ خوشكەزای خۆیدا، لەیەك كاتا ژنی یەك كەس بن، یان كچی شیری لەگەڵ دایكی شیری خۆی، یان لەگەڵ خوشكی شیری خۆی، یان لەگەڵ نەنكی شیری خۆی، یان لەگەڵ برازای شیری خۆی، یان لەگەڵ خوشكەزای شیری خۆی، لەیەك كاتا، هەردووكیان ژنی یەك مێرد بن ئەمانە هەموو نادروستن.

٣٩- مناڵی شیرەخۆرەكەیش، دەبن بەمناڵەزای شیردەرو مێردەكەی، با بەرەو خواریش بڕوات، هەروا منالی شیرەخۆرەكە دەبن بە برازا، یان خوشكەزای براو خوشكی شیری منالەشیرەخۆرەكە.

٤٠- هەروا ژنی شیرەخۆرەكە دەبێ بەبووكی شیری باوكو دایكو باپیرو نەنكە شیرییەكانی!!

# ١٩- كِتَابُ اللِعَانِ
# نامەی شەڕەنەفرین

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٧٧٧، زنجیرە: ٢٨٨ + تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٥٧٤، چاپی چوارەم، ژمارە: ٢٢٥٠ + تەجریدی بوخاری بەرگی چوارەم، ژمارە: ١٦٧٥ = ٤٧٤٥ بوخاری + تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٦٩، ژمارە: ١٧٩٥ = ٥٣١٢، ٥٣١١، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠ بوخاری + مختصر صحیح مسلم، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٣٧٩، زنجیرە: ٦٧٣ لە ژمارە: ٨٦٥ هەتا ژمارە: ٨٧٢ + شەرحی بلوغ المرام/٢ لەژمارە: ١١٢٧ هەتا ژمارە: ١١٣٤}.

٩٥٢- عَنِ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ (رضى الله عنه): أَخْبَرَهُ أَنَّ عُوَيْمِراً الْعَجْلاَنِيَّ جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيّ الأَنْصَارِيِّ فَقَالَ لَهُ: أَرَأَيْتَ يَا عَاصِمُ لَوْ أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ، فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَسَلْ لِي عَنْ ذَلِكَ يَا عَاصِمُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ جَاءَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ عَاصِمٌ لِعُوَيْمِرٍ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا. فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ، حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَسَطَ النَّاسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « قَدْ نَزَلَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا». قَالَ سَهْلٌ فَتَلاَعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا فَرَغَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ

إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ سُنَّةَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ. {الحديث: ٣٧٢٣ = ٣٧١٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٧٥ = ٤٧٤٥، ٤٢٣، ٤٧٤٦، ٥٢٥٩-٥٣٠٨-٦٨٥٤-٧١٦٥-٧١٦٦-٧٣٠٤. أبو داود. طلاق: ٢٢٤٥. نسائي. طلاق: ٣٤٠٢. ابن ماجة. طلاق: ٢٠٦٦. تحفة الأشراف: ٤٨٠٥}: [٩٥٢]

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عووەیمیری عەجلانی هات بۆلای عاصیمی کوڕی عەدی ئەنصاری، کە سەرۆک خێڵی عەجلان بوو (ڕەزای خودایان لێ بێ) پێی گوت: ئەی عاصیم! پێم بفەرموو: پیاوێ پیاوێک بەسەر ژنەکەیەوە بگرێت ئەگەر دەیکوژێ ئێوە دەیکوژنەوە، ئەگەر نایکوژێ ئەی چی فوڕێ بەسەر خۆیدا بکا؟ ئەی عاصیم! ئەم پرسیارەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆبکە، عاصیم چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارەکەی لێی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم جۆرە پرسیارانەی پێ ناخۆش بوو، بەڵکوو بەشوورەیی دانا، تەنانەت ئەو وەڵامەی کە عاصیم لەم بارەیەوە لە پێغەمبەری بیست کارێکی ئەستەمو قورس‌و گران بوو لەسەر شانی عاصیم.

کاتێ عاصیم گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، عووەیمیر چوو بۆلای‌و پێی گوت: ئەی عاصیم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چی فەرمووی؟ عاصیم پێی گوت: خێرم نەدی لێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوە، حەزی لەم پرسیارە نەبوو کەمن لێیم کرد، سەبارەت بەژنەکەی تۆ، عووەیمیر فەرمووی: بەخودا کۆڵ نادەم، هەتا لەمبارەیەوە بۆخۆم لە پێغەمبەر نەپرسم،

[٩٥٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٧٥ = ٤٧٤٥ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٨٦٥ - ٣٧٢٣ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا. (بخاری — ٤/٦٨).

جا عـوومیمر بۆخۆی رۆیـشت، کەچـووە خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەناو کۆمـەڵێ خـەڵکا بـوو، عـەرزی کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! پیـاوێ پیاوێـك بەسـەر ژنەکەیـەوە بگـرێ چـی بکـا، ئەگـەر دەیکـوژێ ئێـوە بـە قەصاص دەیکوژنەوە، گوایە پیاوێکی کوشتووە دەبێ بکوژرێتەوە لـەجیاتی ئـەو، ئەگـەر نەشـی کـوژێ ئـەی چـی بکـا؟ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (خـودای گـەورەو سـەروەر، سـەبارەت بەبابـەتی تـۆو ژنەکـەت ئایـەتی قورئانی ناردۆتە خوارەوە، برۆ ژنەکەت بهێنە!).

سەهل فەرمووی: مـن لـەناو خەڵکەکـەدا بـووم، لەخزمـەت پێغەمبـەر، کـە فـەرمانی بەهـەردوکیان کـرد، بـە ژنو بەپیاوەکـەی لـەناو مزگـەوتا شـەرە نـەفرینیان کـرد، بـەپێی ئـەو دەسـتوورەی کـە خـودا لـە قورئانـدا دیـاریکردووە، لەئایـەتی شەشـەما لـە سـوورەتی نـوور، کاتـێ عـوومیمرو ژنەکـەی لـە شـەرە نەفرینەکە لێ بوونەوە، عوومیمر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئـەم ژنـە لەپاش ئەم رووداوو کەینو بەینەو ئابڕووچوونە قەبووڵ بکەمەوە، ئـەوە واتـای وایـە کـەمن بوختیـانم بـۆیکردووە، ئـیتر سێبەسـێ تـەڵاقی دا، بەرلـەوەی کـە پێغەمبەر فەرمانی پێ بکاو پێی بڵێ کە تەڵاقی بدا، ئیبنـو شـەهاب دەفـەرموێ: ئیتر لەدوا ئەو ژنو مێردە، جیابوونەوەو تـەڵاق بـوو بـەباوو دەسـتوور لـەنێوان ئەو ژنو مێردانەدا کە شەرە نەفرین دەکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٢٢٥٠، ٢٢٥١}.

٩٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضی الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلی الله علیـه وسلم) لِلْمُتَلاَعِنَيْنِ: « حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا »، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ مَالِي؟ قَالَ: « لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ مِنْهَا ». {الحديث: ٣٧٢٧

= ٣٧٢٤ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٩٥ = ٥٣١٢، ٥٣١١، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠. أبو داود. طلاق: ٢٢٥٧. نسائي. طلاق: ٣٤٧٦. تحفة الأشراف/٧٠٥١}: [٩٥٣]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو ژنو مێردەی فەرموو، کە لەناو مزگەتەکەی پێغەمبەردا، شەڕە نەفرینیان کرد: حیسابو لێپرسینەوەتان لەودنیا لەسەر خودایە، لەم دنیا خوانەبێ کەس نازانێ کامتان راست دەکەنو کامتان درۆ دەکەن، دیارە کەئێوە یەکێکتان درۆ دەکەن، ئەی مێرد! ئیتر ئەم ژنە لەژنی تۆ دەرچوو، وەمافت نەما بەسەریەوەو فڕت پێیەوە نەماوە).

پیاوەکەی مێردی ژنەکەیش گوتی: ئەی ماڵەکەم، ئەی ئەو ماڵەی کە لەجیاتی مارەیی داومەپێی، ئەوەم ناکەوێتەوە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ماڵت ناکەوێ، ئەو مارەیەی کە داوتەپێی بووە بەهی خۆی، چونکە ئەگەر قسەکەت راست بێ ئەوە ماڵەکەی دەکەوێو ئەو مارەییە دەبێ بەهی خۆی لەباتی ئەوە کە لەمەو پێش ژنت بووەو لە باخەڵت گرتووەو بەحەڵاڵی لەگەڵی دروستبووی، خۆ ئەگەر بوختیانیشت کردبێ بۆی، ئەمەیانت خراپترو زیاتر بیانووت دەبڕێو ڕێگەی تەشقەڵەت نامێنێ بەوژنە).

٩٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضی الله عنهما): أَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَهُمَا وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِأُمِّهِ قَالَ نَعَمْ. {الحديث: ٣٧٣١ = ٣٧٢٩ فم = فتح المُلْهِم بخاري. طلاق: ٥٣١٥،

---

[٩٥٣] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٩٥ - ٥٣١٢ بخاری مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٨ - ٣٧٢٧ شیحا. (بخاری — ٥٣/٦٨).

٦٧٤٨. أبو داود. طلاق: ٢٢٥٩. ترمذي. طلاق: ١٢٠٣. نسائي. طلاق: ٣٤٧٧. ابن ماجة. طلاق: ٢٠٦٩. تحفة الأشراف: ٨٣٢٢} : [٩٥٤]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ شەڕە نەفرینی کرد لەگەڵ ژنەکەیدا، پێغەمبەر جیای کردنەوە لەیەك‌و منداڵەکەی کە لەبەینیانا بوو دای بەدایکی‌و لکانی بەوەو لەمنالی مێردەکە دەرچوو).

## روونکردنەوە:

١- منداڵ، لەپاش شەڕە نەفرین، ئەگەر مێردی دایکی حاشای لێ بکا، بەمەرجێ، یا لەسکی دایکیدابێ، یاتازە لەدایك بووبێ، ئیتر دەبێ بەمنالی دایکی‌و لەمنالی مێردەکەی دەردەچێ.

٢- هەندێ زانا دەفەرموون: (ئەگەر ئەو منالە کچ بێ مارەی دێ لەو مێردەی کە شەڕە نەفرینی کردووە لەگەڵ دایکیدا، بەڵام ئەم رایە بەناوازەو ناباو دادەنرێ، رای دروست فەرمایشتی جەماوەری زانایانە، کە دەفەرموێ: (کچی ژن گوێزرابێتەوە یانا، ئەگەر مێردەکەی شەڕە نەفرینی لەگەڵ کرد، ئەوکچە لەو پیاوە حەرامەو بەخۆیی دادەنرێ، بەلایەنی کەمەوە زڕکچیەتی، هەر هیچ نەبێ کچی ژنەکەیەتی، کچی ژنیش دەستنوێژی لەمێردی دایکی ناشکێ‌و مارەی لێی نایەت). {بڕوانە: موغنی موحتاج، شەرحی مینهاج بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٧٥. باب: مایحرم من النکاح}.

---

[٩٥٤] بخاری. طلاق: ٥٣١٥ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٩ = ٣٧٣١ شیحا. (بخاری — ٣٥/٦٨).

شت شت رادەکێشێ لەمەزهەبی شافیعیدا کچی پەیدابوو لە ئاوی داوێنپیسی پیاو، بەو پیاوە دەشێ، چونکە ئاوی داوێنپیسی بێ ڕێزەو بێ بایەخە!).

بەڵام بەهەرحاڵ ئەگەر پیاوەکە، لەپاشا دایکی ئەو کچە مارەبکاو بیگوێزێتەوە، ئەو کچەی لێ حەرام دەبێ، چونکە دیسان بەلایەنی کەمەوە دەبێ بەزڕکچی! هەروا باشترین چارە لەم لایەنەوە بۆ کەسێ کە دووچاری ناشایستەیەکی ئاوابێ.

أ/ ئەگەر دایکی کچەیشی مارەنەکرد، بۆئەوەی ببێ بە مەحرەم و خۆیی بۆی، کەسێکی مەحرەمی وەك دایك، یاکچ، یاخوشك، یاژنی خۆی شیربدا بەو منالە کەلە تۆماوی داوێنپیسی خۆیەتی.

ب/ تەقلیدی رای جەماوەری زانایان دەفەرموون: کچی دروستبوو لەئاوی داوێنپیسی لەخاوەن ئاوەکە حەرامە. {بڕوانە: موغنی موحتاج شەرحی مینهاج، بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٧٥. باب: مایحرم من النکاح}.

## تێبینی:

ئەم حاڵەتە گەرچی لە وڵاتی ئێمەو لەوڵاتی ئیسلاما زۆر کەمەو بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ، بەڵام بمانەوێ و نەمانەوێ هەیە، وەمن و زۆر کەسی تری وەکوو من بەچاوی خۆمان ئەم جۆرە حاڵەتانەمان دیوە، وە ئەو کچە گەورە بووەو دراوە بەشوو، وە لەوماوەدا لای باوکە ناشەرعییەکەی بووە! بەڵام ئەوەی وا لەبەرچاو لە وڵاتە ناموسوڵمانەکانا، منالی زۆڵ، لە هەندێ وڵاتا دوو لەسەر سێی سەرجەمی دانیشتوانی هەندێ وڵاتە، وە لەوشوێنانە موسوڵمان هەیە زۆریش نەوەك کەم، وە مرۆڤیش گای ڕەش نییە هەتا هەتایە لەیەك پێستابێ،

جا ئەگەر موسوڵمانێ تووشی ئەم جۆرە بەلواعاممەیە بوو، باکاتی تەوبەو پەشیمانیو گەڕانەوە بۆ وڵاتی ئیسلامی لەبیربێ، ئەگەر منالی وای بوو، بەشێوەیێ لەشێوەکان بیکا بە مەحرەمی خۆی.

٩٥٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ ذُكِرَ التَّلاَعُنُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ فِي ذَلِكَ قَوْلاً ، ثُمَّ انْصَرَفَ ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ يَشْكُو إِلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً ، فَقَالَ عَاصِمٌ مَا ابْتُلِيتُ بِهَذَا إِلاَّ لِقَوْلِي ، فَذَهَبَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي وَجَدَ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ وَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مُصْفَرًّا قَلِيلَ اللَّحْمِ سَبْطَ الشَّعَرِ ، وَكَانَ الَّذِي ادَّعَى عَلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَ أَهْلِهِ خَدْلاً آدَمَ كَثِيرَ اللَّحْمِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « اللَّهُمَّ بَيِّنْ » . فَجَاءَتْ شَبِيهًا بِالرَّجُلِ الَّذِي ذَكَرَ زَوْجُهَا أَنَّهُ وَجَدَهُ ، فَلاَعَنَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَهُمَا. قَالَ رَجُلٌ لاِبْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمَجْلِسِ هِيَ الَّتِي قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « لَوْ رَجَمْتُ أَحَدًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ رَجَمْتُ هَذِهِ » . فَقَالَ لاَ تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَتْ تُظْهِرُ فِي الإِسْلاَمِ السُّوءَ ».[٩٥٥]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: باسی شەڕە نەفرین، لەنێوانی ژنو مێردداکرا، عاصیمی کوڕی عەدی، لەم بارەیە قسەیەکی نابەجای کرد، ئەوجا ڕۆیشت، پیاوێ لەهۆزەکەی عاصیم دەچێ بۆلای، سکاڵا لەبارودۆخێکی ئاوا دەکات، کە پیاوێکی گرتووە بەسەر ژنەکەی خۆیەوە. عاصیم گوتی: ئەوا لەسەر ئەو قسە نابەجایەی کە لەم بارەیەوە لەخزمەت پێغەمبەردا کردم، خودای گەورە پێی نواندم، جا عاصیم پیاوەکە دەبات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەباسی داستانی ژنەکەیو ئەو پیاوەی بۆیکرد، کە بەسەر ژنەکەیەوە گرتبووی!

---

[٩٥٥] بوخاری. طلاق/٥٣١٠، ٥٣١٦، ٦٨٥٦، مسلم ترقیم وتخریج الشیخ خلیل مأمون شیحا: ٣٧٣٧. (بخاری – ٣١/٦٨).

مێردەکــە زەردەڵەیـــەکی سیـــسەڵەی لەڕکەڵـــەبوو، قـــژی خـــاوبوو، تۆمەتبارەکـەیش قەویلکەیـەکی سـەوزەڵەی گۆشـتن بـوو. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەی خودایـە! حـوکم و بڕیـاری ئـەم پرسـە تازەیەمان بۆ روون بکەرەوە!).

جا کەژنەکە مناڵەکەی بوو، شێوەی مناڵەکە، لـە تۆمەتبارەکەی دەکـرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەنێوانی ژنەکـەو مێردەکەیـدا، کرداری شەڕە نەفرینی سازدا.

پیاوێ کە لەکۆڕی دانیشتنەکەدا بوو، بە ئیبنو عەبباسی گوت: ئایا ئەمـە ئەو ژنەیـە، کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەبارەیـەوە فـەرمووی: (ئەگەر کەسێکم بەبێ بەڵگەو شایەت رەجم بکردایە، ئەم ژنەم رەجم دەکرد؟!).

ئیبنـو عـەبباس فـەرمووی: (نـەء، ئەمـە ئـەو ژنـە نـەبوو، ئـەوە ژنێکـی تربوو، کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وای پـێ فـەرموو، بەئاشـکرا لەبەرچاوی موسوڵمانان بەدڕەوشتیو داوێنپیسی ئەنجام دەدا).

**روونکردنەوە:**

لێـرەدا بـۆ چارەسـەری کێـشەیەکی گرنگـی هاوچـەرخ، ئـەم چـەند دەقو راوبۆچوونی زانایان دەنووسین:

**یەکەم:** ئیمامی نـەوەوی (پـڕ گۆڕەکـەی لـەنوور بـێ) لـەبارەی ئـەم ژنـەوە دەفەرموێ: (ئەم ژنـە ناسـراوە بـە بەدڕەوشـتیو بەئاشـکرا داوێـن پیـسی ئـەنجام داوە، بەڵام بەبەڵگـەو شـایەت نەچەسپاوە لەسـەری کـە حـاڵی وایـە، وە خۆیـشی پێڵێنانی ئاشکرا نەکردووەو بە فەرمی ددانی بەشتی وادا نەناوە!).

ئەوجا پێشەوا نەوەوی دەفەرموێ: (ئەمەیش ئەوە دەسەلمێنێ: کە تۆڵەی یاسایی‌و حەددی شەرعی، هەر حەددێ بێ، بە وردە بەڵگە (قەرائین)و نیشانەو بە شۆڕەتی خراپی ناو کۆمەڵگا، جێبەجێ ناکرێ، بەڵکوو حەددی شەرعی کاتێ جێبەجێ دەکرێ، کە بەشایەت‌و بەڵگە بچەسپێ، یا کەسەکە خۆی پێ لەتاوانی خۆی بنێ).

**دووەم:** بۆ تەواوکەری ئەم بابەتە ئاڵۆزە شەرم ئاوەرە، کە هیچ کۆمەڵگایەك لێی خاڵی نییە، وەلەم سەردەمەی ئێمەدا واپەرەی سەندووە، بووە بە قوڕولیتەی زستان، مەگەر کەسێ خودا بیپارێزێ دەنا کەم تا زۆر، پرژو پریشکی بەری دەکەوێ، جا بۆ تەواوکەری ئەم بابەتە، کەبووە بە گەورەترین گرفت‌و کێشەی سەردەم، ئەم فەتوایەی ئیمامی رافیعیش (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەنووسین، لە شەرحی بلوغ المرام/٢، ژمارە: ١١٣٢ راگوێزی دەکەین. پێش ئەمە عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم:

أ- ئەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵەکانی تر جیادەکاتەوە، تەنیا ئایینە، رەفتاری شیرین‌و رەوشتی بەرز، بەری باخی باوەڕە بەخوداو بەڕۆژی دوایی، دەنا مرۆڤ لە ئاژەڵ ئاژەڵترە، نەچاکە بەچاکە دەزانێ‌و نەخراپە بەخراپە دەزانێ، تاقە پێوەرێ بۆ چاکەو خراپە، تەنیا ورگ‌و دامەنیەتی‌و بەس، ئەمەیش خوویەکی ناخی جێگیری زاڵی ناو ئاژەڵەکانە بەشێوەی گشتی!!

ب- ئێمەی ئیسلامپەروەر، بمانەوێ‌و نەمانەوێ گەڕاوینەتەوەو چووینەتەوە سەردەمی مەککەیی، بەتەواوی بواری پەخشی نووری ئیسلامیشمان بۆنییە، نەوەك توانای خەبات بە چەك‌و بەشیرو تیر، بەڵکوو مەودای خەباتی قەڵەمیشمان نییەو (جهاد الكلمە)یشمان هاکا لێ قەدەغەکرا، جا لەم روانگەیەوە واپەسەندو لەبارترە، کە ئێمە لەم قۆناغەدا، رۆڵی پۆلیس‌و داواکاری گشتی‌و

سیخوڕ نەبینین‌و، لەباتی ئەوەی کە پەردەی خودا لەسەر بەندەکانی، هەڵبدەینەوەو تۆمەت‌و جمین‌و نەفرەت دابەش بکەین، لەباتی ئەوە، لە کەشێکی هێمندا سەرقاڵی لاواندنی جەماوەربین‌و ڕێگەی ڕاستیان بۆ روونبکەینەوەو خوداو پێغەمبەری خوداو ئایینی خودایان لەلا شیرین بکەین‌و بەکردەوەو بەکردارو بە رەفتارو بە گوتار بیسەلمێنین، کە ئێمەی ئیسلامپەروەر لەدژی کەس نین‌و شەڕفرۆش‌و شۆق وەشێن نین، بەڵکوو دۆستترین دۆستی کۆمەڵ‌و کۆمەڵگاین، بەهەموو چین‌و توێژو بەشەکانیەوە، ئێمە رۆڵی فریشتەو پەری‌و پزیشك دەبینین‌و بەس! ئەمەیش فەتواکەی ئیمامی رافعییە:

وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا { أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ اِمْرَأَتِي لَا تَرُدُّ يَدَ لَامِسٍ. قَالَ: "غَرِّبْهَا". قَالَ: أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي. قَالَ: "فَاسْتَمْتِعْ بِهَا"} . رَوَاهُ أَبو دَاوُدَ، وَالْبَزَّارُ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ. {أبو داود. نكاح: ٢٠٤٩. نسائي ١٧٦/١. ابن ماجة: ٢٧٤٣. صحيح أبي داود: ١٨٠٤. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧١ = شيحا = ٣٧٤٧}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەم دەست بەرووی کەسەوە نانێ، بەنەخوێنی شلە؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (بەرەڵایکە) واتە: تەڵاقی بدە. گوتی: دەترسم دوایی دڵم بۆی لێ بدا! فەرمووی: (کەواتە ڕابوێرە لەگەڵیا، هەتا دڵت لێی هەڵدەکەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٨}.

**روونكردنەوە:**

١- ئەم فەرموودەیە تەندروستە، روونكردنەوەیەكی باشی دەوێ، گەلی ئیسلام وەك دەریای ئۆقیانووس وەهایە، لەهەموو جۆرە كەسێكی جیاجیای واتیادا، بمانەوێو نەمانەوێ، ئەم جۆرە حاڵەتانەیش روودەدا

جا لەم سۆنگەیەوە، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەئیمامی رافیعی، كە دائەنرێ بە گەورە زانای شافیعیو لەگەڵ ئیمامی نەوەویدا پێیان دەگوترێ: (الشیخان) ئیمامی رافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر دەركەوتو بە بەڵگە چەسپا، كە ژن داوێنپیسی ئەنجام دەدا، وەمێردەكەی نەیدەتوانی كەلێی جیا ببێتەوە، ئەوا پێویست نییە، لەسەری كە تەڵاقی بدا). واتە: دەتوانێ گوزەرانی لەگەڵ بكا هەتا لێی بیزار دەبێ، وەبەپێی توانا رێگەی ئەوەی لێ بگرێ.

٢- هەندێ لە سەروەرییەكانی ئیمامی رافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ).

ناوی عەبدولكەریمی كوڕی موحەممەدی كوڕی عەبدولكەریمی كوڕی فەضلی كوڕی ئەلحەسەنی ئەل – قەزوێنییە، ناسراو بە (الإمام الجلیل أبو القاسم الرافعی).

رافیعی زانایەكی گەورەی مەوسووعی بوو، لەهەموو زانستەكانا مەلەوان بوو، لەتەفسیرو زانستەكانی قورئانا، لەحەدیثو زانستی فەرموودەشوناسیدا، لەشەرعو فیقهدا، ئۆقیانووسێ بوو بۆخۆی، بگرە زانستە فیقهییەكان فەوتا بوون، ئەو زیندووی كردنەوە، زانایەكی پایەبەرزی خاوەنی وەرعو تەقواو زوهد بوو، وەرعی لەناوی شەوی دەكرد، كەراماتی شەرعی زۆری لێ بینراوە. یەكێ لەشاگردەكانی كە فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە (الحافظ عبدالعظیم المُنذِری/ مصنِف مختصر صحیح مسلم للمنذری) بوو. ئیبنو صەلاح دەڵێ:

(لەباوەڕی منا، زانای وا، لەهەمووو وڵاتی عەجەمدا، نموونـەی نییـە). سـوبوکیش دەڵێ: (بەبێ گومان کەخۆی هەروایە!) ئیمامی نەوەی (ڕەحمەتی خودای لێ بـێ) دەفەرموێ: (ڕافیعی یەکێکە لەو پیاوچاکانەی نەتـەوەی ئـیسلام، کەشـاد بـوون بەپلەی دامەزراوانو یەقینی تەواو، کەراماتی شەرعی زۆری لێ بینـراوە!).

لەقەزوین کۆڕی پەخشی تەفسیری قورئـانو بڵاوکردنـەوەی فـەرموودەی هەبوو، هەمیشە کۆڕی پەخشی زانستی دەنگوت پوورەی هەنگە.

ئیبنو خەلەکان دەفـەرموێ: (پێـشەوا ڕافیعـی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) لەمانگی ناو جەژنانی ساڵی (٦٢٣)ی کۆچی لە قـەزوین، مـەرگ بـووە بـەمیوانیو مردووە، هەر لەم ساڵەدا، سوڵتان خوارەزم شـاه جەلالـەدین، کـەرج لـە (تلفـیس) غـەزا دەکـا، لەشەڕەشمـشێری زۆردا خـوێن بەدەسـتیەوە وشـك دەبێتـەوە، کاتـێ جەلالـەدین شـاه لەقەزوینـەوە ڕەت دەبـێ، پێـشەوا ڕافیعـی دەچـێ بەپیریـەوە، سوڵتان ڕێزێکی شایانی لێ دەگـرێ، ڕافیعـی پێـی دەڵـێ: بیـستوومە کـە ئەوەنـدە جەنگت لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام کردووە، خوێن بەدەستەوە وشـك بۆتـەوە، ئـەو دەستەتم بـدەرێ هەتا ماچی بکەم، خوارەزم شاه پێـی دەڵـێ: بـەڵکوو تـۆ دەسـتی خۆتم بدەرێ هەتا من ماچی بکەم، جا سـوڵتان جەلالـەدین دەسـتی ڕافیعـی مـاچ دەکا، وەماوەیێ بەیەکـەوە گوفتوگـۆ دەکـەنو ئـەوجا ڕافیعـی سـواری وڵاخەکـەی دەبـێو دەڕوا، وڵاخەکـەی سـەرسمێ دەداو ڕافیعـی دەگلێنـێو ئـەو دەسـتەی کەسوڵتان ماچی دەکا، تووشی ئازار دەبێ.

ڕافیعی دەفەرموێ: سوبحانەڵڵا، پاکیو بێ گەردی هەر بۆ خودایەو بەس! کاتێ سوڵتان ئەم دەستەی ماچ کردم، کەمێ هەستم بەمەزنایی کرد، بەڵام خـودا بەبێ وچان پێی نواندمو تۆڵەی ئەوەی لێ سەندم!!.

پێشەوا ڕافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) شەوێ خەریکی نووسین دەبێ، چرا نابێ ڕۆشنایی بۆ بکا، لەو کاتەدا بەفەرمانی خودا، لقی درەختێ دەبێ بەچرا بۆی‌و لەبەری دەست دەکا بەنووسین!

لەم بابەتە: جارێ مەلایێ، شەوێ خەریکی نووسین دەبێ، بەژنەکەی خۆی دەڵێ: ئەو چرایەم بۆ بگرە هەتا ئەم نوووسینە تەواو دەکەم، ژنەکەی دەڵێ: ئەم نووسینە نەبڕایەوە، چراکە ناگرم!! پشیلەیێ لەوێ دەبێ مەلاکە بەپشیلەکە دەڵێ: نادەی پشیلەکە تۆ ئەو چرایە بگرە! پشیلەکە چراکەی بۆ دەگرێ. مەلاکە بەژنەکەی دەڵێ: من مەبەستم ئەوەیە کەتۆش خێرت بگا، دەنا چراگر زۆرە!!!

## کۆمەڵێ لەبەرهەمە قەڵەمیەکانی پێشەوا ڕافیعی:

١- الشرح الكبير، کەناسراوە بە (الفتح العزيز فى شرح الوجيز).

٢- الشرح الصغير.

٣- المحرّر.

٤- شرح مسند الشافعي.

٥- التذنيب.

٦- الأمالى.

٧- الإيجاز فى اخطار الحجاز.

٨- المحمود فى الفقه (٨ مجلدات). (بڕوانە: طبقات الشافعية الكبرى للإمام عبدالوهاب السبكى).

٣- ئەم فەرموودەیە، نەسائی لەڕێگەیێ ترەوە لەئیبنو عەبباسەوە دەیگێڕێتەوە:

دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (کەواتە تەلاقی بدە) کابرا گوتی: بەبێ ئەو ناتوانم ئۆقرە بگرم! فەرمووی: (دەی بیهێڵەرەوە!). {صحیح سُنَنُ أبی دَوُد: ٣٤٦٥}.

**سێیەم:** ئەمەیش کۆمەڵێ دەقی ترە، چارەسەری ئەم دیاردە قێزەونە دەکەن‌و بەئاشکرا بە موسوڵمان دەڵێن: پزیشکی تیمارکەر بن‌و مەردوم لە چەورتوم رزگاربکەن‌و تێلاوەشێن‌و توندڕەو مەبن‌و نموونەی هێمنی‌و نەرمونیانی‌و مرۆڤ دۆستی بن‌و تادەتوانن کار بۆ موسوڵمانان ئاسان بکەن‌و باریان گران مەکەن، دانایانەو زانایانە سرپۆش بن‌و پەردەی خودا لەسەر بەندەکانی خودا هەڵمەدەنەوە، هەتا بۆتان دەکرێ، بە وشەی شیرین چارەسەری گرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکان بکەن‌و هەوێنی هیواوو ئومێدو خۆشی‌و مژدەی خۆش لەدڵی خەڵکا بڕوێنن‌و خۆتان لەئاستی گوناهی خەڵك بێئاگا بکەن، ئەگەر توانای یارمەتیتان هەبوو ئەوا باشە، دەنا چیلکە لەپیسایی تێ وەرمەدەن! چونکە پیسایی تا چیلکەی تێ وەردەی بۆگەنی زیاتر دەردەچێ!!

وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حَصِينٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) { أَنَّ اِمْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتْ نَبِيَّ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) —وَهِيَ حُبْلَى مِنْ اَلزِّنَا—فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اَللّٰهِ! أَصَبْتُ حَدًّا، فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، فَدَعَا نَبِيُّ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَلِيَّهَا. فَقَالَ: "أَحْسِنْ إِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ فَائْتِنِي بِهَا" فَفعَلَ. فَأَمَرَ بِهَا فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا، فَقَالَ عُمَرُ: أَتُصَلِّي عَلَيْهَا يَا نَبِيَّ اَللّٰهِ وَقَدْ زَنَتْ؟ فَقَالَ: "لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِّمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ اَلْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدَتْ أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا لِلّٰهِ؟ }". رَوَاهُ مُسْلِمٌ. {مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٣٩ = شیحا: ٤٤٠٧، ٤٤٠٨ = صحيح مسلم/١٦٩٦}:

له موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

بورەیدە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مالیکی کوڕی مالیکی ئەسلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆر ستەمم لەخودی خۆم کردووە، داوێنپیسیم کردووە، دەمەوێ کەتۆ پاکم بکەیتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوجارە ڕەتی کردەوە، جا بۆ سبەینێ هاتەوە خزمەتی، گوتیەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووە، پاکم بکەرەوە، بۆ جاری دووەم پێغەمبەر رەتی کردەوە، وەڵامی نارد بۆ هۆزەکەی فەرمووی: (ئایا کەموکوڕی لەئەقڵ و هۆشیدا گومان دەبەن؟ یان نەنگێکی تری تیادا گومان دەبەن؟). گوتیان: ئەوەی کە ئێمە ئاگامان لێیەتی هۆشی تەواوە، بەپێی بۆچوونی ئێمە لەپیاوچاکانی ئێمەیە، جا بۆ جاری سێیەم هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردیەوە بۆلای هۆزەکەی، پرسیاری لەبارەی حاڵی ماعیزەوە لێ کردنەوە، دیسان گوتیانەوە: هیچ گومان نابەین، نە لەخۆیا، نەلەئەقڵیدا، جا بۆ جاری چوارەم کەماعیز هاتەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە بەردباران بکرێ، چاڵێکی بۆ هەڵکەندرا، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەردبارانیان کرد.

فەرمووی: ژنێکیش لەهۆزی غامید هات، عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووە، بەجێبەجێ کردنی حەددی شەرعی پاکم بکەرەوە، پێغەمبەریش گەڕاندیەوەو حەددی بەسەردا جێبەجێ نەکرد، جا بۆ سبەینێ ژنەکە هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی

دەمگەڕێنیتەوە رەنگ بێ وەك چۆن ماعیزت گەڕاندەوە منیش بگەڕێنیتەوە، سوێندم بەخودا، سکم پڕە لەکرداری داوێنپیسی.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی کەهەر واز ناهێنیتو ناتەوێ نهێنی خۆت بپۆشیت، دە ئێستا بڕۆ هەتا منالّەکەت دەبێ).

فەرمووی: جا ژنەکە منالّەکەی بوو، لەپارچەیێ پەڕۆدا منالّەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو گوتی: ئەمە منالّەکەمە بوومە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دە ئێستە بڕۆ شیری پێ بدە، هەتا لەشیر دەبڕێتەوە).

جا کاتێ ژنەکە منالّەکەی گەورە کرد، هەتا لەشیر بڕییەوە، منالّەکەی هێنایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەتێ نانی بەدەستەوە بوو دەیخوارد گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە منالّەکەمە، ئەوەتا بڕیومەتەوە لەمەمكو ئەوەتا نانو ئاو دەخوات، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منالّەکەی دایە دەست پیاوێ لەموسولّمانان، کەسەرپەرشتی بکا، ئەوجا فەرمانی کرد، چالّێکیان بۆ ژنەکە هەلّکەند، قولّیەکەی هەتا سەر سینگی بوو، وەفەرمانی کرد بەخەلّکەکە بەردبارانیان کرد، لەوکاتەدا خالیدی کوڕی وەلید بەردێکی هێنا کێشای بەسەری ژنەکەدا، خوێنەکە فیچقەی کرد، چوو بەدەموچاوی خالیددا، لەسەر ئەوە خالید جمێنی بە ژنەکە دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جمێنەکەی خالیدی بیست کەدای بەژنەکە، فەرمووی: (هێواش ئەی خالید! بەوکەسە کەگیانی منی بەدەسە، ئەم ژنە تەوبەیەکی جوانی وەهای کرد، ئەگەر باجگرو گومرگخۆریش تەوبەی وا جوان بکەن، خودا لێیان خۆش دەبێو تەوبەکەیان قەبووڵ دەکا).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو، تەرمی ژنەکەیان ئامادە کرد، وەك شۆردنو کفن کردن، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی

خوداى لەسەر بێ) فەرمانى فەرموو، تەرمى ژنەکەیان هێنا، خۆى نوێژى مردووى لەسەر تەرمەکەى کرد، ئەوجا لەگۆڕستانى موسوڵمانان تەرمەکەیان ناشت. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦١ ج/٤}.

ئەمەیش گێڕانەوەیەکى ترى ئەم باسەیە:

عیمرانى کوڕى حوصەین (ڕەزاى خودا لەخۆى و لەباوکى بێت) فەرمووى: ژنێکى جوهەینەیى زۆڵێکى لەسکدا بوو، هاتە خزمەتى حەزرەت (درودى خوداى لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەى ڕابەرى خودا! شایانى حەددەم حەددم لێ بدە، پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) هەقدارى ژنەکەى بانگ کردو پێى فەرموو: (باش بە بۆى و چاك بە لەگەڵیدا کاتێ سکەکەى دانا، ژنەکەم بۆ بهێنە، ئەویش ئاواى کردو فەرمایشتەکەى پێغەمبەرى بەجێ هێنا، ئینجا پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمانى فەرموو ژنەکەیان بەجلەکانى خۆیەوە شەتەکدا، هەتا لەکاتى سەنگەسارکردنەکەدا، لەشى دەرنەکەوێ، ئینجا فەرمانى کرد ژنەکەیان بەردەبارانکرد، لەپاشا پێغەمبەر خۆى نوێژى مردووى لەسەر تەرمەکەى کرد. عومەریش (ڕەزاى خوداى لێ بێ) عەرزى حەزرەتى کرد: ئەى پێغەمبەرى خودا! ئەمە داوێن پیسى کردووە، کەچى تۆ نوێژى مردوو لەسەر تەرمەکەى دەکەى!؟ فەرمووى: (درودى خوداى لەسەر بێ) (ئەى عومەر! بەڕاستى ئەمە تەوبەیەکى وەهاى کردووە ئەگەر بێت و دابەش بکرێت بەسەر حەفتا کەس، لەخەڵکى مەدینەدا، بەشى هەموویان دەکا، تەوبە لەوە باشتر دەبێ چى بێت کەگیانى خۆى بەخشى لەبەر ڕەزامەندى خوداى گەورە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦١ ج/٤}.

**روونكردنەوە:**

١- بڕوانــــە: (مختـــصر صـــحيح مـــسلم/٣، لاپـــەڕە: ٣٠٤، ژمـــارە: ١٣٤٩). روونكردنەوە.

٢- زاناكـان دەفـەرموون: (الحُـدُودُ جَـوَابِرُ) واتـە: حـەددى شـەرعى بريتـى گوناه دەكەوێ، وەك پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسـەر بێ) لـە فەرموودەيـەكى تەندروستدا دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ تووشى تاوانى شيرك، يـان دزيـن، يـان تـاوانى داوێنپيـسى، يـا كوشـتن بـوو، يـا هـەر تـاوانێكى تـر، وە تەوبـەى لێ كـرد، ومتۆڵەى شـەرعى ئـەوەى لەجيهانـدا لێ سـەندرا، ئـەوە ئـەو تۆڵـەو حـەددە دەبـێ بەكەفارەت بۆىو تاوانەكەى دەسڕێتەوە). {بڕوانـە: تـاج/٣، زنجيرە: ١٠١، ژمـارە: ٢٤٠٠}.

٣- بڕوانە ژمارە: (١٢٣٣ - روونكردنەوە)و ژمارە: (١٢٢١ - روونكردنەوە) لە شەرحى بلوغ المرام، هەروا بڕوانە: موختەصـەرى صـەحيحى موسـليم/٣، ژمـارە: ١٣٤٩ لەگەڵ روونكردنەوەكەيدا.

٤- كاتێ ماعيز لەسەر راوێژى هـەززال، هـات بـۆلاى پێغەمبـەرو داواى لـە پێغەمبەر كرد، كە بەحەددى شەرعى، كـە بـەردەباران بـوو بـۆ مـاعيز، لـەتاوانى داوێنپيـسى پـاكى بكاتـەوە، پێغەمبـەر (درووودى خـوداى لەسـەر بـێ) بـەماعيزى فـەرموو: {وَيْحَكَ! ارْجِعْ فَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ وَتُبْ إِلَيْهِ – صحيح مسلم رقم/٤٤٠٦ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا}.

واتە: پێى فـەرموو: (هـاوار لـەخۆت چـۆن قـسەى وا دەكـەيت بـڕۆ، داواى لێخۆشبوون لەخودا بكـەو تەوبـەى لێ بكـەو پەشـيمان بـەرەوە ئـەوەت باشـترە!). هەروا بەژنە غاميديەكەشى وا فـەرموو: {وَيْحَكِ! ارْجِعِي فَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ – صحيح مسلم ترقيم شيحا: ٤٤٠٦}.

وه بەهەززالی فەرموو: کە بەماعیزی گوتبوو: کەبچیّ بۆلای پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو لەسەر خۆی ببیّ بەشایەتو داوای خۆپاك کردنەوە لە پێغەمبەر بکاو ددان بنێ بەتاوانەکەیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم هەززالەی فەرموو: {يَاهَزَّالُ! لَوْ سَتَرْتَهُ بِرِدَائِكَ لَكَانَ خَيْراً لَكَ!} (المنتقى شرح الموَطَّأ – مبحث ماجاء في الرجم + المسند الجامع لأبي الفضل).

واتە: باشتر وابوو، کە فەرمانت پێ بکردایە کە تەوبە بکاو پەردە لەسەر نهێنی خۆی هەڵنەداتەوەو نهێنی خۆی بپۆشێ، تەنانەت بۆ ئەوەی کە کەسێ چاوی لەتاوانەکەی نەبێو نەبێ بەشایەت لەسەری، تەنانەت لەحاڵی وادا، لەکاتی ئەنجامدانی زیناکردنەکەدا، بەعاباو جلەکانی خۆت، ماعیزو ژنەکەت دابپۆشیبایە هەتا کەس بەم کارەیان نەزانێو نەبێ بەشایەت لەسەریان، ئەوەت زۆر باشتر بوو لەمەی کە کردتو ماعیزت تووشی بەردەباران کرد!!. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٢٣٩٥}.

آ- کەواتە: بوون بەشایەت بۆ داوێنپیسی کارێ باش نییە، وەبەپێی توانا شایەتی شتی وا، شایەتییەکەی نەداو بەخراپە باسی ئەو کەسە نەکا، مەگەر لەکاتی ڕاوێژ پێ کردندا، ئەویش بەمەرجێ شایەتییەکە بۆ خودا بێ، وەك کەسێ بڵێ: من کچ دەدەم بەو پیاوە تۆ دەڵێی چی؟

ب- مەلاو مامۆستای ئایینیو کەسانی تر، ئەگەر کەسێ لەم ڕووەوە پرسیاری لێ کردن، با پێی بڵێن: پەردەی خودای گەورەو میهرەبان لەسەر خۆت هەڵ مەدەرەوەو برۆ تەوبەی لێ بکەو داوای لێخۆشبوون لەخودا بکەو تەواو.

ج- ئەمەیش واتای وا نییە، کە ئیسلام ڕێگە لە داوێنپیسی ناگرێو بەری بۆ بەرەڵا دەکا، بەڵکوو بەپێچەوانەوە، ئیسلام لەهەموو ڕوویەکەوە، بەهەموو هۆکارێکی ڕەوا، ڕێگە بەمونکەرو کاری ناشایشستە نادا، لەماڵەوە، لەمزگەوت،

لــەهۆكاری ڕاگەیاندنــەكان، بەدەســتو بــەزمانو بەهــەموو هۆكــارێكی ڕەوا، پێـشگیری لـەكاری ناشایـستە دەكـاو، هـەوڵ دەدا كـە كۆمەڵگایـەكی تەندروسـتی نموونەیی پاكو خاوێن گەشە پێ بدا.

جا لەم سوانگەو روانگەیەوە، دەردەكەوێ: ئەم جۆرە بابەتـە، وا پەسـەندە زۆر لێی نەكۆڵێتەوەو خۆتی پێوە خەریك نەكەیو وا لـەبارترە كە هـەر خۆتی لێ كەڕبكەی، چونكە كۆمەڵو كۆمـەڵگا، تـەواو گەنـدەڵ بـوونو كۆمـەڵێ شایەرو بەناو نووسەر بانگەشە بۆ بەرەڵایی نێرو مێیی دەكەنو بەو پـەڕی شارسـتانیو شانازی دادەنێن!! بەئاشـكرا، بەشـێوەی دەسـتووری، مـەیو بـادەو تلیـاكو مـاددە سـڕكەرەكان دەخورێنــەوە، بگـرە شـوێنی تایبــەتی هەیــە بـۆ هــەموو جـۆرە بەدڕەوشـــتییەك، وەك تیـــاترۆو قەحبەخانـــەو خانـــەی لەشفرۆشـــانو ئارەقخانەو....تاد. وابڕوات هاكا نێرباز خانەیش كرایەوە!).

جا لەم روانگەیەوە، مەرج نییە بۆ لایەنـە ئـایینیـیەكانو بـۆ نووسـەرانو ئەدیبانی ئایین پەروەر، ئەم جۆرە بابەتە ڤیزەونانە بورووژێننو كێـشەیەك بـۆ خۆشـیانو بـۆ خـەڵكیشو بـۆ پەیوەنـدی دارانـیش بـسازێنن، بەتایبــەتی ئـەو لایەنانەی كە سەرگەرمی خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامن، وە بـەم جـۆرە شتـە بۆگەنانــەوە، كـاتی زێڕینــی خۆیـان بـەفیڕۆ نـەدەنو لەگـەڵ تـەوژمی رۆژگـاردا خۆیـان بـسازێننو لـەم جـۆرە دیاردە زەقو رەقانـە خۆیـان بـێ ئاگـا بكـەنو دەم نەنێنە دەمی كەسانێكەوە كە دەمیان گڵاوبێ!

وەك عیـسای مەسـیح (دروودو سـڵاوی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: {دَعِ الْمَوْتى يَدْفَنُونَ مَوْتاهُمْ!!} . واتە: واز لەمردوان بهێنن با مردوانی خۆیان بنێژن!).

بەڵام بەبێ گومان ئەمە واتـای وانییـە، كـە ئێمـە تەسـلیمی ئـەمری واقیـع بــبین، نــەء، بــەڵكوو بەشــێوەی هــەرەوەزیو دەســتەجەمعی، دەبــێ ئــەمر

بەمەعروفو نەهی لەمونکەر بکەینو درێغی لەفەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە نەکەین!

ئەوەندەی لەتوانامانە هەیە، بەدەست، بەدەم، بەزمان، بەقەڵەم، بەدڵ، بەسەر، بەماڵ، بەگوتار، بەکردار، بەدەنگ، بەڕەنگ، بەهەموو جۆرە خزمەتێکی شایانی شایستە، خزمەتی گەلو نیشتمانو ئایینی خۆمان بکەین، وە خراپەکارو دەستەی شەڕخواز، هەواڵە بەخودا بکەینو، خۆیانو خوای خۆیان، ئێمە لەبەر کۆمەڵێ هۆکاری کارا لە کارەکەدا، خۆمان لە ئاستیان کەڕو بێئاگا بکەین!!

٩٥٦- قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ لَوْ رَأَيْتُ رَجُلاً مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفِحٍ ، فَقَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ ، لأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّى» وَمِنْ أَجْلِ غَيْرَةِ اللَّهِ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ شَخْصَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ وَلاَ شَخْصَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنَ اللَّهِ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ بَعَثَ اللَّهُ الْمُرْسَلِينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَلاَ شَخْصَ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمِدْحَةُ مِنَ اللَّهِ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ وَعَدَ اللَّهُ الْجَنَّةَ»[٩٥٦]

سەعدی کوڕی عوبادە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەگەر پیاوێ ببینم لەگەڵ ژنەکەم دەیدەمە بەر شمشێر، دەیدەمە بەر دەمە تیژەکەی نەك لەسەر باری پانی.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئایا ئێوە سەرتان سوڕ دەمێنێ لە غیرەتو لە ناموس پەروەری سەعد دەسا من لەویش زیاتر بە تەنگی ناموسەوە دێم وە خوداش لەمن پتر! (ش).

موسلیم (خودای لێ ڕازی بێ) ئەمەیشی لێ زیاد کردووە: هەر لەبەر ئەوەیە کە خودا ئەوەی پێی بڵێن خراپە (خوا ئاشکرا بێ خوا نهێنی) هەمووی

[٩٥٦] بخاری. نکاح: ٥٢٢٠ مسلم: ٦٩٢٩ (بخاری رقم الکتاب/٩٧ رقم الباب/٢٠).

قەدەغە كردووە، كەس وەك خودا غیرەتو دەمار نایگریّ، كەسیش وەك خودا عوزر خواهیی پیّ خۆش نیە، هەر لەبەر ئەومیشە كە خودا ئەم پێغەمبەرانەی ناردووە تا مژدە بدەن بە چاكانو هەڕەشە بكەن لە بەدكاران، وە كەسیش وەك خودا مەدحو پیاهەلگوتنی پیّ خۆش نیە، هەر لەبەر ئەومیشە كە مژدەو مزگێنی بەهەشت دەدا.

٩٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ، وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ »؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « مَا أَلْوَانُهَا »؟ قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: « فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ ؟». قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَأَنَّى هُوَ ؟». قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ ». {الحديث: ٣٧٤٧ = ٣٧٤٤ فم. تجريد بخاري/٥، رقم: ١٧٩٤ = ٥٣٠٥، ٦٨٤٧، ٧٣١٤. أبو داود. طلاق: ٢٢٦٢. تحفة الأشراف: ١٥٣١١}: [٩٥٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: پیاویّ لە عەرەبی دەشتەكی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیّ) عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم سپیم، كەچی ژنەكەم كوڕێكی ڕەشی بووەو من ئەو منالّە بەمنالّی خۆم نازانمو حاشام لیّ كردووە، جا تۆچی دەفەرمووی؟ پێغەمبەر پێی فەرموو: (هیچ وشترت هەیە؟). گوتی: بەلّیّ هەمە. فەرمووی: (ڕەنگیان چۆنە؟) گوتی: سوورن، فەرمووی: (وشتری تالّەیان تیادا هەیە؟) گوتی: وشتری تالّەی زۆریان واتیادا، فەرمووی: (ئەو وشترە تالأنەیان لەكوێوە تیّ كەوتووە؟)

---

[٩٥٧] مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧١ + شەرحی بلوغ المرام/٢، ژمارە: ١١٣٤ (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٢٦).

گوتی: ڕەنگبێ ڕەگێ لە ڕەگەزیان ڕەنگی وابووبێ‌و ئەمانەی ئێستا چووبنەتەوە سەر ڕەنگی ئەو ڕەگەزە کۆنەی خۆیان! فەرمووی: (دە کوڕەکەی تۆیش هەروەها!).

## پوختەی بڕیارەکانی بابەتی شەڕەنەفرین

١- شەڕەنەفرین، کە لە زاراوی شەرعی پیرۆزی خوادا ناسراوە بە (لیعان). ئەم کۆمەڵە بڕیارانەی لەسەر دروست دەبێ:

آ- ئەو پیاوو ژنە، کە لەنێوانیانا، شەڕەنەفرین روو دەدا، هەتا هەتایە لەیەکتری حەرام دەبن، بەهیچ شێوەیێ حەڵاڵ نابنەوە بۆ یەکتری‌و هەتا مردن ئەو ژنە مارەی نایەتەوە لەو مێردەی کە شەڕەنەفرینی لەگەڵدا کردووە.

ب- داری حەددی بوختیان لەکۆڵ پیاوەکە دەخا.

ج- داری حەددی داوێنپیسی لەکۆڵ ژنەکە دەخا، ئەگەرنا موحصەن بێ، هەروا حەددی ڕەجم‌و بەردەبارانی لەکۆڵ دەخا، ئەگەر ژنەکە موحصەن بێ، ژنی موحصەن ئەوەیە، شووی کردبێ‌و مێردی چووبێتە لای‌و کردبێتی بە ژن‌و کچێتی نەمابێ. چونکە مێرد وەك قەڵا (حصن) وایە بۆ ژنی خۆی، ژنی مێرددار وەك لەناو قەڵا (واتە: حصن) دابێ وەهایە!

د- ئەگەر مێرد، لەکاتی شەڕەنەفریندا، حاشا لەو منداڵە بکا، کە لەنێوانی مێردو ژنەکەیدا هەیە، ئیتر ئەو مناڵە، لەمناڵی ئەو دەردەچێ‌و دەبێ بەمناڵی دایکی‌و پەیوەندی بە بنەماڵەی مێردەوە نامێنێ.

٢- بۆ دووربینی‌و وەرع‌و تەقوا، واباشە موسوڵمان خۆی لەشتی گوماناوی بپارێزێ، وەك هەبوونی گومان‌و شوبهەی بەهێز لە بابەتێکا، وەك هەبوونی

داوای شیرخواردن، لەنێوانی دوو منالا، با بەلگەی رۆشنی حاشاهەڵنەگریش نەبێ لەئارادا.

٣- منالی حاشا لێکراو گووناهی لەسەر نییە، مرۆڤێکی بێ تاوانی بەرییە، بەهیچ شێوەیێ دروست نییە، هەستی برووکێنرێ، تانەی ناڕەوای لێ بدرێ.

٤- ئەو ماڵەی کە خەرج کراوە بۆ ژنەکە، وەك مارەیی و دیاری و خەڵات و شتی تری وا، هەمووی بووە بەهی ژنەکە خۆی، مافی مێردی پێوە نەماوە، ئەوەی ژنەکە وەری گرتووە ئەوە بووە بەهی خۆی، ئەوەی کە وەرنەگیراوە، وەك مارەیی قەرزی دواخراو، مێرد دەبێ ڕادەستی ژنەکەی بکات.

٥- لەکاتی ڕوودانی کارەساتی وادا، کەمێرد زەلامێ بەسەر ژنی خۆیەوە بگرێ:

آ- بۆی هەیە کارەکە نەووروژێنێ و لەگەڵیدا ڕابوێرێ و بەهۆکاری ڕەوا، کارێکی وا بکا، کەرێگەی ئەوەی لێ بگرێ، ئەگەر بۆی کرا.

ب- بەهێمنی، بەبێ هاتوو هاوار، تەڵاقی بداو خۆی ڕزگار بکا لەدەستی و لەشەڕی بەدوور بێ، وە ئەمە لەهەمووی باشترە. {بڕوانە: ژمارە: ١١٣٢ لەشەرحی بلوغ المرام} .

ج- شەرمەنەفرینی لەگەڵدا بکا، لەپاش شەرمەنەفرین مێرد هیچ مافێکی لەسەر ژن نامێنێ، گریمان بیکوژێ، دەکوژرێتەوە لەباتی ئەو.

٦- ئەو پیاوەی دەگیرێ بەسەر ژنی کەسێکی ترەوە:

آ- ئەگەر دانی نا بەتاوانەکەیدا، حەددی داوێنپیسی لێ دەدرێ و بەس، ئەگەر موحصەن بوو بەردباران دەکرێ، ئەگەر ناموحصەن بوو سەد داری حەددی لێ دەدرێ.

ب- ئەگەر چوار شایەتیش هەبوو هەروەها.

ج- ئەگەر نەپێڵینان هەبوو، نەشایەت لەئارادا بوو، ئەوا ئەو کابرایە هیچی لەسەر نییە بەپێی رووکار (ظاهر)ی حاڵ، بەڵام لای خودا تاواننبارە.

٧- مێردو کەسوکاری ژن، مافی ئەومیان نییە، کەژنەکە یا پیاوەکە بکوژن، یاسزای بدەن، ئەوە کاری قازییە، ئیشی ئەوان نییە، ئەوەی کە لەناو ڕەشەخەڵکا باوە پێی دەڵێن: (غَسلُ العَار: شۆرینەوەی شوورەیی) بنەمایەکی شەرعی نییە، لەیاسانامە (شەریعەت)ی خودادا، بەڵام جەماوەری زانایان دەفەرموون: (ئەگەر مێرد یا خاوەنی ژنی مێرددار، کابرای تۆمەتبار، یا ژنەکەیان کوشت، ئەگەر چوارشایەتیان هەبوو، ناکوژێتەوە، دەنا دەکوژێتەوە!)

٨- خانەگومانیو دڵ پیسکردن لەژن، بەبیانووی پڕوپووچ، کارێ بێ بایەخە، بەڵام لەهەمان کاتا، نامووس پارێزیو بەتەنگەوە بوونی نامووسو ئابروو، کارێ زۆر باشە، دروشمی پیاوچاکانو پێغەمبەرانە (درووردی خودایان لەسەر بێ).

٩- بڕیاری شێوەناس (قائیف = ڕەگەزناس) بۆ سەلماندنی نەسەبو نژادو بنەچەو ڕەچەڵەك کارێ پەسەندە، بەتایبەتی لەکاتێکا ئەگەر هەمهەمەو قاومیێ لەنێوانا هەبێ. هەروەها لەم ڕۆژگارەدا پشکنینی پزیشکی، بەتایبەتی ئەو جۆرانەی کە گەیشتوونەتە پلەی دڵنیایی، یا نیمچە دڵنیایی، دروستە کاری پێ بکرێو نژادو نەسەبی پێ بڕیار بدرێ.

## ٢٠- كِتَابُ العِتقِ
## نامەی کۆیلە ئازادکردن

{بڕوانــە: موختەصــەری صــەحیحی بوخــاری، ناســراو بــە تەجریــدی بوخاری، بەرگی/٣، لاپەڕە:١٧٦، زنجیرە: ٥٤، فەرموودەی ژمارە: ١٠٨٣ هـەتا ژمارە: ١٠٩٤ = ٢٥١٧ هـەتا ٢٥٦٠ بوخـاری + باسـی کۆیلـە ئـازادکردن لـە فیقهـی ئاسـان/٢، زنجـیرە: ٤٠٧، لاپـەڕە: ١٠٧٤ هـەتا زنجـیرە: ٤١٧ + تـاجول ئوصـول/٢، لاپـەڕە: ٤٤٥، زنجیرە: ١٦، ژمـارە: ٢٠٠٩ هـەتا ٢٠٢٣ + ریـاض والصالحین/٣، زنجـیرە: ٢٣٦، ژمـارە: ١٣٥٨ هەتا ١٣٦٥ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، لـە ژمـارە: ١٦٠٠وە هـەتا ژمـارە: ١٦٠٨} + {شەرحی بلوغ المرام/٣، لەژمارە:١٤٤٧ تا ژمارە: ١٤٦٥ لـە زنجـیرە: ٩١ هـەتا زنجـیرە: ٩٢}.

٩٥٨- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): { "مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ اَلْعَبْدِ، قُوِّمَ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ اَلْعَبْدُ، وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْـهِ. {تەجریـدی بوخـاری/٣، ژمـارە: ١٠٧٨ = ٢٥٢٢، ٢٤٩٢، ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمـارە: ٨٩٣ = شـیحا: ٣٧٥٢ = محمـد فؤاد عبدالهادی/١٥٠١}: [٩٥٨]

لــە موختەصــەری صــەحیحی بوخــاری ژمــارە: (١٠٧٨ = ٢٤٩٢)و لــە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

---

[٩٥٨] تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٧٨ = ٢٥٢٢ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٣ = ٣٧٥٢ شیحا. شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٤٥١، ١٤٥٢. (بخاری رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/٤).

ئـەبوهورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کەبەشـی خـۆی لـە کۆیلەیـەك ئـازاد بکـا، لەسەریەتی، کە لەماڵی خۆی هەمووی ئـازاد بکـا، ئەگـەر ئەوەنـدەی مـاڵ هـەبوو کەبەشی هەموو پشکەکانی تری ئەو کۆیلەیـە بکـا، بـەلاّم ئەگـەر ئەوەنـدەی مـاڵ نەبوو کەبەشی ئەوە بکا، ئەوا هەر ئەوەندەی ئازاد دەبێ کە ئازاد کـراوە، ئەوسا کۆیلەکە بەنرخی تەواوی کاتی کۆیلەیی ڕێك دەقەبڵێنرێ، ئەوجا کەسابەتی پـێ دەکرێ هەتا ئەوەندە ماڵ پەیدا دەکا کەبیدات بەهەقی ئەو پشکانەیدا کەهێـشتا ئازاد نەبوون، هەتا بەئێجگاری خۆی پێ ئازاد دەکـاو، لەکۆیلـەیی ڕزگـاری دەبـێ، بەلاّم نابێ زەبری زیاتر لەتوانای خۆیی لێ بکـرێ، بـۆ پەیـدا کردنـی بـەهای ئـەو بەشەی تری، کە لەسەر خۆیەتی بەئیشکردن ئـازادی بکـا). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٨}.

وَلَهُمَا: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) {"وَإِلَّـا قُـوِّمَ عَلَيْـهِ، وَاسْتُـسْعِيَ غَيْـرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ"}. وَقِيلَ: إِنَّ اَلسِّعَايَةَ مُدْرَجَةٌ فِـي اَلْخَبَـرِ. {مختـصر صـحيح مـسلم/٢، ژمارە: ٨٩٤}:

ئەم ژمارەیە دەقی ژمـارە (١٤٥١)ە لـە (شـەرحی بلوغ المرام) بـەبێ زیـادو کەم، تەنها ئەمـەی پـترە. کـە دانـەر مامۆسـتای عەسـقەلانی دەفـەرموێ: هەنـدێ دەڵێن: ڕستەی کۆتای ئەم ژمارەیە کە ئەمەیـە {وَاسْتُـسْعِيَ غَيْـرَ مَـشْقُوقٍ عَلَيْـهِ} مودەرەجـەو بەشـێ نییـە لەگوتـەی پێغەمبـەر، بـەڵکوو تێـچەنەو هەنـدێ لەڕاویەکان خستوویانەتە ناو دەقی گوتەکانی پێغەمبـەرەوە واتـای ئـەم ڕسـتەیە بەکوردی لەوێوە دەست پێ دەکات هەتا کۆتایی فەرموودەکە، کە دەڵێ: (.......... ئەوجا کەسابەتی پێ دەکرێ هەتا ئەوەندە ماڵ.......... تاد).

## (١) باب ذِكْرِ سِعَايَةِ العَبْدِ

## کۆیله ئەگەر بەشێکی ئازادکرا، دەبێ کەسابەت بکا هەتا بە تەواوی خۆی ئازاد دەکا

٩٥٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ فِى عَبْدٍ فَخَلاَصُهُ فِى مَالِهِ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ اسْتُسْعِيَ الْعَبْدُ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ ». {الحديث: ٣٧٥٢ = ٣٧٤٩ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٧٨ = ٢٤٩٢، ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧}: [٩٥٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کەپشکی خۆی لە کۆیلەیەك ئازادبکا، لەسەریەتی لەماڵی خۆی هەمووی ئازادبکا، ئەگەر ئەوەندەی ماڵ هەبوو کە بەشی هەموو پشکەکانی ئەو کۆیلەیە بکا، بەڵام ئەگەر ئەوەندەی ماڵ نەبوو کەبەشی ئەوەبکا، ئەوا هەر ئەوەندەی ئازاد دەبێ کە ئازادکراوە، ئەوسا کۆیلەکە، بەنرخی کاتی کۆیلەیی ڕێك دەقەبڵێنرێ، ئەوجا کەسابەتی پێ دەکرێ هەتا ئەوەندە ماڵ پەیدا دەکا، کەبیدات بەهەقی ئەو پشکانەیدا کە هێشتا ئازاد نەبوون، هەتا بە ئێجگاری خۆی پێ ئازاد دەکاو لە کۆیلەیی ڕزگاری دەبێ، بەڵام نابێ زەبری پتر لەتوانای خۆیی لێ بکرێ، بۆ پەیداکردنی بەهای ئەو بەشەی تری، کە لەسەر خۆیەتی بەکارکردن ئازادی بکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٨}.

---

[٩٥٩] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٧٨ = ٢٤٩٢ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٤ = ٣٧٥٢ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٤٧ رقم الباب/٥).

## (٢) باب إنّما الولاءُ لمنْ أعتَقَ

## ئەو کەسەی دەبێ بە خاوەنی هەقداریی (الولاء = سەرداریی) کە ئازادی دەبەخشێ

٩٦٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) : أَنَّ بَرِيرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) جَاءَتْ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئًا قَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ وَيَكُونَ وَلاؤُكِ لِي فَعَلْتُ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لأَهْلِهَا فَأَبَوْا وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ وَيَكُونَ وَلاؤُكِ لَنَا فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي فَإِنَّمَا الْوَلاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ) قَالَ ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا بَالُ أُنَاسٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَنْ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَلَيْسَ لَهُ وَإِنْ شَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ شَرْطُ اللَّهِ أَحَقُّ وَأَوْثَقُ) (الحديث ٢٥٦٠، أطرافُهُ في: ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٢، ٦٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥)[٩٦٠].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (بەریرە هات بۆ لام، گوتی: خاوەنەکانم نامەنووسی (موکاتەبە) یان لەگەڵدا کردووم، لەسەر نۆ ئۆقیە بۆماوەی نۆ ساڵ کەهەر ساڵە ئۆقیەیە بدەم، جا هاتووم بۆ لات کە تۆیش یاریدەیەکم بدەی؟! ئەو کاتە هیچ پشکێکی لەنامەنووسیەکەی جێ بەجێ نەکردبوو، منیش پێم گوت: بڕۆ بەئاغاکانت بلێ: ئەگەر ئاغاکانت ئارەزویان هەیە، ئەوا من ئەو پارەیان بەنەختی بۆ دەژمێرم و یەکسەر ئازادت دەکەم، بەڵام بەمەرجێ کەسەرداریی (وەلاء= هەقداریی) یەکەمت بۆ من بێ و من ببم

[٩٦٠] تجرید/٢، ژمارە: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٦ - ٣٧٥٨ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٥٠ رقم الباب/٢).

بەهەقدارت، جا ئەویش ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ ئاغاكانی بەڵام ئاغاكانی بەوە رازی نابنو دەڵێن: سەرداریىو هەقداریی هی خۆمانەو نایدەین بەكەس، ئەگەر عائیشە حەز دەكا، با لەبەر رەزای خودا ئەمەت بۆ بكا، بەڵام بەهەرحاڵ سەرداری (وەلاء) هەر بۆ خۆمان دەبێ!

جا دیسانەوە هاتەوە بۆ لامو ئەم باسەو خواسەی بۆم گێڕایەوە، منیش باسەكەم عەرزی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كرد، فەرمووی پێم: (تۆ بیكڕەو ئازادی بكەو مەرجیش دابنێ كەسەرداری بۆ ئەوان بێ، ئەو مەرجە بایەخی نییە، چونكە لەراستیدا سەرداریی بۆ ئەو كەسەیە بەندەكە ئازاد دەكا). منیش وام كرد. جا سەر لە ئێوارەیێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵسایەوەو وتارێكی دا، سوپاسو ستایشی خودای كردو ئنجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە ئەوە بۆچی هەندێ كەس هەندێ مەرجیوا بەمەرج دەگرن، لەكاتی سەوداو مامەڵەو كردنی كارێكا، كەشتیواو مەرجیوا لەبەرنامەی خودادا، لەشەرعی خودادا نییە، دەی هەركەسێ مەرجیوا بەمەرج بگرێ، كە لەناو یاسانامەی خودادا نەبێ، ئەوە پووچو بەتاڵە ئەو جۆرە مەرجە سوودی نابێ بۆی، ئەگەر سەد مەرجیش بێ هەموویان پوچو بێ بایەخن، مەرجی خودا راستترەو مەحكەم ترو لەبارترە). (تاج/٣/ل-٣٨ز-١٨ف-١+تاج/٢/ل-٣١٠ف-٣ز-١٤٩ = تاج/٢، ژمارە: ١٧٩٧، ٢٠١٩).

## راڤەو شیكردنەوە:

ئەم جۆرە زاراوانە: (مُكاتب) و (ولاء) لەكوردیدا واتاو بەرابەرەكەیان زۆر روونو ئاشكرانییە، گەلێ لە مامۆستا بەرێزەكان هەوڵی تەرجەمەی ئەم جۆرە وشانەیان داوە، پەیڕەوكردنی ئەو زاتانە زۆر بەسوودو بەكەڵكە، دەنا زمانی

کوردی، لەبابەتی وەرگەڕان و بەکوردیکردندا تووشی گێژاوو پاشاگەردانیو بێ سەرو بەرییەکی وا دەبێ، کەمانەندی نەبێ.

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئۆقیەی سەردەمی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) چل درەمی زیوە.

٢- بەریرە لەپێشا خزمەتی عائیشەی دەکرد، دوایی عائیشە کڕیو ئازادی کرد، زۆر دڵسۆزی عائیشە بوو، هەتا مردن.

ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا، ئەم کەرامەتە لە بەریرەوە دەگێڕێتەوە:

(عەبدولخالیقی کوڕی زەیدی کوری واقید فەرمووی: باوکم گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان گێڕایەوە بۆمان، فەرمووی: لەپێش ئەوەدا کەببم بەجێنشین (خەلیفە) لە مەدینە، لەخزمەتی بەریرەدا دادەنیشتم، زۆرجار پێی دەفەرمووم: ئەی عەبدولمەلیك! دەبینم چەند ڕەوشتێکی بەرزی باشت واتیادا، لەبەرئەوە واهەست دەکەم کەتۆ دەبیت بەجێنشین لەسەر موسوڵمانان، جا ئەگەر بوویت بەخەلیفەو جێنشین، خۆت لەخوێنرشتنی ناڕەوا بەدوور بگرە، چونکە بۆ خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست دەیفەرموو: (پیاوی واهەیە، دەڕوا بەرەو بەهەشت، تادەگاتە بەردەرگاکەیو بەچاوی سەر تەماشای دەکا، لەوێ بەپاڵ دەری دەکەنو تەسی پێ دەکەنەوە، لەسەر لوێچێ خوێنی ناڕەوا، لەسەر پڕشاخی کەڵە شاخێ خوێن، کە لەدنیادا بەناڕەوا ڕشتوویەتی!).

عەینی دەفەرموێ: بەریرە بەڕەگەز نەبەطی، یا قیبطی بووە. بەریرە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە مابوو،

بەریرە ئەو بەریرەیە، کە لەحەدیثی ئیفکا، ناوی هاتووەو لەسەر راوێژی ئیمامی عەلی، پێغەمبەر پرسی پێ دەکاو پێی دەفەرموێ: (ئەی بەریرە! هیچت لە عائیشە دیوە کە جێگەی گومان بێ؟). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٧ تەفسیری سوورەتی نوور، ژمارە: ٤٠٠٨. بەتایبەتی لاپەڕە/ ٣٩٠ چاپی چوارەم} + {تەجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەکوردی، بەرگی/٣، ژمارە: ١١٢١، لاپەڕە: ٢٠٩ چاپی یەکەم}.

وەلاء، یا سەرداریی، یا هەقداریی، لەزاراوی شەرعو یاسا نامەی خوای گەورەدا، باوانییەکە، کە هۆکەی نەمانی خاوەنییە، لەکۆیلەدا، بەهۆی ئازادبوونەوە.

بەنموونە: ئەگەر کەسێ بەهەر هۆیێ، کەسێ ئازادبکا، وە ئازادکراوەکە بمرێ، وە میراتبەری خزمی نەبێ، ئەوە ئازادکەرەکەی کەلەپوورەکەی دەبا، ئەگەر مێینەبێ، لەکاتی شووکردنا، ئازادکەرەکەی هەقداریەتیو مارەی دەبڕێ لە شووەکەی، یا ئەگەر بمرێ نوێژی لەسەردەکا، وە کۆمەڵێ مافی تر، کە بەپێی شەرع بۆ ئازادکەرو ئازادکراو دەچەسپێ.

٩٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ كَانَ فِى بَرِيرَةَ ثَلاَثُ سُنَنٍ عَتَقَتْ فَخُيِّرَتْ ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ » . وَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَبُرْمَةٌ عَلَى النَّارِ ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ خُبْزٌ وَأُدْمٌ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ فَقَالَ «لَمْ أَرَ الْبُرْمَةَ». فَقِيلَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ عَلَى بَرِيرَةَ ، وَأَنْتَ لاَ تَأْكُلُ الصَّدَقَةَ قَالَ « هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ»: [٩٦١]

---

[٩٦١] بخاری. مکاتب: ٢٥٦٢ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٧ = ٣٧٦٥ ترقيم وتخريج الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم. (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/١٤).

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەهۆی بەریرەوە سێ پرسی شەرعی ڕوونکرانەوە:

١- مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەریرە خۆیی کرد بەسەر پشك: کە یاوەك جاران کە خۆشی کەنیز (ئەمەتە) بوو، هێشتا ئازاد نەکرابوو، بەلای مێردەکەیەوە دانیشێت، یا هەر لەئێستاوە دەستی لێ هەلگرێتو لەپاش ئازادبوون خۆی هەڵبژێرێو شووەکەی هەڵوەشێنێتەوە.

٢- گەلێ جار خەڵك خێریان بۆ دەهێنا، وە ئەویش لەپاش ئەوەی کەوەری دەگرت، بەدیاریی دەیهێنا بۆ ئێمە. جا منیش ئەمەم عەرزی پێغەمبەر کرد، فەرمووی: (ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەلام لەوەوە بۆ ئێوە دەبێ بەدیاریی، کەواتە: بیخۆن قەیناکا. وەك ئەوە جارێ گۆشتیان بەدیاری هێنابوو بۆ بەریرە، کە ئەوکاتە کارەکەری من بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، دیزەکە بەسەر ئاگرەوە بوو، گۆشتەکەی بەریرەی تیادا دەکولا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای خواردەمەنی کرد، نانو پێخۆریان لەهی ماڵەوە بۆهێنا، ئەویش فەرمووی: (دیزەیەکم بینی لەسەر ئاگرەکە دەکولا گۆشتی تیابوو، ئەی بۆچی لەوەتان بۆم نەهێنا؟).

عەرزیانکرد: بەڵێ وایە، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە گۆشتێکە بەخێردراوە بە بەریرە، لەبەرئەوە حەزمان نەکرد کەتۆ لێی بخۆیت، چونکە تۆ زەکاتو شتی وا ناخۆیت. فەرمووی: (ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەلام لەوەوە بۆ ئێمە دەبێ بەدیارییو خواردنی بۆ منیش دروستە).

خاوەنەکانی ویستیان کە بیفرۆشن، بەلام بەمەرجێ کە هەقدارییەکەی بۆ خۆیان بێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەقداریی

هینی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٤، ١٢٥٥، ١٢٥٦، ١٢٥٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩ + تاج/٢، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٢٣٩}.

## (٣) باب النَّهْيِ عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ وَهِبَتِهِ
## هەقداریی (وەلاء) نە دەفرۆشرێ نە دەبەخشرێ

٩٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ وَعَنْ هِبَتِهِ. {الحديث: ٣٧٦٧ = ٣٧٦٤ فم. بخاري. عتق: ٢٥٣٤، ٦٧٥٦. أبو داود. فرائض: ٢٩٢٥. نسائي. بيوع: ٤٦٧٣. تحفة الأشراف: ٧١٨٦}: [٩٦٢]

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) جڵەو گیریی کردووە لەفرۆشتنی سەرداریو بەخشینی بەکەسێکی تر. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٢٣ – ش/د/ت/ن}.

## (٤) تَحْرِيمُ تَوَلِّي الْعَتِيقِ غَيْرَ مَوَالِيهِ
## کەسێ سپڵە دەرچێ حاشا لە خێڵی ئازادکەرانی خۆی بکاتو کەسانێ تر بکا بە ئازادکەرانی خۆی، شتی وا نادروستە

٩٦٣- حديث عَلِيٍّ بن أبي طالب (رضى الله عنه) عَلَى مِنْبَرٍ مِنْ آجُرٍّ ، وَعَلَيْهِ سَيْفٌ فِيهِ صَحِيفَةٌ مُعَلَّقَةٌ فَقَالَ وَاللَّهِ مَا عِنْدَنَا مِنْ كِتَابٍ يُقْرَأُ إِلاَّ كِتَابُ اللَّهِ وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ . فَنَشَرَهَا فَإِذَا فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَإِذَا فِيهَا « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مِنْ عَيْرٍ إِلَى كَذَا ، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً » . وَإِذَا فِيهِ « ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ ، فَمَنْ أَخْفَرَ

---

[٩٦٢] بخاری. عتـف/٢٥٣٤، ٦٧٥٦ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٨ - ٣٧٦٧ (بخاری رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/١٠).

مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَـدْلاً » . وَإِذَا فِيهَا « مَنْ وَالَى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِـينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً »: [٩٦٣]

ئیبراهیمی تەمیمی فەرمووی: باوکم فـەرمووی: عـەلی کوڕی ئـەبو تالیـب، وتارێکی بۆماندا، فەرمووی: هەرکەسێ گومانی وابێ، کە ئێمە، کـە کـەس‌و کـاری پێغەمبـەرین، نامـەو نووسـراوێکی تایبـەتیمان لـەلا هەیـە، کـە بـەس خۆمـان دەیخوێنین‌و لەلای خەڵکی ترنییە، هەرکەسێ گومانی وابکا درۆدەکا، ئێمەش کـە ئـاڵ‌و بـەیتی پێغەمبـەرین، وەك سـەرجەمی موسوڵمانانی تـر بەگشتی، بـەس قورئانی پیرۆزمان لەلا هەیە، کە نامەی خودایە، بـەڵام لـە سوننەتی پێغەمبـەر، ئێمـەیش وەك موسـوڵمانانی تـر، هەنـدێ فـەرموودەمان لـەلا هەیـە، بـەڵام بڕیارەکەی بۆ هەموانە نەك هەر بۆ خۆمـان، وەك ئـەم چـەند فەرموودەیـە، کـە لەم تۆمارەدا نووسیومنەتەوە (فەرمووی: تۆمارێکی پێچراوە بوو، لەناو هەبگەی شمشێرەکەیدا دانـابوو بـۆ پاراستنی، نـەبادا بفـەوتێ) ئـەوجا عـەلی فـەرمووی: ئەمانـە لـەم تۆمـارەدا نووسـراون: تەمـەنی ئـەو وشـترانەی دەدرێـن بەخوێنـداو چەند شتێ تر سەبارەت بەخوێنی زام‌و زامکاری. وە ئەمەیشی واتیادا: (مەدینـە لە نێوانی چیای عەیرەوە هەتا چیای ثەور بەستە) (واتە: حەرەمە، بە فەرمانی شەرع کۆمەڵێ کاری تیا نادروستە کە لەشوێنانی تـر، بـەپێی مـەرجی دیـاریکراو دروستن). جا هەرکەسێ کارێکی ناڕەوای تیادا بەرپا بکا، یا پیـاو خراپێکـی تیـادا پەنابدا، یا کارێکی ناشایستەی تازە هەڵلای تیادا بکا بـەباو، لەعنـەت‌و نـەفرەتی خـوداو نـەفرەت‌و لەعنـەتی هـەموو فریـشتەکان‌و لەعنـەت‌و نـەفرینی هـەموو

---

[٩٦٣] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٦ - ١٨٧٠ بخاری. مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٧٧٧ - ٣٣١٤ شـیحا (بخاری – ٥/٩٦).

مرۆڤەكانى لێ بێ، لەڕۆژى قیامەتدا خودا نە فەرزو نە سوننەتى لێ قەبووڵ ناكا، لەئەستۆ گرتنى پەیمان بۆ موسوڵمانان وەك یەكە، هەموو موسوڵمانێ مافى ئەوەى هەیە كە پەیمانى ئەمان بەكافران‌و بەبێ بڕوایان، بە پێى یاسا نامەى خودا بدا، هەرە خوارینەكەیان مافى ئەمان پێدانى هەیە، بەهەر كافرێ بیەوێ ئامانى پێبدا، وە هەركەسێ حاشا لەباوكى خۆى بكاو خۆى بكا بەنەتەوەى پیاوێكى تر، یا حاشا بكا لە ئازادكەرانى خۆى‌و كەسانى تر بكا بە ئاغاى ئازادكەرى خۆى، لەعنەت‌و نەفرینى خوداو فریشتەكان‌و هەموو مرۆڤەكان لەو جۆرە كەسانەبێ، لە قیامەتدا نەتەوبەیان لێ قەبوول دەكرێ، نە تۆڵەو برێتى‌و كەفارەتیان لێ وەردەگیرێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١١٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ١٧٣٣} .

## (٥) باب فَضْلِ العِتْقِ
## خێرى بەندە (كۆیلە) ئازادكردن

٩٦٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً، أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنَ النَّارِ حَتَّى يُعْتِقَ فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ».{الحديث: ٣٧٧٦ =٣٧٧٢ فـم. تجريد/٣، رقـم: ١٠٨٣=٢٥١٧، ٦٧١٥} : [٩٦٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێكى كۆیلە ئازادبكا، خودا لەجیاتى هەر ئەندامێكى ئەو كۆیلەیە، ئەندامێكى ئەو ئازادكارە،

---

[٩٦٤] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٨٣ = ٢٥١٧ بخارى مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩١ = ٣٧٧٦ شیحا (بخارى رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/١).

لـه ئـاگرى دۆزەخ، ئـازاد دەكـا، تەنانــەت دامــەنو شــەرمگاى لـەجياتى دامــەنو شەرمگاى ئازاد دەكا). {تاج/٢، زنجيرە: ١٦، ژمارە: ٢٠١٠}.

## ٢١- كِتابُ البُيُوعِ
## نامەى كڕينو فرۆشتن

{بڕوانــە: تجريــدى بوخــارى. بــەرگى ســێيەم، لاپــەڕە: ٥، زنجـيرە: ٢٩، لـە ژمارە: ٩٣٣وە هەتا ژمارە: ١٠٠٢ + پوختەى موسليم لە زنجيرە: ١٨وە هەتا زنجيرە: ١٩ لە ژمارە: ٩٠٨وە هەتا ژمارە: ٩٧١ + تاجول ئوصول/٢، زنجيرە: ١٤٥ هەتا زنجـيرە: ١٨٥ لـە ژمـارە: ١٧٥٦وە هـەتا ژمـارە: ١٩٦٥ + فيقهـى ئاسـان، لاپـەڕە: ٤٧١، زنجـيرە: ١٨٧} + {شەرحى بلوغ المرام/٢ لە زنجيرە/٢٩ هەتا زنجيرە: ٤٤ لـەژمارە: ٨٠٠ هـەتا ژمـارە: ٨٩٣}.

### (١) باب إبْطَالِ بَيْعِ المُلاَمَسَةِ وَالمُنابَذَةِ
### پێشگيريى لە مامەڵەى (ملامسة)و (منابذه)

٩٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ). [٩٦٥]

ئـەبو هـورەيرە (رەزاى خـوداى لىٚ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) جلەوگيريى دەكا لەم دوو جۆرە مامەڵەيە: لە مولامەسـەو لـە مونابەزە).

---

[٩٦٥] بخارى. بيوع/٢١٤٦ مسلم. بيوع/٣٧٨٠ (بخارى رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٦٣).

جا وا بۆ روونکردنـەوەی ئـەم دوو جـۆرە کـڕینو فرۆشـتنە فـەرموودەی ژمارە (٩٣٨)ی پوختەی موسلیم (= مختصر صحیح مسلم بەکوردی) دەنووسین:

عَنِ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعَتَيْنِ وَلِبْسَتَيْنِ، نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِى الْبَيْعِ، وَالْمُلاَمَسَةُ: لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، وَلاَ يَقْلِبُهُ إِلاَّ بِذَلِكَ وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، وَيَكُونُ ذَلِكَ بَيْعَهُمَا مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ. {الحديث: ٣٧٨٥ = ٣٧٨١ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ٢٣٢ = ٣٦٧، ١٩٩١، ٢١٤٧، ٥٨٢٢، ٦٢٨٤، ٥٨٢٠، ٢١٤٤ فتح الباری. أبـو داود. بيـوع: ٣٣٧٩. نـسائی. بيـوع: ٤٥٢٢}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەدوو جۆرە فرۆشـتنو لـەدوو جـۆرە لەبەرکردن، نەهی کردووە لەفرۆشتن بـە مولامەسـە، مولامەسە ئەوەیـە: پیـاوێ لـەپیاوێ تـر، پارچـەیێ جل دەکڕێ، لـەباتی تەماشاکردنو ئـەم دیوەو ئـەودیو کردنـی، دەسـتی لێ دەدا، وە ئـەم دەسـت لێدانـەیش خـوای بەشـەوی تاریـك بـێ، خـوای بـەرۆژی روونـاك بـێ. وەنـەهی کـردووە لەفرۆشـتن بـە مونابـەزە، مونابەزەیش واتە: هەڵدان بۆیەکتری، بەم شێوەیە: ئـەم جلەکـەی خـۆی هەڵبـدا بۆ ئـەوو ئـەویش جلەکـەی خـۆی هەڵبـدا بـۆ ئـەم، وە ئـەم گۆڕینـەوە بەهەڵدان بۆیەکتری لەجیاتی گوتە (صیغە)ی فرۆشتن، کـە برێتییـە لـە ئیجابو قـەبووڵ، ئیتر بەبێ سەرنجدانی فرۆشراوو بەبێ ئەوە کەدڵ بیگرێ یانا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨٠٦}.

**روونكردنەوە:**

**مەبەست لە (دوو جۆرە لەبەركردن)ەكەیش ئەمەیە، كە لەگێڕانەوەی ژمارە (٢٣٢)ی تەجریددا دەفەرمویێ:**

**ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی كردووە لەوە كە مرۆڤ بە پارچە جلێ خۆی شەتەك بدا، بەشێوەیەكی وا، كە نەتوانێ دەستی لێوەی دەربێنێ، مەگەر لەدامێنەوە، كە بەم جۆرە خۆپێچانەوەیە لەزاراوی شەریعەتدا دەگوترێ: (إشْتِمَالُ الصَّمَّاء = مەلۆتكە پێچ). وەنەهی كردووە لەوجۆرە لەبەركردنەیش: كەپیاو بەچیچكانەوە جلێ بئالێنێ بەخۆیەوە، بەلام هیچ نەدا بەشەرمگای خۆیدا، كە بەم جۆرە خۆپێچانەوەیش دەگوترێ: (ئیحتیباء: تێوەپێچان).**

٩٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ يُنْهَى عَنْ صِيَامَيْنِ وَبَيْعَتَيْنِ الْفِطْرِ وَالنَّحْرِ، وَالْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ: [(٩٦٦)]

**پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی دووجۆرە رۆژوو، وە دوو جۆرە كڕینو فرۆشتنی نەدەدا:**

**یەكەم: رێگەی گرتنی:**

**١- رۆژووی رۆژی جەژنی رەمەزانی نەدەدا .**

**٢- رۆژووی رۆژی جەژنی قوربانیشی نەدەدا.**

**دووەم: رێگەی:**

**١- رێگەی بەیعی مولامەسەی نەدەدا.**

---

(٩٦٦) بخاری. صوم: ١٩٩٣ مسلم/شيحا: ٣٧٨٠ (بخاری رقم الكتاب/٣٠ رقم الباب/٦٧).

٢- ڕێگەی بەیعی موونابەزەیشی نەدەدا. کە ئەم دووجۆرە لەپێشەوە روونکرانەوە.

٩٦٧- عن أبى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – عَنْ لِبْسَتَيْنِ وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ ، نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِى الْبَيْعِ ، وَالْمُلاَمَسَةُ لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ ، وَلاَ يُقَلِّبُهُ إِلاَّ بِذَلِكَ ، وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ ثَوْبَهُ ، وَيَكُونَ ذَلِكَ بَيْعَهُمَا ، عَنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ ، وَاللِّبْسَتَيْنِ اشْتِمَالُ الصَّمَّاءِ ، وَالصَّمَّاءُ أَنْ يَجْعَلَ ثَوْبَهُ عَلَى أَحَدِ عَاتِقَيْهِ ، فَيَبْدُو أَحَدُ شِقَّيْهِ لَيْسَ عَلَيْهِ ثَوْبٌ ، وَاللِّبْسَةُ الأُخْرَى احْتِبَاؤُهُ بِثَوْبِهِ وَهْوَ جَالِسٌ ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَىْءٌ):

واتاو وەرگەڕاوەکەی لەژمارە (٩٦٥)دا رابورد.

## (٣) باب تحريم بيع حَبَلِ الحبلة
## فرۆشتنی ئاژەڵ بەمەرجی سك کردنی سك نادروستە

٩٦٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ وَكَانَ بَيْعًا يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الْجَزُورَ إِلَى أَنْ تُنْتجَ النَّاقَةُ ثُمَّ تُنْتَجُ الَّتِي فِي بَطْنِهَا) (الحديث ٢١٤٣، طرفاهُ في: ٢٢٥٦، ٣٨٤٣):[٩٦٨]

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەرگیری (نەهی) کردووە لەو جۆرە فرۆشتنەی کەدەبەستڕێ بەزاییینی بەچکەی ناوسکی وشتری ئاوسەوە! ئەم جۆرە فرۆشتنەیش

---

[٩٦٨] تجريد/٣، ژمارە: ٩٧١ = ٢١٤٣ بخاری مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٣٧ = ٣٧٨٩ شیحا (بخاری رقم الككتاب/٣٤ رقم الباب/٦١).

لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلاما باوبوو، خەڵك دەیانكرد لەسەر یەكێ لەم دوو شێوەیە: یەكەم پیاوێ وشترێكی دەكڕی یا شتێكی دەكڕی، بەبەهایەكی دیاریكراوی نەدراوی دواخراو، بەوادەی ئەوەندە كە ئەو وشترە بزێو سكەكەشی بزێتەوە ئەوسا بەهاكە بدات، دووەم بەچكەی ئەو بەچكەیە كەوا لەسكی ئەم وشترە ئاوسەدا لەتۆم كڕی بەئەوەندەو ئەوەندە.

## (٤) باب تحريم بيع الرجل على بيع أخيه وَسَوْمِهِ علَى سَوْمِهِ وتحريم النجش وتحريم التَّصْرِيَةِ

## مامەڵە لەسەر مامەڵەی برای ئایینی خۆت نادروستە، هەروا سەودا لەسەر سەودای، كۆستە كۆستە نادروستە، فرۆشتنی ئاژەڵی نەدۆشراو بە نیازی تەفرەدانی كڕیار نادروستە

٩٦٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: (لايبيعُ بعضُكم على بيعِ بعضٍ، ولاتلقّوا السلعَ حتّى يهبط بها إلى السّوقِ). (الحديث ٢١٦٥، أطرافُهُ في: ٢١٣٩).[٩٦٩]

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەودا لەسەر سەودای یەكتری مەكەن، وەمەچن بەپیر ئەو كەسو كاروانیانەوە، كەلەدەرەوە خۆراكو شمەكیان هێناوە تالەناو شارا بەنرخی ئاساییو ڕۆژو بازاڕ بیفرۆشن، مەچن بەپیری ئەم جۆرە كەسانەوە بۆ ئەوەی پێش ئەوەی بگەنە ناو بازاڕ، كاڵاكەیان بەهەرزان لێ بكڕنو خۆتان لەوەدوا بەگران ئەو شتانە بفرۆشنەوە، بەڵكوو

---

[٩٦٩] بخاری. بیوع: ٢١٣٩ = تجرید/٣، ژمارە: ٩٧٥ = ٢١٦٥ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٠ = ٣٤٤٩ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٥٨).

کەی شتو مەکەکە گەیشتە ناو بازاڕو جێگەی ئاسایی فرۆشتنی ئەوسا ئەگەر ویستتان بیکڕن).

٩٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ « لاَ تَلَقَّوُا الرُّكْبَانَ ، وَلاَ يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ ، وَلاَ تُصَرُّوا الْغَنَمَ ، وَمَنِ ابْتَاعَهَا فَهْوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْتَلِبَهَا إِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا ، وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ تَمْرٍ »: [٩٧٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەچن بەپیر کاروانییەوە بۆئەوەی کە پێش ئەوەی کە بگاتە بازاڕ، کاڵاکەی بەهەرزان لێ بکڕن و خۆتان لەوەدوا بەگران بیفرۆشنەوە، وە سەودا لەسەر سەودای یەکتریش مەکەن، وە کۆستە کۆستە لەیەکتری مەکەن، وە شاریی نەبێ بە دەڵاڵ بۆ لادێیی و شتی بۆ بفرۆشێ، نەکەن بچن چەند ڕۆژێ ئاژەڵ نەدۆشن، هەتا کڕیاری پێ تەفرە بدەن، ئەوە لەکاتی وادا لەپاش دۆشینی ئەو ئاژەڵەو دەرکەوتنی ئەو فێڵە، کڕیار خۆی سەرپشکە لە یەکێ لەم دوو ئەگەرە، ئەگەر ئارەزووی بوو ئەوا با ئاژەڵەکە قەبووڵ بکاو گرێبەستەکە دابمەزرێنی، ئەگەر ویستیشی با ئاژەڵەکە بداتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، بەڵام دەبێ مەنێ خورما بدا بە خاوەنەکەی، لەجیاتی شیرەکەی). {تەجرید/٣، ژمارە: ٩٧٢ + ٩٧٤ + ٩٧٥}.

٩٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ نَهَى رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ التَّلَقِّي ، وَأَنْ يَبْتَاعَ الْمُهَاجِرُ لِلأَعْرَابِيِّ ، وَأَنْ تَشْتَرِطَ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا ، وَأَنْ يَسْتَامَ الرَّجُلُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ ، وَنَهَى عَنِ النَّجْشِ ، وَعَنِ التَّصْرِيَةِ: [٩٧١]

---

[٩٧٠] بخاری. بیوع: ٢١٥٠، مسلم. بیوع: ٣٧٩٤. (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٦٤).

[٩٧١] بڕوانە ژمارە (٩٧٠) (رقم الكتاب/٥٤ رقم الباب/١١).

واتـاو مەبەسـت لێـی لەژمارەکـەی پێـشيدا، کـە ژمـارە (٩٧٠) بـوو رابـورد، بەس ئەم رستەيەی پترە: (نابێ ژن بە مەرج بگرێ کە پياو ژنەکەی تـەلاق بـدا، ئەوجا ئەو شووی پێ دەکا).

## (٥) باب تحريم تَلَقّي الجلَب

## چوون بە پير کاروانييەوە بۆ تەفرە نادروستە

٩٧٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) قَالَ مَنِ اشْـتَرَى شَـاةً مُحَفَّلَـةً ، فَرَدَّهَا فَلْيَرُدَّ مَعَهَا صَاعًا . وَنَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ تُلَقَّى الْبُيُوعُ): [٩٧٢]

واتاکەی لەژمارە (٩٧٠)دا رابورد.

## (٦) باب تحريم بيع الحاضر للبادِي

## نابێ شاری ببێ بە دەلاڵ بۆ لادێی

٩٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسلم) أَنْ تُتَلَقَّى الرُّكْبَانُ، وَأَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ، قَالَ طاووس: فَقُلْتُ لابْـنِ عَبَّـاسٍ: مَـا قَوْلُهُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَـالَ: لاَ يَكُـنْ لَـهُ سِمْـسَارًا. {الحديث: ٣٨٠٤ شـيحا = ٣٨٠٠ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ٩٧٤ = ٢١٥٨، ٢١٦٣، ٢٢٧٤. أبـو داود. بيـوع: ٣٤٣٩. نـسائي. بيوع: ٤٥١٢. تحفة الأشراف: ٢٧٢١} : [٩٧٣]

ئيبنـو عـەبباس (رەزای خودايـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەيی کردووە لەچوون بەپيری کاروانييەوە بـۆ قـەراخی شـار، کە لەدەرەوە خۆراك‌و شمەك دەهێنن، تا لەناو شارا بەنرخی ئاسايی‌و رۆژو بازاڕ

---

[٩٧٢] بڕوانە ژمارە (٩٧٠) (رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٦٤).

[٩٧٣] تجريد/٣، ژمارە: ٩٧٤ = ٢١٥٨ بخاری مختـصر صحيح مسلم/٢، ژمـارە: ٩٤٢ = ٣٨٠٤ شـيحا. (رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٦٨).

بیفرۆشن، وەنەیی کردووە لەوەیش کەشاری شت بۆ لادێیی بفرۆشێ. تاووس (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی ئیبنو عەبباسم کرد: مەبەستی لەگوتەی (شاری بۆ لادێیی) چییە؟ فەرمووی: نەبێ بەدەڵاڵی. {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٥، ژمارە: ١٧٧٥ + تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٢ + ١٨١٣}.

٩٧٤- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضى الله عنه) نُهِينَا أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ): [٩٧٤]

واتاو کوردییەکەی لە پێشەوە نووسراوە.

## (٨) باب بُطلانُ بَيْعِ المَبِيعِ قَبْلَ القَبْضِ
## پێشگیری لە فرۆشتنەوەی فرۆشراو بەر لە وەرگرتنی

٩٧٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ ». قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَحْسِبُ كُلَّ شَيْءٍ مِثْلَهُ. {الحديث: ٣٨١٥ شيحا = ٣٨١١ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٦٧ = ٢١٣٢، ٢١٣٥ فتح الباري. أبو داود. بيوع. طعام: ٣٤٩٧. ترمذي. بيوع: ١٢٩١. نسائي. بيوع: ٤٦١٢ تحفة الأشراف: ٥٧٣٦} : [٩٧٥]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ خۆراکێکی لەکەسێ تر کڕی، تاخۆی بەتەواوی وەری نەگرێ نەیفرۆشێتەوە بەکەسێکی تر).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: وادەزانم هەموو شتێ لەم لایەنەوە وەك خۆراك وایە).

---

[٩٧٤] بخاری. بیوع: ٢١٦١ مسلم/٣٨٠٧ (رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٧٠).

[٩٧٥] تجرید/٣، ژمارە: ٩٦٧ = ٢١٣٢ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٠٩ = ٣٨١٥ شیحا (رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٥٥).

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدا (ژمارە: ٩٦٧) ئاوایە:

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى أَنْ يَبِيعَ الرَّجُلُ طَعَامًا حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ قُلْتُ لِإِبْنِ عَبَّاسٍ كَيْفَ ذَاكَ قَالَ ذَاكَ دَرَاهِمُ بِدَرَاهِمَ وَالطَّعَامُ مُرْجَأٌ). (الحديث ٢١٣٢، طرفُهُ في: ٢١٣٥):

ئیبنوعەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا کەسێ ئەندازەیێ خۆراك بکڕێ و، بەر لەوەی کە خۆی وەری بگرێ لەفرۆشیار، بیفرۆشێتەوە بەکەسێ تر، عەرزی ئیبنوعەبباس کرا ئەم مەسەلەیە چۆن چۆنییە، بۆمان روون بکەرەوە، بالە مەبەستەکەی تێبگەین؟ فەرمووی: ئەوە وەك ئەوە وایە پارە بدەیت بەپارە بەشێوەی سووخۆری، خۆراکەکەیش ئامادە(حازر) نەبێ). (تاج/٢/٣٠٧ف —٤ز- ١٤٨).

روونکردنەوە:

وەك ئەوە ئازاد مەنێ گەنم لەکامەران بکڕێ، بەدرەمێ، بەو مەرجە پاش مانگێ مەنە گەنمەکەی لێ وەربگرێ، جا هەر ئەو مەنە گەنمە کە هێشتا وەرنەگیرابێ، ئازاد بیفرۆشێتەوە بەمایەکەی خۆی یابەزیاتر، یابەکەمتر، وەبەکامەران یابەکەسێکی تر، مامەڵەی وا بەپێی شەرع دادەنرێ بەسوود، لەبەر ئەوە بەرگیری لێ دەکرێ).

٩٧٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) قَالَ « مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِيعُهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ»: [٩٧٦]

بڕوانە: ژمارە (٩٧٥).

[٩٧٦] بخاری. بیوع: ٢١٣٦. مسلم/شیحا: ٣٨٢١ - مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩١١ (رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٥١).

٩٧٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنه) قَالَ كَانُوا يَبْتَاعُونَ الطَّعَامَ فِي أَعْلَى السُّوقِ فَيَبِيعُونَهُ فِي مَكَانِهِمْ ، فَنَهَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَبِيعُوهُ فِي مَكَانِهِ حَتَّى يَنْقُلُوهُ: (٩٧٧)

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەلای سەرووی بازاڕەوە، خۆراکیان دەکڕی، لەپاشا هەر لەجێگەی خۆیدا دەیانفرۆشتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێیانکرد، کەشتی وابکەن، هەتا نەیگوێزنەوە بۆ شوێنی تر نەیفرۆشنەوە!).

## (١٠) باب ثبوت خيار المجلس للمتبايعين

## سەرپشکی بۆ کڕیارو فرۆشیار چەسپاوە هەتا کۆڕی کڕینەستەکە بەجێ دەهێڵن

٩٧٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ « الْمُتَبَايِعَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ عَلَى صَاحِبِهِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا ، إِلاَّ بَيْعَ الْخِيَارِ »: (٩٧٨)

ئەم فەرموودەیە لە (شەرحی بلوغ المرام)دا، بەرگی/٢، ژمارە: ٨٤٦ ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیاوێ شتێکی بە پیاوێکی تر فرۆشت ئەوە هەردوو لایان سەرپشکن و مافی پەشیمان بوونەویان بۆ هەیە، هەتا بەیەکەوەبن، تا ئەو دەمەی کە لەیەکتری جیادەبنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان ئەوی تریانی کرد بەسەرپشك، کە مافی سەرپشکی و پەشیمان بوونەوەی بۆ هەبێ، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، یان کەمتر، ئەوە ئەو مافەی بۆ هەیە، یا کردی بەسەرپشك کە سەوداکە

---

(٩٧٧) بخاری. حدود/٦٨٥٢، مسلم/٢٨٢٤ شیحا. (رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٧٢).

(٩٧٨) بخاری. بیوع: ٢١١٢ پوختەی موسلیم/٩٤٤ = ٢٨٣٣ شیحا. (رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٤٤).

هەڵبگرێو قوبووڵی بکاو کەس مافی سەرپشکیو پەشیمانبوونەوەی نەمێنێ، وە لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە سەوداکە بەتەواوی دامەزرێو کەس مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نییە، با بەجەستەیش لەیەکتری جیا نەبنەوە، ئەگەر کەسی شتێکی فرۆشت بەکەسێ، وە دوایی لەیەکتری جیابوونەوە وە لەو ماوەیەدا کەسیان فرۆشتنەکەی هەڵنەوەشاندەوە، وە سەرپشکیان بۆ ماوەی سێ رۆژ یا کەمتر بەمەرج نەگرت، ئەوە دیسان فرۆشتنەکە بەتەواوی دامەزراوەو مافی هەڵوەشاندنەوەو پەشیمان بوونەوەیان نامێنێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٨ چاپی چوارەم}.

٩٧٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلاَنِ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا وَكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، وَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا، وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا الْبَيْعَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ ». {الحديث: ٣٨٣٣ = ٣٨٣٠ فم. بخاري. بيوع: ٢١١٢. نسائي. بيوع: ٤٤٨٣. تحفة الأشراف: ٨٢٧٢}: [٩٧٩]

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیاوێ شتێکی بە پیاوێکی تر فرۆشت، ئەوە هەردوو لایان سەرپشکنو مافی پەشیمان بوونەوەیان بۆ هەیە، هەتا بەیەکەوە بن، تا ئەودەمەی کە لەیەکتری جوێ دەبنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان ئەوی تریانی کرد بەسەرپشك، کەمافی پەشیمان بوونەوەی بۆ هەبێ، هەتا سێ رۆژ، یاکەمتر، ئەوە ئەو مافەی بۆ هەیە، یاکردی بەسەر پشك کەسەوداکە

[٩٧٩] بخاری. بیوع: ٢١١٢ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٤٤ - ٣٨٣٣ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٧٢).

هەڵبگرێو قوبووڵی بکاو مافی سەرپشکیو پەشیمان بوونەوە نەمێنێ، وەلەسەر ئەوە رێ کەوتن ئەوە سەوداکە بەتەواوی دادەمەزرێو کەس مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نییە، بابەلەشیش لەیەکتری جیانەبنەوە. ئەگەر کەسێ شتێکی فرۆشت بەکەسێ، وەدوایی لەیەکتری جیابوونەوە، وەلەو ماوەیەدا کەسیان فرۆشتنەکەی هەڵنەوەشانەوە، وە سەرپشکییان بۆماوەی سێ رۆژ پاکەمەتر بەمەرج نەگرت، ئەوە دیسان فرۆشتنەکە بەتەواوی دامەزراوەو مافی هەڵوەشانەوەو پەشیمان بوونەوە نامێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٨}.

بۆئەوەی لەم فەرموودەیە بەتەواوی تێ بگەین، بفەرموون تەماشای فەتحولباری بفەرموون، فەرموودەی ژمارە: ٢١١٢. كتابُ البُيُوعِ، باب: إِذَا خَيَّرَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ بَعْدَ الْبَيْعِ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ.

## (١١) باب الصِدقَ في البيع والبيان
## سەر ڕاستیو مامەڵە خۆشیو ڕاستگۆییو ڕوونکردنەوەی نەنگ لە سەوداو مامەڵەدا

٩٨٠- عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا، بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا ». {الحديث: ٣٨٣٦ شيحا = ٣٨٣٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٤٥ = ٢٠٧٩، ٢٠٨٢، ٢١٠٨، ٢١١٠، ٢١١٤. أبو داود. بيوع: ٣٤٥٩. ترمذي. بيوع: ١٢٤٦. نسائي. بيوع: ٤٤٦٩. تحفة الأشراف: ٣٤٢٧}: [٩٨٠]

---

[٩٨٠] تجرید/٣، ژمارە: ٩٤٥ - ٢٠٧٩ بخاری پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٤٥ = ٣٨٣١ ترقيم وتخريج الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/١٩).

حەكيمی كوڕی حيزام (رەزای خودای لێ بێ) لەخۆشەويستەوە دەفەرموێ: (كڕيارو فرۆشيار، هەردوو لايان خۆيـان سەرپشكنو دەتـوانن پەشيمان ببنـەوە، هەتا لەيەكتری جيادەبنەوە، جائەگەر لەگەڵ يەكتريدا، راستو دروست بنو شـت لەيـەكتری نەشـارنەوەو، نـەنگی شـاراوەی سـەوداكە حەشـارنەدەن، ئـەوە ئـەو سەودايەيان پيتو فەڕی تێ دەكەوێ بۆيان، بەڵام ئەگەر لەگەڵ يـەكتری ناڕاست بـنو شـت لەيـەكتری حەشـاربدەن، ئـەوا پيـتو فـەڕی سـەوداكەيان دەچـێ بەحەوادا). {تاج/٢، زنجيرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٦}.

## (١٢) باب مَنْ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ
## كەسێ لە مامەڵەو سەودادا بخەڵەتێ چی بكات؟

٩٨١- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: ذَكَرَ رَجُلٌ لِرَسُـولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِى الْبُيُوعِ، فَقَالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم): « مَـنْ بَايَعْتَ فَقُلْ: لاَ خِلاَبَةَ »، فَكَانَ إِذَا بَايَعَ يَقُولُ: لاَ خِيَابَةَ. {الحديث: ٣٨٣٨ = ٣٨٣٥ فم. تجريـد/٣، رقـم: ٩٥٧ = ٢١١٧، ٢٤٠٧، ٢٤١٤، ٦٩٦٤. أبـو داود. بيـوع: ٣٤٥٩. ترمذی. بيوع: ١٢٤٦. نسائی. بيوع: ٤٤٦٩. تحفة الأشراف: ٣٤٢٧} : [٩٨١]

ئيبنـو عومـەر (رەزای خودايـان لێ بـێ) فـەرمووی: پيـاوێ عـەرزی پێغەمبـەری كـرد، كـە لەسـەوداو مامەڵـەدا دەخەڵـەتێ، فـەرمووی پێـی: (كاتـێ سـەودای شـتێ دەكـەی پێـی بڵـێ: بـەبێ فـڕوفێڵو فـۆڵبڕين). جا پياوەكـە كاتـێ كەشتێكی سەودا دەكـرد دەيگوت: بـەبێ فڵو فـێڵو فـۆڵبڵێن!! چـونكە زمـانپس بوو، زمانی دەگرت لەقسەكردنا، پيتێكی دەكـرد بـەپيتێكی تـر، لامـی بـەيێ گـۆ دەكرد، لەباتی لاخيلابەتە، دەيگوت لاخييابەتە.

---

[٩٨١] تجريـد/٣، ژمـارە: ٩٥٧ - ٢١١٧ پوختـەی موسـليم/٢، ژمـارە: ٩٤٦ - ٣٨٣٨ تـرقيم شـيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٤٨).

## (١٣) النهى عن بيع الثمار قَبْلَ بُدُوِ صَلاَحِهَا بغير شرط القطعِ
## جلەوگيرى لە فرۆشتنى بەروبووم تا پێ دەگات

٩٨٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَزْهُوَ، وَعَنِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ وَيَأْمَنَ الْعَاهَةَ، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ. {الحديث: ٣٨٤٠ = ٣٨٣٩ فـم. بخاري. بيوع: ٢١٩٤. أبو داود. بيوع: ٣٣٦٧. تحفة الأشراف: ٨٣٥٥}:[٩٨٢]

ئيبنو عومەر (رەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) جلەوگيرى كردووە لەفرۆشتنى بەرى دارخورما، تا ماتە دەدا، سوور يازەرد هەڵ دەگەڕێ، وە لەفرۆشتنى دانەوێڵە لەناو گوڵەكەيدا، بەرلەوە كەسپى هەڵگرێو لەدەردو بەڵاى ئاسمانى رزگارى ببێ، جلەوگيرى كردووە لەم جۆرە سەودايە، چ بۆ فرۆشيار چ بۆ كڕيار. {تاج/٢، زنجيرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٧}.

٩٨٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَطِيبَ وَلا يُبَاعُ شَيْءٌ مِنْهُ إِلاّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ إِلاّ الْعَرَايَا) (الحديث٢١٨٩): [٩٨٣]

جابير(ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر(دروودى خواى لەسەر بێ) نەهى كردووە لەفرۆشتنى بەرى دارو درەخت تاخۆش نەبێو بەكەڵكى خواردن نەيێ، وەهيچى لێ نافرۆشرێ مەگەر بەپارە بێجگە لە عەرايا، بەڵام عەرايا واتە: دارە دۆخە، دروستە بەرەكەى بفرۆشرێ بەخورما.

---

[٩٨٢] بخارى. بيوع: ٢١٩٤ پوختەى موسليم/٢، ژمارە: ٩١٧ = ٣٨٤٠ ترقيم شيحا لصحيح مسلم (بخارى رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٥).

[٩٨٣] تجريد/٣، ژمارە: ٩٨٣ = ٢١٨٩ بخارى. مسلم محمد فؤاد/١٥٣٦ = مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩١٥ = ٣٨٤٩ شيحا. (بخارى رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٣).

**روونكردنەوە:**

عەرایا ئەوەیە: کە دەوڵەمەندێ دارێ دووان دەدا بەهەژارێ، تابەرەکەی بخواو لەپاشا دارەکە هی خۆیەتی، جا لەپاشا بۆ بارسوکی -ئەگەر کابرای هەژار لەو ماوەیەدا بەری دارەکەی بەکارنەهێنابوو- خاوەن باخەکە بەرەکەی لێ دەکڕێتەوە، بەخورمای گەییو ئەگەر هەردوولا مەیلی ئەوەیان هەبوو. (بڕ: تاج/٢/ل/٣٢٤ف-٢ = ژمارە: ١٨٣٣).

٩٨٤- عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَأْكُلَ مِنْهُ، أَوْ يُؤْكَلَ، وَحَتَّى يُوزَنَ. قَالَ: فَقُلْتُ: مَا يُوزَنُ؟ فَقَالَ رَجُلٌ عِنْدَهُ: حَتَّى يَحْزَرَ. {الحديث: ٣٨٥١ = ٣٨٤٨ فم. بخاري. بيوع: ٢٢٤٦، ٢٢٤٧، ٢٢٤٨، ٢٢٤٩، ٢٢٥٠}: [٩٨٤]

ئەبولبەختەری (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ئیبنو عەبباسم پرسی، لەبارەی بەری دارخورماوە، ئایا دەفرۆشرێ یانا، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکا لەفرۆشتنی بەری دارخورما، تا بەکەڵکی خواردن دێ، ئەوکاتە دروستە بیفرۆشێ، وەك فەریکە خورماو روتاب، وەهەتا بەسەر دارەکەوە دەقەبلێنرێ، گوتم: مەبەست لە دەقەبلێنرێ چییە؟ پیاوێ لەخزمەتیدا بوو گوتی: مەبەست ئەوەیە کە خەمڵ بکرێو بەرەکەی بگاتە ڕادەیەکی وا کە خەمڵکار بەمەزنە بزانێ کەچەند ربە، یاچەن باتمان خورما دەردەچێ!

---

[٩٨٤] بخاری. بیوع: ٢٢٤٦ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩١٦ = ٣٨٥١ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٥ رقم الباب/٤).

## (١٤) باب تحريم بيع الرُّطبِ بالتمر إلا في العرايا
## نادروسته فەریکه خورما بفرۆشرێ بە خورما مەگەر لە بابەتی دارەدۆخەدا

٩٨٥- عن زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا: [٩٨٥]

ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیما ئاوایە:

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی بەیعولعەرایای داوە، کە خاوەن باخەکە، لە هەژارەکەی دەکڕێتەوە، دەیقەبڵێنێ بە ئەندازەیێ خورمای دیاریکراو، وە خۆیان بەروتابی دەیخۆن).

٩٨٦- عن سَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ ، وَرَخَّصَ فِي الْعَرِيَّةِ أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا يَأْكُلُهَا أَهْلُهَا رُطَبًا: [٩٨٦]

بۆ زانینی واتای ئەم فەرموودەیە:

**یەکەم:** بڕوانە ژمارە: (٩٨٥ - فەرموودەکەی زەیدی کوڕی پابیت).

**دووەم:** بڕوانە ژمارە: (٩١٨) لە پوختەی موسلیم، کە لەدواوە لەژمارە (٩٨٧)دا دێ.

عَنِ بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ وَسَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ حَدَّثَاهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، إِلاَّ أَصْحَابَ الْعَرَايَا فَإِنَّهُ قَدْ أَذِنَ لَهُمْ. {الحديث: ٣٨٦٨ = ٣٨٦٥ فم = ف.م. بخاري. بيوع: ٢١٩١ ، ٢٣٨٤ ، أبو داود. بيوع: ٣٣٦٣. ترمذي. بيوع: ١٣٠٣. تحفة/٤٦٤٦} :

---

[٩٨٥] بخاری. بیوع: ٢١٧٣ مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩١٩ - ٣٨٥٧ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٢).

[٩٨٦] بخاری. بیوع: ٢١٩١ مسلم/٣٨٦٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٣).

بوشەیری کوڕی یەسار، ئازادکراوی بەرەبابی بەنی حاریثە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: رافیعی کوڕی خەدیجو سەهلی کوڕی ئەبو حەیثەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان پێم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کردووە لە فەریکە فرۆش، کە برێتییە لەفرۆشتنی بەروبوومی خەمڵکراو بەسەردارەوە، بەخورمای رنراو، یا بەمێوژ. تەنیا بەیعولعەرایای لێ دەرچێ، چونکە پێغەمبەر لەبەر ئاسانکاریو بەرژەوەندی گشتی رێگەی بەیعول عەرایای داوە).

## روونکردنەوە:

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (رەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، ئەوسییە، راستتر ئەوەیە کە ئەم سەهلی کوڕی حەثمەیە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مردووە، ئەم تەمەنی حەوت هەشت ساڵان بووە، وە لەهاوڕێ بچووکەکانی پێغەمبەرە، گێڕانەوەی بەجوانی لە پێغەمبەرەوە هەیە، سەهل لەبوخاریدا، سێ فەرموودەی هەیە، بەخەڵکی مەدینە دەژمێردرێ، لەوێش مردووە، (رەزای خودای لێ بێ).

٩٨٧- عَنِ بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ وَسَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ حَدَّثَاهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، إِلاَّ أَصْحَابَ الْعَرَايَا فَإِنَّهُ قَدْ أَذِنَ لَهُمْ. {الحديث: ٣٨٦٨ = ٣٨٦٥ فم = ف.م. بخاري. بيوع: ٢١٩١، ٢٣٨٤، أبو داود. بيوع: ٣٣٦٣. ترمذي. بيوع: ١٣٠٣. تحفة/٤٦٤٦}: [٩٨٧]

---

[٩٨٧] بخاری. بیوع: ٢١٩١ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩١٨ - ٣٨٦٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٢ رقم الباب/١٧).

بوشەیری کوڕی یەسار، ئازادکراوی بەرەبابی بەنی حاریثە.(رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: رافیعی کوڕی خەدیج و سەهلی کوڕی ئەبو حەیثەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان پێم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کردووە لە فەریکە فرۆش، کە برێتییە لەفرۆشتنی بەروبوومی خەملکراو بەسەردارەوە، بەخورمای رنراو، یا بەمێوژ. تەنیا بەیعولعەرایای لێ دەرچێ، چونکە پێغەمبەر لەبەر ئاسانکاری و بەرژەوەندی گشتی رێگەی بەیعول عەرایای داوە).

٩٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ فِي خَمْسَةِ. (يَشُكُّ دَاوُدُ قَالَ: خَمْسَةٌ أَوْ دُونَ خَمْسَةٍ). {الحديث: ٣٨٦٩ شيحا = ٣٨٦٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٤ = ٢١٩٠، ٢٣٨٢ فتح الباري. أبو داود. بيوع: ٣٣٦٤. ترمذي. بيوع: ١٣٠١. نسائي. بيوع: ٤٥٥٥. تحفة الأشراف: ١٤٩٤٣}: [٩٨٨]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی فرۆشتنی بەری دارە بەدۆخە (عەرایا)ی داوە، کە بەسەر دارەکەوە بخەملێنرێ بەخورمای پێگەیشتووی رنراو، بەمەرجێ لەپێنج وسق کەمتربێ، یا فەرمووی: بەمەرجێ لەپێنج وسق تێ نەپەڕێ). داوود کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبو سوفیانەوە، لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە، گومانی لەوەدا هەبوو کە فەرموویەتی: (لەپێنج ویسق تێ نەپەڕێ) یاخۆ فەرموویەتی: (بەمەرجێ لەپێنج وسق کەمتربێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٣٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

---

[٩٨٨] تجرید/٣، ژمارە: ٩٨٤ = ٢١٩٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٢٠ = ٣٨٦٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٨٣).

**روونكردنەوە:**

١- عەرایا بەچەند واتایێ واتاكراوە، بەڵام پوختەی ئەو واتایانە ئەمەیە: كە خاوەن باخ، دارێ، دوو دار، دەدا بەهەژارێ، كەخۆیان باخیان نەبێ، تابەرەكەی بخۆن‌و لەپاشا دارەكە هی خۆیەتی، هەروەك چۆن بزنە دۆخە بەهاران دەدرێ بەئاغا، یا بەهەژارێ، یا بەماڵی رەشایی كە ئاژەڵیان نەبێ هەتا دۆكەی بخۆن‌و پایز دەیدەنەوە بەخاوەنی، دارە دۆخەیش (واتە: عەرایاش) شتێكە لەم بابەتە. جا گەڵێ جار رێ دەكەوێ، هەژارەكە بەرەكە بەكارناهێنێ، لەبەرئەوە بە ئاموشۆی زۆر، یا ناوەخت ئازاری خاوەن باخەكە نەدا، خاوەن باخەكە، بەرەكەی لێ دەكرێتەوە، بەسەر دارەكەوە دەیقەبلێنن بەخورمای رنراو، بە ئەندازەیەكی دیاریكراو خاوەن باخەكە لەباتی روتاب یا میوەی كە بەدارەكەوەیە ئەو ئەندازە خورما دیاریكراوەی دەداتێ.

بڕوانە تاجول ئوصول، بەرگی دووەم زنجیرە: ١٧٧، لاپەڕە: ٤٠١. باسی (دۆخە = منیحة) + زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢٠).

٩٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ الْمُزَابَنَةِ وَالْمُزَابَنَةُ بَيْعُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً وَبَيْعُ الزَّبِيبِ بِالْكَرْمِ كَيْلاً. (الحديث ٢١٧١، أطرافُهُ في: ٢١٧٢، ٢١٨٥، ٢٢٠٥): [٩٨٩]

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەرگیری كردووە لەو جۆرە فرۆشتنە كەلەشەرعا ناوداره بەموزابەنە. موزابەنە واتە: بەرسیلەكاری (بریتییە لەفرۆشتنی فەریكە خورما

---

[٩٨٩] تجرید/٣، ژمارە: ٩٧٦ = ٢١٧١ بخاری مسلم/١٥٤٢ = ٣٨٧٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٧٥).

کەپێی دەگوترێ روتاب، بەخورمای کاملٚ بەپێوانە، وەبریتییە لەفرۆشتنی مێوژ بەترێ بەپێوانە) (تاج/٢/٣١٩).

**روونکردنەوە:**

حیکمەتی ئەم جۆرە نەهیە چونکە ئەم جۆرە فرۆشتنە سەردەکێشێ بۆ قومارو غەرەرو شتی وا.

٩٩٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْمُزَابَنَةِ: أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ إِنْ كَانَتْ نَخْلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ كَرْمًا أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ زَرْعًا أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، نَهَى عَنْ ذَلِكَ كُلِّهِ. {الحديث: ٣٨٧٦ شيحا = ٣٨٧٣ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٦ = ٢١٧١، ٢١٧٢، ٢١٨٥، ٢٢٠٥. نسائي. بيوع: ٤٥٦٣. أبن ماجة. تجارات: ٢٢٦٥. تحفة الأشراف: ٨٢٧٣}:[٩٩٠]

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) نەیی دەکرد لە موزابەنە، موزابەنە بەکوردی واتە: بەرسیلەکاری، یا تەرەکاری، یا تەرە فرۆشی، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا بریتییە لەوە: کە بەروبوومی دێبەرەکەی، ئەگەر باخی خورما بوو، بەری خورماکەی، بەفەریکی، کەپێی دەگوترێ: روتاب، یا بەرسیلە، بیفرۆشی بەخورمای کاملٚ، بە پێوانەیەکی دیاریکراو، وە ئەگەر مێو بوو، بەرەکەی بخەملێنێو بیفرۆشێ بە ئەندازەیە مێوژ کە پێوانەکەی زانراوبێ، وەك ئەوە بلێ: چی خورما، یا بەرسیلە، یاترێ، یا روتاب، بەم باخەی منەوە هەیە، ئەوا

---

[٩٩٠] تجرید/٣، ژمارە: ٩٧٦ = ٢١٧١ بخاری مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩١٢ = ٣٨٧٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٩١).




فرۆشتم بەبیست ربە خورما، یا چل ربە مێوژ، بەتۆ، وە ئەگەر شینایی‌و دانەوێڵە بوو، بیفرۆشێ بەدانەوێڵەی وشك، بەپێوانە، وەك ئەوە بڵێ: بەری ئەم پارچە نیسکەم فرۆشت بەتۆ بە پەنجا ربە نیسکی ئاسایی.

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیری دەکرد لەم مامەڵانە لەهەموویان.

## (١٥) باب من بَاعَ نَخلاً عَلَيه ثَمَرٌ
## کەسێ دارەخورمای بەرگرتوو بفرۆشێ

٩٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) قَالَ « مَنْ بَاعَ نَخْلاً قَدْ أُبِّرَتْ فَثَمَرُهَا لِلْبَائِعِ ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ »: [٩٩١]

لەشەرحی بلوغ المرام دا، ژمارە (٨٧٣) بەرگی/٢ ئاوایە:

وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنِ اِبْتَاعَ نَخْلًا بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ، فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ اَلَّذِي بَاعَهَا، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ اَلْمُبْتَاعُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٤٥ = بوخاری/٢٣٧٩. مسلم/شیحا/٣٨٨٢ = صحیح مسلم/١٥٤٣}:

لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کەسێ دارە خورما، یا باخە خورمای کڕی، پاش موتوربەکردنی، بەرەکەی بۆ فرۆشیارەکەیە، لەبەرئەوە مافی هاموشۆ و ئاودان‌و شتی وای هەیە، تا بەرەکەی دەڕنێ، مەگەر کڕیارەکە مەرج دابنێ کە بەرەکەی بۆ خۆی بێ‌و فرۆشیاریش

---

[٩٩١] تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٤٥ - ٢٣٧٩ - بخاری. مسلم/شیحا: ٣٨٨٢ = صحیح مسلم ترقیم محمد فؤاد/١٥٤٣ (بخاری — ٣٤/٩٠).

لەكاتی گرێدانەكەدا بەوە رازی بێ، وەكەسێ كۆیلەیێ بكڕێ، كە كۆیلەكە ماڵی هەبێ، ماڵەكەی هی ئەو كەسەیە كە دەیفرۆشێ، مەگەر كڕیارەكە مەرج دابنێ كە ماڵی كۆیلەكە بۆ خۆی بێ).

## (١٦) باب النَّهْى عَنِ المُحَاقَلَةِ وَالمُزَابَنَةِ وَعَنِ المُخَابَرَةِ وَبَيْعِ الثَّمَرَةِ قَبْلَ بُدُوِ صَلاَحِهَا وَعَنْ بَيْعِ المُعَوْمَةِ وَهُوَ بَيْعُ السِّنِينَ

## واتای ئەم زاراوەو وشانە لەم فەرموودەی دواوەدا دێ

٩٩٢- حديث جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) نَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْمُخَابَرَةِ ، وَالْمُحَاقَلَةِ ، وَعَنِ الْمُزَابَنَةِ ، وَعَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا ، وَأَنْ لاَ تُبَاعَ إِلاَّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ ، إِلاَّ الْعَرَايَا). [٩٩٢]

بۆ روونكردنەوەی ئەم فەرموودەیە ئەم فەرموودەی ژمارە (٩٢٤)ی پوختەی موسلیم دەنووسین:

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِى أُنَيْسَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبو الْوَلِيدِ الْمَكِّيُّ وَهُوَ جَالِسٌ عِنْدَ عَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ وَالْمُخَابَرَةِ، وَأَنْ تُشْتَرَى النَّخْلُ حَتَّى تُشْقِهَ. (وَالإِشْقَاهُ: أَنْ يَحْمَرَّ) أَوْ يَصْفَرَّ أَوْ يُؤْكَلَ مِنْهُ شَيْءٌ، وَالْمُحَاقَلَةُ: أَنْ يُبَاعَ الْحَقْلُ بِكَيْلٍ مِنَ الطَّعَامِ مَعْلُومٍ، وَالْمُزَابَنَةُ: أَنْ يُبَاعَ النَّخْلُ بِأَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَالْمُخَابَرَةُ: الثُّلُثُ، وَالرُّبُعُ وَأَشْبَاهُ ذَلِكَ. قَالَ زَيْدٌ: قُلْتُ لِعَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ: أَسَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَذْكُرُ هَذَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ: نَعَمْ. {الحديث: ٢٨٨٨ شيحا = ٢٨٨٥ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٩ = ٢٢٠٧، ٢١٨٦، ٢١٨٧. نسائى. إيمان: ٣٨٨٨} :

---

[٩٩٢] (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٥) مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٢٤ = ٢٨٨٢ شيحا.

زەیدی کوڕی ئەبو ئونەیسە فەرمووی: ئەبولوەلیدی مەککی لەخزمەتی عەتای کوڕی ئەبو رەباحا دانیشتبوو، گێڕایەوە بۆمان فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کردووە لە (موحاقەلە) و (موزابەنە) و (موخابەرە) وە نەیی کردووە لەوە کەبەری دارە خورما بفرۆشرێ، هەتا ماتە دەدا، ماتەدان ئەوەیە کەوا سووربێ، یاوا زەرد هەڵگەڕێ کە نیشانەی سەرەتای گەیینی دیاری دابێ، بەشێوەیێ وا کەبەکەڵکی خواردن بێت. فەرموودە گێڕەوە دەفەرموێ:

١- موحاقەلە، واتە: قەرسیلکاریی، بڕێتییە لەفرۆشتنی قەرسیل و شینایی نەدووراوە، بەگەنم، یا بەدانەوێڵەی تر، بە پێوانەیەکی زانراو، وەك دەربە، یا شەش تەنەکە.

٢- موزابەنە، واتە: بەرسیلەکاری، واتە: فرۆشتنی روتاب و بەرسیلەی ترێ، بەسەر دارەوە، بەخورما، یا بەمێوژ بە پێوانەیەکی دیاریکراو، وەك چەند وەسقێ خورما.

٣- موخابەرە، واتە: ملکانەکاریی، بڕێتییە لەوە کەیەکێ پارچەیێ زەوی بدا بەکەسێ کە خۆشی بکاو، دایچێنێ، بەملکانە، بەسێ یەك، یا بەچوار یەك، یا بەکەمتر، یا بەزیاتر.

زەید فەرمووی: عەرزی عەتائی کوڕی ئەبو رەباحم کرد: ئایا تۆ ئەمەت بیست لەجابیری کوڕی عەبدوڵلا کە ئەمە بگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ فەرمووی: (بەڵێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٩ ج/٤}.

بۆ واتای کۆتایی فەرموودەکە بڕوانە ژمارە (٩٨٣).

## (١٧) باب كراءِ الأرْضِ
## باسی بە کرێدانی زەوی

٩٩٣- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ كَانَتْ لِرِجَالٍ مِنَّا فُضُولُ أَرَضِينَ فَقَالُوا نُؤَاجِرُهَا بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالنِّصْفِ . فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ »:

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: چەند پیاوانێ لە ئێمەی ئەنصار، زەوی زیاد لەخۆیان هەبوو، گوتیان: دەیدەین بە ملکانە، بەسێیەك و چواریەك و نیوەیی و شتی تری لەم بابەتە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ زەوی هەیە، با خۆی دایچێنێ و بەرهەمی بهێنێ، یا با بەپیاوەتی بیدا بەبرای ئایینی خۆی کە بۆ خۆی بەرهەمی بهێنێ، بەڵام ئەگەر ئەم دوو خاڵەی نەکرد، با زەوییەکەی بخەوێنێ وە نەیدا بەکرێ!).**

٩٩٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ»:[٩٩٤]

**بڕوانە ژمارە (٩٩٣) واتاکەی لەوێ ڕۆیشت.**

٩٩٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ . وَالْمُزَابَنَةُ اشْتِرَاءُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ فِى رُءُوسِ النَّخْلِ):[٩٩٥]

---

[٩٩٤] **بخاری. حرث ومزارعه/٢٣٤٠ مسلم/شیحا: ٣٨٩٥ (بخاری رقم الکتاب/٤١ رقم الباب/١٨).**

[٩٩٥] **بخاری. حرث ومزارعه/٢٣٤٠، ٢٦٣٢ مسلم/شیحا: ٣٨٩٥. (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٨٢).**





ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) جڵەوگیری دەکـرد لـە موزابەنـەو لـە موحاقەلـە، موزابەنەیش بریتییە لە فرۆشتنی بەری دارخورما بەسـەر دارخورماکەوە بـە خورمای ڕنراو.

٩٩٦- عَنْ نَافِعٍ رحمه الله تعالى أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) كَانَ يُكْرِي مَزَارِعَهُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَصَدْرًا مِنْ إِمَارَةِ مُعَاوِيَةَ ثُمَّ حُدِّثَ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ فَذَهَبَ ابْنُ عُمَرَ إِلَى رَافِعٍ فَذَهَبْتُ مَعَهُ فَسَأَلَهُ فَقَالَ نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَدْ عَلِمْتَ أَنَّا كُنَّا نُكْرِي مَزَارِعَنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا عَلَى الأَرْبِعَاءِ وَبِشَيْءٍ مِنْ التِّبْنِ) (الحديث٢٣٤٣، طرفه في: ٢٣٤٥، والحديث: ٢٣٤٤) [٩٩٦].

نافیع (ڕەزای خوای لـێ بێ) فەرمووی: جاران ئیبنوعومەر (ڕەزای خوایان لـێ بێ) لەسەردەمی پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانـدا (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) جـاران ئیبنوعومـەر(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) لەسـەردەمی ئـەم زاتانـەدا، هـەتا سـەرەتای فـەرمانڕەوایی موعاویـەیش، لـەم ماوەیەدا زەوی‌و زاری خۆی دەدا بەکرێ، بەڵام کە فەرموودەکەی ڕافیعی کوڕی خـەدیجی ژنـەوت، کـە پێغەمبـەر(درووودی خـوای لەسـەر بـێ) نـەیی کـردووە لەبەکرێدانی زەوی‌و زار، کاتێ ئەم فـەرموودەی پـێ گەیشت ئیبنوعومـەر خـۆی چوو بۆلای ڕافیع بۆ دڵنیـا بـوون لەکارەکە، منـیش لەخزمـەتی دا چووم کـەلێم

[٩٩٦] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٣١ = ٢٣٤٣ بخاری. مسلم محمد فؤاد: ١٥٤٧ = ٣٩١٥ ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤١ رقم الباب/١٨).

پرسی رافیع فەرمووی: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پێشگیری (نـەیی) کردوە لەبەکرێدانی زەوی‌و زار).

ئیبنوعومـەر فـەرمووی: (ئـەوەی مـن دەیـزانم جـاران زەوی‌و زارمـان لەسەردەمی پێغەمبەردا دەدا بەکرێ لەسەر ئـەم شـێوەیە: ئـەوەی لەسـەر ماکـاو وجۆگەلەکانــە بــۆ خــاوەن زەوییەکــە لەگــەڵ هەنــدێ کــا، لــەباتی مڵــکانە) (تاج/٢/٣٥٣/-٤ز -١٦٨)

## (١٨) باب كراءِ الأرْضِ بالطعَامِ
## بەکرێدانی زەوی بە خۆراك

٩٩٧- عَنْ رَافِعَ بْنَ خَدِيجِ بْنِ رَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ عَمِّهِ ظُهَيْرِ بْنِ رَافِعٍ قَالَ ظُهَيْرٌ لَقَدْ نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ أَمْرٍ كَانَ بِنَا رَافِقًا قُلْتُ مَا قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَهُوَ حَقٌّ. قَالَ: دَعَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا تَصْنَعُونَ بِمَحَاقِلِكُمْ؟) قُلْتُ: نُؤَاجِرُهَا عَلَى الرُّبُعِ وَعَلَـى الأَوْسُـقِ مِـنْ التَّمْرِ وَالشَّعِيرِ قَالَ: (لا تَفْعَلُوا ازْرَعُوهَا أَوْ أَزْرِعُوهَا أَوْ أَمْسِكُوهَا) قَـالَ رَافِـعٌ: قُلْـتُ: سَمْعًا وَطَاعَةً) (الحديث ٢٣٣٩، أطرافُهُ في: ٢٣٤٦,٤٠١٢): [٩٩٧]

رافیعـی کـوڕی خـەدیج ی کـوڕی رافیـع (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: مامـەم ظوهـەیری کـوڕی رافیـع (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەراسـتی دا سەرەنجام پێغەمبەر لەسەر شێوەیەکی روون‌و ئاشکرا نـەیی لـێ کـردین لـەکارێ لەبار بوو بۆمان. منیش گـوتم: هەرچی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) بیفـەرموێ: رەوایـەو راسـتەو دروسـتە. فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای

[٩٩٧] تجریـد/٣، ژمـارە: ١٠٣٠ = بخـاری: ٢٣٣٩ مـسلم/شـیحا: ٣٩٢٦ (بخـاری رقـم الکتـاب/٤١ رقـم الباب/١٨).

لەسەر بێ) بانگی کردمو فەرمووی: (زەویو زارەکانتان چۆن چۆنی بەرهەم دەهێنن؟) عەرزیم کرد: دەیدەین بەکرێ، بە چواریەکی داهاتەکەیو بەچەند تەغارێکی ناوبراو لەخورماو جۆ، فەرمووی: (وامەکەن، بەڵکوو خۆتان بۆ خۆتان دایچێنن یابەپیاوەتی بیدەن بەکەسێ بۆ خۆی دایچێنێ، یا بەبەیاری بیهێڵنەوە!).

## راڤەو شیکردنەوە:

**یەکەم:** زەوی دان بەمڵکانە راجیاییەکی زۆری واتیا بەڵام کورتو پوخت: (شتیوا دروستە بەمەرجێ سەرنەکێشێ بۆ کێشەو بەرەلەنێوانی خاوەنی زەویەکەو وەرزێرو ئاودێرەکانو کشتیارەکان دا).

**دووەم:** ظوهەیری کوڕی رافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەنصارییە، ئەوسییە، مامەی رافیعی کوڕی خەدیجە، کەلەکۆتایی فەرموودەی ژمارە (١٠٢٥)ی تجریدی بوخاری دا ژیاننامەکەی نووسراوە. ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بووە، لەم پەیمانەدا پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەردا بەست عەسقەلانی لەئیصابەدا دەفەرموێ: ئامادەی جەنگی بەدر بووە، کەواتە بەدرییە، بەڵام لەئیستیعابا ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێ: (ئامادەی بەدر نەبووە بەڵام ئامادەی جەنگی ئوحودو شەڕگەو جەنگەکانی تری پێغەمبەر بووە، کەلەپاش ئوحود رویان داوە) لەسەر فەرمایشتی موقەددیمەی فەتحولباری یەك فەرموودەی لەصەحیحی بوخاری پیرۆزدا هەیە، دیارە کەئەویش ئەم فەرموودەیەی ئێرەیەتی (ڕەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ).

## (٢١) باب الأرض تمنح
## بەخشینی زەوی بە خۆڕایی بە وەرزێر بۆخۆی دایبچێنێ

٩٩٨ـ عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَنْهَ عَنْهُ ، وَلَكِنْ قَالَ « أَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهِ خَرْجًا مَعْلُومًا ».[٩٩٨]

**لە موختەصەری صەحیحی موسلیما، ژمارە (٩٧٦) ئاوایە:**

عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ كَانَ يُخَابِرُ: قَالَ عَمْرٌو: فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَوْ تَرَكْتَ هَذِهِ الْمُخَابَرَةَ، فَإِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ، فَقَالَ أَيْ عَمْرُو!: أَخْبَرَنِي أَعْلَمُهُمْ بِذَلِكَ، يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَنْهَ عَنْهَا، إِنَّمَا قَالَ: « يَمْنَحُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا خَرْجًا مَعْلُومًا ». {الحديث: ٣٩٣٤ = ٣٩٣١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٢٧ = ٢٣٣٠، ٢٣٤٢، ٢٦٣٤. أبو داود. بيوع: ٣٣٨٩. ترمذى. أحكام: ١٣٨٥. نسائى. أيمان ونذور: ٣٨٨٢. ابن ماجة. رهون: ٢٦٥٦، ٢٤٦٤. تحفة الأشراف: ٥٧٣٥}:

عەمری کوڕی دینار (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی تاووسم کرد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ): خۆزگا وازت لەبەکرێدانی زەوی بەملکانە دەهێنا، چونکە ئەوانە بەقسەی خۆیان دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی لەشتی واکردووە؟ تاووس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی عەمر! زاناترینیان کە ئیبنو عەبباسە (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەواڵی پێمداوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی لێ نەکردووە، بەڵام فەرموویەتی:

---

[٩٩٨] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٢٧ = ٢٣٣٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٧٦ = ٣٩٣٤ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٤١ رقم الباب/١٠).

(ئەگەر زەوی‌و زارتان بەپیاوەتی بدەن بەبرای ئایینی خۆتان کە بۆخۆی دایبچێنێ، لەوە باشترە کە بەملکانە پێی بدەن، یا بەکرێیەکی دیاریکراو پێی بدەن!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٨، ژمارە: ١٩٠٧}.

## ٢- پوختەی بڕیارەکانی فەرموودەکانی نامەی کڕین‌و فرۆشتن:

١/ کڕین‌و فرۆشتنی خۆراك بەخۆراك‌و بژێوی بە بژێوی‌و بەروبووم‌و میوە، بەجۆری خۆی، یابەجۆرێکی تر، یا پارە بەپارە یا زێڕ بەزێڕ، یا زیو بەزیو، دەستوورو یاسای تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر موسوڵمان ئاگای لەخۆی نەبێ دوورنییە کەتووشی سوود خۆریی ببێ، واباشە لەکاتی وادا پرس بە پسپۆڕان بکرێ.

٢/ فرۆشتنی شت بەگۆترە بەبەهای دیاریکراو نادروست‌و ناپەسەندو ناباشە.

٣/ میوەو بەروبووم هەتا بەکەڵکی خواردن نەیەت دروست نییە بیفرۆشن. بەڵام ئەگەر بەکەڵکی خواردن دەهات دروستە، وەك: فەریکە نۆك‌و فەریکە چوالەو روتاب‌و فەریکە گوێز.

٤/ دارە دۆخە سوننەتە، ئەگەر ماڵێ رەشایی بوو لەگوندێکا، ئاژەڵیان نەبوو، سوننەتە ئاژەڵدارەکان، ئاژەڵی شیرداریان بەدۆخە بدەنێ، یائەگەر باخیان نەبوو، دارە خورمایێ، بڕکە هەنجیرێ، یابنجێ مێویان پێ بدرێ کەشیرو بەرەکەی بخۆن‌و دوایی سەرەکە بۆخاوەنەکەی بگەڕێننەوە.

٥/ لەکاتی دەردو بەڵای ئاسمانی بۆ ئاژەڵ‌و بێستان‌و باخ دەستووری تایبەت هەیە، بڕیاری تایبەت هەیە.

٦/ لەهەموو روویەکەوە یارمەتی لێقەوماو، بەتایبەتی قەرزار، کاری پەسەندە.

٧/ باسی کۆمەڵێ سەوداو مامەڵەی جیاجیا، کە حوکمو ناوو بڕیارەکانیان، کەمێ دوورو درێژە، لەکتێبی شەرعا بەباشی باس کراون.

٨/ بەشێوەی گشتی دار رواندنو باخو رەز دروست کردنو شینایی چاندنو برەودان بەکشتوکاڵو باخو شتی وا کارێکی زۆر نایابو پەسەندە، وەهۆی خێری هەردوو جیهانە، تەنانەت رواندنو چاندنو ناشتنی دارو درەختو گوڵو شتی وا، ئەگەر لەناوماڵیشدا بێو بۆ زینەتیش بێ، کارێ زۆر پەسەندو باشنو مایەی رەحمەتی خودان. گەڵێ جار تاقە گوڵێ لەماڵێکا، لەسەرە رێگەیەکا، لەباخچەیەکا، سەرەنجی مرۆڤ رادەکێشێو خۆشی دەروێنێ لەناو دڵو هەستی مرۆڤو سۆزێکی تەلیسماوی پڕ لەمیهرو هەژانو خەمی تەماوی دەورووژێنێ، کە بەکتێبێ تەعبیری لێ نادرێتەوە، رەحمەت لەگوتەری:

بەچاو نەمدیوە لەم دنیا
جوان بێ وەک گوڵی تەنیا

## ٢٢- كِتَابُ المُسَاقَاةِ
## نامەی باخەوانیو ئاودێریی

{بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ٣٨٨ + لاپەڕە: ٣٦٣ لە زنجیرە: ١٥٩ + ١٧٠ ژمارە: ١٨٥٧ هەتا ژمارە: ١٩٣٠ + فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٢٣٠ لاپەڕە: ٥٥٩ + تجرید/٢، لاپەڕە: ١٣٣، زنجیرە: ٤٧ + مختصر صحیح مسلم بەکوردی/٢، لاپەڕە: ٤٨٨، زنجیرە: ٧٦٢ هەتا زنجیرە: ٧٧٠ نامەی ژمارە: ١٩ لە ژمارە: ٩٧٢ هەتا ٩٨٠} + {شەرحی بلوغ المرام/٢، لەژمارە: ٩٣٠ هەتا ژمارە: ٩٥٠}.

### (١) باب المُسَاقَاةِ والمعاملة بجزءٍ من التمر والزرع
### باخەوانیو ئاودێری بە موڵکانە، واتە: بە بەشێکی دیاریکراو لە بەروبوومی زەوییە بەرهەمهێنراوەکە

٩٩٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ، فَكَانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ كُلَّ سَنَةٍ مِائَةَ وَسْقٍ، ثَمَانِينَ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ، وَعِشْرِينَ وَسْقًا مِنْ شَعِيرٍ، قال: فَلَمَّا وَلِيَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَسَمَ خَيْبَرَ، خَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُقْطِعَ لَهُنَّ الأَرْضَ وَالْمَاءَ. أَوْ يَضْمَنَ لَهُنَّ الأَوْسَاقَ كُلَّ عَامٍ، فَاخْتَلَفْنَ. فَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الأَرْضَ وَالْمَاءَ، وَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الأَوْسَاقَ كُلَّ عَامٍ، فَكَانَتْ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) مِمَّنِ اخْتَارَتَا الأَرْضَ وَالْمَاءَ. {الحديث: ٣٩٤٠ = ٣٩٣٧ فم}: [٩٩٩]

---

[٩٩٩] تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٢٥ = ٢٣٢٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٧٧ = ٣٩٤٠ شیحا = ١٥٥١ محمد فؤاد عبدالباقی. (بخاری رقم الکتاب/٤١ رقم الباب/٨).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ وڵاتی خەیبەری ئازادکرد، دایەوە بەخەڵکی خەیبەر، کە بەنیوەیی بەرهەمی بهێنن، چ میوەو بەروبوومو چ دانەوێڵەو شیناییی بەنیوەیی، نیوەی بۆ دەوڵەتی ئیسلامو نیوەی بۆ وەرزیرو ئاودێرەکان بۆخۆیان. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو ساڵێ لەدەرامەتی خەیبەر، سەد وەسقی دەدا بە هاوسەرەکانی، هەشتای خورماو بیستی جۆ.

جاکاتێ پێشەوا عومەر بوو بەجێنشینو خەیبەری دابەشکرد، هاوسەرەکانی پێغەمبەری کرد بەسەرپشك: کەیا بەشە زەویو ئاو هەڵبگرن، یالەسەر ساڵانەی خۆیان بەردەوام بنو ساڵ بەساڵ چەند تەغاریان بۆ دانراوە وەری بگرن. ئیتر ئەوەبوو هەندێکیان زەویو ئاویان هەڵگرتو هێندێکیان ساڵانەیان هەڵبژارد. عائیشەو حەفصە لەو هاوسەرانە بوون کە زەویو ئاویان هەڵگرتبوو. {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٠، ژمارە: ١٩١٥ – ش/د/ت}.

ئەمە دەقی ژمارە (٩٧٧)ی پوختەی موسلیم بوو، زیادەی بەسوودی زۆری واتیادا. گێڕانەوەی کتێبەکە، واتە: ئەصڵەکە دەقی ژمارە (١٠٢٥)ی تەجریدی بوخارییە.

١٠٠٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَجْلَى الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا ظَهَرَ عَلَى خَيْبَرَ أَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا وَكَانَتْ الأَرْضُ حِينَ ظَهَرَ عَلَيْهَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلِلْمُسْلِمِينَ وَأَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا فَسَأَلَتِ الْيَهُودُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيُقِرَّهُمْ بِهَا أَنْ يَكفُوا عَمَلَهَا وَلَهُمْ نِصْفُ الثَّمَرِ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ

(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (نُقِرُّكُمْ بِهَا عَلَى ذَلِكَ مَا شِئْنَا). فَقَرُّوا بِهَا حَتّى أَجْلاهُمْ عُمَرُ إِلَى تَيْمَاءَ وَأَرِيحَاءَ) (الحديث ٢٣٣٨): [١٠٠٠]

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، جولەکەو گاورەکانی لەحیجاز وەدەرناو خاکی حیجازی پێ چۆڵ کردن، هۆی ڕەوایی ئەم کارەی عومەریش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم داستانە: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ سەرکەوت بەسەر قەڵای خەیبەردا، ویستی بەجولەکەکانی چۆڵ بکا، چونکە بەئازادکردنی خەیبەر، لەلایەنی سوپای ئیسلامەوە، خاك‌و زەوی خەیبەر هەمووی بوو بەهی خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان، لەهی ناموسوڵمان دەرچوو، جا کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ویستی خەیبەر بەجوولەکەکان چۆڵ بکا، جوولەکەکان داوایان لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کرد: کەلەوێ بیانهێڵێ، هەتا زەوی‌و زارەکەی بەرهەم بهێنن، بەمەرجێ جوولەکەکان کارەکان ئەنجام بدەن‌و کارو ئیش‌و فەرمانی بەرهەمهێنان لەسەر ئەوان بێ بەلام بەروبومەکەی بەنیوەیی بێ: نیوەی بۆ موسوڵمانان‌و نیوەی بۆ جوولەکەکان. پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشە لەسەر ئەمە ڕێدەکەوین‌و مافی مانەوەتان پێ دەدەین، هەتا خۆمان ئارەزومان هەبێ!!) ئیتر ئەوانیش بەمە رازی بوون‌و لەوێ مانەوە هەتا ئەو سەردەمەی عومەر ئەوێی پێ چۆڵ کردن‌و ڕەهەنەی کردن بۆ تەیماو ئەریحا.

---

[١٠٠٠] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٢٩ = ٢٣٣٨ بخاری مسلم: ١٥٥١ = ٣٩٤٤ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٤١ رقم الباب/١٧).

## (٢) باب فَضْلُ الغَرْسِ وَالزَرْعِ
## خێرو بەهرەی نەمامناشتنو شت چاندن

١٠٠١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ إِلاَّ كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ وَقَالَ لَنَا مُسْلِمٌ حَدَّثَنَا أَبَانُ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسٌ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٣٢٠، طرفُهُ في: ٦٠١٢)؛ [١٠٠١]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ نەمامێ بنێژێ، یاشتێ بچێنێ، باڵندەیێ، کەسێ، ئاژەڵێ، لێی بخوات، یا هەر سوودێکی تری لێ وەربگیرێ، دەبێ بەخێرو بەخشش بۆی).

مامۆستای عەسقەلانی لەشیکردنەوەی ئەم فەرموودەیە دا دەفەرموێ: (..خـوازەی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە: پاداشتی ئەوە بەردەوام دەبێ مادام ئەو نەمامە، یا ئەو چێنراوەی بمێنێ، تەنانەت ئەگەر خاوەنەکەشی یاچێنەرەکەشی بمرێ، یا خاوەنێتی ئەو چێنراوە بگوێزرێتەوە بۆ کەسێ تر هەروایەو، خێرەکەی ئەو بەردەوامە، ئەوەش کە دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ یا هەر گیانداری لەسەر شێوەی گشتی، بەڵگەی ئەومیە، هەر موسوڵمانێ ئازادبێ یا کۆیلە، ژن بێ یا پیاو، بەدین بێ یا نافەرمان، کارێکی وا ئەنجام بدا، کە گیانداران کەڵکی لێ وەربگرن، بۆی دەبێ بەخێرو خێراتو بەخششو خێری نەبڕاوە...).

---

[١٠٠١] تجرید/٣، ژمارە: ١٠١٩ - ٢٣٢٠ بخاری مسلم ١٥٥٢ = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٧٨ - ٣٩٤٤ شیحا (بخاری – ١/٤١).

بەنـدەیش دەڵێم: چێنراو نموونـەو وێنەیـە، دەنـا هـەموو کارێـکی ڕەوای بەردەوام هەمان خێرو پاداشتی بۆ هەیـە، هـەتا کەسـێ بـەهرەی لـێ وەربگـرێ، وەهـەتا گیانـدارێ کەڵـکی لـێ وەربگـرێ، وەك: بـیرو کـارێزو پـردو مزگـەوتو کتێبو خانووو شتی تری لەم بابەتە، لـەپاش مردنـی خاوەنیـشی هـەروا لـەپاش گواستنەوەی خاوەنێتیـشی واتــە: لـەپاش نەقـڵی موڵکیەتیـشی، خێـرو پاداشـتی دروستکەری یەکەمی هەر دەمێنێ، ئەوەش مەعنای وانییە، ئەگەر کەسـی دووەم کاتێ ئەوشتە دەکڕێو دەیکا بەخێر خێری ئەو ناگات، بەڵـکو هـەموولا خێریـان دەگا، هەرکەسەیان بەپێی ڕۆڵی خۆی بۆ خودا چی تێ دەچێ.

ئەمەیش دەقی ژمارە (٩٧٨)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَـا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، إِلاَّ كَانَ مَا أُكِلَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا سُرِقَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَـا أَكَلَ السَّبُعُ مِنْهُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا أَكَلَتِ الطَّيْرُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ، وَلاَ يَرْزَؤُهُ أَحَدٌ إِلاَّ كَـانَ لَهُ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٣٩٤٥ = ٣٩٤١ فم. ريـاض/ زنجـيره: ١٣، ژمـاره: ١٣٥/١٩. تجريد/٣، رقم: ١٠١٩ = ٢٣٢٠، ٦٠١٢}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درroودی خودای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ، شتێ بڕوێنێ، یا نەمامێ بنێـژێ، ئـەوەی لێـی بخوا، ئەوەی لێی بدزێ، ئەوەی دڕندەو دەعبا بیخوا، ئـەوەی مـەلو مـۆر بیخـوا، ئەوەی سوودی لـێ ببینێ، ئیتر هەر سوودێك بـێ، ئەمانـە هـەموویان بـۆی دەبـن بەخێرو خێرات). {تاج/٢، زنجیره: ١٦٧، ژماره: ١٩٠٥}.

## (٣) باب وَضْعِ الجَوَائِحِ
## داشكاندنو بوورین بەهۆی دەردو بەلای ناكەهان

١٠٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ فَقِيلَ لَهُ وَمَا تُزْهِي قَالَ حَتَّى تَحْمَرَّ فَقَالَ رَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَرَأَيْـتَ إِذَا مَنَـعَ اللَّـهُ الثَّمَـرَةَ بِـمَ يَأْخُـذُ أَحَـدُكُمْ مَـالَ أَخِيهِ؟). (الحديث ٢١٩٨)[١٠٠٢]

ئەنەسی كوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەیی كردووە لەفرۆشتنی بەروبووم هەتا ماتەنەدات، پێیان گوت: ماتەدان واتای چییە؟ فەرمووی: ئەوەتە كەسوور ببێ. پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی پێم بڵێن: ئەو بەروبوومەی كەبەكاڵی دەیفرۆشن بەرلەوەی كە پێ بگات، ئەگەر خوا فەوتانی ئیتر فرۆشیار بەچی مەهانەیەكی نارەوا ماڵی كڕیار دەخوات؟).

## (٤) باب إِسْتِحْبَابُ الوَضْعِ مِنَ الدَّيْنِ
## داشكاندن لە قەرز سوننەتە

١٠٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) تَقُولُ سَمِعَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) صَوْتَ خُصُومٍ بِالْبَابِ عَالِيَةٍ أَصْوَاتُهُمَا وَإِذَا أَحَدُهُمَا يَسْتَوْضِعُ الآخَرَ وَيَسْتَرْفِقُهُ فِي شَيْءٍ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لا أَفْعَلُ فَخَرَجَ عَلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

[١٠٠٢] تجرید/٣، ژمارە: ٩٨٧ = ٢١٩٨ بخاری. مسلم: ١٥٥٥ - پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٢١ = ٣٩٢٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/ ٣٤ رقم الباب/٨٧).

فَقَالَ: (أَيْنَ الْمُتَأَلِّي عَلَى اللَّهِ لا يَفْعَلُ الْمَعْرُوفَ؟) فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَهُ أَيُّ ذَلِكَ أَحَبَّ) الحديث٢٧٠٥): [1003]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) گوێی لەقیڕەقیڕێ بوو لەپشت دەرگاکەوە هاوداواکان کردبوویان بەهەراو زەنا، قەرزارەکە داوای لەخاوەن قەرزەکە دەکرد، کە دڵی بەحاڵی بسووتێ وە هەنێ لەقەرزەکەی سەری بۆ دابشکێنێ، ئەویش دەیگوت: بەخودا نایکەم، حەزرەتیش (درودی خوای لەسەر بێ) دەرچوو بۆ لایان و فەرمووی: ئەوە کێیە بەخودا سوێند دەخواو دەیکا بەبیانوو بۆ ئەوەی کە چاکە نەکا؟ خاوەن قەرزەکەش گوتی: ئەوە منم ئەی پێغەمبەری خودا! کەواتە هاوڕێکەم چۆن حەز دەکا با وابێ و چەندەم لەقەرزەکەم دەداتەوە کەیفی خۆیەتی. (ریاض/٢١٩/١ف-٢٥٠ز-٣١- باسی ناوبژی کردن و نێوان ڕێکخستن-ش).

١٠٠٤- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ فَنَادَى يَا كَعْبُ قَالَ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ ضعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذا وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ أَيْ الشَّطْرَ قَالَ لَقَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ قُمْ فَاقْضِهِ). (الحديث ٤٥٧ ـ أطرافه في: ٤٧١، ٢٤١٨، ٢٤٢٤، ٢٧٠٦، ٢٧١٠): [1004]

---

[1003] تجرید/٣، ژمارە: ١١٣٠ - ٢٧٠٥ بخاری مسلم محمد فؤاد/١٥٥٧ - ٣٩٦٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٣ رقم الباب/١٠).

[1004] تجرید/١، ژمارە: ٢٧٩ - ٤٥٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦١ - ٣٩٦١ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨ رقم الباب/٧١).

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قەرزێکم لەسەر ئیبنوئەبو حەدرەد بوو لەناو مزگەوتا داوایم لێ ی کردەوە بەهۆی ئەوەوە دەنگمان بەرزەوە بوو، تارادەیەکی وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو ماڵی خۆیەوە گوێی لەدەنگە دەنگمان بوو، جاتەشریفی هاتە دەرەوە کەبێ بۆلامان، چوو پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆیی کلاکردو بانگی کرد: (ئەی کەعب!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! سەرم لەڕێتایە. فەرمووی: (ئەوەندە لەقەرزەکەت دابشکێنە) بەئاماژە تێی گەیاند کەلەنیوەی قەرزەکەی خۆش ببێ لێ ی. کەعب فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەوا دام شکان ئەی پێغەمبەری خودا! جا حەزرەت بەئیبنوئەبی حەدرەدی فەرموو: (دەتۆیش هەڵسە بڕۆ ئەو نیوەکەی تری پێ بدەرەوە!).

## شیکردنەوە:

کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) تاقانەی باوکی بووە، ناوداره بەکەعبی شاعیر، یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا، یەکێکە لەوسێ کەسەی کەئەم ئایەتە لەبارەیانەوە هاتووە: (وعلى الثلاثة الذين خلفوا حتى إذا ضاقت عليهم الأرض) تا کۆتایی ئایەت، هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، چوار فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لەکۆتایی تەمەنیدا کوێر بوو بوو، عەبدوڵلای کوڕی چاوساغی بوو: (ریاض الصالحین بەرگی یەکەم ل-٣٤ فـ٩ = ز-٢ ژ-٢١/٩ چ-٢).

لە پوختەی موسلیما ژمارە (٩٦١) بەرگی/٢ ئاوایە:

عَنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا،

حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ، وَنَادَى كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ فَقَالَ: « يَا كَعْبُ». فَقَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ بِيَدِهِ أَنْ ضَعِ الشَّطْرَ مِنْ دَيْنِكَ، قَالَ كَعْبٌ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « قُمْ فَاقْضِهِ ». {الحديث: ٣٩٦١ = ٣٩٥٧ فم. تجريد/١، رقم: ٢٧٩ = ٤٥٧، ٤٧١، ٢٤١٨، ٢٤٢٤، ٢٧٠٦، ٢٧١٠. أبو داود. أقضية: ٢٥٩٥. نسائي. قضاة: ٥٤٢٣، ٥٤٢٩. رياض/١، زنجيره: ٣١، ژماره: ٣/٢٥٠ چاپي دووەم} :

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قەرزێکم لەسەر ئیبنو ئەبو حەدرەد بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا داوایم لێی کردەوە، بەهۆی ئەوەوە دەنگمان بەرزەوە بوو، تارادەیەکی وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو ماڵی خۆیەوە گوێی لەدەنگە دەنگمان بوو، جا تەشریفی هاتە دەرەوە کەبێ بۆلامان، چوو پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆیی لادا، دەرگای هۆدەکەی لەسەر ماڵی مزگەوت بوو، ئەوجا بانگی کرد: (ئەی کەعبی کوڕی مالیك!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! سەرم لەرێتایە. فەرمووی: (ئەوەندە لەقەرزەکەت دابشکێنە) بەئاماژەی دەست تێی گەیاندم کە لەنیوەی قەرزەکەی خۆش ببم. کەعب فەرمووی: ئەوا دایم شکان ئەی پێغەمبەری خودا! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئیبنو ئەبی حەدرەدی فەرموو: (دەتۆیش هەڵسە بڕۆ ئەو نیوەکەی تری پێ بدەرەوە).

## (٥) باب مَنْ أدْرَكَ مَابَاعَهُ عِنْدَ المُشْتَرِي وَقَدْ أفْلَسَ فَلَهُ الرُجُوعُ فِيهَ
## کەسێ ماڵی خۆی بەسەر بگرێتەوە کە فرۆشتبێتی بەکەسێ تر و ئەوکەسە نابووت کەوتبێ، ئەوە دەتوانێ بیباتەوە بۆ خۆی

١٠٠٥- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {بوخاری: ٢٤٠٢. پوختەی موسلیم/٩٦٥ = شیحا/٣٩٦٨ = مسلم/١٥٥٩}:[1005]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ خودی ماڵی خۆی، بەسەر گرتەوە، لەلای پیاوێکی لاتکەوتوو، ئەوە هی خۆیەتیو بەو ڕەواترە هەتا کەسێکی تر). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٥، ژمارە: ١٨٩٤}.

## (٦) باب فَضْلِ إنْظَارِ المُعْسِرِ
## خێری چاوپۆشی کردن لە نەداراو مۆڵەتدانی

١٠٠٦- عنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) حَدَّثَهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَلَقَّتِ الْمَلائِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ قَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنْ الْخَيْرِ شَيْئًا؟ قَالَ: كُنْتُ آمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا المعسِرَ وَيَتَجَاوَزُوا عَنْ الْمُوسِرِ قَالَ: قَالَ: فَتَجَاوَزُ الله عنه). (الحديث ٢٠٧٧ – طرفاه في: ٢٣٩١، ٣٤٥١)؛[1006]

---

[1005] بوخاری: ٢٤٠٠٢ پوختەی موسلیم/٩٦٥ = شیحا/٣٩٦٨ = ١٥٥٩ = ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی. (بخاری/ رقم الكتاب/٤٣ رقم الباب/١٤).

[1006] تجرید/٣، ژمارە: ٩٤٤ = ٢٠٧٧ بخاری. مسلم/١٥٦٠ محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٣ = ٣٩٧١ شیحا (بخاری/ رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/١٨).

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی گیانکێشان دا، فریشتەکانی خوا گیانی پیاوێکیان وەرگرت کەلە نەتەوەکانی پێش ئێوە بوو، پێیان فەرموو: ئایا لەژیانتا هیچ چاکەیەکت کردووە؟ گوتی: بەلێ قەرزم دەدا بەخەڵك دەستورم وابوو، بەپیاوەکانی خۆمم دەگوت: لەکاتی قەرز وەرگرتنەوەدا بیکەن بەعادەت: مۆڵەتی قەرزاری نەدارا بدەن و، لەگەڵ قەرزاری دەوڵەمەندیشا چاوپۆشی بکەن، مامەڵەتان خۆش بی، خودای گەورەش بەفریشتەکانی خۆی دەفەرموێ: ئێوەش چاوپۆشی لەو بکەن!) (تاج/٢/٣٠٤ ز-١٤٧ف -٩+ ریاض٣/٩٩٢ - ف -٣، ٤، ٥,٦ز-٢٤٠).

له پوختەی موسلیما، ژمارە (٩٦٣)ی بەرگی دووەم ئاوایە:

عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): « أَنَّ رَجُلاً مَاتَ فَدَخَلَ الْجَنَّةَ، فَقِيلَ لَهُ: مَا كُنْتَ تَعْمَلُ (قَالَ: فَإِمَّا ذَكَرَ، وَإِمَّا ذُكِّرَ) فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أُبَايِعُ النَّاسَ، فَكُنْتُ أُنْظِرُ الْمُعْسِرَ وَأَتَجَوَّزُ فِي السِّكَّةِ أَوْ فِي النَّقْدِ، فَغُفِرَ لَهُ »، فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: وَأَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٩٧١ = ٣٩٦٨ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٤٤ = ٢٠٧٧، ٢٣٩١، ٣٤٥١. تحفة الأشراف: ٣٣١٠}:

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێ دەمرێو دەچێتە بەهەشت، پێی گوترا: تۆ چیت دەکرد، کەوا خودا بەهەشتی پێ بەخشیت؟)

فەرمووده گێڕەوە فەرمووی: یابەندەکە خۆی هۆی لێخۆشبوونەکەیی لەیادبوو وەباسی کرد، یا فریشتەکان ئەوەیان یادخستەوە، بەهەرحاڵ گوتی: من لەجیهانا سەوداو مامەڵەم لەگەڵ خەڵکا دەکرد، دەستوورم وابوو چاوپۆشیم

لەنەدارا دەکردو مۆڵەتم دەداو پێم لێ نەدەکردە کەوش، لەپارە وەرگرتنیشا چاوپۆشیم دەکردو گوێم بەکەموکوڕی دراوەکە نەدەدا، جا خودا لێی خۆش بوو).

ئەبو مەسعوودی ئەنصاریش (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: منیش ئەم فەرموودەیەم، وەك حوزەیفە، لە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٠، ژمارە: ١٣٦٨، ١٣٦٩، ١٣٧٠، ١٣٧١، ١٣٧٢، ١٣٧٣ + تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٩}.

١٠٠٧- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « كَانَ تَاجِرٌ يُدَايِنُ النَّاسَ ، فَإِذَا رَأَى مُعْسِرًا قَالَ لِفِتْيَانِهِ تَجَاوَزُوا عَنْهُ ، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا ، فَتَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُ »: [١٠٠٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بازرگانێ دەبێ، قەرزدەدا بەخەڵکی، کاتێ قەرزارێکی نەدارا دەبینێ، بە کارمەندەکانی خۆی دەڵێ: چاوپۆشی لێ بکەن و مۆڵەتی بدەن، سا بەشکوو خودایش چاوپۆشی لەئێمە بکات. فەرمووی: (خودایش چاوپۆشی لەو دەکاو لێی خۆش دەبێ).

---

[١٠٠٧] بخاری. بیوع/٢٠٧٨ مسلم/شیحا: ٣٩٧٣ – ٣٩٧٥ (بخاری/ رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/١٨).

### (٧) باب تَحْرِيم مُطْلِ الغَنِيِّ وَصِحَّةُ الحَوالَةِ وإستِحبابُ قَبُولِها إذا أُحيلَ عَلَى مَلِيئٍ

### قەرزكوێری دەوڵەمەند نادروستە، بەرەو رووكردنەوە دروستە، وا پەسەندە ئەگەر بەرەو رووی داراكرایەوە قەبووڵی بكات

١٠٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ ». {الحديث: ٣٩٧٨ = ٣٩٧٤ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٠٨ = ٢٢٨٧، ٢٢٨٨، ٢٤٠٠. أبو داود. بيوع: ٣٣٤٥. نسائي. بيوع: ٤٧٠٥. رياض/٤، زنجيره: ٢٨٤، ژماره: ١٠/١٦١١} : [١٠٠٨]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (قەرزكوێریی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە! زۆر ناڕەوایە، ئەگەر كەسێكیشتان لەلایەنی قەرزارەكەی خۆیەوە، بەرەو رووی كەسێكی دەوڵەمەند كرایەوە، كە ئەوكەسە دەوڵەمەندە، لەباتی قەرزارەكەی خۆی، قەرزەكەی پێ بداتەوە، ئەوە بابچێ قەرزەكەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە). {تاج/٢، زنجيرە: ١٦٦، ژمارە: ١٨٩٧}.

### (٨) باب تَحْرِيم فَضْلِ الماءِ

### فرۆشتنی زیادە ئاو نادروستە

١٠٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ الْكَلأُ) (الحديث ٢٣٥٣، طرفاهُ في: ٢٣٥٤، ٦٩٦٢): [١٠٠٩]

---

[١٠٠٨] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٠٨ - ٢٢٨٧ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٢ = ٣٩٧٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٨ رقم الباب/١).

[١٠٠٩] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٣٥ - ٢٣٥٣، ٢٣٥٤ بخاری مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٨٠ - ٣٩٨٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٢ رقم الباب/٢).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئاوی زیادە قەدەغە مەکەن، هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغە بکەن). (تاج/٢ل-٣٦٥ف-١ز-١٧٤، ژمارە: ١٩٢٨).

### راڤەو شیکردنەوە:

ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: وەك ئەوە کەسێ لەدەشت یالەشوێنێ، بیرێکی هەبێ، وەئاوی بیرەکە لەخۆی زیادبێ، وەلەنزیکی ئەو بیرەوە لەوەڕ هەبێ، جا ئەگەر خاوەن بیرەکە، ئاوی زیادەی بیرەکەی قەدەغە بکا لەڕان و گایەل و مالاًت و ئاژەڵ، ئیتر لەبەر بێ ئاوی کەس ئاژەڵ و مالاًت نالەوەڕێنێ لەو لەوەڕگایە!

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لە پوختەی موسلیمدا، ژمارە (٩٨٠) بەرگی دووەم:

عَنِ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ الْكَلأَ ». {الحديث: ٣٩٨٣ = ٣٩٧٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (ئاوی زیادە قەدەغە مەکەن، هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغە بکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٤، ژمارە: ١٩٢٨ — ش/د/ت/ن - بخاری. مساقاة: ٢٥٥٣، ٢٤٥٤، ٦٩٦٣. ترمذی. بیوع: ١٢٧٢}.

### ڕوونکردنەوە:

١- نەوەوی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنووری خودابێ) دەفەرموێ: وەك ئەوە کەسێ بیرێکی هەبێ، وە ئاوی بیرەکە لەخۆی زیادبێ، وە لەنزیکی ئەو بیرە

لەوەڕ هەبێ، جا ئەگەر خاوەن بیرەکە، یاخاوەن کارێزەکە، بیرەکەی، یا ئاوەکەی قەدەغە بکا، لە مالاّتو ئاژەڵ، لەبەر بێ ئاوی کەس ئاژەڵ نەلەوەڕێنێ، لەو لەوەڕگایە!

٢- **کورتو پوخت:** خاوەن بیرو کارێزو چەم، ئەگەر ئاوەکەی لەخۆی زیادبوو، نابێ قەدەغەی بکا، لە ئاتاج، تەنانەت نابێ قەدەغەی بکا لە ئاژەڵو مالاّتو گیانلەبەرانیش.

٣- خاوەن کارێزو بیرو چەمو جۆگە، دەتوانێ ئەو ئاوە بفرۆشێ، بۆ ئاودێریو ئاودانی کشتوکاڵو باخو رەز.

٤- ئێستا ئاو بەزۆر شێوە دەفرۆشرێ، وەك بە بوتڵ، یا بەکارتۆن، یا بەتەنکەر، وەزۆر دەسگا سەرگەرمی ئەم کارەن، هەیە تەقطیری دەکا، هەیە تەعقیمی دەکا، فرۆشتنی ئەم جۆرە ئاوانە بەهیچ شێوەیێ بەرواتاو چەمکی ئەم فەرموودانە ناکەوێ. بگرە ئەم جۆرە کارە پیرۆزانە ئەرکێکی پیرۆزی دینیو ژینیو سەردەمین، بەلاّم ئەوەندە هەیە: (مۆڵەتی دەستەلاّتی وڵاتو رێپێدانی تایبەتی بۆ ئەم جۆرە کارانە مەرجەو بەس).

لێرەدا، بۆ پشتگیریی ئەم برگەی چوارە، ئەم دەقە لەشەرحی (فتح الملهم)ەوە راگوێز دەکەم، دەفەرموێ: ئیمام ئەبو یوسف دەفەرموێ: {وَإِنْ هَيَّأَ لَهُ مصنعة فَاسْتَقَى فِيهَا بِأَوْعِيَتِهِ حَتَّى جَمَعَ فِيهَا مَاءً كَثِيراً، ثُمَّ بَاعَ مِنْ ذلِكَ فَلاَ بَأْسَ}.

واتە: ئەگەر کەسێ کارگەیێ دابنێو ئاوی زۆری تیا ئامادە بکاو بیکاتە دەفرو شتی واوەو دوایی لێی بفرۆشێ قەیدی نییە). {بڕوانە شەرحی فەرموودەی ژمارە (٣٩٧٩) لە فتح الملهم دا}.

## (٩) باب تحريم ثَمَنِ الكَلْبِ وَحُلْوانِ الكاهِنِ وَمَهرِ البَغيِّ
## بەهای سەگو مزو سەرقەڵەمانەی کوڵەنانیو فاڵچیو کرێی لەشفرۆشو ئەو جۆرە بابەتانە نادروستە

١٠١٠- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّـهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ ». {الحديث: ٣٩٨٥ = ٣٩٨١ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ٩٩٧ = ٢٢٣٧، ٢٢٨٢، ٥٣٤٦، ٥٧٦١. أبـو داود. بيوع: ٣٤٢٨. ترمذى. نكـاح: ١١٣٣. نسائى. صيدو ذبـائح: ٤٣٠٣. تحفـة الأشـراف: ١٠٠١٠} : [١٠١٠]

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهای سەگو کرێی حیزو وەڵیفەتو سەرقەڵەمانەی کوڵە نانی قەدەغە کردووە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨٠} .

## (١٠) باب الأمر بِقَتْلِ الكَلابِ
## فەرمانکراوە بە کوشتنی سەگ

١٠١١- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللّـهِ (صلى الله عليه وسلم) أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ: [١٠١١]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەکوشتنی سەگ.

---

[١٠١٠] تجريد/٣، ژمارە: ٩٩٧ = ٢٢٣٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٣٢ = ٣٩٨٥ شیحا (بخاری — ١١٣/٣٤).

[١٠١١] بخاری. بدءُ الخلق/٣٣٢٣ مسلم: ٣٩٩٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/١٧).

١٠١٢- عَنْ عَبْدُاللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّه عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: مَـنِ اقْتَنَـى كَلْبًـا لَـيْسَ بِكَلْـبِ مَاشِـيَةٍ أَوْ ضَـارِيَةٍ نَقَـصَ كُـلَّ يَـوْمٍ مِـنْ عَمَلِـهِ قِيرَاطَانِ.(الحديث ٥٤٨٠ طرفاه في: ٥٤٨١، ٥٤٨٢)؛ [١٠١٢]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- لەپێغەمەرەوە -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەرکەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی پاسی ڕانو کێڵگەو ڕاو نەبێ، هەموو ڕۆژێ پارچەیێ، هەتا ئەوسەگە ڕابگرێ، لەپاداشتی باشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە، یا دووپارچە لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەکا). (تاجی کوردی/٢ ل/٣٥٨ ز/١٧١ = ژمارە/١٩١٨ باسی سەگ بۆ پاس و ڕەشەوڵاخ بۆ زەوی کێڵان).

## ڕوونکردنەوە:

بەپێی یاسانامەی ئیسلام سەگ پیسە، وەزیانی زۆرە لەزۆر ڕووەوە، بەڵام لەگەل ئەوەیشا شەرعی پیرۆز ڕێگەی سوود وەرگرتنی لەسەگ داوە، بەهەموو چەشنەکانیەوە، بەڵام ئەوکەسەی کەسەگ ڕادەگرێ، دەبێ چەند خاڵێ ڕەچاوبکا، وەك پاكو تەمیزی و پاکژکردنی، لەسەر ئەم شێوەیە:

### یەکەم: دروستە سەگ بۆ ئەم مەبەستانە ڕابگیرێ:

١. بۆ پاسو ئاگاداری، وەك پاسی ڕانو مەزراو کێڵگەو ماڵ، لەدزو جانەوەری زیانەخرۆ، وەك گورگو چەقەڵو بەراز، یا بۆ پاسی منالی ساوا وەك لەلە، یا بۆ پاسو ئاگاداری پیاووژنی کەفتەکار لەماڵەوە.

---

[١٠١٢] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٢٩ - ٥٤٨٠ بخاری مسلم/شیحا: ٣٩٩٩. (بخاری رقم الکتاب/٧٢ رقم الباب/٦).

٢. بۆ ڕاوشکار، وەك توولە و تانجیو سەگی ڕاوی تر.

٣. سەگی پۆلیسی، بۆ دۆزینەوەی تاوانو بۆ زۆر مەبەستی ڕەوای تر وەك لەکاتی بوومەلەرزەو کارەساتی سروشتیدا، تەرمی ژێردار و بەرد ئەدۆزێتەوە، یا مرۆڤی گیر خواردووی ژێر ڕووخاوی و شتی وا دەدۆزێتەوە، یا مادە سڕکەرەکان و بارووتو تەقەمەنی شاراوە بەنیازی خراپ کەشف دەکا، یالە زۆر ڕووی تری شەرعیەوە سوود بەکۆمەڵگا دەگەیەنێ.

٤. سەگی چاوساخ لەئەوروپاو لەزۆر وڵاتانی تر، دەبن بە چاوساخ بۆ کوێرو ئەمانەو لەپێشیانەوە دەڕۆنو ئەوانیش بەهۆی پەتێکەوە شوێنیان دەکەون.

٥. بۆ کارکردن، وەك دەبینین، لەوڵاتی ئالاسکا، لەناو ئەسکیمۆکاندا، لەبەر زۆر ساردی سەگ بەکاردەهێنن بۆ گالیسکەو عەرەبانەی سەربەفر، وە بەسەگ ڕایدەکێشن، وەك لەزۆر شوێن سەگ فێردەکەنو مەشقی پێدەکەنو زەمیلە دەکەنە ملیو دەچێ لەبازاڕ لەلای مامیل گۆشتو سەوزەو شتیوا دەکڕێو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خاوەنی، جا ئەم سەوداو مامەڵەیە لەڕووی شەرعەوە دروستە یانا، دوایی دەگەڕێینەوە سەری.

**دووەم: سەگ لەم سەردەمەی ئێمەدا و لەکۆنیشدا بۆ زۆر شتی تر بەکار دەهێنرێ، وەك:**

١. سەگی گەمەو یاری وەك مەیمونی لۆتی، وەك لە سێرك و ئەمانەدا دەیبینین، وەك سەگ بۆ جوانی، وەك خولیاو هیوایە.

٢. بۆ شەڕە سەگو شتی تری واو بۆ قومارو بۆڕ بۆڕێن.

٣. بۆ هەندێ کاری ناڕەوا، کە پێویست ناکا ناوی بەرین.

٤. دەواجینی سەگ هەیە لەکۆریاو ئەو ولاتانەی کەسەگ دەخۆن، بۆ خواردنی گۆشتەکەی، وەك دەواجنی پەلەوەر و ئاژەڵی ولاتی خۆمان.

**سێیەم: جا ئەوەی ئەرکی موسوڵمانە ئەمەیە:**

١. بەپێی تەوانا خۆی لەسەگ دوور بگرێ، وە بۆناچاری نەبێ، بەپێی برگەکانی (**یەکەم**)، بەکاری نەهێنێ.

٢. لەکاتی بەکارهێنانیدا بیکوتێ، بە لقاحی دژی هاری.

٣. هەرکاتێ شوێنێکی بەتەڕی بەرسەگەکە کەوت گلاوی دەربکات، وە ئەوەندەی دەتوانێ، جێگەو کولانەی سەگو شوێنی، پاكو پوخت ڕابگیرێ، وە برسی و توونی نەکات. چونکە لەفەرموودەدا هەیە: (ژنێ بەهۆی تێراوکردنی سەگێکەوە دەچێتە بەهەشت وە ژنێ بەهۆی ئازاردانی پشیلەیەکەوە دەچێتە دۆزەخ).

٤. جا بەنیازی سوود وەرگرتنی ڕەوا لەسەگ دروستە پەروەردەش بکرێو بە توتکەیی گەورەبکرێ. وە لەڕووی شەرعەوە ئەم جۆرە کردارانە دروستەو قەیدی نییە و بەر ئەو نەهیە ناکەوێ کە لەڕاگرتنی سەگ کراوە. بەلام ئەوەندە هەیە کارکردن بەوسەوداو مامەڵەی کەسەگ ئەنجامی دەدا، پاکردنی هەندێ تصەروفاتی سەگ بەبەڵگەو نیشانە لەسەر هەندێ بڕیار ئەوە باسێکی دوورو درێژە، ئێرە جێگەی ئەوە نییە.

١٠١٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): «مَنْ أَمْسَكَ كَلْبًا فَإِنَّهُ يَنْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِـيرَاطٌ ، إِلاَّ كَلْـبَ حَـرْثٍ أَوْ مَاشِيَةٍ»: [١٠١٣]

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیما، ژمارە (١٢٤٤):

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ): «مَنِ اتَّخَذَ كَلْبًا إِلاَّ كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ صَيْدٍ أَوْ زَرْعٍ، انْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ». قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَذُكِرَ لابْنِ عُمَرَ قَوْلُ أَبِى هُرَيْرَةَ فَقَالَ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا هُرَيْـرَةَ كَـانَ صَـاحِبَ زَرْعٍ. {الحديث: ٤٠٠٧ = ٤٠٠٢ فم}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ سەگێ رابگرێ، سـەگی پاسـی ئاژەڵو سـەگی راوو سـەگی پاسـی زەوی‌و زارو مـەزرا نـەبێ، هـەموو رۆژێ ئەنـدازەیێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

زوهری دەفـەرموێ: کاتـێ ئـەم فەرموودەیـەی ئـەبو هورومیرە باسـکرا بـۆ ئیبنو عومەر، کە ئەم رستەیەی واتیـا: (سـەگی پاسـی زەوی‌و زارو مـەزرا نـەبێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لە ئەبو هورەیرە بێ، خۆی خاوەنی مەزرا بـوو، بۆیـە وا گرنگی داوە بەم رستەی (سەگی پاسی زەوی‌و زارو مەزرا نەبێ).

١٠١٤- حديث سُفْيَانَ بْـنَ أَبِـى زُهَيْـرٍ – رَجُـلاً مِـنْ أَزْدِ شَـنُوءَةَ – وَكَـانَ مِـنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسـلم)

---

[١٠١٣] بخـارى. (٤١) المزارعـه (٣) مختـصر صـحيح مـسلم/٣، ژمـارە: ١٢٤٥ = ٣٩٩٦ (بخـارى رقـم الكتاب/٤١ رقم الباب/٣).

يَقُولُ: « مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لاَ يُغْنِي عَنْهُ زَرْعًا وَلاَ ضَرْعًا ، نَقَصَ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطٌ »:[(١٠١٤)]

**سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم بیستم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی پاسی مەزراو ئاژەڵ نەبێ، هەموو ڕۆژێ پارچەیێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەکات).**

**لێرەدا ئەم ڕوونکردنەوەیە تۆماردەکەین کە عەسقەلانی لەسەر ژمارە (١٠٢١)ی تەجرید نووسیویەتی:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ أَمْسَكَ كَلْبًا فَإِنَّهُ يَنْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطٌإلاَّ كَلْبَ حَرْثٍ أَوْ مَاشِيَةٍ). قَالَ ابْنُ سِيرِينَ وَأَبُو صَالِحٍ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إلاَّ كَلْبَ غَنَمٍ أَوْ حَرْثٍ أَوْ صَيْدٍ). وعَنْه (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ) (الحديث ٢٣٢٢، طرفهُ في: ٢٣٢٣):

**ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کەسێ سەگێ ڕابگرێ کە سەگی پاسی زەوی‌و زارو، پاسی ڕان‌و ئاژەڵ نەبێ، هەموو ڕۆژێ دووپارچە لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).**

**لەگێڕانەوەیەکی تریدا: (..کەسەگی پاسی ڕان‌و کێڵگەو ڕاو نەبێ..).**

**لەگێڕانەوەیەکی تریدا: (..کەسەگی پاسی ئاژەڵ‌و ڕاوپێکردن نەبێ...).**

**ڕوونکردنەوە:**

---

[(١٠١٤)] **تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٢١ = ٢٣٢٢، ٢٣٢٣، بوخاری. مسلم/ مساقاە: ١٥٧٥ - ٤٠٠٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤١ رقم الباب/٣).**

(بڕوانە: تاج/٢/٣٥٧ ز —١٧١، ژمارە: ١٩١٨).

لێرەدا مامۆستای مەزن ئیبن حەجەری عەسقەلانی، ڕوونکردنەوەیەکی نایابی هەیە کە گوێزانەوەی بۆ ئێرە، لەم ڕۆژگارەدا زۆر لەبارە، چونکە ئێستا واباوە کەلەوڵاتی خۆرئاوا ئەم یاسایە چەسپاوە: (بەپلەی یەکەم مافی سەگو بەپلەی دووەم مافی ژنو بەپلەی سێیەم مافی پیاو ڕەچاو دەکرێ!).

عەسقەلانی دەفەرموێ: لەم فەرموودەیەدا ئەوەی واتیا کەڕاگرتنی سەگ، بۆ ڕاوو پاس دروستەو ڕەوایە، هەروا ئەگەر لەبەر هەر بەرژەوەندییەکی ڕەوای تر ڕابگیرێ، یا لەبەر پێشگیری لەهەر زیانێ ڕابگیرێ، کەواتە پوختەی کار ئەمەیە: (ڕاگرتنی سەگ بەبێ کارپێبوونو بەخۆڕایی ناباشەو مەکروهە چونکە دەبێت بەهۆی تۆقانی خەڵکو دوورکەوتنەوەی فریشتە لەوشوێنە...).

لەڕاستی دا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا سەگ بۆ زۆر مەبەستی ڕەواو گرنگ بەکاردەهێنرێ، وەك سەگی پۆلیسی، سەگی چاوساغ، سەگی ئەزموونی پزیشکیو بەکارهێنانی سەگ لەمەودا زانستیو هونەرییەکاندا، کەبەئاژەڵێ تر ناکرێ، چونکە سەگ زۆر زیرەکە، زووشت فێردەبێ دەتوانێ فەرمان جێ بەجێ بکا.

جا لەم کاتانەدا کە سەگ ڕابگیرێ بۆ مەبەستی ڕەوا ڕاگرتنەکەی پاداشی باشی هەیە، نەك گوناه، چونکە سەگیش بەر ئەو فەرموودەیە دەکەوێ کە دەفەرموێ: (فِي كلِّ ذاتِ كبِدٍ حرّى أجرٌ= ئەوەی تەڕایی ژیانی تیابێ خێری پێ دەشێ).

وەکی تر: کەڕاگرتنی سەگ دروست بێ، بەمەرجی خۆی دیارە پەروەردەکردنی بەچکەشی هەر دروستە، بەهەمان مەرج، بەڵام بەپێی توانا پێشگیری لەزیانەکانی بکرێ، وەك: کوتانی پزیشکی هەتا نەبێ بەهۆی هاربوونی کەسێ، هەروەها نەهێڵرێ ببێ بەهۆی پیسو پۆخڵیو ئازاردانی مەردوم بەهۆی

ومرین‌و شتی تری واوە، یان لەبەر برسێتی بچێ شتی دەرو دەراوسێ بدزێت‌و بیخوات.

عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە کراوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە، کە هەر سەگێ دروست بێ رابگیرێ پاکە، چونکە خۆلێپاراستنی زۆر زەحمەتە.

## (١١) باب حِلُّ أجْرَةِ الحَجَامَةِ
## باسی کرێی کەڵەشاخگرتن دروستە

١٠١٥- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الْحَجَّامِ فَقَالَ احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَكَلَّمَ مَوَالِيَهُ فَخَفَّفُوا عَنْهُ وَقَالَ: إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ وَقَالَ: لَا تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ.(الحديث ٥٦٩٦ طرفه في: رقم: ٩٥٣ تجريد = ٢١٠٢ فتح الباري = بەرطی/٣ ل/٢٧): [١٠١٥]

پرسیارکرا لەئیمامی ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ): ئایا کرێی کەڵەشاخگر حەڵاڵە یا چییە؟ فەرمووی: (کرێی کەڵەشاخ گر دروستە، چونکە ئەبو طەیبە کەڵەشاخی گرت لەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- جا حەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- لەباتی ئەوە دوومەن خۆراکی پێیدا، وە قسەی لەگەڵ ئاغا ئازادکەرەکانی کرد، لەبارەی پارەتی دانیەوە، چونکە ئەم خزمەتە باشەی پێشکەش بە پێغەمبەری خودا کردووە، ئەوانیش ئەوسەرانەی کەدایان نابوو لەسەری بەرامبەر بەئازادکردنی بۆیان کەم کردەوە).

---

[١٠١٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٥ - ٥٦٩٦ بخاری. مسلم/شیحا: ٤٠١٥ (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/١٣).

وە خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بەڕاستی باشترین نموونە بۆ دەرمانی باش، بۆ ئێوەی دانیشتووانی گەرمیان کەڵەشاخ گرتنە، وە هەروەها عوودی دەریایی، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: قوسطی بەحری). وە هەروەها حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (منداڵتان ئەگەر تووشی دوومەڵی گەروو بوو، یا ئاڵووی کەوت، بەگوشینی پەنجە ئازاریان مەدەن، بەڵکوو لەباتی ئەوە بەعوودی هیندی واتە: بە قوسط دەرمانی بکەن. (بڕ: تاج/٢ /٢٩٩ + ژ/١٨٧٤ + تاج/٤ ل/٢٠١ ژ/١).

روونکردنەوە:

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. کەڵەشاخ گرتنو خوێن بەردانو خۆ داخکردن و زالوو بەکارهێنان، لەشەرعا ڕێگەیان پێ دراوە، وەهەتا ئێستاش نیازمەندان بەکاریان دەهێنن، وە سودیان لێ وەردەگرن، وە پزیشکی و دوکتۆریش ڕێگەی شتی وا دەدا.

٢. هەرکاتێ باشتر هەبوو، کاربەو بکرێ نەوەك کار بە باش بکرێ. وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێ: کە عەرەبەکان بە ئەزموون لەکۆنا، دوومەڵی گەروو، وە یائاڵوو کەوتنیان، بەگوشینی سەری پەنجەو بەتەقاندن دەرمانو چارەسەر کردووە، بەلام ئەوەتا پێغەمەر -درودی خوای لەسەربێ- دەفەرموێ: لەوە باشتر هەیە، ئەوە دەبێ بەهۆی ئازار، تیمارکردنی ئەوجۆرە نەخۆشیانە بەدارە هیندی بکرێ بێ ئێشترو باشترە. بڕوانە: ژمارە: ٩٤٧=بەرگی/٣ ل/٢٠ لە تەجریدی بوخاری.

٣. لەفەرموودەکەوە دەردەکەوێ کەکەڵەشاخ گرتن، لەوڵاتی گەرمیان بەسوودترە، هەتا کوێستان، هەروەها بۆلاو بەسوودترە هەتا بۆ پیر.

٤. وەکی تریش ئێستا هەموو شتێ گۆڕاوە، وەئەم ڕێنماییە پزیشکیانە، پەیوەندی بەعیباداتەوە نییە، لەبەرئەوە دەتوانرێ خۆ دەرمان کردن‌و خۆ چارەسەرکردن بەشێوەیەکی سەردەمانە بێت نەك بەم شێوانە.

١٠١٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) احْتَجَمَ وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ وَاسْتَعَطَ.(١٠١٦)

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە عەبباسی باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڵەشاخی لەخۆی گرت، وە کرێی کەڵەشاخگرەکەی دا، وە بڕنووتیشی بەکاردەهێنا.

## ڕوونکردنەوە:

لە فەتحولباریدا لە شەرحی ژمارە (٥٦٩١ و ٥٦٩٢) دەفەرموێ: لەسەر ئەم شێوەیە بڕنووتییەکەی بەکاردەهێنا:

(لەسەر گازەرەی پشت ڕادەکشا، شتێکی دەخستە ژێر شانەکانی، تا تۆزێ بەرزببنەوەو سەری پیرۆزی بە پشتا کەمێ شۆڕ بێتەوە، ئەوجا بڕنووتییەکەی دەتکانە لووتی، تا بگاتە ناو دەماخی، تا بە پژمین دەردەکە دەربچێ!

جا بۆئەوەی کە لە (سەعوط)ی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تێ بگەین‌و بەهەڵە تێی نەگەین، دەڵێین: وەك لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: سەعوط بە قوسطی بەحری‌و بە قوسطی هیندی دەکرێ، وە (قوسط) بەم چوار جۆرە دەخوێنرێتەوە:

١- قُسط: بە قاف‌و بە طێ، بە تێی گەورە (= ق - ط).

٢- قُست: بەقاف‌و بە تێی بچووك (= ق - ت).

---

(١٠١٦) بخاری. طب: ٥٦٩١. مسلم/شیحا: ٤٠٧٠ (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/٩).

٣- كُسْت: بە كافو بە تێ بچووك (= ك - ت).

٤- كُسْط: بە كافو بە طێی گەورە (= ك - ط).

جا بۆ زانینی واتای ئەم چوار وشەیە كە یەك شتن، بڕوانە: ژمارە (١٠١٥) كەوا لەپێش ئەم ژمارەیەوە. وە هەربۆ ئەم مەبەستە فەرموودەی ژمارە (١٨٧٤)ی تەجریدی بوخاری، كەوا لەبەرگی پێنجی تەجریدا دەنووسین:

عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ. وَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِابْنٍ لِي لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ فَبَالَ عَلَيْهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَرَشَّ عَلَيْهِ.(الحديث ٥٦٩٢ أطرافه في: ٥٧١٣، ٥٧١٥، ٥٧١٨، و الحديث ٥٦٩٣ طرفه في: ٢٢٣):

ئوم قەیسی كچی میحصەن (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپێغەمەرم بیست، دەیفەرموو: عوودی هیندی بەكاربهێنن، چونكە حەوت دەرمانی پێوەهەیە، بەم شێوەیە بەكاردەهێنرێ: دەیكوتن و بەڕۆن زەیتوونەوە، یان ڕۆنەكەی دەگرن بۆ دوومەڵی مەلاشووی منداڵ دەیتكێننە كونە لووتی، وە ڕۆنەكەشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە، لەگێڕانەوەیەكدا: كوڕێكی خۆمم پێبوو، دوومەڵ لەناو قوڕگی هاتبوو، بەزەبری پەنجە دوومەڵەكەم تەقاند، كە چوومە خزمەتی حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بۆچی بەزەبری پەنجە دوومەڵی گەرووی منداڵتان دەتەقێنن‌و ئازارێكی زۆریان ئەدەن، بەڵكوو لەباتی ئەوە بەعودی هیندی دەرمانی بكەن، ئەم عوودی هیندییە، كە بەكوردی پێی دەگوترێ: دارهیندی، دەرمانی حەوت دەردی واپێوە، بۆ دومەڵی گەرووی منداڵ، دەیتكێننە ناو كونەلووتی، وە ئاوەكەیشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە). (تاج/٤ ل/٢٠٢ ز/٦٣، ژمارە: ٢٩٨٩).

لەگێڕانەوەیەکی ئێرەدا دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی پێغەمەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕێکی ساوای خۆمم پێ بوو، نانە خۆرە نەبوو بوو، میزی کرد بەجلەکانی پێغەمەردا، (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو لێی پرژاندو ئیتر نەیشۆرد).

عودی هیندی واتە: قوسط، بۆ واتای ئەم وشەیە بڕوانە: ژمارە: ٢٠٥ تەجرید = ٣١٣ فەتح = بەرگی/١ ل/٢١٤ + ژ/١٦٢ تجرید = ٢٢٣ = بەرگی/١ ل/١٨٣.

## (١٢) باب تَحْرِيم بَيْع الخَمْرِ
## فرۆشتنی مەیو بادە (ئارەق) نادروستە

١٠١٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: (لَمَّا أُنْزِلَتْ الْآيَاتُ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي الرِّبَا خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ حَرَّمَ تِجَارَةَ الْخَمْرِ). (الحديث ٤٥٩ ـ أطرافه في: ٢٠٨٤، ٢٢٢٦، ٤٥٤٠، ٤٥٤١، ٤٥٤٢,٤٥٤٣): [١٠١٧]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئایەتەکانی سوورەتی بەقەرە لەبارەی سووخۆرییەوە هاتن، کەدەفەرموون: (الذین یأکلون الربا لایقومون إلا کما بقوم الذی یتخبطە الشیطان من المس) هەتا (لاتظلمون ولا تظلمون) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە دەرەوەو هات بۆ مزگەوتو لەوێ ئایەتەکانی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە، بڕیاری ناڕەوابوونی سوودی پێ ڕاگەیاندن، لەپاشتر بازرگانی بادەو مەیشی ناڕەوا کرد).

---

[١٠١٧] تەجرید = تەجریدی بوخاری - مختصر صحیح البخاری - پوختەی صەحیحی بوخاری/١، ژمارە: ٢٨١ = ٤٥٩ بخاری مسلم: ١٥٨٠ = ٤٠٢٣ (بخاری رقم الكتاب/٨ رقم الباب/٧٣).

## (١٣) باب تحريم بيع الخَمْرِ وَالمَيتةِ وَالخنزيرِ والأصنامِ
## فرۆشتنی مەیو مردارو بەراز نادروستە

١٠١٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ: « إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ ». فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: « لاَ هُوَ حَرَامٌ ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عِنْدَ ذَلِكَ: « قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا أَجْمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ ». {الحديث: ٤٠٢٤ شيحا = ٤٠١٩ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٦ = ٣٢٣٦، ٤٢٩٦، ٤٦٣٣. أبو داود. ليوع: ٣٤٨٦. ترمذي. بيوع: ١٢٩٧. نسائي. بيوع: ٤٢٦٧. تحفة الأشراف: ٢٤٩٤} : [١٠١٨]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی شاری مەککە، لەوکاتەدا کە هێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەککە بوو، نەگەڕابۆوە بۆ مەدینە، لەوکاتەدا لەخۆیم بیست دەیفەرموو: (خوداو پێغەمبەری خودا، کڕینو فرۆشتنی مەیو ئارەقو مردارو بەرازو بتیان حەرام کردووە). عەرزیکرا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو: ئەی ئایا ئەوە چۆنە کە خەڵك بەزو پیوی مردارەوە بوو، دەچن کەشتیو کەوڵی پێ چەور دەکەن، تا کەشتییەکە بپارێزێ لەهەوای دەریاو کەوڵەکەیش جیڕببێو قایم ببێ، یا چرای پێ دەگرێنن، شتی وا دەبێ یانا؟ فەرمووی: (نابێ ئەوەیش هەر حەرامە). لەهەمان کاتدا فەرمووشی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا بچێ بەگژ جوولەکەکاندا، کاتێ خودای گەورەو سەروەر، بەزو پیوی

---

[١٠١٨] تجرید/٣، ژمارە: ٩٩٦ - ٣٢٣٦ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٣١ - ٤٠٢٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/١٠٣).

مردارەوەبووی لێیان حەرام کرد، دەچوون بەئاگر دەیان تواندەوەو پوختیان دەکردو دەیان پالآوتو بەرۆنی دەیانفرۆشت، ئەوجا پارەکەیان دەخوارد).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨٣}.

١٠١٩- عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) يَقُولُ: بَلَغَ عُمَرَ أَنَّ فُلاَنًا بَاعَ خَمْرًا فَقَالَ قَاتَلَ اللَّهُ فُلاَنًا ، أَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ ، حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَجَمَلُوهَا فَبَاعُوهَا ». [١٠١٩]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هەواڵ گەیشتەوە بە عومەری کوڕی خەطاب: کە فیسارە کەس مەی دەفرۆشێ؟ عومەر فەرمووی: (خودا بچێ بەگژیدا، ئاخر نازانێ، کە لەم بارەیەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ﴿قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ ، حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَجَمَلُوهَا فَبَاعُوهَا﴾ کە لەژمارە (١٠١٨)دا واتاکەی رابورد.

١٠٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ « قَاتَلَ اللَّهُ يَهُودًا حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَبَاعُوهَا ، وَأَكَلُوا أَثْمَانَهَا ». [١٠٢٠]

لە ژمارەکانی پێشەوە مەبەست لێی رابورد.

---

[١٠١٩] تجرید/٢، ژمارە: ٩٩٦ - ٢٢٣٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٢٩ = ٤٠٢٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/١٠٣).

[١٠٢٠] بخاری. بیوع/٢٢٢٤ مسلم. بیوع/٤٠٢٩ (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/١٠٣).

## (١٤) باب الرِّبَا
## باسی سوود (ریبا)

١٠٢١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ وَلا تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ وَلا تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِبًا بِنَاجِزٍ). (الحديث ٢١٧٧، طرفاهُ في: ٢١٧٦، ٢١٧٨): [١٠٢١]

ئەبو سەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕو زیو بەزیوو گەنم بەگەنمو جۆ بەجۆو خورما بەخورماو خوێ بەخوێ) دەبێ دەقاو دەق بنو بەقەد یەك بن وەبەبێ زیادو کەم بن، نابێ حازریان بە بزر بفرۆشن، وەك ئەوە لایەکیان زێڕەکەی حازر بێو ئەو لایەکەی تریان زیوەکەی دواخراو بێ).

## (١٦) باب النَّهْيِ عَنْ بَيْعِ الوَرِقِ بِالذَّهَبِ دَيْناً
## جڵەوگیریی لە فرۆشتنی زیو بە زێڕ بە قەرز

١٠٢٢- عن الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رضي الله عنهم) عَنِ الصَّرْفِ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا يَقُولُ هَذَا خَيْرٌ مِنِّي . فَكِلاَهُمَا يَقُولُ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ دَيْنًا): [١٠٢٢]

---

[١٠٢١] مسلم. بيوع: ٤٠٢٨. بخاری. بیوع (٣٤) بيع الفضة/٧٨ (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٧٨).

[١٠٢٢] تجريد/٩٣٨ = ٢٠٦٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٥٠ = ٤٠٤٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٠).

بۆ بەراوردو شارەزابوون لە گێڕانەوەکانو بۆ زانستو بەهرەی پتر، گێڕانەوەی ژمارە (٩٣٨)ی تەجریدو گێڕانەوەی (٩٥٠)ی پوختەی موسلیم بەرودوا راگوێز دەکەین:

عَنْ الْبَرَاء بْنَ عَازِبٍ وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رضي الله عنهما) قَالا: كُنَّا تَاجِرَيْنِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الصَّرْفِ فَقَالَ: (إِنْ كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَلا بَأْسَ وَإِنْ كَانَ نَسَاءً فَلا يَصْلُحُ). (الحديث ٢٠٦٠-أطرافُهُ في: ٢١٨٠، ٢٤٩٧، ٣٩٣٩) (الحديث ٢٠٦١-أطرافُهُ في: ٢١٨١، ٢٤٩٨، ٣٩٤٠):

بەرائی کوڕی عازیبو زەیدی کوڕی ئەرقەم(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: لەسەردەمی پێغەمبەردا، ئێمە دوو بازرگان بووین لەبارەی گۆڕینەوەی پارەوە بەپارەی تر (وەك فرۆشتنی زیو بەزێڕ) لەپێغەمبەرمان پرسی، فەرمووی: ئەگەر دەست بەدەست بێ(ونەخت بێ) قەیناکات، بەڵام ئەگەر دەست بەدەست نەبێ نابێ).

**ڕوونکردنەوە:**

پارە وردکردنەوە بەر بڕیاری ئەم فەرموودەیە دەکەوێ، وەك گۆڕینەوەی پارەی کاغەزی دەیی‌و پێنجی، بەپارەی تری وەك دیناری نیکڵو پوولی مس.

ئەمە ژمارە (٩٣٨)ی تەجرید بوو، ئەمەیش ژمارە (٩٥٠)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: بَاعَ شَرِيكٌ لِي وَرِقًا بِنَسِيئَةٍ إِلَى الْمَوْسِمِ أَوْ إِلَى الْحَجِّ فَجَاءَ إِلَيَّ فَأَخْبَرَنِي، فَقُلْتُ: هَذَا أَمْرٌ لاَ يَصْلُحُ، قَالَ: قَدْ بِعْتُهُ فِي السُّوقِ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ. فَأَتَيْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)

الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ نَبِيعُ هَذَا الْبَيْعَ، فَقَالَ: « مَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَلاَ بَأْسَ بِهِ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَهُوَ رِبًا، وَائْتِ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ تِجَارَةً مِنِّي). فَأَتَيْتُهُ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ. {الحديث: ٤٠٤٧ = ٤٠٤٢ فـم. تجريد/٣، رقم: ٩٣٨ = ٢٠٦٠، ٢١٨٠، ٢٤٩٧، ٢١٣٩، ٢٠٦١، ٢١٨١، ٢٤٩٨، ٢٩٤٠. نسائي. بيوع: ٤٥٨٩، ٤٥٩٠، ٤٥٩١}:

ئەبو مینهال (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: هاوبەشێکم هەبوو، بڕێ زیوی فرۆشت بەزێڕ بەقەرز هەتا وەرزی حەج، کەهات بۆلام ئەم باسەی بۆم کرد، گوتم: شتی وانابێ، ئەوە سوودە، گوتی: من تائێستا ئەم جۆرە مامەڵەو سەودایەم لەبازاڕ کردووە، کەسێ ڕەخنەی لێم نەگرتووە. جاچووم بۆ خزمەتی بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) لێم پرسی، فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هاتو کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئێمە ئەم جۆرە مامەڵەیەمان دەکرد: پارەمان دەگۆڕییەوە بەپارە، کەلەم بارەیەوە پرسیارمان لێی کرد، فەرمووی: (ئەگەر دەست بەدەست بێ قەیدی نییە، بەڵام ئەگەر پارەیەکیان دەست بەدەستو ئەوی تریان قەرزبێ، واتە: دواخراوبێ، ئەوە سوودە. بەراء فەرمووی: بچۆ بۆلای زەیدی کوڕی ئەرقەم، چونکە بازرگانیی ئەو لەهی من گەورەترە، جاچووم بۆلایو پرسیارم لێی کرد، ئەویش هەمان شتی فەرموو). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٤٣}.

١٠٢٣- عن أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ وَالْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ إِلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ وَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ كَيْفَ شِئْتُمْ). (الحديث ٢١٧٥، طرفهُ في: ٢١٨٢): [١٠٢٣]

---

[١٠٢٣] تجريد/٣، ژمارە: ٩٧٨ - ٢١٧٥ بخاری مسلم: ١٥٩٠ محمد فؤاد = ٤٠٤٩ شيحا. (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨١).

ئەبوبەكرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕ مەفرۆشن مەگەر سەر بەسەرو بەبێ باقی، هەروا زیو بە زیو، بەڵام زێڕ بەزیوو زیو بەزێڕ چۆنی دەفرۆشن بیفرۆشن).

## (١٨) باب بيع الطَّعام مثلاً بِمثل

١٠٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ فَجَاءَهُ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟) قَالَ: لا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلاثَةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لا تَفْعَلْ بِعْ الْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيبًا) (الحديث ٢٢٠١، أطرافُهُ في: ٢٣٠٢، ٤٢٤٤، ٤٢٤٦، ٧٣٥٠) (الحديث ٢٢٠٢، أطرافُهُ في: ٢٣٠٣، ٤٢٤٥، ٤٢٤٧، ٧٣٥١):[١٠٢٤]

ئەبوسەعیدی خودریو ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پیاوێکی کرد بەسەرکاری سەر قەڵای خەیبەر کەهاتەوە خورمایەکی نایابی هێنابوو، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا خورمای خەیبەر هەمووی ئاوایە؟ وەك ئەمە گشتی ئاوا نایابو هەڵبژاردەیە؟) پیاوەکە گوتی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام مەنێ لەم خورما نایابە لەباتی دوومەن لەخورمای ئاسایی وەردەگرین، وەدوو مەن لەجیاتی سێ مەن! فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (شتی وا مەکەن بانەبێ بەسوود، واتە: بانەبێ بەریبا، بەڵام خورما ئایەخەکە بفرۆشن بەپارە،

---

[١٠٢٤] تجريد/٣، ژمارە: ٩٨٨ - ٢٢٠١ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩١٣ - ٤٠٥٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٩).

لەپاشا ئەو پارمیە چەندی کرد، خورمای نایابی پێ بکڕن). (بڕ: تاج/٢/ل/٣٣٨ز-١٦١، ژمارە: ١٨٧٠).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لەم جۆرە مامەڵەیە ئەوەیە کە موسوڵمان خۆی لە شتی گوماندار بپارێزێ، هەمیشە خۆی رابهێنێ بەکاری پاکی بێ گەردی بێ گومانەوە، بەپێی تەواناییش بەپێی کاتو شوێنو جێگەوڕێگە، کارئاسانیش بەکاربهێنێ، بار لەمەردوم گران نەکا لەکاتی سەوداو مامەڵەی رۆژانەدا، کە زۆربەی کات، زۆربەی خەڵك لە زۆربەی شوێن، ناچاری کردنی ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕە دەبن، جا وەك ڕێسایەکی دامەزراو دەڵێین: (گۆڕینەوەی میوە بەمیوە هەروەها دانەوێڵە بەدانەوێڵە، وەك ترێ بەترێ، چ رەش چ سپی چ باش چ خراپ، گەنم بەگەنم، چ باش چ خراپ، خورما بەخورما، جۆ بەجۆ، هەروا، مێوە بەمێوە لەجۆری خۆی، دانەوێڵە بەدانەوێڵە لەجۆری خۆی، لەزاراوەی یاسانامەی پیرۆزی خودادا، هەموو بەیەك چەشن دادەنرێن، لەکاتی کڕینو فرۆشتنو قەرزو ئاڵو گۆڕی تردا، دەبێ هەردوو لایەکە وەك یەك بن کەمو زیادیان نەبێ، سەربەسەربن، چ بەپێوانەبێ چ بەکێشانە بێ...).

ئەگەر دوو کەس ویستیان بەوێنە گەنم بەگەنم بگۆڕنەوە هی لایەکیان باش بوو، وەکوو ئەوە قەندەهاری بوو، هی ئەو لایەکەیان خراپ بوو، وەك ئەوە رەشگوڵ بوو، وەویستیان کەسیان زەرەر نەکەن، ئەوە دەبێ لەپێشا رەشگوڵەکە بقەبڵێنن بەپارە، بابڵێین دەربە رەشگوڵ دەکاتە دە دینار، ئەوجا بەو پارەیە گەنمە قەندەهاری لەکابرای دووهەم بکڕێ، ئەگەر قەندەهاری ربەی بەدوو دیناربێ، دەبێ دەدینار بدا بەخاوەنی رەشگوڵەکەو دە رەبەی رەشگوڵی لێ

وەربگرێ، ئەوسا پێنج ربەی قەندەهاری پێ بفرۆشێ‌و دە دینارەکەی لەباتی ئەوە لێ‌وەربگرێ!

١٠٢٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ جَاءَ بِلالٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مِنْ أَيْنَ هَذَا؟) قَالَ: بِلالٌ كَانَ عِنْدَنَا تَمْرٌ رَدِيٌّ فَبِعْتُ مِنْهُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ لِنُطْعِمَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (عِنْدَ ذَلِكَ أَوَّهْ أَوَّهْ عَيْنُ الرِّبَا عَيْنُ الرِّبَا لا تَفْعَلْ وَلَكِنْ إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ فَبِعْ التَّمْرَ بِبَيْعٍ آخَرَ ثُمَّ اشْتَرِبِهِ) (الحديث ٢٣١٢):(١٠٢٥)

ئەبوسەعیدی خودری (رەزای خوای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: جارێ بیلال(ڕەزای خوای لێ بێ) خورمای بەرنی کە جۆرە خورمایەکی زۆر نایابە، خریلەیەکی زەردباوە، هێنای‌و داینا بۆ پێغەمبەر کەنۆشی بکا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە هی کوێیە؟) بیلال فەرمووی: خورمایەکی ئایەخمان هەبوو، یەك بەدوو فرۆشتم بەمە، هەتا پێشکەشی پێغەمبەری خۆشەویستی بکەین، تانۆشی بفەرمووێ: کە بیلال وای فەرموو: حەزرەت فەرمووی: (وای! وای! ئەوە سوودی پەتییە، ئەوە سوودی تەواوە، بەڵام کاتێ ویستتان مامەڵەی وا ئەنجام بدەن، خورماکەی خۆت بەفرۆشتنێکی سەربەخۆ بفرۆشە، ئەوسا بەبەهاکەی خورماکەی تر بکڕە). (بڕوانە: فەرموودەی: (١٠٢٤) کەلەم بەرگەدا لەپێشەوە رابوورد).

---

(١٠٢٥) تجرید/٣، ژمارە: ١٠١٧ - ٢٣١٢ بخاری. مسلم: ١٥٩٤ ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی - ٤٠٥٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٠ رقم الباب/١١).

بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی(ڕەزای خوای لـێ بـێ) نـاوداره بەبانگـدەری پێغەمبەر، یەکێـکە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان، دەڵێن: حەوتەم کەس بـووە کە ئیسلام بووە، دایکی نـاوی حەمامـە بـوو، برایـەکی هـەبوو نـاوی خالیـد بـوو، خوشکێکی هەبوو ناوی عەفرە بوو، پیاوێکی کەڵەگەتی لاوازی سەوزە بـوو، زۆر دڵپاك بوو زۆر موسوڵمانێـکی جوانو ڕاسـتو دروسـت بـوو، لەسـەر ئیـسلامەتی بتپەرسـتەکان ئـازارو ئەشـکەنجەیەکی زۆریـان دا، ئومەییـەی کـوڕی خەڵـەف لەقرچـــــەی گـــــەرمای نیـــــوەڕۆدا، لەســـــەر زیـــــخو لـــــی زیخەلانەکـەی مەککـە، لەسـەر گـازەرەی پـشت تـەخت ڕای دەکێـشاو تاوێرێـکی گەورەی دەخستە سەر سکیو پێی دەگوت: یا کافر دەبی بە موحەممەد، یا ئەمـە حاڵتە تادەمری، لەسەر ئەم حاڵە ئەبوبەکر لەم کاتەدا بینی، کڕیو ئازادی کرد.

لەهەموو شەڕگەو غەزاو مەڵبەندەکاندا، لە خزمەت پێغەمبـەر دا ئامـادەی شـەڕ بووە، هەمیشە لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـووە، لێـی جیانـەدەبۆوە مەگـەر لـەکاتی تایبـەت دا، لـەکاتی پەیمانبەسـتنەکەدا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـردی بـەبرای ئەبوعوبەیـدەی جـەڕاح، لـەپاش وەفـاتی پێغەمبـەریش(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) بـیلال دەچـوو، بـۆ غـەزاکردن، هـەتا لەسـەردەمی جێنـشینی عومەردا لەشام لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا گیانی پاکی سپارد.

ئەم زاتانە گێڕانـەوەیان لێـوە ئـەنجام داوە: ئەبوبـەکرو عومـەرو ئوسامەو عەبدوڵڵای کوڕی عـەمرو کەسـانی تـریش، لەفـەتحول باریـدا دەفـەرموێ: بـیلال سـێ فـەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، پێغەمبـەر زۆر خۆشـی دەویـست، واڕێدەکەوێ: بیلال خوا بـۆی دەرەخسێنێ ئومەییـەی کـوڕی خەلـەف دەکـوژێ، ئەبوبەکری صدیق بەم هەڵبەستە پیرۆزبایيو دەستخۆشی لـێ دەکا:

**هنيئــــاً زادك الــــرحمن خــــيراً   فقــدْ أدركــتَ ثــأرَكَ يــابلالُ!**

**واته:**

**پیرۆزبــێ، بــیلال! خواپیرۆزیکــا   تۆڵەی خۆتت سەند لەدوژمنی خوا**

١٠٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كُنَّا نُرْزَقُ تَمْرَ الْجَمْعِ وَهُوَ الْخِلْطُ مِنْ التَّمْرِ وَكُنَّا نَبِيعُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لا صَاعَيْنِ بِصَاعٍ وَلا دِرْهَمَيْنِ بِدِرْهَمٍ) (الحديث ٢٠٨٠)[١٠٢٦].

ئەبوسەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: تێکەڵەی خورمامان دەدرایە لەو خورما جۆراو جۆرەی کەلە هی زەکات کۆوە کرابوو، کەوەك مزە ئاش، باش‌و خراپی تێدا بوو، ئەومیان لەباتی یارمەتی دەداینێ. ئێمەش دوو مەنمان لەو تێکەڵەیە دەدا بەیەك مەن خورمای تری یەك چەشنی باشتر، جا بەم بۆنەیەوە خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێمان: (شتیوا مەکەن دوو مەن بەمەنێك‌و دوو درەم بەدرەمێك مامەڵەی وا سوودە دروست نییە).

١٠٢٧- عن أبي صَالِحٍ الزَّيَّاتَ رحمه الله تعالى أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ فَقُلْتُ لَهُ: فَإِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ لا يَقُولُهُ: فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ سَأَلْتُهُ فَقُلْتُ سَمِعْتَهُ مِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْ وَجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ كُلَّ ذَلِكَ لا أَقُولُ وَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

[١٠٢٦] بخاری. بیوع: ٢٠٨٠ مسلم/شیحا: ٤٠٦١ تجرید/٣، ژمارە: ٩٤٦ - ٢٠٨٠ بوخاری. (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٢٠).

مِنِّي وَلَـكِنْ أَخْبَرَنِي أُسَـامَةُ أَنَّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ لا رِبًـا إِلاَّ فِـي النَّسِيئَةِ). (الحديثان: ٢١٧٨، ٢١٧٩، طرفاهما في: ٢١٧٦)؛ [١٠٢٧]

ئەبو صالحی زەییات (سۆزو رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمویٚ: گوێم لێ بوو ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (دیناریٚ بەدیناریٚ، دەست بەدەست، بەبێ زیادو کەم، دەفرۆشریٚ، هەروا درەم بەدرەم) منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی بۆچی ئیبنوعەبباس وا نافەرمویٚ؟ بەڵکوو دەڵیٚ: مادەم حازر بەحازرە مەرج نییە وەك یەك بنو بەقەد یەکتربن؟!

ئەبوسەعید فەرمووی: منیش بۆ ئەمەی تۆ دەیڵێیت ئەی زەییات! لە ئیبنوعەبباسم پرسی، پێم گوت: ئەمەی کەدەیڵێیت خۆت لە پێغەمبەرت بیستووە، یا لەنامەی خودادا دیوتە؟ فەرمووی: من شتی وا ناڵێم ئێوە خۆتان زاناترن لەمن بەهەواڵەکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەلام من ئوسامەی کوڕی زەید(ڕەزای خوای لێ بێ) هەواڵی پێم دا: کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (سوود کاتێ روودەدا کە لایێ لە دوو بەهاکە حازربێو ئەوی تریان قەرز، یادواخراوبێ).

## (٢٠) باب أخذ الحلال وترك الشبهات
## وەرگرتنی حەلاڵی ڕوونو ئاشکراو وازهێنان لە شتی گوماناوی

١٠٢٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ - وَأَهْوَى النُّعْمَانُ بِإِصْبَعَيْهِ إِلَى أُذُنَيْهِ -: « إِنَّ الْحَلاَلَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ، لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ

---

[١٠٢٧] تجرید/٢، ژمارە: ٩٨٠ = ٢١٧٨ بخاری. مسلم/شیحا. مساقاە/٤٠٦٤ = محمد فؤاد/١٥٩٦ (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٧٩).

اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ، وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ». {الحديث: ٤٠٧٠ شيحا = ٤٠٦٥ فم. تجريد/١، رقم: ٤٨ = ٥٢، ٢٠٥١ فتح الباري. أبو داود. بيوع: ٣٣٣٠، ٣٣٢٩، ترمذي. بيوع: ١٢٠٥. نسائي. بيوع: ٤٤٦٥. رياض/٢، زنجيره: ٦٨، ژماره: ١/٥٨٨} : [١٠٢٨]

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەردوو دەستی خۆی درێژکرد بۆ هەردوو گوێی خۆیو فەرمووی: بەم دوو گوێیانەی خۆم، لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): شتی حەڵاڵ دیارو ئاشکرایە، هەروەها شتی حەرامیش دیارو ئاشکرایە، بەڵام لەوبەینەدا هەندێ شت هەن دوو بەینینو لەهەردوولا دەچن، لەبەرئەوە گەلێ کەس حوکمەکەیان نازانن، بەڵام زانایانی ئایین، لەپاش لێکۆڵینەوەی شایان، بڕیارە شەرعییەکەیان دەدۆزنەوەو بڕیار دەدەن کە حەڵاڵن یا حەرامن، جا ئەوەی کەخۆی بپارێزێ لەشتی شوبهەدارو گومان لێکراو، ئەوە ئایینو ناموسی خۆی لە نەنگو لکە دەپارێزێ بەپێی شەرعی خوا.

بەڵام ئەوەی کە توخنی شتی شوبهەدارو گومانلێکراو دەکەوێ، خواناخوا، تووشی دەبێ، بەتووشی حەرامیشەوە، وەك چۆن شوان ئەگەر لەدەوروبەری پاکژو پاوان، ران بلەوەڕێنێ، بەرە بەرە ڕانەکە لەپاوەندەکەیش دەلەوەڕێ.

باش ئاگاداربن! کەهەموو پادشایێ بەستو پاوەندێکی تایبەتی خۆی هەیە، بزانن کە بەستو پاوەندی خودایش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون!

---

[١٠٢٨] تجرید/١، ژمارە: ٤٨ = ٥٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٥٦ - ٤٠٧٠ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٢ رقم الباب/٣٩).

باش ئاگاداربن! کە گوڵمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا ئەگەر ئەو گوڵمە گۆشتە سازو باش بوو، ئەوا جەستەیش هەمووی سازو باش دەبێ، بەلام ئەگەر ئەو گوڵمەیە خراپ بوو، ئەوا جەستەیش هەمووی خراپ دەبێ، بزانن کە ئەو گوڵمەیە بریتییە لەدڵ، دڵی پاكو لەشی چاك، دڵی پیسو لەشی ناپاك). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٧٥٦}.

## (٢١) باب بيع البَعيرِ وَإستثناءِ رُكُبِه

## فرۆشتنی وشتر لە ڕێگەوبان بە مەرجی ئەوە کە فرۆشیار هەتا دەگاتەوە ناو کەسوکاری خۆی سواری وشترەکەی ببێ!!

١٠٢٩- حديث جَابِرٌ (رضى الله عنه) أَنَّهُ كَانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ لَهُ قَدْ أَعْيَا ، فَمَرَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَضَرَبَهُ ، فَدَعَا لَهُ ، فَسَارَ بِسَيْرٍ لَيْسَ يَسِيرُ مِثْلَهُ ثُمَّ قَالَ « بِعْنِيهِ بِوَقِيَّةٍ » . قُلْتُ لاَ . ثُمَّ قَالَ « بِعْنِيهِ بِوَقِيَّةٍ » . فَبِعْتُهُ فَاسْتَثْنَيْتُ حُمْلاَنَهُ إِلَى أَهْلِي ، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَتَيْتُهُ بِالْجَمَلِ ، وَنَقَدَنِي ثَمَنَهُ ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ ، فَأَرْسَلَ عَلَى إِثْرِى ، قَالَ « مَا كُنْتُ لآخُذَ جَمَلَكَ ، فَخُذْ جَمَلَكَ ذَلِكَ فَهْوَ مَالُكَ »[١٠٢٩].

واتاو مەبەست لێی لەنامەی (رضاع)دا رابورد، فەرموودەی ژمارە (٩٣١)و ژمارە (٩٣٢) تەنها لێرە ئەم پترییەی هەیە: جا کە وشترەکەم فرۆشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە مەرجم گرت: (لەوسەفەرەدا هەتا دەگەینە ماڵەوە خۆم سواری بم، ئەویش رازی بوو بەوە..........).

١٠٣٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَتَلاَحَقَ بِي وَتَحْتِي نَاضِحٌ لِي قَدْ أَعْيَا وَلاَ يَكَادُ يَسِيرُ، قَالَ: فَقَالَ لِي: مَا لِبَعِيرِكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: عَلِيلٌ، قَالَ: فَتَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه

---

[١٠٢٩] بخاری: ٢٣٨٥، ٢٧١٨، ٢٩٦٧، ٢٥٠٥ مسلم/شیحا: ٤٠٧٤ (بخاری رقم الکتاب/٥٤ رقم الباب/٤).

وسلم) فَزَجَرَهُ وَدَعَا لَهُ، فَمَا زَالَ بَيْنَ يَدَيِ الإِبِلِ قُدَّامَهَا يَسِيرُ، قَالَ: فَقَالَ لِي: « كَيْفَ تَرَى بَعِيرَكَ » قَالَ: قُلْتُ: بِخَيْرٍ، قَدْ أَصَابَتْهُ بَرَكَتُكَ، قَالَ: « أَفَتَبِيعُنِيهِ »؟ فَاسْتَحْيَيْتُ، وَلَمْ يَكُنْ لَنَا نَاضِحٌ غَيْرُهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَبِعْتُهُ إِيَّاهُ عَلَى أَنَّ لِي فَقَارَ ظَهْرِهِ حَتَّى أَبْلُغَ الْمَدِينَةَ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي عَرُوسٌ فَاسْتَأْذَنْتُهُ، فَأَذِنَ لِي، فَتَقَدَّمْتُ النَّاسَ إِلَى الْمَدِينَةِ، حَتَّى انْتَهَيْتُ، فَلَقِيَنِي خَالِي، فَسَأَلَنِي عَنِ الْبَعِيرِ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا صَنَعْتُ فِيهِ، فَلاَمَنِي فِيهِ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لِي حِينَ اسْتَأْذَنْتُهُ: « مَا تَزَوَّجْتَ، أَبِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟». فَقُلْتُ لَهُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا، قَالَ: « أَفَلاَ تَزَوَّجْتَ بِكْرًا تُلاَعِبُكَ وَتُلاَعِبُهَا »؟ فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوُفِّيَ وَالِدِي أَوِ اسْتُشْهِدَ وَلِي أَخَوَاتٌ صِغَارٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ إِلَيْهِنَّ مِثْلَهُنَّ فَلاَ تُؤَدِّبُهُنَّ، وَلاَ تَقُومُ عَلَيْهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا لِتَقُومَ عَلَيْهِنَّ وَتُؤَدِّبَهُنَّ، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَدِينَةَ غَدَوْتُ إِلَيْهِ بِالْبَعِيرِ، فَأَعْطَانِي ثَمَنَهُ، وَرَدَّهُ عَلَيَّ. {الحديث: ٤٠٧٦ = ٤٠٧١ فم. بخاري. استقراض: ٢٢٨٥، ٢٧١٨، ٢٩٦٧. أبو داود. بيوع: ٢٥٠٥. ترمذي. بيوع: ١٢٥٢. نسائي. بيوع: ٤٦٥١}: [١٠٣٠]

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ غەزا، وشترێكی ئاوكێشم لەژێردا بوو، وەستابوو، كەڵكی ڕۆیشتنی نەمابوو، بەئاستەم ڕێگەی دەكرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوامەوە بوو پێم گەیشت، فەرمووی پێم: (ئەی جابیر! ئەوە وشترەكەت چییەتی؟) عەرزیم كرد: نەخۆشە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو لەدواوە تێی خوڕیو نزای بۆیكرد، ئیتر وای لێهات هەر لەپێش وشترەكانەوە دەڕۆیشت، پاش ماوەیێ حەزرەت

[١٠٣٠] پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٠ = ٤٠٧٦ (بڕوانە ژمارە: ١٠٢٩) (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١١٣).

(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەرێ وشترەکەت ئێستا چۆنە؟) منیش عەرزیم کرد: زۆرباشە، لەپیت‌و فەڕو پیرۆزی تۆوە زۆرباش بووە. خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (پێمی دەفرۆشیت؟). گەرچی وشتری ئاوکێشی ترمان نەبوو، لەبەرئەوە حەزم لەفرۆشتنی نەبوو، بەڵام شەرمم لە پێغەمبەر کرد، لەبەرئەوە گوتم: بەڵێ دەیفرۆشم، جاپێیم فرۆشت، بەمەرجێ هەتا دەچمەوە مەدینە خۆم سواری پشتی ببم.

جا عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! من تازە زاوام، لەبەرئەوە حەزدەکەم زوو بگەمەوە ماڵەوە، ئەگەر مۆڵەتم بدەی پێش دەکەوم‌و دەڕۆم، ئەویش مۆڵەتی ئەوەی پێدام، ئیتر پێش خەڵکەکە کەوتم بەرەو مەدینە، تا گەیشتمە ناوشار، لەوێ خاڵم پێ گەیشت، پرسیاری وشترەکەمی لێمکرد، منیش چیرۆکەکەیم بۆیگێڕایەوە، ئەویش لەسەرئەوە سەرزەنشتی کردم.

جابیر فەرمووی: لەوکاتەدا کە مۆڵەتم لە پێغەمبەر وەرگرت، کەپێش بکەوم لەبەرئەوەی کەتازە زاوام، فەرمووی پێم: (چیت هێناوە، کچ یا بێوەژن؟) عەرزیم کرد: بێوەژنم هێناوە. فەرمووی: (ئەی بۆ کچێکت نەهێنا، گەمەو یاری لەگەڵ بکەیت‌و گەمەو یاریت لەگەڵ بکا؟) عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! عەبدوڵڵای باوکم کەمردو لەغەزای ئوحوددا شەهیدبوو، حەوت خوشك، یانۆ خوشکی بەسەردا بەجێ هێشتم، کەهەموویان سەرو قنگ بوون‌و مناڵ بوون، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا کە کارامەبێ، ماڵ‌و مێردی دیبێ‌و وەك خۆیان کۆڵی‌و دەسەوسان نەبێ، تابتوانێ بەجوانی پەروەردەیان بکات‌و سەرپەرشتییان بکات.

جـابير فـەرمووی: کاتـێ پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) گەیشتەجێو هاتەوە مەدینە، وشترەکەم بۆیبرد، ئەویش پارەکەیی پێمدا، بەلام لەپاشا وشترەکەشی پێم دایەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٣}.

١٠٣١- حديث جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ اشْتَرَى مِنِّي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بَعِيرًا بِوَقِيَّتَيْنِ وَدِرْهَمٍ أَوْ دِرْهَمَيْنِ ، فَلَمَّا قَدِمَ صِرَارًا أَمَرَ بِبَقَرَةٍ فَذُبِحَتْ فَأَكَلُوا مِنْهَا ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ أَمَرَنِي أَنْ آتِيَ الْمَسْجِدَ فَأُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ ، وَوَزَنَ لِي ثَمَنَ الْبَعِيرِ): [١٠٣١]

جابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خودا لە خۆیو لە باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) وشترێکی لێم کڕی، یا بە ئۆقیەیەك زیوو درەمی، یا بە ئۆقیەیەكو دوو درەم، جا کاتێ پێغەمبەرو لەشکرەکەی گەیشتنە صیرار، کە ناوی جێگەیەکە، سێ میل لە مەدینەوە دوورە، لەوێ فەرمانی کرد مانگایەك سەربڕاو کولانیانو خواردیان، جا کاتێ گەیشتنە شاری مەدینە فەرمانی پێم کرد، کە بچم بۆ مزگەوتو لەوێ دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سلاوی مزگەوت بکەم، وەمنیش وامکرد، وە فەرمانی کرد پارەی وشترەکەمیان بۆم کێشاو دایان پێم.

---

[١٠٣١] مسلم: ٤٠٨١ بڕوانە ژمارە: (٩٣١)و (٩٣٢) کە لەم پەڕاوەدا لە پێشەوە ڕۆیشتن. (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٩٩).

### (٢٢) باب مَن إسْتَسْلَفَ شَيْئاً فَقَضى خَيْراً مِنْهُ وَخَيْرُكُمْ أحْسَنُكُمْ قَضاءً
### کەسێ شتێ قەرز بکاو دوایی بەشتێ باشتر ئەو قەرزە بداتەوە ئەوە دروستە، وە باشترینی موسوڵمانانیش ئەوانەیانە کە بە سەر ڕاستیو زۆر بە جوانی قەرزی سەریان دەدەنەوە بە خاوەنی

١٠٣٢- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رضـی الله عنـه) أَنَّ رَجُـلاً أَتَـی النَّبِـیَّ (صـلی الله علیـه وسلم) یَتَقَاضَاهُ ، فَأَغْلَظَ ، فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم): « دَعُوهُ فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً » . ثُمَّ قَالَ « أَعْطُوهُ سِنًّا مِثْلَ سِنِّهِ » . قَالُوا یَا رَسُـولَ اللَّهِ لاَ نَجِدُ إِلاَّ أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ . فَقَالَ « أَعْطُوهُ فَإِنَّ مِنْ خَیْرِکُمْ أَحْسَنَکُمْ قَضَاءً »: [١٠٣٢]

بە مەبەستی شارەزا بوون لە شێوەی گێڕانەوەکان، کە خاڵی هاوبەش لە نێوانیانا چییەو چۆنە، ئایا وردە جیاوازی لە نێوان بێژە (لەفظ)ە کانیاندا هەیە، یان نا، بە مەبەستی ئەم جۆرە مەبەستانەو شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی دەقی فەرموودەکانو وەرگرتنی بڕیارە شەرعییەکەیان، لە فەرموودەکان، کە وەرگرتنی حوکمو بڕیارە شەرعییەکان، مەبەستی سەرەکییە لە گێڕانەوەی فەرموودە، بەم مەبەستەوە بەم نیازە، گێڕانەوەی بوخاریو گێڕانەوەی موسلیم بۆ ئەم فەرموودەیە لە موختەصەری صەحیحی بوخاری، ژمارەە (١٠١٤)و لە پوختەی موسلیم/٢، ژمارە ٩٥٧ ڕاگوێز دەکەین، لە پێشا بوخاریو ئەوسا موسلیم، ئاوەها:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَتَقَاضَاهُ فَأَغْلَظَ فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (دَعُوهُ فَـإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً) ثُمَّ قَالَ: (أَعْطُوهُ سِنًّا مِثْلَ سِنِّهِ) قَالُوا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ لانجِـدُ إِلاَّ

---

[١٠٣٢] تجرید/٣، ژمارە: ١٠١٤ = ٢٣٠٦ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٥٧ = ٤٠٨٦ شیحا = ١٦٠١ محمد فؤاد (بخاری رقم الکتاب/٤٠ رقم الباب/٦).

أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ فَقَالَ: (أَعْطُوهُ فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً) (الحديث٢٣٠٦، أطرافُهُ في: ٢٣٠٥، ٢٣٩٠، ٢٣٩٢، ٢٣٩٣، ٢٤٠١، ٢٦٠٦، ٢٦٠٩):

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ قـەرزی لەسـەر پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، هات بۆ خزمـەتی بەشێوەیەکی رەق و تـەق داوای قەرزەکـەی لـێ کـردەوە، هاوڕێیـانی پێغەمبـەر - دروودی خـودا لـە پێغەمبەرو رەزای خـودا لـە هاوڕێـکانی بـێ- ویـستیان تـەمێی بکـەن، بەقـسە یـا بـەئازاردان، لەسـەر ئـەوە چـۆن بـێوێڵی وا لـەڕووی پێغەمبـەردا ئـەنجام دەدا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەکەن، وازی لـێ بێنن، چونکە خاوەنی ماف ڕێـگەی گوتاری هەیەو، مافی ئەوەی پێ دراوە کە قسەی خۆی بکـا) ئـەوجا فـەرمووی: (وشترێـکی پـێ بـدەن کـە لەسێرەی وشـترەکەی خـۆی دا بـێ) عەرزیان کرد: قوربان! وشتری وامان لا نییە، کـە لەتەمـەنی وشـترەکەی خـۆی دا بێ، مەگـەر وشترێـکی تەمـەن گـەورەتری پـێ بـدەین فـەرمووی: (بیـدەن پێـی، لەڕاستیدا مرۆڤی باش هەمیشە قەرزی خەڵك بەباشی دەبژێرێتەوە).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَقٌّ، فَأَغْلَظَ لَهُ، فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً، فَقَالَ لَهُمْ: اشْتَرُوا لَهُ سِنًّا فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَقَالُوا: إِنَّا لاَ نَجِدُ إِلاَّ سِنًّا هُوَ خَيْرٌ مِنْ سِنِّهِ، قَالَ: « فَاشْتَرُوهُ فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَوْ خَيْرَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً ». {الحديث: ٤٠٨٦ = ٤٠٨١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠١٤ = ٢٣٠٥، ٢٣٩٠، ٢٣٩٢، ٢٣٩٣، ٢٤٠١، ٢٦٠٦، ٢٦٠٩ فتح الباري. ترمذي. بيوع: ١٣١٦، ١٣١٧. نسائي. بيوع: ٤٧٠٧. رياض/٣، زنجيره: ٢٤٠، ژماره: ١/١٣٦٧} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کابرایێ، ئاژەڵێکی لەسەر پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) کابراکە داوای ئاژەڵەکەیی کردەوە، قسەی ڕەق بوو لەگەڵ پێغەمبەردا، جا هاوەڵان فرمیان لێ خۆشکرد، کە پەلاماری بدەنو تەمێی بکەن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وازی لێ بێنن، چونکە خاوەن ماف قسەی ڕەوایەو هەقی قسەی هەیە، ئاژەڵێکی هاوتەمەنی ئاژەڵەکەی خۆیی بۆ بکڕنو بیدەن پێی. گوتیان: ئاژەڵی وانییە، مەگەر لەئاژەڵەکەی خۆی باشتری بۆپەیدا بکەین؟ فەرمووی: دەبیکڕنو بیدەنێ، چونکە لەپیاو باشانی ئێوەن، ئەو کەسانەتانن کە قەرز زۆر بەجوانی دەدەنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٨١ —ش/د/ت/ن + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٠، ژمارە: ١/١٣٦٧}.

عَنْ أَبِى قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِى الْبَيْعِ فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ ». {الحديث: ٤١٠٢ شيحا = ٤٠٩٦ فم}:

ئەبو قەتادەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەسەوداو مامەڵەدا دووربن لەسوێند خواردنی زۆر، چونکە لەپێشا برەو بەکاڵا دەدا، بەڵام لەئەنجامدا پیتو بەرەکەتی دەبا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٢ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣١٨، ژمارە: ١٧٢٠، ١٧٢١}.

## (٢٤) باب الرهن وَجوازِهِ في الحَضَرِ كالسَّفَرِ
## باسى رەهن (بارمتە) لەسەفەرو لە كاتى تريشدا، بارمتە دروستە

١٠٣٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اشترى مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا إلى أجل، وَرَهَنَهُ دِرْعًا مِنْ حَدِيدٍ. {الحديث: ٤٠٩٢ = ٤٠٨٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٤١ = ٢٠٦٨، ٢٠٩٦، ٢٢٠٠، ٢٢٥١، ٢٢٥٢، ٢٣٦٨، ٢٥٠٩، ٢٥١٣، ٢٩١٦، ٤٤٦٧. نسائى. بيوع: ٤٦٢٣. ابن ماجة. رهون: ٢٤٣٦. تحفة الأشراف: ١٥٩٤٨} : [١٠٣٣]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرانی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، لەجوولەکەیێ هەنێ جۆ بەقەرز، بۆماوەیەکی دیاریکراو دەکڕێ، زریەیەکی ئاسنی هەبوو، لەبارمتەی ئەو جۆیەدا، لەلای جوولەکەکە دانابوو).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ١٨٥٠} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٥٠٥/١٠} .

گێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیە، لە ئەنەسەوە، لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە (٩٤١) ئاوایە:

عَنْ أَنَسٍ (رضي اللهُ عنهُ) أَنَّهُ مَشَى إِلَى النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِخُبْزِ شَعِيرٍ وَإِهَالَةٍ سَنِخَةٍ وَلَقَدْ رَهَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دِرْعًا لَهُ بِالْمَدِينَةِ عِنْدَ يَهُودِيٍّ وَأَخَذَ مِنْهُ شَعِيرًا لأَهْلِهِ وَلَقَدْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَا أَمْسَى عِنْدَ آلِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَاعُ بُرٍّ وَلا صَاعُ حَبٍّ وَإِنَّ عِنْدَهُ لَتِسْعَ نِسْوَةٍ):

ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەمەدینە، زریەکەی خۆی لەبارمتەی هەنێ جۆدا، لەلای جولەکەیێ دانابوو، جارێ نانی

---

[١٠٣٣] بخاری. بیوع: ٢٠٦٨ مسلم/شیحا: ٤٠٩١ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٦ = ٤٠٩٢ شیحا + تجرید/٣، ژمارە: ٩٤١. (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/١٤).

جۆو هەندێ رۆنە زەنگی پیوم بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) برد، گوێم لێ بوو، دەیفەرموو: (خێزانەکانی موحەممەد - درودی خودا لەسەر خۆیو رەزای خودا لە خێزانەکانی – یەك مەن گەنم یا یەك مەن دانەوێڵە چییە لەماڵیان دا نییە، چ بۆ بەیانی چ بۆ ئێوارەیان، ئەو کاتەش حەزرەت نۆ ماڵی هەبوو). (ریاض/٢/٧٨ ژ: ٥٠٥/١٠ز-٥٦).

## (٢٥) باب السَّلَم

## سەلەمکردن بەسەر بەروبوومو شتی تری وا

١٠٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَدِمَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِى الثِّمَارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَقَالَ: « مَنْ أَسْلَفَ فِى تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِى كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ ». {الحديث: ٤٠٩٤ = ٤٠٨٨ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٨ = ٢٢٣٩، ٢٢٤٠، ٢٢٤١، ٢٢٥٣. أبو داود. بيوع: ٣٤٦٣. ترمذي. بيوع: ١٣١١. نسائي. بيوع: ٤٦٣٠. ابن ماجة. تجارات: ٢٢٨٠. تحفة الأشراف: ٥٨٢٠}: [١٠٣٤]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، خەڵك بەسەر بەری دارو درەختو شینایيو دانەوێڵە، سەلەمیان دەکرد بۆماوەی ساڵێ یادوو ساڵ. جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ سەلەم بەسەر خورما، یا بەسەر شتێ تر دەکا، با ئەندازەی شتە سەلەم بەسەرکراوەکە دیاری بێ، وەك دەربە، یا بەکێشانە زانراوبێ، وەك سەدکیلۆ، هەروەها بۆماوەی

---

[١٠٣٤] تجرید/٣، ژمارە: ٩٩٨ = ٢٢٣٩ بوخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٧ = ٤٠٩٤ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٣٥ رقم الباب/٢).

چەندیشە، ماوەکە ناوببرێ، وەك ساڵێ، دوو ساڵ، مانگێ، دوو مانگ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ١٨٤٧}.

## (٢٧) باب النهي عن الحلف في البيع

## سوێندو سوێندکاری لە سەوداو مامەڵەو کڕینو فرۆشتندا نەهی لێ کراوە

١٠٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (الْحَلِفُ مُنَفِّقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مُمْحِقَةٌ لِلْبَرَكَةِ) (الحديث ٢٠٨٧): [١٠٣٥]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سوێندی درۆ برەو بەفرۆشتنی کاڵا دەدا بەڵام پیتو بەرەکەتی مامەڵە دەبا) (تاج/٢/٣٠٠ف -٢).

لە پوختەی موسلیما، ژمارە (٩٥٨ = ٤١٠٢ شیحا)دا ئاوایە:

عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِى الْبَيْعِ فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ ». {الحديث: ٤١٠٢ شيحا = ٤٠٩٦ فم}:

ئەبو قەتادەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەسەوداو مامەڵەدا دووربن لەسوێند خواردنی زۆر، چونکە لەپێشا برەو بەکاڵا دەدا، بەڵام لەئەنجامدا پیتو بەرەکەتی دەبا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٢ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣١٨، ژمارە: ١٧٢٠، ١٧٢١}.

---

[١٠٣٥] تجرید/٣، ژمارە: ٩٤٨ = ٢٠٨٧ بخاری. مسلم: ١٦٠٦ = پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٥٨ = ٤١٠٢ شیحا (بخاری — ٣٤/٣٦).

## (٢٨) باب الشُّفْعَة
## باسی بەش هەڵگرتنەوە (شوفعە)

١٠٣٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ قَضَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ: (١٠٣٦)

لە تاجول ئوصولدا، بەرگی/٢، ژمارە (١٨٥٢) ئەم فەرموودەیە ئاوایە: (بڕوانە: ژمارە: ٩٦٨ پوختەی موسلیم/٢):

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شوفعە (واتە: بەشی هاوبەش، یا هاوسێ هەڵگرتنەوە)ی داناوە لەهەموو شتێکا کە هاوبەشی بێو هێشتا دابەش نەکرابێ، بەڵام ئەگەر شتەکە جیاکرایەوەو سنوور دانراو توخوب نیشانەکراو، ڕێگەوبان دیاریکرا، ئیتر هەقی شوفعەی بەسەرەوە نامێنێ – ش/د/ت/ن).

## (٢٩) باب غَرْزِ الخَشَبِ في جِدَارِ الجار
## سەری دەستەک و لاداروو نیرکەو کوێسەوانە لەسەر دیواری هاوسێ

١٠٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا يَمْنَعْ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي جِدَارِهِ) ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ وَاللَّهِ لأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ) (الحديث ٢٤٦٣، طرفاهُ في: ٥٦٢٧، ٥٦٢٨): (١٠٣٧)

---

(١٠٣٦) بخاری. شفعە: ٢٢٥٧ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٨ - ٤١٠٤ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٣٦ رقم الباب/١).

(١٠٣٧) تجرید/٣، ژمارە: ١٠٦٩ = ٢٤٦٣ بخاری. مسلم. محمد فؤاد/١٦٠٩ = پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٦٨ = ٤١٠٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٦ رقم الباب/٢٠).

ئـەبوهورەیرە(ڕەزای خـوای لــێ بــێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ڕێـگەی دراوسـێ بـدەن کەسـەری دەسـتەك‌و گوێسەوانە لەسەر دیواری ئێوە دابنـێن). لەپاشا ئـەبوهورەیرە فـەرمووی: ئـەوە بۆچی دەتان بینم لوتەلان لەم فەرمایشتە! دەسا بەیەزدانی پاك خۆشـیتان بێ‌و ترشـیتان بـێ، مـن ئـەرکی سەرشـانی خـۆم بـەجێ دەهێـنم‌و ئـەم فەرمایـشت‌و ئامۆژگارییانـە وەك گـوڵ مـێخ دەکـوتم بـەناو شـانتانا. (تـاج/٢/ل-٣٣٤ف —٥ز-١٥٨، ژمارە: ١٨٥٦).

## (٣٠) باب تحريم الظلم وَغَصَب الأرضِ وَغَيْرَها
## زۆرو ستەم‌و شت زەوتکردن نادروستە، ئیتر چی زەوی‌و زار بێ، وەچی شتی تر بێ

١٠٣٨- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ أَنَّهُ خَاصَمَتْهُ أَرْوَى فِي حَقّ زَعَمَـتْ أَنَّهُ انْتَقَصَهُ لَهَا إِلَى مَرْوَانَ ، فَقَالَ سَعِيدٌ أَنَا أَنْتَقِصُ مِـنْ حَقِّهَـا شَـيْئًا ، أَشْـهَدُ لَـسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: «مَـنْ أَخَـذَ شِـبْرًا مِـنَ الأَرْضِ ظُلْمًـا ، فَإِنَّـهُ يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ».(١٠٣٨)

ئەمـە دەقـی ژمـارە (٩٧٠)ی پوختــەی موسـلیمە، بـۆ ئـەم فەرموودەیـە، روونکردنــەوەی زۆری واتیـادا، دەیکـەین بـە ڕافـەو شـیکردنەوە بـۆ گێڕانـەوەی ئێرە:

عَنْ عُرْوَةَ بن الزبير (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أَرْوَى بِنْتَ أُوَيْسٍ ادَّعَـتْ عَلَـى سَـعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ أَخَذَ شَيْئًا مِنْ أَرْضِهَا فَخَاصَـمَتْهُ إِلَـى مَـرْوَانَ بْـنِ الْحَكَـمِ

(١٠٣٨) تجريد/٣، ژمارە: ١٠٦٣ = ٢٤٥٢ بخاری. مسلم محمد فـؤاد/١٦١٠ = ٩٧٠ پوختـەی موسـلیم = ٤١١٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/٢).

فَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا كُنْتُ آخُذُ مِنْ أَرْضِهَا شَيْئًا بَعْدَ الَّذِي سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟! قَالَ وَمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنَ الأَرْضِ ظُلْمًا طُوِّقَهُ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ ». فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ: لاَ أَسْأَلُكَ بَيِّنَةً بَعْدَ هَذَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَتْ كَاذِبَةً فَعَمِّ بَصَرَهَا، وَاقْتُلْهَا فِي أَرْضِهَا، قَالَ: فَمَا مَاتَتْ حَتَّى ذَهَبَ بَصَرُهَا، ثُمَّ بَيْنَا هِيَ تَمْشِي فِي أَرْضِهَا، إِذْ وَقَعَتْ فِي حُفْرَةٍ فَمَاتَتْ. {الحديث: ٤١١٠ = ٤١٠٤ فم}:

عورەی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەروای کچی ئوومیس سکاڵای ئەوەی دەکرد، کە سەعیدی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) بەشێ لەزەوییەکەی ئەوی داگیرکردووە، لەلای مەروانی کوڕی حەکەم سکاڵای لێ کرد، کە ئەوکاتە مەڕوان میری سەر مەدینە بوو، سەعید فەرمووی: منێ کە بەگوێی خۆم لەم بارەیەوە هەڕەشەی گەورەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستبێ، دەچم زەوی لەو زەوت دەکەم؟! مەڕوان فەرمووی: چیت لەم بارەیە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە؟ سەعید فەرمووی: (بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ، بەناهەق، بەزۆرو ستەم، بستێ زەوی یازیاتر داگیربکا، لەرۆژی قیامەتا، ئەو بستە زەوییە، بەهەر حەوت چینەی زەمینەوە، وەك کەڵەمە لەملی گادا، ئاوا دەکرێ بەتەوق‌و دەکرێتە ئەستۆی!).

مەڕوان فەرمووی بەسەعید: ئەم فەرموودەیە بەسە کەببێ بە بەڵگە لەسەر ڕاستگۆیی تۆ، سەبارەت بەداوای ئەم ژنە، لەبەرئەوە لەپاش ئەم بەڵگەیە داوای بەڵگەی ترت لێ ناکەم‌و داوای ژنەکەی ڕەتکردەوە.

سەعید فەرمووی: خودایە! تۆ ئاگات لێ هەیە، کە ئەم ژنە ئەم بوختانەی بۆمن کرد، کە بەناهەق زەویم لێی داگیرکردووە، خودایە! ئەگەر درۆ دەکا چاوی کوێرکەو لەناو ئەم زەوییەی خۆیدا بەکوشتی بدەی).

فەرمووی: ئەروا نەمرد هەتا کوێربوو، جارێکیش لەناو زەوییەکەی خۆیدا، کە لەپاڵ زەوییەکەی سەعیددا بوو دەسووڕایەوە، لەپڕ کەوتە ناو بیرێکەوەو مرد!! هەردوو نزاکەی سەعیدی لێ گیرابوو). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٢٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بڕوانە: ژمارە: ١٠٦٣ تەجریدی بوخاری بەرگی سێیەم، هەروا ریاض/١، لاپەڕە: ١٩٤، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٠٦/٤.

٢- سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری ئەلعەدەوییە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئیمامی عومەر لەماڵی ئەودا ئیسلام بووە، سەعید مێردی فاطیمەی کچی خەطاب بوو، کە خوشکی پێشەوا عومەر بوو، سەعید یەکێکە لە عەشەرەی موبەشەرە، واتە: یەکێکە لەو دەکەسە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، ئامادەی گەلێ لەغەزاو نەبەردەکانی پێغەمبەر بووە، وەك غەزای یەرمووك، بەشداری لەئازادکردنی دیمەشقدا کردووە، سەعیدی کوڕی حەبیب دەیفەرموو: ئەم زاتانە لەخزمەت پێغەمبەردا لەیەك پلەو پایەدا بوون: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو سەعدو سەعیدو طەلحەو زوبەیرو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، لەجەنگو نەبەردو کوشتارگاکاندا، لەبەردەمیەوە بوون، لەنوێژدا لەپشتیەوە بوون، سەعید پیاوێکی گەنم ڕەنگی تووکن بوو، نزای زۆر زۆر گیرادەبوو، زەیدی باوکی پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو، لەسەر ئایینی حەزرەتی

ئیبراهیم بوو (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ)، خوێن و مردارەوەبووی نەدەخوارد، هەروا گۆشتی ئاژەڵێکی نەدەخوارد کەناوی بت و ئەنصابی لەکاتی سەربڕیندا لێ هێنرابێ، لەپێش پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەردا، بەخزمەتی پێغەمبەر دەگا، بەڵام فریای هاتنی ئیسلام ناکەوێ.

ئیبنو عەبدول بەڕ، لە ئیستیعابا راگوێز دەکا:

(سەعیدی کوڕی زەید دەچێتە خزمەتی حەزرەت، عەرزی دەکا: قوربان! باوکم ئەوەبوو کەخۆت دیوتەو خەڵك باسی کردووە بۆت، کەواتە: نزای باشی بۆبکەو بۆی بپاڕێرەوە کەخودا لێی خۆش بێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باوکت لەڕۆژی دوا رۆژدا کە زیندوو دەکرێتەوە، بەیەك نەتەوەی تەواو دادەنرێ).

سەعید سێ فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، سەعید لەکۆتایی تەمەنیدا لەعەقیق دەمرێ، تەرمەکەی دەبەنەوە بۆ مەدینە، لەوێ بەخاکی دەسپێرن، لەساڵی (٥٥) پەنجاو پێنجی کۆچیدا دەمرێ، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، تەمەنی نزیکی حەفتاو سێ ساڵ بووە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

١٠٣٩- عن أبي سَلَمَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أُنَاسٍ خُصُومَةٌ ، فَذَكَرَ لِعَائِشَةَ (رضي الله عنها) فَقَالَتْ يَا أَبَا سَلَمَةَ اجْتَنِبِ الأَرْضَ ، فَإِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «مَنْ ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ مِنَ الأَرْضِ طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ »: [١٠٣٩]

ئەبو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کێشەیێ لەسەر پارچەیێ زەوی، لەنێوان من و چەند کەسێکا هەبوو، چووم بۆ خزمەتی دایکە عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) کێشەکەم باسکرد بۆی، فەرمووی: ئەی ئەبو سەلەمە!

---

[١٠٣٩] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٦٣ مسلم: ٤١١٣ شیحا. (بخاری رقم الكتاب/٤٦ رقم الباب/١٣).

خۆت لەکێشەو بەرەی زەوی بپارێزە، چونکە سەبارەت بەم بابەتە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ بەزۆرو ستەم، بەناڕەوا، بەقەد بستێ زەوی داگیربکا، یا کەمتر، یازیاتر، لەڕۆژی قیامەتدا، بەهەر حەوت چینەی زەوییەوە، وەك کەڵەمەی نیل، لەملی کەڵەگادا، ئاوا دەکرێ بە تەوقو دەکرێتە ئەستۆی). {تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٦٣ + تاج/٥، ژمارە: ٤٧٢٧ زنجیرە: ١٠}.

## (٣١) باب قَدَرُ الطَّرِيقِ إِذَا اخْتَلَفُوا فِيهِ
## ئەگەر لەسەر ئەندازەی ڕێگە بوو بە کێشە

١٠٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا تَشَاجَرُوا فِي الطَّرِيقِ بِسَبْعَةِ أَذْرُعٍ) (الحديث٢٤٧٣): [١٠٤٠]

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) حەوت گەز بەگەزی بەنایی داناوە بۆ پانیی ڕێگەی گشتی، ئەگەر لەسەری بووبە کێشەو بەرە).

### راڤەو شیکردنەوە:

یاسایەکی ئوصولی هەیە دەفەرموێ: (بڕیار بەپێی ڕۆژ دەگۆڕێ) : مەبەست لەم جۆرە یاسا ئوصولیە ئەم جۆرە بڕیارانەیە، کە بەپێی کاتو شوێنو سەردەم، بابەتی مەحکومو فیهیەکە دەگۆڕێ. ئەمە بۆ جاران بوو، ئێستا شەقامو ڕێگەوبان دەستوورو ڕێساو یاسای تایبەتی خۆی هەیە.

[١٠٤٠] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٧١ - ٢٤٧٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٧١ - ٤١١٥ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٤٦ رقم الباب/٢٩).

ئەمە دەقی ژمارە (١٠٧١)ی تەجریدی بوخاری بوو، ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا، ژمارە (٩٧١) بەرگی/٢.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِي الطَّرِيقِ جُعِلَ عَرْضُهُ سَبْعَ أَذْرُعٍ ». {الحديث: ٤١١٥ = ٤١٠٩ فم. تحفة الأشراف/١٣٥٥٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درוودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر لەسەر چەندێتی ڕێگەوبان بوو بەهەراو کێشەتان، ئەوا شەرع بڕیاری داوە کەپانیی ڕێگەکە لەحەوت گەز کەمتر نەبێ).

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەمە بۆ کۆن وابوو، ئێستا ڕێگەوبانو شەقام، بەتایبەتی لەناو شارەکاندا، لەڕێگەوبانە سەرەکییەکاندا، دەستوورو یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە، بەپێی شوێنو کاتو جێگەی تایبەت، بەپێی بەرژەوەندی گشتی، پسپۆڕان ئەندازەی دیاری دەکەن! شەرعیش ڕەزای لەسەرەو لاری لێی نییە.

## ٢٣- كِتَابُ الفَرَائِضِ
## نامەی فەرائیز: دابەشکردنی کەلەپوور لە نێوانی کەلەپووربەرانی مردوودا (فەرائیض)

بڕوانە: ئەم سەرچاوانەیە:

{فیقهی ئاسان بەرگی دووەم، زنجیرە: ٢٤٣ + تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم زنجیرە: ٨٨، لەژمارە: ٢٠٥٩ وە هەتا ژمارە: ٢٠٦٤، بەتایبەتی بڕوانە: (پایانێ = خاتمة) هەتا کۆتایی لاپەڕە: ٣٢١ ج/١ + مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٧٧٨، نامەی ژمارە: ٢١ لەژمارە: ٩٩٤ وە هەتا ٩٩٩ + تاج/٢، لاپەڕە: ٤١٦، لەزنجیرە: ١وە هەتا زنجیرە: ١٠ لەژمارە: ١٩٥١ - ١٩٩٦} + {شەرحی بلوغ المرام/٢ لەژمارە: ٩٧١وە هەتا ژمارە: ٩٩١ = لاپەڕە: ٤٤١ هەتا لاپەڕە: ٤٦١ چاپی یەکەم}.

### (١) باب أَلحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَلأَولَى رَجُلٍ ذَكَرٍ
### هەموو خاوەن بەشێ، بە پێی قورئان پشکی دیاریکراوی خۆیان پێ بدەن، هەرچی لەوان مایەوە هی خزمترین کەسی نێرینەیە

١٠٤١- عن ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنهُما عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ قال: أَلحِقوا الفرائِضَ بأهلها، فمابَقِيَ فَهوَ لأولَى رجلٍ ذكر. (الحديث ٦٧٣٢ أطرافه في: ٦٧٣٥، ٦٧٣٧، ٦٧٤٦):[١٠٤١]

ئیبنوعەباس (ڕەزای خواله خۆیو بابی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەموو خاوەن بەشێ لەکەسو کاری مردوو، بەشی دیاریکراوی خۆی پێ بدەن، بەپێی دەقی قورئانەکە، ئەنجا هەرچی لەوان

---

[١٠٤١] مختصر صحيح البخاری - تجريد: ٢٠٥٩ - ٦٧٣٢ پوختەی موسلیم: ٩٩٥ - ٤١١٧ شیحا - ١٠٥٩ محمد فؤاد عبدالباقی (بخاری رقم الكتاب/٨٥ رقم الباب/٥).

مایەوە، ئەوە بۆخزمترین کەسە بەمەرجێ کەنێرینە بێت. (تاجی کوردی/٣ ل/١١ ز/٤ ژ/٢ – ش/د/ت).

## (٢) باب میراث الكَلالَة

## کەلەپووری کەلالە، کە بەمردۆیێ دەگوترێ: نە بنەچە (ئەصڵ)ی مابێ و نە وەچەی هەبێ

١٠٤٢- حديث جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) يَقُولُ مَرِضْتُ مَرَضًا ، فَأَتَانِي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَعُودُنِي وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا مَاشِيَانِ ، فَوَجَدَانِي أُغْمِيَ عَلَيَّ ، فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ صَبَّ وَضُوءَهُ عَلَيَّ ، فَأَفَقْتُ فَإِذَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي فَلَمْ يُجِبْنِي بِشَيْءٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆیو لە عەبدوڵلای باوکی بێ) فەرمووی: نەخۆش بووم، زۆر کەشەنگبووم، پێغەمبەرو ئەبوبەکر، بەم بۆنەیەوە، دێن بۆ سەردانو هەواڵپرسیم، بە پیادە هاتبوون، نەوەکوو بەسواری، دەبینن بووراوەمەتەوەو هۆشم بەخۆم نییە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەسنوێژێ دەگرێو لە ئاوی دەستنوێژەکەیم لێ دەپرژێنێ، ئەوجا هۆشم هاتەوە، ڕوانیم وا پێغەمبەر وا لەلام، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چی لەماڵەکەم بکەم؟ ئەویش هیچ وەڵامی نەدامەوە، هەتا ئایەتی مەواریث دابەزی).

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە، دەقی ژمارە (٩٩٦)ی پوختەی موسلیم، بەرگی دووەم، ڕاگوێز دەکەین، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قال: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَنَا مَرِيضٌ لاَ أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ فَصَبُّوا عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِه، فَعَقَلْتُ، فَقُلْتُ: يَا

رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا يَرِثُنِى كَلاَلَةٌ، فَنَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ، فَقُلْتُ لِمُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى الْكَلاَلَةِ) قَالَ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ). {الحديث: ٤١٢٤ = ٤١١٨ فـم. تجريد/١، رقم: ١٤٣ = ١٩٤، ٤٥٧٧، ٥٦٥١، ٥٦٦٤، ٥٦٧٦، ٦٧٢٣، ٦٧٤٣، ٧٣٠٩. تحفة الأشراف: ٣٠٤٣}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نەخۆش بووم، هۆشم بەخۆم نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتبوو بۆ سەردانو هەواڵپرسیم، دەستنوێژ دەگرێو لەئاوی دەستنوێژەكەیم لێ دەپرژێنێ، ئەوجا هۆشم هاتەوە، جاگوتم: ئەی ڕەهبەری خودا! میراتو كەلەپوورەكەم بۆ كێ دەبێ؟ چونكە من تەنیا چەن خوشكێكم هەن كەلەپوورم لێ بگرنو كەسی ترم نییە نەباوكو دایكو نەمناڵ، ئیتر بەم بۆنەیەوە ئایەتی كەلەپووری كەلالە هاتە خوارەوە).

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا ئاوایە: موسلیم، لە موحەممەدی كوڕی حاتەم، لە بەهز، لە شوعبە، لە موحەممەدی كوڕی مونكەدیر، لە جابیرەوە. جا لێرەدا شوعبە دەفەرموێ: بە موحەممەدی كوڕی مونكەدیرم گوت: مەبەستی جابیر لەهاتنە خوارەوەی ئایەتی كەلالە، ئەم ئایەتەیە، كە ئایەتی (١٧٦)ە لەسوورەتی نیساء، كە دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ}؟!

موحەممەد فەرمووی: بەڵێ، ئەم ئایەتە لەكەشێكی وادا هاتۆتە خوارەوە. {تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٨ چ/٤}.

## (٣) باب آخر آيَةٍ أنزِلَتْ آيَةُ الكَلالَةِ
## دواترین ئایەتی قورئان کە هاتووە ئایەتی کەلالەیە

١٠٤٣- عَنِ الْبَرَاءِ بن عازب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ آخِرَ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ تَامَّةً سُورَةُ التَّوْبَةِ، وَأَنَّ آخِرَ آيَةٍ أُنْزِلَتْ آيَةُ الْكَلاَلَةِ. {الحديث: ٤١٣٠ = ٤١٢٤ فم}: [١٠٤٣]

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دوا سوورەت کەهات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوورەتی بەرائەت بوو، هەمووی بەتەواوی بەیەکجار هات، وەدوا ئایەتیش کەهات ئایەتی کەلالە بوو، کە دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ}. {تاج/٢، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٨٢٢}.

## (٤) باب مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ
## کەسێ بمرێ‌و سامانی لێ بەجێ بمێنێ، بۆ کەلەپووربەرەکانیەتی

١٠٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمَيِّتِ عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ: « هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ؟ فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً، صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِلاَّ قَالَ: « صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ ». فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ، قَالَ: « أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ ». {الحديث: ٤١٣٣ = ٤١٢٧ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤٩ = ٢٣٩٩، ٢٢٩٨، ٢٣٩٨، ٤٧٨١، ٥٣٧١، ٦٧٣١، ٦٧٤٥، ٦٧٦٣}: [١٠٤٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو، تەرمی مردوویان دەهێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا نوێژی

---

[١٠٤٣] بخاری. تفسیر (٦٥/٤). پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٩٨ = ٤١٣٠ ترقیم شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٤).

[١٠٤٤] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٤٩ = ٢٣٩٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٩٩ = ٤١٣٣ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٣٩ رقم الباب/٥).

**مـردووی لەسـەر بكـا، وادەبـوو مـردووەكـە قـەرزار بـوو، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (ئەوەنـدەی مـاڵ لـەپاش خـۆی بەجێهێشتووە كەبەشی دانەوەی قەرزەكەی سەری بكا؟).**

**جا ئەگەر عەرزیان بكردایە: بەڵێ، ئەوا نوێژی لەسەر تەرمەكەی دەكـرد، دەنا ئەگەر بیانگوتبایە ئەوەندەی ماڵ لەپاش بـەجێ نـەماوە كەبەشـی دانـەوەی قەرزەكـەی سـەری بكـا بەتـەواوی، دەیفـەرموو: (دە خۆتـان نوێـژ لەسـەر مردووەكەتان بكەن!).**

**بەڵام بـەرە بـەرە كـە خـودای گـەورە دەرووی دارایـی، بـەهۆی فتوحاتـەوە، لەحەزرەت كردەوە، مردوو ئەگەر قەرزاریش بوایە نوێژی لەسەر دەكردو ئاماژە بە ئایەتی {النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ} دەیفـەرموو: (مـن دڵسۆزترو لەپێشترم بـۆ گشت موسوڵمانێ، لەهەموو كەسێكی تر، هەتا لەخۆشی لەپێشترم بۆی، جائەگەر موسوڵمانێ مردو قەرزی لەسـەربوو، ئـەوە قەرزەكـەی لەسـەر مـن، ئەگـەر خـۆی ماڵی لەپاش بەجێ نەمابوو، من قەرزەكەی بۆ دەدەمەوە، بەڵام ئەگەر ماڵی تری لەپاش بەجێمابوو، ئەوە بۆ مـیرات بەرەكانیـەتی). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٦٤، ژمـارە: ١٨٩٢ – ش/د/ت/ن}.**

## ٢٤- كِتَابُ الهِبَاتِ
## نامەی شت بەخشین

### (١) بابُ كَرَاهَةُ شِرَاءِ الإِنْسَانِ مَا تَصَدَّقَ بِهِ مِمَنْ تَصَدَّقَ عَلَيْهِ
### شتێ بکەی بەخێر، ناباشە بیکڕیتەوە لەوکەسەی کە بەخشیوتە پێی

١٠٤٥- عَنِ عُمَرَ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: حَمَلْتُ عَلى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فأضَاعَهُ الَّذِي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أنْ أشْتَرِيَهُ، وَظَنَنتُ أَنَّهُ يَبِيعُهُ بِرُخصٍ فَسَأَلْتُ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لاَتَشْتَرِهِ وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ فَإِنَّ العَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ كالعائِدِ فِي قَيْئِهِ). (الحديث ١٤٩٠ – اطرافه في: ٢٦٢٣، ٢٦٣٦، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣)؛ [١٠٤٥]

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەسپێکم هەبوو، لە ڕێگەی خودادا بەخشیم بە غەزا کارێ، بەڵام خاوەنەکەی قەدری نەزانیو زۆربێ خزمەتی کرد، منیش ویستم لێی بکڕمەوە، بەزەینی خۆم گوتم: بە هەرزان دەیفرۆشێتەوە، چونکە تەواو لەڕو لاوازی کردبوو، بۆ ئەمە پرسیارم لە خۆشەویست -درودی خوای لەسەر بێ- کرد، فەرمووی: (نەبیکڕەوەو نەهیچ خێرو بەخشینێکی تری خۆت بەپارە هەڵبگرەوە، با پێبەخشراوەکە بە یەك درەمیش بیداتەوە پێت، چونکە ئەوەی کە خێرو بەخشراوی خۆی بکڕێتەوە، یا بیقەبڵێنێ بە پارەو بەو پارەیە هەڵی بگرێتەوە، وەك سەگێ وایە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە(ریاض/٤/١١٨٨—١ ز/٢٨٥ + تاج/٢ ل/٣٦٩ ف/١ ز/١٧٨).

---

[١٠٤٥] تجرید/٢، ژمارە: ٧١٦ = ١٤٩٠ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٨٨ = ٤١٣٩ بخاری ژمارەی کتاب (٢٤) ژمارەی باب (٥٩).

١٠٤٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ عُمَرَ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ لَـهُ فِـى سَـبِيلِ اللّٰهِ أَعْطَاهَا رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) لِيَحْمِلَ عَلَيْهَا رَجُلاً ، فَأُخْبِرَ عُمَرُ أَنَّهُ قَدْ وَقَفَهَا يَبِيعُهَا ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَبْتَاعَهَا فَقَالَ « لاَ تَبْتَعْهَـا ، وَلاَ تَرْجِعَنَّ فِي صَدَقَتِكَ »: [١٠٤٦]

**لەپوختەی موسلیما ئاوایە:**

عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: حَمَلْتُ عَلَى فَـرَسٍ عَتِيـقٍ فِـى سَـبِيلِ اللّٰـهِ فَأَضَاعَهُ صَاحِبُهُ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذٰلِكَ فَقَالَ: « لاَ تَبْتَعْهُ وَلاَ تَعُدْ فِى صَدَقَتِكَ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِى صَدَقَتِهِ كَالْكَلْبِ يقيء ثم يَعُودُ فِى قَيْئِهِ ». {الحديث: ٤١٣٩ = ٤١٣٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٧١٦ = ١٤٩٠، ٢٦٢٣، ٢٦٣٦، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣. نسائي. زكاة: ٢٦١٤. ابـن ماجـة. صـدقات: ٢٣٩٠. تحفة الأشراف: ١٠٣٨٥}:

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: ئەسـپێکی نایـابم هـەبوو، لەرێگـەی خـودادا بەخـشیم بەغـەزاکارێ، بـەڵام خاوەنەکـەی قـەدری نـەزانیو زۆر بـێ خزمـەتی کـرد، منـیش ویـستم لێـی بکڕمـەوە، بـەزەینی خـۆم گـوتم: بەهـەرزان دەیفرۆشـێ، چـونکە تـەواو لـەڕو لاوازی کردبـوو، بـۆ ئەمـە پرسـیارم لـە خۆشەویـست کـرد (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (نـە بیکڕەرەوەو نەهیچ خێرو بەخشینێکی خۆت بەپارە هەڵبگرەوە، یا ئـەو کەسـەی کە بەخشیوتە پێی، بەیەك درەمیش بیداتـەوە پێـت، چونکە ئـەوەی کـە خێـرو بەخشراوی خۆی بکڕێتەوە، یا بیقەبڵێنێ بە پارەو بەو پارەیە هـەڵی بگرێتـەوە، ئـەوە وەك سـەگێ وایـە ڕشـانەوەی خـۆی بخواتـەوە). {ڕیـاض/٤، زنجـیرە: ٢٨٥، ژمارە: ١٦١٢/١} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٨، ژمارە: ١٩٤٠ ج/٤}.

---

[١٠٤٦] بڕوانە ژمارە: (١٠٤٥) + بخاری ژمارەی کتاب (٥٦) ژمارەی باس (١١٩).

(٢) باب تحريم الرجوع في الصدَقَةِ وَالْهِبَةِ بَعْدَ القَبْضِ إلاَّ مَا وَهَبَهُ لِوَلَدِهِ وَإِنْ سَفَلَ

نادروسته كه مرۆڤ خێرو بەخشینو خەڵاتی خۆی، كه دەیدا به كەسێ، له پاش وەرگرتنی، دووباره هەڵیبگرێتەوه بۆ خۆی، جا به كڕین بێ، یان به هەر شێوەیێ تر

١٠٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « الْعَائِدُ فِى هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِى قَيْئِهِ ». {الحديث: ٤١٥٢ = ٤١٤٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٥ = ٢٥٨٩، ٢٦٢١، ٢٦٢٢، ٦٩٧٥. نسائي. هبة: ٣٦٩٣. تحفة الأشراف: ٥٧١٢}:[١٠٤٧]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەسێ دەسەنەو بەخششی خۆی، دووباره هەڵبگرێتەوه، یان بیسەنێتەوه لەو كەسه كەپێی بەخشیوه، وەك سەگ وایه كه بڕشێتەوەو لەدواییدا سەرلەنوێ ڕشانەوەی خۆی دووباره بخواتەوه).

(٣) باب كراهة تفضيل بَعْضِ الأولاَدِ في الهبة

زیاده بەخشین به هەندێ له منالەكانی

١٠٤٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَمًا. فَقَالَ: «أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَهُ». قَالَ: لاَ. قَالَ: « فَارْجِعْهُ »:[١٠٤٨]

---

[١٠٤٧] تجرید/٣، ژماره: ١١٠٥ بخاری پوختەی موسلیم/٢، ژماره: ٩٨٩ = ٤١٥٢ شیحا (بخاری ژمارەی كتاب/٥١ ژمارەی باب/١٤).

[١٠٤٨] تجرید/٣، ژماره: ١١٠٤ - ٢٥٨٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٢ ژماره: ٩٩٠ - ٥١٥٧ شیحا. (بخاری ژمارەی كتاب/٥١ ژمارەی باب/١٢).

لەژمارە (٩٩٠ و ٩٩١)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيُشْهِدَهُ عَلَى صَدَقَتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ »؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: « اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلاَدِكُمْ ». فَرَجَعَ أَبِي فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ. {الحديث: ٤١٥٧ = ٤١٥١ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٤ = ٢٥٨٧ فتح الباري}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم بڕێ لەماڵەکەی خۆی بەخشی بەمن، عەمرەی کچی ڕەواحەی دایکم، گوتی بەباوکم: من بەمە ڕازی نابم، هەتا پێغەمبەر نەکەی بەشایەت لەسەر ئەم خەڵاتە، جا باوکم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا بیکا بەشایەت لەسەر ئەم بەخششە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئایا هەموو منداڵەکانی ترت بەقەد ئەمت پێ بەخشیوە؟) فەرمووی: (نەء) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخودا بترسن‌و بێ فەرمانی مەکەن‌و بەیەك چاو تەماشای هەموو منداڵەکانتان بکەن‌و دادپەروەربن لەنێوانیانا، چونکە خودا وای پێخۆشە).

فەرمووی: باوکم لە بەخشیشەکەی پەشیمان بۆوەو لەمنی سەندەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٩٥٨ ج/٤}.

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: انْطَلَقَ بِي أَبِي يَحْمِلُنِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْهَدْ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ كَذَا وَكَذَا مِنْ مَالِي، فَقَالَ: « أَكُلَّ بَنِيكَ قَدْ نَحَلْتَ مِثْلَ مَا نَحَلْتَ النُّعْمَانَ؟». قَالَ: لاَ، قَالَ: « فَأَشْهِدْ عَلَى

هَذَا غَيْرِي»، ثُمَّ قَالَ: «أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً »؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: « فَلاَ إِذًا ». {الحديث: ٤١٦١ = ٤١٥٥ فم. تقدم تخريجه في الحديث ٩٩٠} :

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم هەڵی گرتم‌و بردمی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بەشایەتبە کەئەوا ئەوەمو ئەوەم لەماڵەکەم بەخشی بە نوعمانی کوڕم. فەرمووی: (ئایا گشت کوڕەکانی تریشت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟) باوکم فەرمووی: نەء. فەرمووی: (دە کەسێکی تر بکە بەشایەتی ئەمە، من شایەتی وانادەم). لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەزیش ئەکەی کە کوڕەکانت هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟). باوکم فەرمووی: (بەڵێ). فەرمووی: (کەواتە نابێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٩٥٨ ج/٤}.

١٠٤٩- عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: أَعْطَانِي أَبِي عَطِيَّةً فَقَالَتْ عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّي أَعْطَيْتُ ابْنِي مِنْ عَمْرَةَ بِنْتِ رَوَاحَةَ عَطِيَّةً فَأَمَرَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (أَعْطَيْتَ سَائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هَذَا؟) قَالَ: لا قَالَ: (فَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُمْ) قَالَ: فَرَجَعَ فَرَدَّ عَطِيَّتَهُ) (الحديث ٢٥٨٧): [١٠٤٩]

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکم بەخششێکی پێم داو عەمرەی کچی ڕەواحە کە دایکی منە، بەباوکمی گوت: بەوەندە ڕازی نابم کە تۆ ئەو شتەت بەخشیوە بە نوعمانی کوڕم، بۆ دڵنیایی تەواو دەبێ بیبەی بۆ لای پێغەمبەرو پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بکەی بەشایەت

---

[١٠٤٩] تجرید/٣، ژمارە: ١١٠٤ = ٢٥٨٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٩٠ و ژمارە: ٩٩١ - ٤١٥٧، ٤١٦١ شیحا. (بخاری ژمارەی کتاب/٥١ ژمارەی باس/١٣).

لەســەر ئــەم پــێ بەخــشینە، جـا بــاوکم هــەڵی گــرتەو بردمــی بــۆ لای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەم کە لەعەمرەی ژنمە خەڵاتێکم پێ بەخشیوە، عـەمرە داوای لـێ کـردوم کـە تـۆ لەسەر ئـەم پێ بەخـشینە بکـەم بەشـایەت. فـەرمووی: (ئایـا هـەموو منالـّەکانی تریشت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟) باوکم فەرمووی: نـەء. پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (دەنـابێ کەسێـکی تـر بکـە بەشـایەتی ئەمـە مـن شایەتیوا نارەوا نادەم).

لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەزیش دەکەی کە هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟) باوکم گوتی: بەلـێ. فەرمووی: (کەواتە نابێ) ئەوجا خۆشەویـست(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (دەی لـە خـودا بترسـنو بـێ فـەرمانی مەکـەنو بەیەك چاو تەماشـای هـەموو منالـّەکانتان بکـەن، چونکە خـوا وای پـێ خۆشـە) فـەرمووی: جـا بـاوکم لـە بەخشیـشەکەی پەشـیمان بـووەو لـەمنی سـەندەوە. (تاج/٣/٣-ف-٢-ش/د/ت = تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٩٥٨ ج/٤).

## (٤) باب العُمْرى

### باسی عومرا وانە: شتێ بدا بە کەسێ تا ماوەی تەمەنی تەواو دەبێ

١٠٥٠- عَنْ جَابِرٍ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ قَـضَى النَّبِـيُّ(صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بِالْعُمْرَى أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ) (الحديث ٢٦٢٥): [(١٠٥٠)]

جابیر(ڕەزای خوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بێ) بڕیاری داوە ئەگەر کەسێ شتێ ببەخشێ بەکەسێ، پێی بڵێ: کە هەتا مـاوی

---

(١٠٥٠) تجریـد/٢، ژمـارە: ١١١٤ = ٢٦٢٥ بخـاری. مـسلم/٤١٦٤ شـیحا. (بخـاری رقـم الکتـاب/٥١ رقـم الباب/٣٢).

ئـەم شـتـە بـۆ تـۆبێ، ئـەوە دەبـێ بـەھی ئـەو كەسـە كـە پێـی بەخـشراوە، پـاش مردنیشی ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنی پێشووی، بەڵكو دەبێ بـەھی كەلـەپوور گرانـی پێبەخـشراوەكە. (تـاج/٣٧١/٢، زنجـیرە: ١٧٩، ژمـارە: ١٩٤٢ ج/٤ - باسـی عـومراو روقبا).

١٠٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليـه وسـلم) قَـالَ: «الْعُمْرَى جَائِزَةٌ»: [١٠٥١]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كرداری عومرا دروستەو دامەزراوە).

---

[١٠٥١] بخاری: ٢٦٢٦. مسلم: ٤١٧٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥١ رقم الباب/٣٢).

## ٢٥- كِتَابُ الوَصِيَّةِ
## نامەی ڕاسپێری (وەسێت)

١٠٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ ) (الحديث ٢٧٣٨): [١٠٥٢]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ کە بیەوێ ڕاسپێریی(وەسێت)ی بۆ بکا، هەق وایەدووشەوی بەسەردا تێنەپەڕێ هەتا وەسێتنامەکەی بەنووسراوەیی لەلای خۆی دا دەنێ). (تاج/٣/٢٥-١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١٩٩٧ - ش/د/ت ن.باسی ڕاسپێری).

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە بوو، لەژمارە (١١٣٦ = ٢٧٣٨)ی پوختەی بوخاریو مفردی بوخاریدا، ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لەژمارە (٩٨١ = ٤١٨٣)ی پوختەی موسلیمو لە صەحیحی موسلیمدا، ژمارە دانانی شیحا:

عَنْ سَالِمٍ عَنْ ابن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ ثَلاَثَ لَيَالٍ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: مَا مَرَّتْ عَلَيَّ لَيْلَةٌ مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ ذَلِكَ إِلاَّ وَعِنْدِي وَصِيَّتِي. {الحديث: ٤١٨٣ = ٤١٧٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٣٦ = ٢٧٣٨. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٢. ترمذي. جنائز: ٩٧٤} :

---

[١٠٥٢] تجرید/٣، ژمارە: ١١٣٦ = ٢٧٣٨ بخاری. مسلم: ١٦٢٧ = ٤١٨٠ ترقيم محمد فؤاد وخليل مأمون شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٥ رقم الباب/١).

**سالم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ، کەبیەوێ راسپێریی (وەسیێتی) تیابکا، هەق وایە سێ شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێ، هەتا وەسیێتنامەکەی بەنووسراوەیی، لەلای خۆی دادەنێ!)).**

**ئیبنو عومەر دەیفەرموو: ئەوەتی ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، شەو نەبووە کە راسپێری نامەکەمم لەلا نەبووبێ.**
**{تاج/٢، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١٩٩٧ ج/٤ = چاپی چوارەم – ش/د/ت/ن}.**

## (١) باب الوَصِيَّةِ بالثلث
## راسپێری بە کردنی سێیەك بە خێر

١٠٥٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي، فَقُلْتُ إِنِّي قَدْ بَلَغَ بِي مِنَ الْوَجَعِ وَأَنَا ذُو مَالٍ، وَلَا يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي ؟ قَالَ: (لَا) فَقُلْتُ: بِالشَّطْرِ ؟ فَقَالَ: (لا). ثُمَّ قَالَ: (الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَبِيرٌ أَوْ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا أُجِرْتَ بِهَا حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ). فَقُلْتُ يَارَسُولَ اللَّهِ أُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَالَ: (إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلًا صَالِحًا إِلَّا ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً ثُمَّ لَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لِأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ وَلَا تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ لَكِنْ الْبَائِسُ سَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ) (الحديث ١٢٩٥): [١٠٥٣]

---

**[١٠٥٣] تجرید/٢، ژمارە: ٦٢٢ = ١٢٩٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٨٢ = ٤١٨٥شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٣ رقم الباب/٣٧).**




سەعدی کوڕی ئەبو وقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجیماڵئاوایی، کەناسراوە بەساڵی حەججەتولوەداع (حَجَّة الوَداع)، لەمەککە نەخۆشکەوتم، کە شەنگ بووم، خەریکبووم بمرم، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هات بۆ سەردان و هەواڵ پرسیم. عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! دەمبینی کەنەخۆشی چی لێ کردووم، ماڵێکی زۆریشم هەیە، تاقە کچێکیشم هەیە کە کەلەپوورو میراتم لێ بگرێ، جادەمەوێ دووبەش لەسێ بەشی ماڵەکەم بکەم بە خێرو وەسێت و ڕاسپێری، لە پاش مردنم بۆم بکرێ بەخێر، تۆ فەرمانت چییە، شتیوا دروستە یان نا؟

فەرمووی: (نەوە دروست نیە) گوتم دە نیوەی؟ فەرمووی: (ئەویش نابێ). گوتم: دە سێ یەکێکی ؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- سێیەك دەبێ، بەلاّم سێیەکیش هەر زۆرە، کەمتر بێ باشترە، چونکە تۆ لەپاش مردنی خۆت، کەلەپوور گرەکانت بەدەوڵەمەندی و تێروتەسەلی بەجێ بهێڵیت، گەلێ لەوە باشترە کە بە هەژاری بەجێیان بهێڵی، لەپ لەم ولەو پان بکەنەوەو چاویان لە دەستی خەڵك بێ !

ئەوەیش بزانە هەرچی خەرج بکەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە، ئەوا پاداشتی باشی لەسەر وەردەگریت، تەنانەت ئەو پاروەوە نانەیش کە دەیدەیت بە ژنی خۆت، یا ئەو مەصرەفەی کە دەیکەی بۆ خێزانی خۆت، کە ژێواریان لەسەر تۆیە، ئەم جۆرە مەسرەفەیش، بەمەرجێ بە نیازی پاك بێ، ئەویش هەر خێرێکی گەورەیە).

عەرزیم کرد: قوربان ! ئەی پێغەمبەری خودا ! دەترسم لەهاوڕێکانم بەجێ بمێنم و لەم نەخۆشییەدا لە مەککە بمرم و نەگەڕێمەوە لەگەڵ ئێوەدا بۆ ڕەوگەی کۆچ و داری هیجرەتم ؟! وە ئەوەیش بۆ کۆچەکەم زیانی هەبێ ؟!

فەرمووی: (بابەجێش بمێنێ، گرنگ ئەوەیە تۆ بەنیازی پاکی خۆت دەگەی هەر کارێ بکەی، لە هەر کوێ بێ، بەمەرجێ مەبەستت ڕەزای خودا بێ پێی، ئەوە پایەوپلەت پێی بەرزتر دەبێتەوە، ئومێد دەکەم کە جارێ نەمری و بمێنی و تەمەنت درێژبێ و خوا بتکا بەمایەی خێرو خۆشی بۆ گەلی موسوڵمانان و ببی بەهۆی زیان و شکستی بۆ هۆزی کافران، ئەی خودایە ! کۆچ و هیجرەتی هاوڕێکانم گیرا بکەو پاشگەزیان مەکەرەوەو ئاخر شەڕیان مەکە، بەلاَم داخەکەم هەژارە سەعدی کوڕی خەولە لەمەککە مرد، بۆیە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەزەیی پیادا هاتەوەو دڵی پێی سووتا). (تاج/٢، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٠٠٠ ج/٤ - ش/د/ن) + (ریاض/١/١٣/٦- كوردی)

### راڤەو شیكردنەوە:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لەپاش ئەم نزایەی پێغەمبەر بۆی، چل ساڵی تر ژیا، خوا پیت و فەڕی خستە تەمەنی.

١٠٥٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَوْ أَنَّ النَّاسَ غَضُّوا مِنَ الثُّلُثِ إِلَى الرُّبعِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ ». {الحديث: ٤١٩٤ = ٤١٨٧ فم. بخاري. وصايا: ٢٧٤٣. نسائي. وصايا: ٣٦٣٦. ابن ماجة. وصايا: ٢٧١١. تحفة الأشراف: ٥٨٧٦} : [١٠٥٤]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆزگە ئەو خەڵكە لەكاتی وەسێتكردندا، لەباتی سێیەكی ماڵ كە دەیكەن بەخێر، بۆ پاش مەرگیان، چواریەكیان دەكرد بەئاخر ئەندازەی دروست بۆ راسپێری، چونكە پێغەمبەر

[١٠٥٤] بخاری. وصایا: ٢٧٤٣ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٨٣ = ٤١٩٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٥ رقم الباب/٣).

(دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (سێیەکی ماڵ بۆ راسپێری (وەسێت) دەبێ، بەڵام سێیەکیش هەر زۆرە، کەمتربێ باشترە).

## (٢) باب وصول ثَوَابِ الصَّدَقَاتِ إلى الميت
## خێرو بەخشین، پاداشەکەی دەگات بە مردوو

١٠٥٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا ، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ ، فَهَلْ لَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا قَالَ: «نَعَمْ»: [١٠٥٥]

دەقەکەی‌و واتاو وەرگەڕاوەکەی لە ژمارە (٥٨٨) لە (کتاب الزکاه)دا، لەباسی ژمارە (١٥)دا، رۆیشت. ئێستایش بۆ روونکردنەوەی زیاترو بە ئومێدی بەهرەو کەڵك‌و سوودی پتر ئەم فەرموودەیە، لە شەرحی بلوغ المرامەوە، ژمارە (٩٨٦) بەرگی دووەم، کە خودی ئەم فەرموودەیەی ئێرەیە، نەقڵ دەکەین:

وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ رَجُلاً أَتَى اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ أُمِّي اُفْتُلِتَتْ نَفْسُهَا وَلَمْ تُوصِ ، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ ، أَفَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا ؟ قَالَ: " نَعَمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. {تەجرید/٢، ژمارە: ٦٦٢ = ١٣٨٨، ٢٧٦٠ بخاری. مختصر صحیح موسلیم/٢، ژمارە: ٥٣٢ = شیحا/٢٣٢٣ + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ١٦٢، ژمارە: ٩٤٨}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سەعدی کوڕی عوبادە (رەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد، فەرمووی: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! دایکم لەناکاوا، لەپڕ، بەمەرگی کوتوپڕ مرد، فریانەکەوت کە راسپێری‌و وەسێت بکا، هەتا لەسەر راسپێری خۆی، خێری بۆبکەین، وەها دەزانم ئەگەر

[١٠٥٥] بڕوانە ژمارە (٥٨٨) کە لە (کتاب الزکاه)دا رۆیشت.

مەودای قسەکردنی ببوایە، خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی، کە لەپاش مردنی بۆی بکرێ، جا ئایا ئەگەر من ئێستا لەجیاتی خۆی، صەدەقەیێ، خێرێکی بۆ بکەم، پێی دەگاو سوودی دەبێ بۆی؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ خێری دەگا، بۆیبکە). {تاج/١، لاپەڕە: ٥٨١، زنجیرە: ٢٢٩، ژمارە: ١١٦٨، ١١٦٩ + زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٣٣، ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦، ١٣٧ + زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٥٢ + زنجیرە: ٢٢٥، ژمارە: ١١٥٥، ١١٥٦ + زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٣، ١١٦٤، ١١٦٥ + مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣٢، ٦٠٥، ٦٠٦، ١٠٠٣ + بەرگی/٢، ژمارە: ٥٧٠، ٤٨٢، ٤٨٣، ٤٨٤، ٤٧٥، ٤٧٧، ٤٧٩، ٤٦٥، ٤٥٦، ٥٠٠ + تاجول ئوصول بەکوردی/٣، لاپەڕە: ١٣٤، ژمارە: ٢٥٢٦، ٢٥٢٧، ٢٥٢٨ + مختصر صحیح البخاری بەکوردی/١، ژمارە: ١٥٩ — ڕوونکردنەوەیێ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٥٠٠ + تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٢٥ هەتا ژمارە: ١٨٢٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

بەپێی شەرحە گەورەکانو ڕاڤە نامەکانی فەرموودە، وە بەپێی ئەو فەرموودانەی کە ئێستا ئاماژەمان بۆ جێگەکانیان کرد، ئەم چەند خاڵە ڕوون دەکەینەوە {بڕوانە: شەرحی: فَتْحُ ذِي الجَلاَلِ وَالإِكْرام}:

**یەکەم:** هەر خێرو چاکەیێ، کە دەکرێ بۆ مردوو، لەڕووی ئەنجامدەریەوە، دەبن بەدوو بەشی سەرەکییەوە:

**بەشی یەکەم:** بریتین لە خزمو کەسوکاری مردووەکە، وەك منداڵی مردووەکەو وەچەو نەوەی‌و، وەك باوكو دایکی‌و، وەك براو مامی‌و ئامۆزاو، وەك خاڵو خاڵۆزاو، وەك هاوسەری‌و، وەك هەموو خزمو کەسوکارێکی تری مردووەکە، لەدوورو نزیکیان، چی لەباوکەوە بن، چی لەدایکەوە بن.

**بەشی دووەم:** بریتییە لەکەسێکی بێگانە، کە خێرێ بکا بۆ دۆستێکی مردووی خۆی، یا خێرێ بکا بۆ مردوویەکی خۆشەویستی خۆی، وەك: فەقێ عەمرەیێ بکا بۆ مامۆستایەکی خۆی کەمردبێ، یا سۆفییەك حەجێکی سوننەت بکا بۆ شێخ عەلائەددینی بیارە، یا بۆ حاجی کاك ئەحمەدی شێخ، یا بۆ ئیمامی غەزالی (رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

**دووەم:** ئەو خێرو چاکەیەی کەدەکرێ بۆ مردوو، لەرووی جۆرو چییەت (ماهیة)ی خێرەکەوە، لەچەند روویەکەوە دابەش دەکرێ، وەك: زارەکی، واتە: قەولی، وەك: کردەیی، واتە: عەمەلی. وەك: جەستەیی رووت، واتە: (جەستەیی پەتی: بَدَنی مَحْض) وەك: رۆژوو، وەك: خێری سامانی پەتی، وەك: زەکات، وەك: خێری ئاوێتەو تێکەڵ لەسامانیو جەستەیی، وەك: حەجو عەمرە.

جاپاش ئەم روونکردنەوەیە بەدڵنیاییەوە عەرزی خوێنەری ئازیز دەکەم:

١- خێری ماڵی، کە کەسوکار بیکەن بۆ مردووی خۆیان، لەلای جەماوەری زانایان، پێی دەگاتو سوودی دەبێ بۆی، وەك: ئەوە منداڵی مردووەکە، یا برای، یا دایکی، یا مامەی، گایەکی بۆبکا بەخێر، یا بیرێکی بۆ بکات بەوەقف، یا دینارێ، یا کولێرەیەکی بۆبکا بەخێر.

٢- خزمو کەسوکار دەتوانن، رۆژوو بۆ مردووی خۆیان قەزا بکەنەوە، قەرزیان بۆ بدەنەوە، حەجو عەمرە، چی سوننەت، چی فەرز، بۆ مردووی خۆیان بکەن، بەڵکوو دەتوانن نوێژیشی بۆ بگێڕنەوەو نەزری بۆ جێبەجێ بکەن.

٣- بێگانەیش دەتوانێو دروستە کە خێرێکی سامانی بکات بۆ مردوو، وەك: کەسێ قوربانی بکا بۆ حەزرەتی عائیشە، یا بیرێ بکا بەوەقف بۆ شێخ

عەبدولقادری گەیلانی، یا پردێ دروست بکاو خێرو پاداشەکەی ببەخشێ بەگیانی ئیمامی عەسقەلانی (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

٤- سەبارەت بەپەرستشی جەستەیی پەتی، وەك: نوێژو رۆژوو و خوێندنی قورئانو خەتمەی قورئانو صەڵاواتو زیکری خودا، هەروا سەبارەت بەهەموو جۆرە خێرێکی تر، کە ماڵی بێ، یا جەستەیی بێ، یا تێکەڵ بێ ئەم دوانە، چی خزم ئەنجامی بدات، وەچی بێگانە ئەنجامی بدات، لەم بارەیەوە ئیمامی ئەحمەد (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

«أَيُّ قُرْبَةٍ فَعَلَهَا الْمُسْلِمُ وَجَعَلَ ثَوَابَهَا لِمَيِّتٍ مُسْلِمٍ أَوْ (مُسْلِمٍ) حَيٍّ نَفَعَهُ».

واتە: هەر خێرێ لەهەر جۆرێ بێ، موسوڵمان ئەنجامی بدات، وە پاداشەکەی ببەخشێ بە موسوڵمانێکی مردوو، یا ببەخشێ بە موسوڵمانێکی زیندوو، سوودی دەبێ بۆی!).

هەروەها پێشەوا ئیبنو تەیمییە (رەحمەتی خودای لێ بێ) سەبارەت بەم بابەتە، بەدەق دەفەرموێ:

«قَوْلُ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ ...» لَمْ يَقُلْ إِنَّهُ لَمْ يَنْتَفِعْ بِعَمَلِ غَيْرِهِ، فَإِذَا دَعَا لَهُ وَلَدُهُ كَانَ هذَا مِنْ عَمَلِهِ الَّذِي لَمْ يَنْقَطِعْ، وَإِذا دَعَا لَهُ غَيْرُهُ لَمْ يَكُنْ مِنْ عَمَلِهِ وَلكِنَّهُ يَنْتَفِعُ بِهِ – الفَتَاوَى – ٣١٢/٢٤».

جا بۆ روونکردنەوەی پرسەکە، دەڵێم:

(پوختەی فەتواکان، کە جێگەی متمانەبێو موسوڵمان سەبارەت بەم بابەتە پشتی پێ ببەستێ، ئەمەیە: مەبەست لەو فەرموودەیەی کە لەپێشەوە لەم پەڕاوەدا لە ژمارە (٩٥١)دا رابورد، مەبەست لێی: کردەوەی باشی خۆی لەدوا مەرگی کۆتایی دێ، تەنیا لەوسێ رێگەیەوە نەبێ، کە لەفەرموودەکەدا دیاریکراون، لەبەرئەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

نەیفەرمووە: کردەوەی باشی موسوڵمانی تر، ئایا بێگانەبێ، یا خزم، سوودی نییە بۆ مردوو، لەبەرئەوە، گومان نییە لەمەدا: (کە هەرکەسێ خێرێ ئەنجام بدا، چی ماڵیو سامانی بێ، وەچی جەستەیی پەتی بێ، وەچی تێکەڵ بێ لە جەستەییو سامانی، وە خێرو پاداشەکەی ببەخشێ بە موسوڵمانێکی مردوو، سوودی دەبێ بۆی).

واباشە لەپێش ئەنجامدانی ئەو کردەوە باشەدا، نێتی وابێ کە پاداشی ئەو کردەوە باشە، بۆ فیسارە کەس بێ، وە لەکاتی دەست پێ کردن بەو کردەوە باشە، کەسەکە دیاری بکا، وەك ئەوە لەکاتی دابەستنی ئیحرامی حەج، یا عەمرەدا، بۆ مردوو بڵێ: (نێتمە ئیحرامی حەج دادەبەستم بۆ خودا، لەجیاتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەرریسو خێرو پاداشی ئەم حەجە دەبەخشم بەو).

یا کاتێ رۆژوو دەگێڕێتەوە بۆ دایکی، لەشەودا بڵێ: (نێتمە سبەینێ بەرۆژوو دەبم بۆ خوا، لەجیاتی رۆژووی قەرزی سەر دایکم).

یا بڵێ: (نێتمە دوو رکات نوێژی بەیانی دەگێڕمەوە بۆ باوکمو دەیکەم بۆ خودا ئەڵڵاهوئەکبەر).

٥- بەکۆی دەنگ، نزاو پاڕانەوەو داوای لێ خۆشبوونو تکاکردنو داوای پایەی بەرزو داوای بەهەشتو نازو بەهرەیو داوای ژیانی پڕ لەنازو نیعمەتی ناوگۆڕو داوای رزگاربوون لەهەموو مەینەتەکانی رۆژی قیامەتو قوتاربوون لە ئاگری دۆزەخو لەسزای گۆڕو لەئازاری حەشرو بەرزەخ، بەبێ هیچ گومانێ، بەکۆی دەنگ، ئەم جۆرە کارو کردەوەیانە، کە زیندوان دەیکەن بۆ مردووان، کارێ پەسەندو زۆر باشنو سونەتێکی گەورەن، بەڵکوو لەهەندێ کاتدا دەبن بەفەرزو پێویست.

## (٤) باب الوقف
## باسی شت وەقفکردن

١٠٥٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِى مِنْهُ فَمَا تَأْمُرُنِى بِهِ، قَالَ: « إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا »، قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ: أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ أَصْلُهَا وَلاَ يُبْتَاعُ وَلاَ يُورَثُ وَلاَ يُوهَبُ، قَالَ: فَتَصَدَّقَ عُمَرُ فِى الْفُقَرَاءِ، وَفِى الْقُرْبَى وَفِى الرِّقَابِ، وَفِى سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. {الحديث: ٤٢٠٠ = ٤١٩٣ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤١ = ٢٧٦٤، ٢٧٣٧، ٢٧٧٢. أبو داود. وصايا: ٢٨٧٨. ترمذى. أحكام: ١٣٧٥. ابن ماجة. صدقات: ٢٣٩٦. تحفة: ٧٧٤٢} : [١٠٥٦]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەر لەخەیبەر، زەوییەکی دەست کەوت، چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە راوێژی پێ بکا، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پارچەیێ زەویم چنگ کەوتووە لەخەیبەر، ئەوەتی هەم ماڵی وا نایابم نەبووە، دەمەوێ بیکەم بەخێر، تۆ دەفەرمووی بیکەم بەچی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر حەزدەکەی خۆی بکە بەوەقفو دەرامەتەکەی بکە بەخێر!).

جا عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەر ئەم شێوەیە کردی بەخێر: جێ زەوییەکە خۆی نە دەفرۆشرێ، نەدەکڕرێ، نەبە کەلەپوور دەبرێ، نە دەبەخشرێ، فەرمووی: عومەر دەرامەتەکەی وەقف کرد لەسەر ئەم کەسانە:

---

[١٠٥٦] تجرید/٣، ژمارە: ١١٤١، کە بە هەڵە نوسراوە (١٠٤١) = ٢٧٦٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٠٠ = ٤٢٠٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٤ رقم الباب/١٩).

لەسەر هەژاران‌و خزم‌و خوێشان‌و لەڕێی ئازادکردنی کۆیلەداو لەڕێگەی خوداداو لەسەر ڕێبوارو میوان، وە ئەو کەسەیشی کە سەرپەرشتی ئەو وەقفە دەکا، گوناهی لەسەر نییە ئەگەر بەشێوەیەکی پەسەند خۆی لێی بخوا، یا دەرخواردی دۆست‌و برادەری بدا، بەمەرجێ لێی نەکا بە ماڵ‌و بیکا بەهی خۆی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ١٩٥٣ — ش/د/ت/ن}.

ئەمە دەقی ژمارە (١٠٠٠)ی پوختەی موسلیم بوو، لە ئەصڵەکەدا ئەمەی پترە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەون (کە یەکێکە لە بگێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: بە ئیبنو سیرینم گوت: نافیع دەفەرموێ: (......غَيْـرِ مُتَمَـوِّلٍ) موحەممەد، کە ناسراوە بە ئیبنو سیرین، فەرمووی: (غَيْـرِ مُتَأَثِّـلٍ) لەباتی (غَيْـرِ مُتَمَـوِّلٍ) کە واتای هەردوو بێژەکە یەك شتە.

## (٥) باب ترك الوَصيَّةِ لِمَنْ لَيْسَ لَهُ شَيءٌ يُوصى فِيهِ
## کەسێ هیچی نەبێ، کە ڕاسپێری لە بارەیەوە بکات، ڕاسپێریی لەسەر نیە

١٠٥٧- حديث عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى عن طَلْحَةُ بْنُ مُصَرِّفٍ قَالَ سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى (رضى الله عنهما) هَلْ كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَوْصَى فَقَالَ لاَ. فَقُلْتُ كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الْوَصِيَّةُ أَوْ أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ قَالَ أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ. (١٠٥٧)

(١٠٥٧) تجرید/٣، ژمارە: ١١٣٨ = ٢٧٤٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٨٤ = ٤٢٠٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٥ رقم الباب/١).

گەرچی دەقی ئەصڵەکە لە بوخاری وەرگیراوە، ژمارە (١١٣٨)ی پوختەی بوخارییە، بەڵام لەبەر بەهرەی پتر، دەقی ژمارە (٩٨٤)ی پوختەی موسلیم دەنووسین، کە دەفەرموێ:

عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): هَلْ أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَقَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَلِمَ كُتِبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْوَصِيَّةُ أَوْ فَلِمَ أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. {الحديث: ٤٢٠٣ = ٤١٩٦ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١١٣٨ = ٢٧٤٠، ٤٤٦٠، ٥٠٢٢. ترمـذي. وصايا: ٢١١٩. نسائي. وَصَايا: ٣٦٢٢. ابن ماجة. وصايا: ٢٦٩٦. تحفة الأشراف: ٥١٧٠}:

طەلحەی کوڕی موصەرریف (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفام پرسی: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاسپێری و وەسێتی کرد بۆ پاش مەرگی؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیمکرد: ئەی باشە ئەی چۆن وەسێت و ڕاسپێریی لەسەر موسوڵمانان داناوە؟ فەرمووی: وەسێت و ڕاسپێریی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئۆمەتی ئەوەبوو کە کارو ڕەفتار بە قورئان بکەن کەنامەی نووسراوی خودایە).

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەچۆنێتیی ئەم ڕاسپێرییەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٧٠، ٧١، ٧٣، ٧٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٥٨١ + تاج/٤، زنجیرە: ٧٦ + تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٣٤٣}:

١٠٥٨- عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: ذَكَرُوا عِنْدَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ عَلِيًّا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ وَصِيًّا، فَقَالَتْ مَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟! فَقَدْ كُنْتُ مُسْنِدَتَهُ إِلَى صَدْرِي (أَوْ قَالَتْ حَجْرِي)، فَدَعَا بِالطَّسْتِ، فَلَقَدِ انْخَنَثَ فِي حَجْرِي، وَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُ مَاتَ،

فَمَتَى أَوْصَى إِلَيْـهِ)؟ {الحديث: ٤٢٠٧ = ٤٢٠٠ فـم. بخـاري. شـروط: ٢٧٤١، ٤٤٥٩. نسائي. وصايا: ٣٦٢٤. تحفة الأشراف: ١٧٥٥١}: [١٠٥٨]

ئەسوەدی کوڕی یەزید فەرمووی: لەلای حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) باسی ئەوەیان بۆیکرد: کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕاسپێرراوی پێغەمبەر بێ بۆ جێنشینی لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ عائیشە فەرمووی: ئەمە کەی ئەم ڕاسپێرییەی کردووە بۆی؟! ئەی بۆ من ئاگام لێی نییە؟ لەکاتی سەرەمەرگا، پێغەمبەر لەباوەشی منابوو، سەریم نابوو بەسینگمەوە، لەوکاتە ناسکەدا داوای تەشتێکی کرد، تاتفی تێبکا، هەرئەوەندەم زانی کە لەشی شل بوو، خاوبۆوە لەباوەشما، نەمزانی چۆن گیانی دەرچوو، کەواتە ئیتر ئەم ڕاسپێرییەی کەی کردووە بۆی؟!

١٠٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضـي الله عنهمـا) أَنَّـهُ قَـالَ يَـوْمُ الْخَمِـيسِ ، وَمَـا يَـوْمُ الْخَمِيسِ ثُمَّ بَكَى حَتَّى خَضَبَ دَمْعُهُ الْحَصْبَاءَ فَقَالَ اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسلم) وَجَعُهُ يَوْمَ الْخَمِيسِ فَقَالَ « ائْتُونِى بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًـا لَـنْ تَـضِلُّوا بَعْـدَهُ أَبَدًا » . فَتَنَازَعُوا وَلاَ يَنْبَغِى عِنْدَ نَبِىٍّ تَنَازُعٌ فَقَالُوا هَجَرَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم). قَالَ: « دَعُونِى فَالَّذِى أَنَا فِيهِ خَيْرٌ مِمَّا تَدْعُونِى إِلَيْـهِ » . وَأَوْصَـى عِنْـدَ مَوْتِـهِ بِثَلاَثٍ « أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِـنْ جَزِيـرَةِ الْعَـرَبِ ، وَأَجِيـزُوا الْوَفْـدَ بِنَحْـوِ مَـا كُنْـتُ أُجِيزُهُمْ » . وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ: [١٠٥٩]

لە پوختەی موسلیما ئاوایە، ژمارە (٩٨٧) بەهرەی پترە:

---

[١٠٥٨] بخاری. شروط/٢٧٤١ پوختەی موسلیم: ٩٨٦ = ٤٢٠٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٥ رقم الباب/١).

[١٠٥٩] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٤٥ = ٣٠٥٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٨٧ = ٤٢٠٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٧٦).

عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): يَوْمُ الْخَمِيسِ وَمَا يَوْمُ الْخَمِيسِ؟ ثُمَّ بَكَى حَتَّى بَلَّ دَمْعُهُ الْحَصَى، فَقُلْتُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! وَمَا يَوْمُ الْخَمِيسِ؟ قَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَجَعُهُ فَقَالَ: « ائْتُونِى أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لاَ تَضِلُّوا بَعْدِى فَتَنَازَعُوا، وَمَا يَنْبَغِى عِنْدَ نَبِىٍّ تَنَازُعٌ»، وَقَالُوا: مَا شَأْنُهُ أَهَجَرَ؟ اسْتَفْهِمُوهُ، قَالَ: « دَعُونِى فَالَّذِى أَنَا فِيهِ خَيْرٌ، أُوصِيكُمْ بِثَلاَثٍ: أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ »، قَالَ: وَسَكَتَ عَنِ الثَّالِثَةِ أَوْ قَالَهَا فَأُنْسِيتُهَا. {الحديث: ٤٢٠٨ = ٤٢٠١ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١٢٤٥ = ٣٠٥٣، ١١٤ فتح الباري. أبو داود. خراج: ٣٠٢٩}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئای لەو ڕۆژی پێنج شەممەیە چۆن ڕۆژی پێنج شەممەیە بوو؟ ئەوجا ئیبنو عەبباس زۆر گریا، هەتا بەفرمێسك زیخو چەوی بەرپێی خۆی تەڕکرد!

جا عەرزیمکرد: قوربان! ئەی ئیبنو عەبباس! کام ڕۆژی پێنج شەممەیەت مەبەستە، کەوا بەیادی واپەرێشانی؟ فەرمووی: لەڕۆژی پێنج شەممەدا، نەخۆشییەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو کەشەنگ بوو، فەرمووی: (نامەیەکم بۆ بهێنن، هەتا نامەیەکتان بۆ بنووسم، ئیتر لەپاش ئەو وەسیەتنامەیە، وەلەپاش مەرگی من، هەتا هەتایە ڕێگەی ڕاست وون ناکەنو سەرتان لێ ناشێوێ) بەڵام هاوەڵان لەناو خۆیانا بوو بەهەرایان، خزمەتی پێغەمبەرانیش، بەتایبەتی لەکاتی واناسکا، شوێنی مشتومڕو بگرەو بەردەو شوێنی هەراو هۆریا نییەو نابێ شتی وا ڕووبدا).

ئەوەبوو هەندێ کەس گوتیان: ئەوە چییە، دەڵێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر سەختی نەخۆشینەکەی وڕێنە دەکاو قسە

دەبڕسكێنیێ؟ ئادەی داوای روونكردنەوەی لێ بكەن كەمەبەستی چییە! حەزرەت (دروودو سڵاوی خودای لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو باوكو دایكو هەستو نەست هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: (كەوای لێ هات! لێم گەڕێن باخەریكی حاڵی خۆم بمو خۆم ئامادە بكەم بۆ شادبوون بەخزمەتی پەروەردگارم، ئەم حاڵەی خۆم گەلێ باشترو چاكترە لەمەی كەئێوە لەمنتان دەوێ!). فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم سێ راسپێرییەتان بۆ دەكەم: یەكەم: فرە خواكان لەدوورگەی عەرەب دەركەنو مەهێڵن دوورگەی عەرەب، فرە خوا (موشریك)ی تیادانیشێ. دووەم: وەك خۆم بەجوانی نوێنەر (وەفد) بەڕێ بكەنو خەڵاتیان پێ بدەن...). ئیبنو عویەینە فەرمووی: سولەیمان فەرمووی: سەعیدی كوڕی جوبەیر باسی راسپێری سێیەمیانی نەكرد، یائەو ناوی راسپێری سێیەمیشی هێناو باسی كرد، بەڵام من لەیادم نەماوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٤٥٦٥ ج/٤ + تەجرید/١، رقم: ٩٣ = ١١٤، ٣٠٥٣، ٣١٦٨، ٤٤٣١، ٣٢٤٤، ٥٦٦٩، ٧٣٦٦ = فتح الباری شرح صحیح البخاری}.

١٠٦٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهما) قَالَ لَمَّا حُضِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) وَفِي الْبَيْتِ رِجَالٌ ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلی الله علیه وسلم) « هَلُمُّوا أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لاَ تَضِلُّوا بَعْدَهُ » . فَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) قَدْ غَلَبَهُ الْوَجَعُ وَعِنْدَكُمُ الْقُرْآنُ ، حَسْبُنَا كِتَابُ اللَّهِ . فَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْبَيْتِ وَاخْتَصَمُوا ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ قَرِّبُوا يَكْتُبُ لَكُمْ كِتَابًا لاَ تَضِلُّوا بَعْدَهُ . وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ غَيْرَ ذَلِكَ ، فَلَمَّا أَكْثَرُوا اللَّغْوَ وَالاِخْتِلاَفَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) « قُومُوا » . قَالَ

عُبَيْدُ اللَّهِ فَكَانَ يَقُولُ ابْنُ عَبَّاسٍ إِنَّ الرَّزِيَّةَ كُلَّ الرَّزِيَّةِ مَا حَالَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَبَيْنَ أَنْ يَكْتُبَ لَهُمْ ذَلِكَ الْكِتَابَ لاِخْتِلاَفِهِمْ وَلَغَطِهِمْ. (١٠٦٠)

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ لە نەخۆشی سەرەمەرگا، پێغەمبەر گەیشتە حاڵی گیانەڵا، لەودەمەدا کۆمەڵێ پیاو لەوێ بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی وەرن با وەسێتنامەیەکتان بۆ بنووسم، هەتا لەپاش مەرگی من سەرتان لێ نەشێوێ).

جا هەندێ پیاو گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا دەرئەکەوێ، ئێش و ئازارەکەی زۆری بۆ هێناوە، با زیاتر باری گران نەکەین، بە نووسینی ڕاسپێرینامەو شتی وا، وەلحاڵ ئێمەی گەلی ئیسلام، قورئان کە نامەی خودایە، واین لەخزمەتیدا، لەمبارەیەوە قورئانمان بەسە کە نامەی خودای گەورەیە، کە چارەسەری هەموو کێشەکانی واتیادا).

جا ئامادەبوانی ناو هۆدەکە، بوون بەدوو دەستەوە، دەستەیەکیان دەیانگوت: (کاغەزو دوێتی بۆ بهێنن، تا ئەو نامەیەتان بۆ بنووسێت، کە لەپاش مەرگی خۆی هەتا هەتایە سەرتان لێ ناشێوێ، هەندێ تریان شتێ تریان دەگوت لەم بارەیەوە، جا کە غەڵبە غەڵبو ڕاجیایی زۆر پەیدابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەستن بڕۆن دەورم چۆڵکەن!).

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، فەرمووی: ئیبنو عەبباس فەرمووی: (نەگبەتییەکە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە نەیهێشت پێغەمبەر، ئەو

---

(١٠٦٠) تجرید/١، ژمارە: ٩٣ - ١١٤ بخاری. مسلم: وصایا/ ٤٢٠٨، ٤٢٠٩، ٤٢١٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٨٣).

راسپێرینامەیە بنووسێ، کە بەهۆی ئەو قڕە قڕو غەڵبە غەڵبو راجیایی‌یەوە روویدا).

ئەمەیش دەقی گێڕانەوەی ژمارە (٩٣)ی پوختەی بوخارییە، کە بریتییە لە ژمارە (١١٤)ی صەحیحی بوخاری، بۆ روونکردنەوەو بەهرەی پتر ئەویش دەنووسین:

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ(رضي الله عنهما) قَالَ: (لَمَّا اشْتَدَّ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعُهُ قَالَ ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَا تَضِلُّوا بَعْدَهُ قَالَ عُمَرُ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَلَبَهُ الْوَجَعُ وَعِنْدَنَا كِتَابُ اللَّهِ حَسْبُنَا فَاخْتَلَفُوا وَكَثُرَ اللَّغَط قَالَ قُومُوا عَنِّي وَلَا يَنْبَغِي عِنْدِي التَّنَازُعُ). (الحديث ١١٤ ـ أطرافه في: ٣٠٥٣، ٣١٦٨، ٤٤٣١، ٣٢٤٤، ٥٦٦٩، ٧٣٦٦):

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنەخۆشی سەرەمەرگا، کاتێ نەخۆشیەکەی کەشەنگ بوو فەرمووی: (قەڵەمو کاغەزم بۆ بێنن بانامەیەکتان بۆ بنووسم، پێداویستی ئەم قۆناغە ناسکەی پاش خۆمتان بۆ رون بکەمەوە، ئیتر لەپاش نووسینی ئەو نامەیە لەم لایەنەوە سەرتان لێ ناشێوێ!)

عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئازارەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆری بۆی هێناوەو تەواو کەشەنگی کردووە، وەکی تریش نامەی خودای گەورە کەقورئانی پیرۆزە، کەچرای رۆشنی دەستمانە واین لە خزمەتیدا، خوا یاربێ بۆ چارەسەرکردنی هەرکێشەیێ کەلەمەولا ڕووبدا قورئانمان بەسە، ئیتر بۆچی لەم کاتی ئێش‌و ئازارەدا بەنووسینی نامەو شتی وا زیاتر ئێش‌و ئازاری حەزرەت بدەین!.




ئیتر یاران بوون بەدوو بەرەو، دەستەیەکیان دەیانگوت: بانامەکەمان بۆ بنووسێ، دەستەیەکیشیان دەیانگوت: پێویست ناکا، لەهەمان کاتا بوو بەدەنگە دەنگو هەراوزەنا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەورم چۆڵ کەن لای من شوێنی ئەم کێشمە کێشمەیە نییە!).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) کاتێ ئەم فەرموودەیەی بۆ عوبەیدوڵلا گێڕایەوە، تەشریفی هەڵسا لەشوێنەکەی خۆیو ڕۆیشتە دەرەوەو فەرمووی: (سەرچاوەی کۆسپو کۆستو کارەساتەکانی گەلی ئیسلام گشتی دەگەڕێتەوە بۆئەوە کەئەو نامەیەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نەنووسرا).

## ٢٦- كِتَاب النَّذْر
## نامەی نەزرکردنو ئاهکردن

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ١٠٢٢، زنجیرە: ٣٧٨ چاپی ئێران هەتا زنجیرە: ٣٨٢ + بڕیاری نەزر = زنجیرە: ٣٨٣ هەتا زنجیرە: ٣٨٦ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣٠٥، چ/١، زنجیرە: ٨٦ — نامەی سوێندو نەزرکردن + تاج/٣، لاپەڕە: ١٢٠، زنجیرە: ١٢٣، لە ژمارە: ٢٤٩٨ هەتا ژمارە: ٢٥٤٨، لە زنجیرە: ١٢٣وە هەتا زنجیرە: ١٣٥ + مختصر صحیح مسلم/٢، لاپەڕە: ٥١٣، زنجیرە: ٧٨٦/٢٣ هەتا زنجیرە: ١٠٠٩ + زنجیرە: ٧٩٢/٢٤، لە ژمارە: ١٠٠٢وەوە هەتا ژمارە: ١٠٢٠} + {شەرحی بلوغ المرام/٣ لەژمارە: ١٣٨٦ هەتا ژمارە: ١٤٠٩} .

### (١) بابُ الأمْرِ بِقَضَاءِ النَّذْرِ
### فەرمانکراوە بە جێبەجێکردنی نەزرکراو

١٠٦١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ (رضى الله عنه) اسْتَفْتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ . فَقَالَ: « اقْضِهِ عَنْهَا »:[١٠٦١]

لەژمارە (١٠٠٣)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ

---

[١٠٦١] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٥٥ = ٦٦٩٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٠٣ = ٤٢١١ (بخاری رقم الکتاب/٥٥ رقم الباب/١٩).

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « فَاقْضِهِ عَنْهَا ». {الحديث: ٤٢١١ = ٤٢٠٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٥٥ = ٦٦٩٨، ٢٧٦١، ٦٩٥٩ فتح الباري} :

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی عوبادە (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەری پرسی: دایکم نەزرێکی لەسەر بوو، لەپێش ئەوەدا کە جێبەجێی بکا مرد، ئایا دەبێ ئێستا من خۆم بیگێڕمەوە بۆی؟ فەرمووی: (بەڵێ دەبێ، ئێستا تۆ خۆت بۆی بگێڕەرەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ٢٥٢٦} .

کەسێ هەر خێرێ نەزر بکا، وەك بڵێ: ئاه بێت سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم بۆ خودا، یا بڵێ: مەرج بێ بەندەیەك ئازاد بکەم، یا بڵێ: نەزر بێ ئەوەندە پارە ببەخشمەوە، یا نەزر بێ خەتمەیێ قورئان بکەم، یا هەر ئاهو نەزرێکی تر بکا، وە لە پێش مردنیدا جێبەجێی نەکا، لەبەر هەر هۆیێ، ئەوە دروستە لەپاش مردنی ئاهکارەکە، ئاهەکەی بۆ جێبەجێ بکرێو بۆی قەزا بکرێتەوە.

## (٢) باب النَّهيِ عَنِ النَّذرِ وَأنَّهُ لا يَرُدُ شَيْئاً
## نەهیی کردن لە نەزر، چونکە چارەنووس ڕەت ناکاتەوە

١٠٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ نَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ النَّذْرِ قَالَ « إِنَّهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»:[١٠٦٢]

ئەم فەرموودەیە گێڕانەوەکانی زۆرن، کۆمەڵێکیان لێ ڕاگوێز دەکەین بۆ پاڵپشتی باسەکە، لە پوختەی موسلیم، ژمارە (١٠٠٦)دا ئاوایە:

---

[١٠٦٢] بخاری. قدر: ٦٦٠٨، ٦٦٩٣ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٠٧ = ٤٢١٩شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٢ رقم الباب/٦).

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّهُ نَهَى عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: « إِنَّهُ لاَ يَأْتِي بِخَيْرٍ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ ». {الحديث: ٤٢١٥ = ٤٢٠٨ فم}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لەنەزر کردن، وە دەیفەرموو: (چونکە خودی نەزرەکە خۆی بەبێ چارەنووسی خودایی، هیچ خێرێ ناهێنێ بۆ نەزرکار، بەلاّم ویستی خودا وایە کە بەهۆی نەزرەوە، خێرو بەخشین لەچنگی مرۆڤی رژدو چرووك دەربهێنرێ). {تەجرید/٥، ژمارە: ٢٠٤٥ = ٦٦٩٤ + بخاری. قدر: ٦٦٠٨ + تاج/٣، لاپەڕە: ١٣١، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٢٥٢٠، ٢٥٢١}.

لە پوختەی موسلیم ژمارە (١٠٠٧)دا ئاوایە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « إِنَّ النَّذْرَ لاَ يُقَرِّبُ مِنِ ابْنِ آدَمَ شَيْئًا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ قَدَّرَهُ لَهُ، وَلَكِنِ النَّذْرُ يُوَافِقُ الْقَدَرَ فَيُخْرَجُ بِذَلِكَ مِنَ الْبَخِيلِ مَا لَمْ يَكُنِ الْبَخِيلُ يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَ ». {الحديث: ٤٢١٩ = ٤٢١٢ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٥ = ٦٦٩٦ فتح الباري}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو شتەی کەخودا نەینووسیبێ لەچارەی ئادەمیزاد، بەشت نەزرکردن بۆی نابێ، بەلاّم وادەبێ کەزۆر جاران کە نەزرەکە لەگەڵ چارەنووس یەك دەگرێو شتەکە روو دەداتو ئادەمیزاد وادەزانێ کە ئەوە لەبەر نەزرەکەی ئەو رووی داوە، جا بەهۆی ئەمەوەو لەسەر ئەم بنیاتە، بەنەزر شت لەپیاوی پیسکەو چرووك دەکێشرێتەوە، بەلاّم ئەگەر وانەبوایە ئەو پیسکەیە ئەو خێرو نەزرەی نەدەکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٠، لاپەڕە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٢١}.

**له پوختەی بوخاری ژماره (٢٠٤٥) بەرگی/٥ ئاوایه:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ النَّـذْرَ لَـا يُقَرِّبُ مِن ابْنِ آدَمَ شَيْئًا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ قَدَّرَهُ لَهُ وَلَكِنِ النَّذْرُ يُوَافِقُ الْقَدَرَ فَيُخْـرَجُ بِـذَلِكَ مِنَ الْبَخِيلِ. (الحديث ٦٦٩٤):

**ئەبو هوریره (رەزای خـوای لیّ بـیّ) فـەرمووی: پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسەر بێ- فەرمووی: (خوای گەوره دەفەرمویٚ: ئەو شتەی کەخودا نەینووسیبیّ لەچارەی ئادەمیزاد، بەشت نەزرکردن بۆی نابیّ، بـەلاّم وادەبـیّ نەزرەکـه لەگـەلّ چاره نووسـەکه یـەك دەگـریّو شـتەکه روودەدات‌و ئـادەمیزاد وادەزانـیّ کەئـەوه لەبەر نەزرەکەی ئەو رووی داوه، جا بەهۆی ئەمەوەو لەسـەر ئـەم بنیاتـه، شـتی له پیاوی پیسکەو چرووك پیّ دەردەهێنم، چونکه ئەگەر وانەبیّ ئەو کابرا رژدو چـرووکه خێـرو نـەزرناکا). (تـاج/٣ ل/ ٣٣٤ ژ/٢+١ ز/١٣٠، تـاج/٢، زنجـیره: ١٣٠، ژماره: ٢٥٢٠، ٢٥٢١ - باسی نەزر).**

## ڕوونکردنەوە:

**مامۆستای عەسقەلانی لـەطـەرەفـی ئـەم فەرموودەیـەدا کـەژماره/(٦٦٩٤)ە، کەوا له ل/٤٣٣ ج/١٣ و ل/٤٣٨ دا دەفەرمووێ: ( هذا من الأحاديث القدسية ولكن سـقط منـه التـصريح بنِـسْبَتِهِ إلى الله) واتـه: ئەمـه فـەرموودەی قودسـی یـەو فەرمایشتی خوای گەورەیه، بەلاّم دانەپالّ خودای لیّ پەڕیوه.**

١٠٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم ): « لاَ يَأْتِي ابْنَ آدَمَ النَّذْرُ بِشَيْءٍ لَمْ يَكُنْ قُدِّرَ لَهُ ، وَلَكِنْ يُلْقِيهِ النَّذْرُ إِلَى الْقَدَرِ قَدْ قُدِّرَ لَهُ ، فَيَسْتَخْرِجُ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ ، فَيُؤْتِي عَلَيْهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُؤْتِي عَلَيْهِ مِنْ قَبْلُ »: [١٠٦٣]

مەبەست لێی لەژمارەکانی پێشیدا روونکرایەوە. لێرەدا ئێستێ دەکەین‌و دەڵێین:

(نەزرکردن بە نیازی شیفاو رزگار بوون لە گیروگرفتی ژیان‌و بە نیازی هاتنەدی مرازو ئاوات، کارێ باشەو بە ئەزموون دەرکەوتووە کە لە کاتی وادا سوودی زۆری هەیە، وە پیاوچاکانی نەتەوەی ئیسلام‌و سەرجەمی موسوڵمانان، لەسەرەتای ئیسلامەوە هەتا ئێستاو لە ئێستاشەوە هەتا نزیکی قیامەت کاری وا، بە دڵنیایی تەواوەوە ئەنجام دەدەن، وە ئەوەیشی کەوا لەبەرچاو نەزرکارەکان سوودو بەهرە لە ئاهو نەزرەکەیان وەردەگرن‌و زۆرینەی کات خودا مرازیان دەدات‌و ئاواتیان دێتە دی!

جا لەبەر ئەوەو لەبەر رۆشنایی ئەو روونکردنەوانەی کە لە پەراوە راڤە نامە گەورەکاندا بێژراون، بە دڵنیایی تەواوە، عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم، کە بە هۆی رواڵەتی ئەم جۆرە فەرموودانەوە، دڵیان لە کردنی نەزر، بۆ دەفعی بەڵاو بۆ جەلبی خێرو بێر سارد نەبێتەوە، وە هەمیشە هەوڵ بدەن کە ئەم یاسایە، لە ژیانیاندا پەیرەوی بکەن: (الصَّدَقَةُ تَسُدُّ سَبْعِينَ بَاباً مِنَ السُّوْءِ: واتە: خێرو بەخشین دەرگای حەفتا جۆر لە شەڕ دادەخەن).

---

[١٠٦٣] تجريد/٥، ژمارە: ٢٠٤٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٠٧ = ٤٢١٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٣ رقم الباب/٢٦).

## (٤) باب مَنْ نَذَرَ أنْ يَمْشِيَ إلَى الكَعْبَةِ
## کەسێ ئاهـ بکا کە بە پێ بچێ بۆ سەردانی کەعبە

١٠٦٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى شَيْخًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: « مَا بَالُ هَذَا؟». قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ عز وجل عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ »، وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ. {الحديث: ٤٢٢٣ = ٤٢١٦ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٥٢ = ١٨٦٥ ، ٦٧٠١. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٣٠١. ترمذي. نذور وأيمان: ١٥٣٧. نسائي. أيمان ونذور: ٣٨٦١. تحفة الأشراف: ٣٩٢} : [١٠٦٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیرە مێردێکی بینی، خۆی دابوو بەسەر شانی دوو کوڕی خۆیدا، بەلارە لارە خۆی بەکێش دەکرد، لەبەر بێ هێزی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە چییە بۆ وادەکا؟) کوڕەکانی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! نەزری کردووە کە بەپێ بڕوا بۆ خانەی خودا، ئەمەیش حاڵیەتی. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی پیرەمێرد! سواربەو بەسواریی بڕۆ بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەت، خودا هەوەجێی بەتۆو بەنەزری تۆ نییە، وەهەوەجای بەوەنییە کە ئەم ئیختیارە ئاوا سزاو ئازاری خۆی بدا). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٣٦، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٣٠ ج/٤} .

١٠٦٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ حَافِيَةً، فَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَاسْتَفْتَيْتُهُ فَقَالَ: « لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ ». {الحديث: ٤٢٢٦ = ٤٢١٩ فم. تجريد/٢، رقم:

---

[١٠٦٤] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٢ = ١٨٦٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٠٥ = ٤٢٢٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٨ رقم الباب/٢٧).

٨٥٣ = ١٨٦٦. أبـو داود. أيمـان ونـذور: ٣٢٩٩. نـسائي. أيمـان ونـذور: ٣٨٢٣. تحفـة الأشراف: ٩٩٥٧} : [١٠٦٥]

عوقبەی كوڕی عامیر (رەزای خودای لیّ بیّ) فـەرمووی: خوشـكێكم نـەزری كردبوو كە بەپێی پەتی بڕوا بۆ خانەی خودا، وەگوتی بەمن كە بۆ ئەمە پرسـی بۆ بكەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا كاتـێ پرسـیارم لێـی كـرد لــەم بارەیــەوە، فــەرمووی (دروودی خــودای لەســەر بــێ): (بــا بــەپیادەیش‌و بەسواریش بڕوا بۆ جێبەجێكردنی نەزرەكەی).

## ڕوونكردنەوە:

ئەگەر لەباری وادا پێلاویش لەپێ بكا قەیناكا.

---

[١٠٦٥] تجرید/٢، ژمارە: ٨٥٣ - ٤٢٣٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٨ رقم الباب/٣٧).

## ٢٧- كِتَابُ الأَيْمَانِ
## نامەی سوێندو سوێندخواردن

بڕوانە: سەرەتای نامەی نەزر، کە ڕاستەوخۆ والەپێش ئەم نامەیەوە.

### (١) باب النَّهْى عَنِ الحلف بِغَيْرِ اللهِ تَعَالى
### سوێند دەبێ تەنیا بە خودای گەورە بێ‌و بەس

١٠٦٦- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ »، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى عَنْهَا، ذَاكِرًا، وَلاَ آثِرًا. {الحديث: ٤٢٣٠ = ٤٢٢٣ فم. بخاري. أيمان ونذور: ٦٦٤٧، ٦١٠٨. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٥٠. نسائي. أيمان ونذور: ٣٧٧٦. تحفة الأشراف: ١٠٥١٨} : [١٠٦٦]

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشت بەدەستەیێ سوار، عومەریان تیابوو، لەوکاتەدا عومەر سوێندی بەباوکی دەخوارد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی لێکردن‌و فەرمووی: (هۆشیاربن! کەخودای گەورەو مەزن قەدەغەی کردووە لەئێوە کە سوێند بخۆن بەباوو باپیرتان، وەك ئەوە بڵێن بەسەری بابم، بەگۆڕی بابم، جا ئەو کەسەی کەدەیەوێ سوێند بخوا، با یاسوێند بەخودا بخوا، یا بێ دەنگ بێ‌و سوێند بەشتی تر نەخوات، عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی:

[١٠٦٦] بخاری. ئیمان‌و نەزر: ٦٦٤٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠١٠ = ٤٢٣٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٣ رقم الباب/٤).

بەخودا لەوساوە کە ئەمەم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بیستووە کە ئەمەی قەدەغە کردووە، ئیتر هێشتا نەخۆم سوێندم پێیان خواردووەو نە لەدەمی کەسی تریشەوە سوێندی وام گێڕاوەتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٢٥٠٢ — ش/د/ت/ن = بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داوودو تەرمەزی‌و نەسائی. پرگۆڕی پیرۆزیان لەنووری خودابێ} .

١٠٦٧- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، { عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّهُ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ اَلْخَطَّابِ فِي رَكْبٍ، وَعُمَرَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَنَادَاهُمْ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَلَا إِنَّ اَللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاَللَّهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٢٥ = بوخاری/٢٦٧٩، ٣٨٣٦، ٦١٠٨، ٦٦٤٦، ٦٦٤٨. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠١٠ و ١٠١١ = شيحا/٤٢٣٠. أبو داود. أيمان ونذور/٣٢٥٠. نسائي. أيمان ونذور/٣٧٧١. تحفة الأشراف/١٠٥١٨} : [(١٠٦٧)]

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەیشت بە دەستەیێ سوار، عومەریان تیادابوو، لەوکاتەدا عومەر سوێندی بە باوکی دەخوارد، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بانگی لێکردن‌و فەرمووی: (هۆشیاربن! کە خودای گەورەو مەزن قەدەغەی کردووە لەئێوە کە سوێند بخۆن بە باوو باپیرتان، وەك ئەوە بڵێن

(١٠٦٧) تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٢٥ - بوخاری: ٢٦٧٩. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠١٠ و ١٠١١ - شيحا/٤٢٣٠ شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٣٨٦ (بخاري رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٧٤).

بەسەری بابم، بەگۆڕی بابم، جا ئەوکەسەی کە دەیەوێ سوێند بخوات، یا با سوێند بەخودا بخوا، یا بێ دەنگ بێو سوێند بەشتی تر نەخوات. عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا لەوساوە کە ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، کە ئەمەی قەدەغە کردووە، ئیتر هێشتا نەخۆم سوێندم پێیان خواردووەو نە لەدەمی کەسی تریشەوە سوێندی وام گێڕاوەتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٢٥٠٢ —ش/د/ت/ن = بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی، پرگۆڕی پیرۆزیان لەنووری خودابێ} .

## (٢) باب مَنْ حَلَفَ بِاللاَّتِ وَالعُزىَّ فَلْيَقُل: ﴿لاَ إِلهَ إِلاَّ اللَّه﴾
## کەسێ سوێندی بە لاتو بە عوززا خوارد با بلێ: ﴿لاَ إِلهَ إِلاَّ اللَّه﴾

١٠٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ بِاللاَّتِ فَلْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ، تَعَالَ أُقَامِرْكَ. فَلْيَتَصَدَّقْ ». وفي رواية: « مَنْ حَلَفَ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى ». {الحديث: ٤٢٣٦ = ٤٢٢٩ فم. بخاري. تفسير: ٤٨٦٠، ٦١٠٧، ٦٣٠١، ٦٦٥٠. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٤٧. ترمذي. نذور وأيمان: ١٥٤٥. نسائي. أيمان ونذور: ٣٧٨٤} :[١٠٦٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا، لەسەر عادەتی سەردەمی نەزانی، گوتی: بەلاتو بەعوززا، بابلێ:

[١٠٦٨] بخاری. تفسیر: ٤٨٦٠ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠١٣ = ٤٢٣٦ = شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٥٣ سورة: والنجم).

(لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ: هیچ خودایەکی ترنییە بێجگە لەیەزدانی پاك) ئەو کەسەشی بەهاورێکەی بڵێ: وەرە باقومار بکەین، باخێرێ بکا، لەکەفارەتی ئەو قسە پیسەدا. {تاج/٣، لاپەڕە: ١٢٢، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٢٥٠٣ – ش/د/ت/ن}.

## (٣) بابُ نَدْبِ مَنْ حَلَفَ يَميناً فَرأى غَيْرَها خَيْراً مِنها أنْ يَأتِيَ الّذى هُوَ خَيْرٌ وَيُكَفِرَ عَنْ يَمِينه

١٠٦٩- عَنْ ابِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (ارْسَلَنِي اصْحَابِي الَى رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْالُهُ الْحُمْلانَ لَهُمْ اذ هُمْ مَعَهُ فِي جَيْشِ الْعُسْرَةِ وَهِيَ غَزْوَةُ تَبُوكَ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَ اللّهِ انَّ اصْحَابِي ارْسَلُونِي الَيْكَ لِتَحْمِلَهُمْ فَقَالَ: (وَاللّهِ لا احْمِلُكُمْ عَلَى شَيْءٍ) وَوَافَقْتُهُ وَهُوَ غَضبانُ وَلا اشْعُرُ وَرَجَعْتُ حَزِينًا مِنْ مَنْعِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)وَمِنْ مَخَافَةِ انْ يَكُونَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَدَ فِي نَفْسِهِ عَلَيَ. فَرَجَعْتُ الَى اصْحَابِي فَاخْبَرْتُهُمْ الَّذي قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ الْبَثْ الا سُوَيْعَةً اذ سَمِعْتُ بِلالا يُنَادِي ايْ عَبْدَ اللّهِ بْنَ قَيْسٍ فَاجَبْتُهُ فَقَالَ: اجِبْ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْعُوكَ فَلَمَّا اتَيْتُهُ قَالَ خُذ هَذيْنِ الْقَرِينَيْنِ وَهَذيْنِ الْقَرِينَيْنِ لِسِتَّةِ ابْعِرَةٍ ابْتَاعَهُنَّ حِينَئِذ مِنْ سَعْدٍ فَانْطَلِقْ بِهِنَّ الَى اصْحَابِكَ فَقُلْ انَّ اللّهَ اوْ قَالَ انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْمِلُكُمْ عَلَى هَؤُلاء فَارْكَبُوهُنَّ فَانْطَلَقْتُ الَيْهِمْ بِهِنَّ فَقُلْتُ: انَّ النَّبِيَ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْمِلُكُمْ عَلَى هَؤُلاء وَلَكِنِّي وَاللّهِ لا ادَعُكُمْ حَتَّى يَنْطَلِقَ مَعِي بَعْضكُمْ الَى مَنْ سَمِعَ مَقَالَةَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لا تَظُنُّوا انِّي حَدَّثْتُكُمْ شَيْئًا لَمْ يَقُلْهُ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: لِي وَاللّهِ انَّكَ عِنْدَنَا لَمُصَدَّقٌ وَلَنَفْعَلَنَّ مَا احْبَبْتَ فَانْطَلَقَ ابُو مُوسَى بِنَفَرٍ مِنْهُمْ حَتَّى اتَوْا الَّذينَ سَمِعُوا قَوْلَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْعَهُ ايَاهُمْ ثُمَّ اعْطَاءهُمْ بَعْدُ

فَحَدَّثُوهُمْ بِمِثْلِ مَا حَدَّثَهُمْ بِهِ ابُو مُوسَى). (رَ: ١٦١١) (الحديث: ٤٤١٥، طرفه في: ١٦١١ت= ٤٣٨٥ف): [(١٠٦٩)]

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ دەستەیەکی ئەشعەری چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) داوامان لێی کرد کە وڵاخی سواریمان بداتێ، هەتا لەخزمەتیدا بچین بۆ غەزای تەبووك، وارێکەوت لەوکاتەدا تووڕە بوو، بۆیە سوێندی خوارد کە وڵاخمان نەداتێو فەرمووی: (بەخودا نە وڵاخی سواریتان پێ دەدەمو نە وڵاخی باریو نە ئەوەندە وڵاخیشم هەیە کەبیدەم بەئێوە بۆ ئەم غەزایە سواری بن، یاتفاقی لێ بنێن). ئێمەیش ئەوەندەی حەزی خودای لەسەر بوو ماینەوە، ئیتر زۆری نەخایاند کە وشتری تالانی زۆریان بۆیهێنا، جا فەرمانی کرد کە سێجووت وشتری دووگ سپییان پێماندا، جاکاتێ وشترەکانمان وەرگرتو ویستمان بڕۆین، گوتمان: کارێکی باشمان نەکرد، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاگای لەوە نەمابوو، کە سوێندی خواردووە، وە ئێمەیش ئەوەمان بەهەل زانیو یادیمان نەخستەوە، کەشتێکی واهەیە، کەواتە: خوا پیرۆزی ناکا لێمان، جامن خۆم چوومە خزمەتیو مەترسییەکەی خۆمانم عەرزی کرد، فەرمووی: (من وڵاخی سواریم نەداوە بەئێوە، ئەوە لەسایەی خوداوە بوو کە وڵاخی سواریی بۆرەخساندن، وەکی تریش سوێندم بەخودا، خوا حەزکا، من سوێند لەسەر هەرچی بخۆم، وە لەپاشا بۆم دەربکەوێ بەبارێکی تردا باشترە، چی باش بێ، ئەوە دەکەمو کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٤، ژمارە: ٢٥٤١}.

---

(١٠٦٩) تجرید/٤، ژمارە: ١٦١١ و ژمارە: ١٦١٧ = ٤٤١٥ بخاری. مسلم: ٢٤٠٤ محمد فؤاد مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ١٠١٨ = ٤٢٣٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٧٨).

١٠٧٠- عَنْ زَهْدَمٍ قَالَ كُنَّا عِنْدَ أَبِى مُوسَى ، فَأُتِىَ ذَكَرَ دَجَاجَةً وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِـنْ بَنِى تَيْمِ اللَّهِ أَحْمَرُ كَأَنَّهُ مِنَ الْمَوَالِى ، فَدَعَاهُ لِلطَّعَامِ فَقَالَ إِنِّى رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ شَيْئًا ، فَقَذِرْتُهُ ، فَحَلَفْتُ لاَ آكُلُ . فَقَالَ هَلُمَّ فَلأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَاكَ ، إِنِّى أَتَيْتُ النَّبِىَّ (صـلى الله عليـه وسلم) فِى نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ فَقَـالَ « وَاللَّـهِ لاَ أَحْمِلُكُـمْ ، وَمَـا عِنْـدِى مَـا أَحْمِلُكُمْ » . وَأُتِىَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِنَهْبِ إِبِلٍ ، فَسَأَلَ عَنَّـا فَقَـالَ « أَيْنَ النَّفَرُ الأَشْعَرِيُّونَ » . فَأَمَرَ لَنَا بِخَمْسِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى ، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا قُلْنَا مَا صَـنَعْنَا لاَ يُبَارَكُ لَنَا ، فَرَجَعْنَا إِلَيْهِ فَقُلْنَا إِنَّا سَأَلْنَاكَ أَنْ تَحْمِلَنَا ، فَحَلَفْتَ أَنْ لاَ تَحْمِلَنَا أَفَنَسِيتَ قَالَ « لَسْتُ أَنَا حَمَلْتُكُمْ ، وَلَكِنَّ اللَّهَ حَمَلَكُمْ ، وَإِنِّى وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا »: [١٠٧٠]

زەهدەم گوتی: لەلای ئـەبو مووسـای ئەشعەری بـووین، پیـاوێکی لـەلابوو، لـەهۆزی بـەنی تـەیموڵلا بـوو، لەبـەر سـووریی لەکۆیلـەی ڕۆمـی دەکـرد، گۆشـتی مریـشکیان هێنـا بۆسـەر خـوانی ئـەبو مووسـا، ئـەبو مووسـا خـوڵکی پیـاوە سورکەڵەکەی کرد، بۆ نانخواردن لەگەڵیاندا، پیاوەکە گوتی: دیومـە کـە مریـشك شتی پیس و قیزەون دەخوات، لەبەرئەوە سوێندم خواردووە کە گۆشـتی مریـشك نەخۆم. ئەبو مووسا پێی فەرموو: وەرە با لەمبارەیەوە قسەت بۆ بکەم......... تا ئـەوێ کەباسـی بڕێتـی (کـەفارەت)ی سـوێندی بـۆکرد، وەك لـەژمارە (١٠٦٩)دا رابورد.

١٠٧١- حديث عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليـه وسـلم): «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ ، فَإِنَّكَ إِنْ أُوتِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَـا

[١٠٧٠] بڕوانە ژمارە (١٠٦٩).

، وَإِنْ أُوتِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا ، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا ، فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ ، وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ »: [١٠٧١]

**ئەم فەرموودەیە لە (شەرحی بلوغ المرام/٣)دا، ژمارە (١٣٩٠) بەرگی/٣ ئاوایە:**

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٤٨ = بوخاری/٦٦٢٢، ٦٧٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٠٢ = شيحا/٤٢٥٧ = محمد فؤاد/١٦٥٢. صحيح أبي داود: ٢٨٠٦}:

**بەشی یەکەمی ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحيح البخاري = تەجریدی بوخاری)دا ئاوایە:**

**ئەورەحمانی کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەورەحمان! داوای فەرمانڕەوایی (ئەمارەت = ئەمیری) مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت فەرمانڕەوایی‌و بەرپرسی‌و دەستەڵات وەربگریت لێت دەبێ بەبار، بەڵام ئەگەر بەبێ ئەوە کەخۆت هەوڵی بۆ بدەیت بکرێیت بە فەرمانڕەواو کارمەند، یا بەسەرکاری سەرکارێ، ئەوا خودا زاڵت دەکا بەسەریداو سەرت دەخا بەسەر ئەو کارەداو بەیاریدەی خودا بەجوانی پێی هەڵ دەستیت.**

**ئەی ئەورەحمان! ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، وە لەپاشا تەماشات کرد کە لەوشتە باشتر هەیە، ئەوە برێتی — واتە: کەفارەت —ی سوێندەکەت بدەو، ئەوە بکە کە بەباشتری دەزانی). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٦}.**

**لەگێڕانەوەی ژمارە: (٦٧٢٢)ی بوخاریدا:**

---

[١٠٧١] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٤٨ = ٦٦٢٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٠٢ = ٤٢٥٧/شیحا، (بخاری رقم الكتاب/٨٣ رقم الباب/١).

(سوێندەکەت بخەو ئەوەی کە بەباشی دەزانی ئەوەبکەو برێتی (کەفارەت)ی سوێندەکەت بدە).

لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داووددا: (لەپێشا کەفارەتی سوێندەکەت بدەو ئەوجا ئەوە بکە کە بەباشی دەزانی).

**ڕوونکردنەوە:**

١- بەپێی ئەم فەرموودەیە هەرکاتێ کەسێ سوێندی خوارد لەسەر شتێ، کە بیکات، یا نەیکات، ئەوە نابێ سوێندەکەی بخات، دەبێ سوێندەکەی بباتە سەر، بەڵام ئەگەر وا بەباشی زانی کە سوێندەکەی بخاتو نەیباتە سەر، ئەوە با کەفارەتی سوێندەکەی بداتو شتەکە کە بەباشی دەزانێ بیکا، یا بەپێچەوانەوە نەیکا.

٢- عەبدوڕەحمانی کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموودەی لە بوخاریو موسلیمدا هەیە، لە مەسلەمەی فەتحە. واتە: ڕۆژوی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بووە، لە فتوحاتی عێراقدا ئامادە بووە، لەسەر دەستی ئەودا سجستان ئازاد کراوە، لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا، هەروا کابل لەسەر دەستی ئەودا غەزاکراوەو ئازادکراوە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا ئامادەی غەزای تەبووك بووە، خۆی فەرموودەی لە پێغەمبەرو لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە گێڕاوەتەوە، ئەم زاتانەیش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە:

ئیبنو عەبباسو سەعیدی کوڕی موسەییبو محەمەدی کوڕی شیرینو حەسەنی بەصریو کەسانی تریش، ساڵی (٥١) پەنجاو یەکی کۆچی لەشاری بەصرە مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

٣- داوای فەرمانڕەوایی کاتێ خراپەو ناباشە، کە مرۆڤ بەزۆر بیسەنێو لەدڵەوە مەبەستی ئەوەبێ، کە لەو پلەو پایەیە مەبەستی ماددیو دنیایی دەست بکەوێ، وەك بەچاوی سەرو بەچاوی ژیری، لەم رۆژگارەی خۆماندا ئەمە دەبینین، بگرە گیرۆدەیش بووین بەدەست ئەم حاڵەوە، کۆمەڵی درندە کە بەزۆری خۆیان، یا بەفرو فێڵی خۆیانو بەهەزارو یەك فێڵو فەرەج دەچنە سەر تەختی حوکمڕانی، دوایی بە تۆپو تەیارەو فڕۆکیش نایەنە خوارەوەو لەسەر تەختی دەسەڵات دانابەزن، هەتا وڵات بەتەواوی وێران نەکەن، ئا لەم یەك دوو ساڵانەدا بەچاوی خۆمان ئەم درندانەمان دی کەچییان لە وڵاتی خۆیان کرد: قەززافی لە لیبیاو حافظ ئەسەد لەسووریاو عەبدوڵڵا صالح لە یەمەنو لا بەشار لا ئەسەد لە سوورییەو کەسانی تریش کە لەوان بەدترو خراپترو مەلعوونترن لە شوێنانی تر، کە هەموو دەزانین!!

بەڵام ئەگەر هەوڵدان بۆ فەرمانڕەواییو کاربەدەستیو پلەو پایەی باش، بەنیازی باش بێو لەڕێگەی ئاسایی خۆیەوە بێو بۆ بەرژەوەندی گشتی بێ، ئەوە کارێکی زۆر باشەو دروستەو بگرە زۆر پەسەندیشە، وەك:

آ- ئەوەتا حەزرەتی یووسف، لەبەرئەوەی بەخۆیا رائەپەرموێو شیاوی ئەوەیە کە ببێ بە عەزیزی میصر، داوا لە پاشای میصر دەکا، کە بیکات بەوەزیری داراییو ئابوری هەتا لەم کاتی تەنگانەی قاتوقڕییەدا فریای ملەتی میصر بکەوێ، وە پاشای میسریش داواکەی قەبووڵ کردو لەبەرئەوەی یوسف نیازی پاك بوو، وەشیاویو ئەهلیەتی هەبوو بۆ ئەو پۆستە، خودایش سەری خست، وەك قورئان لەم ئایەتانەدا ئەم داستانەمان بۆ تۆمار دەکا کە دەفەرموێ:

{قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ، وَكَذَلِكَ مَكَّنِّا لِيُوسُفَ فِي الأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاء نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَاء وَلاَ نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ – يوسف/١٢ – آية/٥٥/٥٦}.

ب- ئەبوبەكری صەدیق لەكاتی خۆیداو پێشەوا عومەری كوڕی خەتاب ئەویش لەكاتی خۆیدا،خۆیان پالاوت كەببن بەجێنشینی پێغەمبەر، وە خەڵكەكەیش هەڵیان بژاردن، وە لەبەرئەوەی نیازیان پاك بوو، وەشیاوو شایستە بوون، بۆ ئەو پایەیە، خودایش سەری خستن‌و بوون بەمایەی رەحمەت بۆ ملەت هەتا هەتایە. وەزۆر كەسانی تریش لە كۆن‌و نۆدا هەروەها بوون.

ج- لەڕاستیدا ئەم جۆرە فەرموودانە، ئاوێنەی بالانومان بۆ ئەم باوو نەریت‌و رژێمە خۆپەرستانە، كە لەم رۆژگارەی ئێمەدا لە ولاتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستتدا بالا دەستن‌و لەسەركارن، بچوكترین بەرپرسیاریی بەكەسێ نادرێ، ئەگەر ئەڵقە بە گوێی حیزبی سەر دەسەلات نەبێ، بەپێی ئەم بیرۆكەیە:

(نەخوێنەوارێكی خۆپەرستی نادان، لە حیزبەكەی خۆمان، ملیار جار باشترە لە زانایەكی شارەزای پسپۆڕ كە چڵكاو خۆری حیزبەكەی خۆمان نەبێ، با زۆر دڵسۆزیش بێ بۆ گەل‌و نیشتمان!).

د- بەندە بۆ نموونە، سا بەشكوو رۆژێ لەڕۆژان، ئێمەیش واز لەم حیزبپەرستییە بهێنن‌و كەسانێ كە پێغەمبەری خوداو یارو یاوەران‌و هاوەلانی پێغەمبەری خودا، پەسنی رەفتارە بەرزەكانیان كردوون ئێمەیش واز لەم خۆ خۆری‌و زۆردار پەرستی‌و نەمروود گەرییە بهێنین‌و ئەوەی باش بێ بۆ دین‌و دونیامان ئەوە پەسەند بكەین، جا بەندە لەم رووەوە لەم شوێنەدا ئەم فەرموودەیەی صەحیحی موسلیم راگوێز دەكەم، كە كۆتا برگەی دەرمانی هەموو دەردێكمانە: {بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٢٦}:

موستەوریدی قورشەیشی (رەزای خودای لێ بێ) لەلای عەمری کوڕی عاص، کە هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون، فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ کە قیامەت بەرپا دەبێ رۆم لەهەموو کەسێ زۆرترن). (روم واتە: دەوڵەتە مەسیحییەکانی رۆژئاوا - وەرگێڕ).

عەمری کوڕی عاصیش پێی فەرموو: ئەی موستەورید! لەقسەکەت وردبەرەوە، بزانە دەڵێی چیو ئەم قسەیە کوێ دەگرێتەوە!

موستەورید فەرمووی: من چیم لە پێغەمبەر بیستووە، ئەوە دەڵێم، زیاتر ناڵێم ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەرە، قسەی من نیە!!

عەمریش فەرمووی: لەسەر ئەم قسەیەی تۆدا، کە فەرمایشتی پێغەمبەرە، دەسا منیش ئەم شایەتییەم لەلایە: ئەم میللەتانی رۆمە چوار رەوشتی چاکیان واتیادا:

**یەکەم:** لەکاتی ئاژاوەو ئاشووبو پشێویدا زۆر زۆر بە حەوسەڵەو هێمنو لەسەرەخۆن.

**دووەم:** لەپاش قۆرتو چورتمو گرفتاری، زۆر زوو دێنەوە سەرخۆیانو خۆیان دەگرنەوە.

**سێیەم:** لەکاتی جەنگو هەرادا، لەپاش کشانەوە گورج هەڵمەت دەبەنەوە سەر دوژمنی خۆیان.

**چوارەم:** بۆ هەژارو بێ نەواو هەتیوانیش زۆر باشن، سەرەڕای ئەم چوار رەوشە باشانەیش رەفتارێکی شیرینی جوانی تریشیان هەیە، کە لەگەڵ ئەم چوارەدا دەکەنە پێنج بەهرەی گەورە، کە ئەویش ئەمەیە: کە نایەڵن سەرۆكو

پادشاكانیان زۆرو ستەمو ناهەقی بكەن!). {تاجول ئوصول بەكوردی بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٥٥٥٥، لاپەڕە: ٥٨٣ چاپی چوارەم}.

## (٥) باب الإِسْتِثْنَاءِ
## (إِنْ شَاءَاللّه) كردن لە كاتی سوێندخواردندا

١٠٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ نَبِيُّ اللّهِ عليهما السلام: لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى سَبْعِينَ امْرَأَةً كُلُّهُنَّ تَأْتِي بِغُلاَمٍ يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللّهِ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ أَوِ الْمَلَكُ: قُلْ إِنْ شَاءَ اللّهُ، فَلَمْ يَقُلْ، وَنَسِيَ، فَلَمْ تَأْتِ وَاحِدَةٌ مِنْ نِسَائِهِ إِلاَّ وَاحِدَةٌ جَاءَتْ بِشِقِّ غُلاَمٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَلَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللّهُ. لَمْ يَحْنَثْ وَكَانَ دَرَكًا لَهُ فِي حَاجَتِهِ ». {الحديث: ٤٢٦٢ = ٤٢٥٥ فم. بخاري. جهاد: ٢٨١٩، ٥٢٤٢، ٦٦٣٩، ٦٧٢٠، ٧٤٦٩. تحفة الأشراف: ١٣٥٣٥}: [١٠٧٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سولەیمان پێغەمبەر (سڵاوی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: سوێندم بەخودا، ئەم شەو دەخولێمەوە بەسەر حەفتا ژنمدا، لەگەڵیان دروست دەبم، هەموویان هەریەكی سەرو كوڕیان دەبێ، دەجەنگن لەپێناوی ئایینی خودادا).

جا فریشتەكەی هاوڕێی پێی فەرموو: بڵێ: إِنْ شَاءَ اللّه: خوا حەزكا) بەلاّم لەبیری چوو، ئەم وشە پیرۆزەی نەگوت، جا هیچ كام لەژنەكانی منالّیان نەبوو، تەنیا ژنێكیان نەبێ كە نیوە كوڕێكی بوو، ئەوەندە ناتەواوو كەم ئەندام بوو، دەتوت نیوە منالّە).

---

[١٠٧٢] بخاری. جهاد: ٢٨١٩، ٥٢٤٢ مسلم/شیحا: ٤٢٦١ (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٩).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر سولەیمان لەکاتی ئەم سوێند خواردنەدا بیگوتبایە: خوا یاربێو خوا حەزکا هەریەکێ لەم حەفتا ژنە کوڕێکی دەبێ، لەپێناوی خودادا دەجەنگێ، ئەگەر وای بگوتبایە سوێندەکەی نەدەکەوتو ئاواتەکەشی دەهاتە دیو خودا حەفتا کوڕەکەی پێ دەداو لەپێناوی خودادا غەزایان دەکرد).

لەگێڕانەوەی ئێرەدا لەجیاتی (سَبْعِينَ إِمْرَأَةً) وشەی (مائة مَرَّةٍ). بڕوانە: ژمارە (١٠٧٣).

١٠٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى سَبْعِينَ امْرَأَةً تَحْمِلُ كُلُّ امْرَأَةٍ فَارِسًا يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ . فَلَمْ يَقُلْ ، وَلَمْ تَحْمِلْ شَيْئًا إِلاَّ وَاحِدًا سَاقِطًا إِحْدَى شِقَّيْهِ » . فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « لَوْ قَالَهَا لَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ».[١٠٧٣]

واتاو مەبەست لێی لەژمارە (١٠٧٢)دا رابورد.

## (٦) بابُ النَّهي عَنِ الإصرار عَلَى اليَمين فِيمَا يتأذَى بِهِ أهْلُ الحلف مِمَّا لَيسَ بِحَرَامٍ

## وا باشە سوێندخۆر ورك نەگرێ لە سەر كردنی ئەوەی كە سوێندی لەسەر خواردووە، ئەگەر زیانی هەبوو، بە مەرجێ حەرام نەبێ

١٠٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال: رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « وَاللَّهِ لأنْ يَلَجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ

---

[١٠٧٣] بخاری. جهاد: ٢٨١٩، ٥٢٤٢. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠١٤ = ٤٢٦٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٤٠).

الَّتِى فَرَضَ اللَّهُ »). {الحديث: ٤٢٦٧ = ٤٢٥٩ فـم. تجريـد/٥، رقـم: ٢٠٤٩ = ٦٦٢٤، ٢٣٨، ٨٧٦، ٨٩٦، ٢٩٥٦، ٣٤٨٦، ٦٨٨٧، ٧٠٣٦، ٧٤٩٥، ٦٦٢٥، ٦٦٢٦}: (١٠٧٤)

ئـەبو هـورەیره (ڕەزای خـودای لیّ بـیّ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بیّ) دەفەرمویّ: (بـەخودا ئەگـەر کەسیّکتان لەسـەر شـتیّ سویّند لەکەسـوکاری بخـواو لەپاشـا وڕکـی لیّ بگـریّو لیّـی پەشـیمان نەبیّتـەوە، وەلحـالّ پەشیمان بوونەوە لەوشتە باشتربیّ، ئەوە بەو پیّ لیّداگرتنە گوناهی زۆرتر دەگا لـەلای خـودا، هـەتا ئـەوە کەسـویّندەکەی بـشکیّنیّو ئـەو کەفارەتـە بـدا کـەخودا دایناوە بۆ سویّند). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٢٥١٢}.

## (٧) باب نَذْرِ الكَافِرِ وَمَا يفعل فيه إِذَا أَسْلَمَ

## نەزری بیّباوەڕ لە پاش ئیسلامبوون چیّبەجیّ دەکریّ

١٠٧٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ بَعْدَ أَنْ رَجَعَ مِنَ الطَّائِفِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى نَذَرْتُ فِى الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ يَوْمًا فِـى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَكَيْـفَ تَرَى؟ قَالَ: « اذْهَبْ فَاعْتَكِفْ يَوْمًا »، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَدْ أَعْطَاهُ جَارِيَةً مِنَ الْخُمْسِ، فَلَمَّا أَعْتَقَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) سَـبَايَا النَّاسِ، سَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَصْوَاتَهُمْ يَقُولُونَ: أَعْتَقَنَـا رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَـالُوا: أَعْتَـقَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) سَبَايَا النَّاسِ. فَقَالَ عُمَرُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ اذْهَبْ إِلَـى تِلْـكَ الْجَارِيَـةِ فَخَـلِّ سَـبِيلَهَا.

(١٠٧٤) تجریـد/٥، ژمـارە: ٢٠٤٩ = ٦٦٢٤ بخـاری پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١٠٢٠ = ٤٢٦٧ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٣ رقم الباب/١).

{الحديث: ٤٢٧٠ = ٤٢٦٢ فم. بخاري. فرض الخمس: ٣١٤٤، ٤٣٢٠. تجريد/٣، رقم: ١٢٦٨، ١٠١٥ = ٣١٤٤، ٢٣٠٧، ٢٥٨٤}: [١٠٧٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپاش غەزای حونەین، لەپاش ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە طائیف گەڕایەوە، لەجیعرانە بوو، باوکم عومەری کوڕی خەتاب عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من لەسەردەمی نەزانیدا، نەزرم کردووە کەشەوێ لەناو مەسجیدولحەراما خەڵوە بکێشم، جا ئێستا تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (برۆ ڕۆژێ لەوێ خەڵوە بکێشەو ئیعتیکافەکەت جێبەجێ بکە).

فەرمووی: لەژنە دیلەکانی غەزای حونەین، لەبەشی پێنج یەك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەنیزێکی دا بەعومەر، جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پیاوەتی ژن‌و منداڵە دیلەکانی هۆزی هەوازینی بەردا، لەخۆشیانا خەڵکەکە، بەناو کۆڵانەکانا رایان دەکردو دەهاتن‌و دەچوون‌و بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد: ئۆخەی! پێغەمبەری خودا ئازادی کردین! عومەر گوێی لەدەنگە دەنگیان بوو، فەرمووی بەمن: عەبدوڵڵا بزانە ئەم دەنگە دەنگە چییە؟ عەرزیمان کرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپیاوەتی منداڵ‌و ژنە دیلەکانی هۆزی هەوازینی ئازادکردووە.

جا باوکم فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا! دەتۆیش بچۆ ئەو کەنیزەکەی منیش، کە لەدیلەکانی غەزای هەوازین بەرم کەوتووە بەرەڵای بکە منیش چووم فەرمانەکەیم بەجێ هێنا. {تاج/٤، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٤٥٤٤} + {تاج/٤، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٤٦٣٤، ٤٦٣٥}.

---

[١٠٧٥] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٦٨ = ٣١٤٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٠٢ = ٤٢٧٠ (بخاری رقم الکتاب/٥٧ رقم الباب/١٩).

(٩) باب تغليظ علَى مَنْ قَذَفَ مملوكَهُ بالزِنا

كەسێ بوختانی داوێنپیسی بۆ کۆیلەی خۆی بکات، تۆڵەی سەختی بۆ هەیە

١٠٧٦- عن أبي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: سمعت أبا القاسم صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: من قذف مملوكه، وهو بريءٌ مما قال، جلد يوم القيامة، إلا أن يكونَ كما قال. (الحديث ٦٨٥٨):[١٠٧٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: کەسێ بوختان بکا بۆ بەندەی خۆی، کۆیلەکەی ژن بێ یا پیاو، بەڵام بەندەکەی بێ تاوان بێو پاك بێ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەو خاوەن کۆیلەیە دادەنرێ بەبوختیانکار، لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو بوختانە داری حەددی لێ دەدرێ. بەڵام ئەگەر وەك دەڵێ، کۆیلەکەوابێ، ئەوە داری حەددی لێ نادرێ. (تاج/٣ ل/٢٥٠ ز/٩٥، ژمارە: ٢٣٧٠ - باسی حەددی بوختیانو جمێن و جادوو بازیی).

(١٠) باب إطعام المَمْلُوك مِمَّا يأكُلُ وَ إلبَاسَهُ مِمَّا يَلْبَسُ ولاَ يُكَلِّفُهُ مَا يَغْلِبُهُ

چاکە کردن لەگەڵ کۆیلەدا، لە بەرگا، لە خۆراکا، نابێ ئەرکی واشیان بدرێ بەسەریاندا، کە لە کێشو وزەیانا نەبێ

١٠٧٧- عَنِ الْمَعْرُورِ قَالَ لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ ، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ ، وَعَلَى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ ، فَقَالَ إِنِّى سَابَبْتُ رَجُلاً ، فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ ، فَقَالَ لِىَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) « يَا أَبَا ذَرٍّ أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ ، إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ ،

---

[١٠٧٦] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٧٣ = ٦٨٥٨ بخاری مسلم/محمد فؤاد/١٦٦٠ = پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٠٣ = ٤٢٨٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٦ رقم الباب/٤٥).

جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ»: [١٠٧٧]

مەعروری کوڕی سوومید فەرمووی: لەڕەبەزە ئەبو زەڕم بینی، دەستێ بەرگی نیوەی تازەو نیوەی کۆنی لەبەردا بوو، خولامەکەیشی هەروەها دەستێ بەرگی وەهای لەبەردا بوو، پێمان گوت: ئەی ئەبو زەڕ! هۆی چییە کە بەرگی خۆت و بەرگی خولامەکەت وەك یەکە، هی هەردوو لاتان نیوەی تازەیەو نیوەی کۆنە، ئەگەر هەردوو پارچە تازەکە بۆ یەکێکتان بوایەو هەردوو پارچە کۆنەکەیش بۆ یەکێکتان بوایە، هەرکەسەتان قاتێکی یەك ڕەنگی لەبەردا دەبوو؟ ئەویش فەرمووی: لەسەردەمی حەزرەتدا، قسەم بەبرادەرێکی خۆم گوت، کە بیلال بوو، دایکی بێگانە بوو، عەرەب نەبوو، تانەی ئەوەم لێیدا کە دایکی ڕەشە، پێم گوت: ئەی کوڕی ژنە ڕەشەکە!

ئەویش لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سکالای ئەوەی لەدەستم کرد، کاتێ چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو زەڕ! هێشتا بۆنی ڕەگەز پەرستی سەردەمی نەزانی (جاهیلییەت)ت لێ دێ). منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خۆی وایە: کەسێ جنێو بەخەڵك بدا، خەڵکیش جنێو بە باوك و دایکی ئەو دەدەن. فەرمووی: (ئەی ئەبو زەڕ! ئەوە ڕەوشتی سەردەمی نەزانییە کە لەتۆدا ماوە، ئەم کۆیلانە هەرچەند بەندەو خولام و بەردەست و نۆکەری ئێوەن، بەلام لە بنەڕەتدا براتانن و ئێوەو ئەوان لەیەك دایك و باوکن، کە باوە ئادەم و دایە حەوان، ئەوەندە هەیە خودا لەبەر حیکمەتێ، ئەوانی کردووە بەژێر دەستەی

---

[١٠٧٧] بخاری. ئیمان: ٣٠، ٢٥٤٥ پوختەی موسلیم: ٩٠٤ - شیحا: ٤٢٨٩ (بخاری رقم الکتاب/٢ رقم الباب/٢٢).

ئێوه، دەی برایەکی باش بن، ئەگەر یەکێ لەم برایانەی خۆتان کەوتە ژێر دەستتان وەك برا رەفتاریان لەگەڵدا بکەن‌و خۆتان چی دەخۆن ئەوەیش بدەن بەوان، وەخۆتان چی لەبەر دەکەن لەهەمان جل‌و بەرگیش بۆ ئەوان بکەن، قەتیش زەحمەتیان مەدەن‌و ئەرکێکی وا مەدەن بەسەریانا کە لەوزەو کێشیانا نەبێت، کە ئەرکێکیش دەدەن بەسەریانا، خۆشتان بەپێی حاڵ‌و توانا یاریدەیان بدەن). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٧، ژمارە: ١/١٣٦٠ - ٤١٤} + {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٢٩} + {تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٣١٨٥ چاپی چوارەم = ج/٤}.

١٠٧٨- عن أَبي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ ، أَوْ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ ، فَإِنَّهُ وَلِيَ حَرَّهُ وَعِلاَجَهُ»: [(١٠٧٨)]

بۆ روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە، گێڕانەوەی ژمارە (١٠٩٢)ی تەجریدی بوخاری‌و گێڕانەوەی ژمارە (٩٠٥)ی پوختەی موسلیم دەنووسین:

دیسان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەسێکتان نۆکەرێ نانەکەی بۆ ئامادە دەکا، با ئەویش دەستی بگرێ‌و لەگەڵ خۆی دایبنێ بۆ نان خواردن، ئەگەر دایشی نەنا لەگەڵ خۆی با پارویێ دووپاروی لەنانەکە بداتێ، یا بۆی بهێڵێتەوە، چونکە ئەو نۆکەرە ئامادەی کردووەو ئەرکی دروست کردن‌و هێنانەکەی کێشاوە!). (تاج/٦٧/٤، زنجیرە: ٢٠، تاج/٢، ژمارە: ٢٦٩٦).

ئەمەیش گێڕانەوەی موسلیمە:

---

[(١٠٧٨)] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠ بخاری مسلم/محمد فؤاد: ١٥٠٤ - پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٠٥ = ٤٢٩٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/٥٥).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان نۆکەرەکەی نانی بۆ دروست کرد، ئەوجا بۆی دانا، دیارە کەئەو پێوەی ماندوو بووەو ئـەو تینـی گەرماکـەیی چەشـتووەو دووکەڵەکـەی چـووە بەسـەرو چـاویدا، کەواتـە بـا لەگـەڵ خـۆی دایبنیـشێنێ هـەتا نانەکـەی لەگـەڵا بخـوات، خـۆ ئەگـەر نانـەکـە کـەمبوو، وەدای نەنیشان لەگەڵ خۆی، با پارووێ، دوو پارووی لێی بداتێ) داوودی کوڕی قـەیس فەرمووی: (واتە: تیکەیێ یا دوو تیکەی پێ بـدات). {تـاج/٢، زنجـیرە: ٢١، ژمـارە: ٢٠٣١ + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٧، ژمارە: ١٣٦١/٢ - ٤١٥}.

## (١١) باب ثواب العَبْدِ وَأجرُهُ إذا نَصَحَ لِسَيدِهِ وَ أحْسَنَ عِبادَةَ اللّهِ
## خێرو پاداشی کۆیلەیێ کە دڵسۆز بێ بۆ خاوەنەکەیو لە هەمان کاتا بە جوانیش خودای خۆی بپەرستێ

١٠٧٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسـلم) قَالَ: « إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا نَصَحَ لِسَيِّدِهِ، وَأَحْسَنَ عِبَـادَةَ رَبِّـهِ فَلَـهُ أَجْـرُهُ مَـرَّتَيْنِ ». {الحـديث: ٤٢٩٤ شيحا = ٤٢٨٦ فم}: [(١٠٧٩)]

ئیبنـو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو بەندەیەی لەگەڵ ئاغاکەی دڵسۆزو سـاغ بـێ، لەهەمان کاتـدا بـەجوانی خـودای خـۆی بپەرسـتێ، ئـەوە دووقـات پاداشـی باشـی بۆهەیـە). {ریـاض/٣، زنجـیرە: ٢٣٧، ژمـارە: ١٣٦٢ + تـاج/٢، زنجـیرە: ٢١، ژمـارە: ٢٠٢٧}.

---

[(١٠٧٩)] بخاری. عتق: ٢٥٤٦ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٩٠٦ = شیحا: ٤٢٩٤ (بخاری رقم الکتاب/٤٩ رقم الباب/١٦).

١٠٨٠- عَنِ أَبو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لِلْعَبْدِ الْمَمْلُوكِ الْمُصْلِحِ أَجْرَانِ »، وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ لَوْلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَجُّ وَبِرُّ أُمِّي لأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ قَالَ: وَبَلَغَنَا أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ لَمْ يَكُنْ يَحُجُّ حَتَّى مَاتَتْ أُمُّهُ لِصُحْبَتِهَا). {الحديث: ٤٢٩٦ شيحا = ٤٢٨٨ فم}:[١٠٨٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەندەی زەڕ خڕیدەی باشی چاکە خواز، دوو پاداشی گەورەی بۆ هەیە). ئەبو هورەیرە دەیفەرموو: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەگەر لەبەر خاتری خەبات و تێکۆشان و غەزا لەڕێگەی خوداداو لەبەر حەج کردن و خزمەتی دایکم نەبێ، حەزم دەکرد کە بەبەندەیی بمرم.

ڕاوی دەفەرموێ: بەئێمە گەیشتۆتەوە کە ئەبو هورەیرە، جگە لەحەجە فەرزەکەی، حەجی تری نەکردووە، هەتا دایکی مردووە، لەبەر خزمەتی دایکی.

{ریاض/ ٣، زنجیرە: ٢٣٨، ژمارە: ١٣٦٣. تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٢٨}.

١٠٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): «نِعْمَ مَا لأَحَدِهِمْ يُحْسِنُ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَيَنْصَحُ لِسَيِّدِهِ »: [١٠٨١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڕاستی بەندەیێ فرە چاکە، ئەو کۆیلەیەی، کە بەجوانی خودای خۆی دەپەرستێ و دڵسۆزیشە بۆ ئاغاکەی، واتە بۆ خاوەنەکەی.

[١٠٨٠] بخاری. عتق: ٢٥٤٨ پوختەی موسلیم: ٩٠٧ = شیحا: ٤٢٩٦ (بخاری رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/١٦).

[١٠٨١] (بخاری رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/١٦) مسلم/٤٣٠٠ ترقيم الشيخ مأمون شيحا لصحيح مسلم.

## (١٢) بابُ مَنْ أعتَقَ شِرْكًا لَهُ في عَبْدٍ
## كەسێ بەشی خۆی لە کۆیلەیەکا ئازاد بکا

١٠٨٢- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ اَلْعَبْدِ، قُوِّمَ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ اَلْعَبْدُ، وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٧٨ = ٢٥٢٢، ٢٤٩٢، ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٣ = شیحا: ٣٧٥٢ = محمد فؤاد عبدالهادی/١٥٠١}: [١٠٨٢]

لە موختەصەری صەحیحی بوخاری ژمارە: (١٠٧٨ = ٢٤٩٢)و لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کەبەشی خۆی لە کۆیلەیەك ئازاد بکا، لەسەریەتی، کە لەماڵی خۆی هەمووی ئازاد بکا، ئەگەر ئەوەندەی ماڵ هەبوو کەبەشی هەموو پشکەکانی تری ئەو کۆیلەیە بکا، بەڵام ئەگەر ئەوەندەی ماڵ نەبوو کەبەشی ئەوە بکا، ئەوا هەر ئەوەندەی ئازاد دەبێ کە ئازاد کراوە، ئەوسا کۆیلەکە بەنرخی تەواوی کاتی کۆیلەیی ڕێك دەقەبڵێنرێ، ئەوجا کەسابەتی پێ دەکرێ هەتا ئەوەندە ماڵ پەیدا دەکا کەبیدات بەهەقی ئەو پشکانەیدا کەهێشتا ئازاد نەبوون، هەتا بەئێجگاری خۆی پێ ئازاد دەکاو، لەکۆیلەیی ڕزگاری دەبێ، بەڵام نابێ زەبری زیاتر لەتوانای خۆیی لێ بکرێ، بۆ پەیدا کردنی بەهای ئەو

---

[١٠٨٢] شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٤٥١ تجرید/٣، ژمارە: ١٠٧٨ = ٢٥٢٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٩٣ - ٣٧٥٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٩ رقم الباب/٤).

بەشەی تری، کە لەسەر خۆیەتی بەئیشکردن ئازادی بکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٨} .

١٠٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ أَعْتَقَ شَقِيصًا مِنْ مَمْلُوكِهِ فَعَلَيْهِ خَلاَصُهُ فِي مَالِهِ ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ قُوِّمَ الْمَمْلُوكُ ، قِيمَةَ عَدْلٍ ثُمَّ اسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ »: [١٠٨٣]

واتاو مەبەست لێی بە تەواوی لەژمارە (١٠٨٢)دا رۆیشت.

## (١٣) باب جَوَازِ بَيْعِ الْمُدَبَّرِ

## کۆیلەی پاشەمەرگە (واتە: مودەببەر) لە پێش ئازادبوونیدا دروستە بفرۆشرێ

١٠٨٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ رَجُلًا مِنَ اَلْأَنْصَارِ أَعْتَقَ غُلَامًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) . فَقَالَ: "مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟" فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اَللَّهِ بِثَمَانِمَائَةِ دِرْهَمٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي لَفْظٍ لِلْبُخَارِيِّ: فَاحْتَاجَ وَفِي رِوَايَةٍ لِلنَّسَائِيِّ: {وَكَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَبَاعَهُ بِثَمَانِمَائَةِ دِرْهَمٍ، فَأَعْطَاهُ وَقَالَ: " اِقْضِ دَيْنَكَ"} . {بخاری. كَفَّارَاتُ الأَيْمَانِ/ ٦٧١٦. مسلم/شيحا/٤٣١٤ — ٤٣١٧. مسلم/٩٩٧} : [١٠٨٤]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە یاریدەدەرانی پێغەمبەر، خولامێکی هەبوو، ئازادیکرد بەمەرجێ کە لەپاش مردنی خۆی ئازاد ببێ، کە بەم جۆرە مامەڵەیە لە یاسانامەدا دەگوترێ (تەدبیر: پاشی مەرگ) پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری وەهای نەبوو، جا کە ئەم باسە

---

[١٠٨٣] مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٤ (بخاری رقم الكتاب/٤٧ رقم الباب/٥).

[١٠٨٤] بخاری/ كفارات الیمان: ٦٧١٦ مسلم/شیحا: ٤٣١٤ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/٩٩٧ (بخاری رقم الكتاب/٨٤ رقم الباب/٧).

گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کێ ئەم کۆیلەیەم لێ دەکرێ؟ جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵا لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پارەکەی وەرگرتو دای بە خاوەنەکەی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢}.

ئەمەیش دەقی دووەمی بوخارییە لە تەجریدی بوخاریدا ژمارە (٩٧٠). {بڕوانە: ژمارە: ٨٠٥ لەپێشەوە رۆیشت}.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پیاوێ لە هاوەڵان، کە ئەنصاری بوو، خوڵامێکی هەبوو، ئازادی کرد بەمەرجێ لەپاش مەرگی خۆی ئازادببێ، کە بەمە لەزاراوی شەرعا دەگوترێ: مودبەر، پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری وای نەبوو، جا دامابوو بۆ ماڵ، جا لەپاشا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر پیاوەکەی خستە سەر سەواو مەزاتو فەرمووی: (کێ ئەم کۆیلەیەم لێ دەکرێ؟).

جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵا لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پارەکەی وەرگرتو دای بە خاوەنەکەی، کەناوی ئەبو مەزکوور بوو، خوڵامەکەیش ناوی ئەبو یەعقوب بوو). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٨٩٦ + تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢ = ئەم ژمارەی دووەمە لەچاپە کۆنەکانی پێش چاپی چوارەمەوە دەکەوتە سەرەتای بەرگی سێیەمەوە}.

لەگێڕانەوەیەکی نەسائیدا: پیاوەکە قەرزار بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیلەکەی فرۆشت بەهەشت سەد درەم، وە پارەکەی دا بەخاوەنەکەی، وە فەرمووی: (دەبڕۆ قەرزەکەتی پێ بدەرەوە). {صحیح، سُنَن النسائی: ٥٤١٨}.

# ٢٨- كِتَابُ الْقَسَامَةِ
# نامەی پاکانە

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٨٦٧، زنجیرە: ٣١٧ چاپی تـەهران. تـاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٣٢٩ ج/٤ + تجرید/٣، ژمارە: ١٢٨٢ = ٣١٧٣}.

## (١) باب القَسَامَة
## باسی پاکانە

١٠٨٥- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ وَسَهْلَ بْنَ أَبِى حَثْمَةَ أَنَّهُمَا حَـدَّثَاهُ أَنَّ عَبْـدَ اللَّـهِ بْـنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ أَتَيَا خَيْبَرَ فَتَفَرَّقَا فِى النَّخْلِ ، فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ ، فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَحُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) فَتَكَلَّمُوا فِى أَمْرِ صَاحِبِهِمْ فَبَدَأَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ ، وَكَانَ أَصْغَرَ الْقَوْمِ فَقَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم): «كَبِّرِ الْكُبْـرَ» . قَـالَ يَحْيَـى لِيَلِـىَ الْكَـلاَمَ الأَكْبَـرُ فَتَكَلَّمُـوا فِـى أَمْـرِ صَاحِبِهِمْ فَقَالَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم): « أَتَسْتَحِقُّونَ قَتِيلَكُمْ – أَوْ قَالَ صَاحِبَكُمْ – بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْكُمْ » . قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْرٌ لَمْ نَرَهُ . قَالَ « فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ فِـى أَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ » . قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَوْمٌ كُفَّارٌ . فَوَدَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ قِبَلِهِ . قَالَ سَهْلٌ فَأَدْرَكْتُ نَاقَةً مِنْ تِلْكَ الإِبِلِ ، فَـدَخَلَتْ مِرْبَـدًا لَهُـمْ فَرَكَضَتْنِى بِرِجْلِهَا. [١٠٨٥]

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمـە (ڕەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: کۆمـەڵێ لـە گـەورە پیـاوانی خزمـانی خـۆم گێڕایانـەوە بـۆم: کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی سـەهل و

---

[١٠٨٥] تجریـد/٣، ژمـارە: ١٢٨٢ = ٣١٧٣ بخـاری پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١٠٣٤ = ٤٣٢٥ تخـریج وترقیم شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٨ رقم الباب/٨٩).

موحەییصەی کوڕی مەسعوودی کوڕی زەید (رەزای خودایان لێ بێ) دەچن بۆ خەیبەر، خەیبەر ئەو سەردەمە ئاشتو بێ شەڕو شۆڕ دەبێو لەلایەنی موسوڵمانانەوە ئازاد کرابوو، لەبەر باری گرانی گوزەران دەچن بۆ ئەوێ، لەوێ بەناو باخە خورماکانا بڵاودەبنەوە، لەوێ عەبدوڵڵایان دەکوژرێ، کە موحەییسەی ئامۆزای دەیدۆزێتەوە دەڕوانێ لەخوێنی خۆیدا گەوزاوە، جالەوێ دەینێژێو دەگەڕێتەوە بۆلای جوولەکەکانو پێیان دەڵێ کە عەبدوڵڵا کوژراوە، وەفڕێ درابووە کارێزێکەوە، یاناو بیرێکی دەم پەلی نزیکە دەستەوە، وە دەڵێ: بەخودا ئێوە کوشتووتانە، دەڵێن: بەخودا ئێمە نەمان کوشتووە، جا موحەییصە هاتەوە بۆناو هۆزەکەیو هەواڵەکەی پێ گوتنو ئەوجا خۆیو حوەیصەی برایو عەبدوڕەحمانی کوڕی سەهل چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حوەیصە لە موحەییصە گەورەتر بوو، عەبدوڕەحمانیش برای کوژراوەکە بوو، جا موحەییصە ویستی قسەبکا، چونکە ئەو لەگەڵ کوژراوەکەدا بووە لەخەیبەر، بەڵام پێغەمبەر پێی فەرموو: (رێزی لەخۆت گەورەتر بگرە با ئەو دەست بەقسە کردن بکا) مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەبوو کێتان بەتەمەن گەورەترە، با ئەو دەست بەقسە کردن بکا، جا حوەیسە چیرۆکەکەی گێڕایەوە، ئەوجا موحەیصەی براشی قسەیکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بەهۆی پاکانەی ئێوەوە خوێنەکە تلایەوە بەسەر جوولەکەکانا، ئەوە یادەبێ خوێنی کوژراوەکەتان بدەنێ، یادەبێ بێ پەیمان دەرچنو بارودۆخی جەنگ رابگەیەنن لەنێوانی ئێمەو ئەواندا!).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەم بابەتە کاغەزێکی نووسی بۆیان، ئەوانیش وەڵامیان نووسییەوە: (بەخودا ئێمە نەمان کوشتووە،

جـا پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) بــە حومەیــسەو موحەیــسەو عەبدوڕەحمانی فەرموو: (ئایا ئێوە سوێند دەخۆن کە ئەوان کوشتوویانە، هەتا خوێنی کوژراوەکەتان بچێتە ئەستۆی ئەوان‌و خوێنتـان پـێ بـدەن؟). گوتیـان: نـەء، سـوێند نـاخۆین، فـەرمووی: (کەواتـە جوولەکـەکان پاکانـەتان بۆدەکـەن‌و سوێندتان بۆ دەخۆن کە ئەوان نەیانکوشتووە؟). گوتیان: ئەوانە موسوڵمان نـین. جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەســەر بـێ) خـۆی لەوشـتری زەکـات، خـوێنی کوژراوەکەی دا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـەد وشـتری مێنگـەی نـارد بۆیـان تاکرانــە ژوورەوە بۆیــان، ســەهل فــەرمووی: وشــترێکی ســووریان لەقەیەکی لێدام). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٣٢٩}.

## (٢) باب حُكْمِ المُحَارِبِينَ وَالمُرْتَدِّينَ
## بڕیاری ناموسوڵمانی جەنگی‌و لە ئیسلام پاشگەز

١٠٨٦- عَنْ أَنَسٌ بن مـالك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَفَرًا مِـنْ عُكْـلٍ ثَمَانِيَـةً قَـدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَبَـايَعُوهُ عَلَـى الإِسْـلَامِ، فَاسْـتَوْخَمُوا الأَرْضَ، وَسَقُمَتْ أَجْسَامُهُمْ فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسـلم)، فَقَـالَ: « أَلاَ تَخْرُجُونَ مَعَ رَاعِينَا فِي إِبِلِهِ فَتُصِيبُونَ مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَـا »؟ فَقَـالُوا: بَلَـى، فَخَرَجُـوا فَشَرِبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَصَحُّوا، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ، وَطَرَدُوا الإِبِلَ، فَبَلَغَ ذَلِـكَ رَسُـولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ، فَأُدْرِكُوا فَجِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِهِمْ فَقُطِعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ، وَسُمِرَ أَعْيُنُهُمْ، ثُمَّ نُبِذُوا فِي الشَّمْسِ حَتَّى مَاتُوا. {الحـديث: ٤٣٣٠ = ٤٣٢٢ فـم. تجريـد/١، رقـم: ١٧٦ = ٢٣٣، ١٥٠١، ٣٠١٨، ٤١٩٢، ٤١٩٣، ٤٦١٠،

٥٦٨٥، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧، ٦٨٠٢، ٦٨٠٣، ٦٨٠٤، ٦٨٠٥، ٦٨٩٩. أبـو داود. حـدود: ٤٣٦٤. نسائي. تحريم الدم: ٤٠٣٦. تحفة الأشراف: ٩٤٥}: [١٠٨٦]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: تاقمێ لـەهۆزی عوکل، ژمارەیان هەشت کەس بوو، هاتنە خزمەتی حەزرەتو موسوڵمان بوونو پـەیمانیان دا بـە پێغەمبـەر، لەسـەر پابەنـدبوون بـەئایینی پـیرۆزی ئیسلامەوە، پاش ماوەیێ هەوای مەدینـەیان پـێ نەکـەوت، جەسـتەیان دەرداوی بـوو، سکاڵای ئەوەیان لای پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی: (کـە لەگـەڵ شوانەکەی ئێمـەدا، بـچن بـۆ دەرەوەی مەدینـە، بـۆ نـاو ڕانـە وشـترە زەکاتـەکانو لەوێ بۆ دەرمان لە گمێزو شیری وشـترەکان بخۆن، هـەتا سـکتان دەکەوێتـە ڕێو لەو نەخۆشینە ڕزگارتان دەبێ).

ئـەوانیش گوتیـان: بـەڵێ باشـەو، وەهایـانکردو لەگـەڵ شـوانی وشـترەکانا دەرچـوونو لـەگمێزو لەشـیری وشـترەکانیان خـواردەوەو چـاکبوونەوە، کەچـی نامەردو بێ پەیمان دەرچوونو ڕۆژێ لەڕۆژان لەئیسلام وەردەگـەڕێنو سـەرەڕای ئەوەیشە شوانەکەی پێغەمبەر زۆر بەبێ نەزاکەت دەکوژن، دەستو پێی دەبڕنو دڕك ئەکەن بەچاویدا، تادەمرێ! ئینجا وشترەکانیش دەدەنە بەرو دەیـان فـڕێنن بۆ وڵاتی خۆیان، کاتێ پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەم کارەسـاتەی زانـی، کۆمـەڵێ پیـاوی نـارد بەشـوێنیاناو لـەڕێ دەیانگرنـەوەو دیلیـان دەکـەنو دەیانهێننەوە بۆ مەدینە. جا پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) چاوەڕێی فەرمانی خودای کرد، تا ئایەتی سیی و سێ لەسوورەتی مائیـدە هاتـە خـوارەوە، ئـەوجا بـەپێی ئـەو ئایەتـە، حـەزرەت فـەرمانی کـرد دەسـتو پایـان بـڕینو

---

[١٠٨٦] تجریـد/١، ژمـارە: ١٦٧ = ٢٣٣ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١٠٢٤ = ٤٣٣٠ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٧ رقم الباب/٢٢).

بەبسماری سوورەوە کراو چاویان رشتن، لەپاشیشا برینەکانیان نەبرژاندنەوەو تیماریان نەکردن بەڵکوو توورِیان دانە ناو خرِە بەرداوییەکەوە لەدەرەوەی شار، کەپێی دەگوترێ: ئەلحەررە، داوای ئاویان دەکردکەس ئاوی نەدەدانێ، هەتا مردن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، لاپەرە: ٣٠، ئایەتی: {إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا ...} + {تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٢٣٣٧}.

## (٣) باب ثُبُوتُ الْقِصَاصِ فِي الْقَتْلِ بِالْحَجَرِ وَغَيْرِهِ مِنَ الْمُحَدَّدَاتِ وَالْمُثَقَّلاَتِ، وَقَتْلُ الرَّجُلُ بِالْمَرْأَةِ

١٠٨٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ عَدَا يَهُودِيٌّ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى جَارِيَةٍ ، فَأَخَذَ أَوْضَاحًا كَانَتْ عَلَيْهَا وَرَضَخَ رَأْسَهَا ، فَأَتَى بِهَا أَهْلُهَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهْىَ فِى آخِرِ رَمَقٍ ، وَقَدْ أُصْمِتَتْ ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « مَنْ قَتَلَكِ فُلاَنٌ » . لِغَيْرِ الَّذِى قَتَلَهَا ، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ لاَ ، قَالَ فَقَالَ لِرَجُلٍ آخَرَ غَيْرِ الَّذِى قَتَلَهَا ، فَأَشَارَتْ أَنْ لاَ ، فَقَالَ « فَفُلاَنٌ » . لِقَاتِلِهَا فَأَشَارَتْ أَنْ نَعَمْ ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ. (١٠٨٧)

{الحديث: ٤٣٤١ = ٤٣٣٣ فم. ٣/، رقم: ١٠٥٣ = ٢٤١٣، ٢٧٤٦، ٥٢٥٩، ٦٨٧٦، ٦٨٧٧، ٦٨٧٩، ٦٨٨٤، ٦٨٨٥. ترمذي. ديات: ١٣٩٤. نسائي. قَسَامَة: ٤٧٥٦. ابن ماجة. ديات: ٤٧٥٦. تحفة الأراف:١٣٩١}:

پێشەوا ئەنەسی کورِی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی جوولەکە، لەسەر هەنێ خشڵ، لەنێوانی دوو بەرددا سەری کچۆڵەیەکی ئەنصاری

---

(١٠٨٧) تجريد/٣، ژمارە: ١٠٥٣ = ٢٤١٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٢٨ = ٤٣٤١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٢٤).

شكاندبوو، لەپاشا تووڕی دابووە ناو بیرێکەوە، کاتێك دۆزیانەوە هێشتا نیوە گیانێکی تیادامابوو، جالێیان دەپرسی: کێ وای لێ کردی؟ ئایا فیسارە کەس بوو؟ ئایا ئەمبوو؟ ئایا ئەو بوو؟ تاناوی کابرایەکی جوولەکەیان هێناو گوتیان: ئایا فیسارە جوولەکە وای لێ کردوویت؟ ئەویش سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی کرد، ئا ئەو وای لێ کردووم، جا کابرای جوومیان هێناو، پێی لەتاوانی خۆی ناو ددانی بەکارەکەدا ناو چووە ژێری، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیدا، لەنێوانی دوو بەرددا سەری ئەویشیان شکاندو لەباتی کچۆڵە ئەنصارییەکە کوشتیانەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٢، چ/٤}.

## (٤) باب الصَّائل علَى نَفْسِ الإنسَانِ أوْ عُضوهِ إذا دَفَعَهُ المَصال عليه

## باسی هەڵمەتهێنو پەلاماردەر، بۆ سەر گیانی مرۆڤ یان بۆ سەر ئەندامێکی، ئەگەر پەلاماردراو بەرگری لەخۆی بکاتو پەلاماردەر بکوژێ، یان ئەندامێکی لەکار بخات، خوێنی لەسەر نیە

١٠٨٨- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ ، فَنَزَعَ يَدَهُ مِنْ فَمِهِ ، فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ ، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ « يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ ، لاَ دِيَةَ لَكَ»: [١٠٨٨]

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ دەستی پیاوێ دەگەزێ، ئەویش لەتاوانا، کەدەستی خۆی رادەپسکێنێ لەدەمی کابرای گازگر، دوو ددانی پێشینەی کابرا لەگەڵ دەستیا دەکەون! جا بۆ دادخوایی و سکاڵا هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چیت لەمن دەوێ؟ دەتەوێ لەمن کەمن پێی بڵێم: واز لەدەستی بێنێ لەدەمی تۆدا، تۆ

[١٠٨٨] تجرید/٣، ژمارە: ١٢١٩ - ٢٩٧٣ بخاری، پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٢٩ - ٤٣٤٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٧ رقم الباب/١٨).

وەك نێرە وشتر پەنجەی بکرۆژی؟ دەی باشە من بەتۆ دەڵێم: تۆ پەنجەی خۆت بدەبەو، بادایکرۆژێ، ئایا لەکاتی وادا تۆ دەستی خۆت راناپسکێنی؟ دەی ئەویش وەك تۆ، کەواتە خوێنت ناکەوێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٢٣٣٠، ج/٤}.

ئەمە دەقی ژمارە (١٠٢٩)ی پوختەی موسلیم بوو، ئەمەیش دەقی ژمارە (١٢١٩)ی تەجریدی بوخارییە، دەیکەین بە پاڵپشت بۆ روونکردنەوەی بابەتەکە:

عَنْ يَعْلَى بن أميّة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) غَزْوَةَ تَبُوكَ فَحَمَلْتُ عَلَى بَكْرٍ فَهُوَ أَوْثَقُ أَعْمَالِي فِي نَفْسِي فَاسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا فَقَاتَلَ رَجُلاً فَعَضَّ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ وَنَزَعَ ثَنِيَّتَهُ فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَأَهْدَرَهَا فَقَالَ: (أَيَدْفَعُ يَدَهُ إِلَيْكَ فَتَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ) (الحديث ٢٩٧٣، أطرافُهُ في: ١٨٤٨، ٢٢٦٩، ٤٤١٧، ٦٨٩٣):

یەعلای کوڕی ئومەییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خوای لەسەر بێ) غەزای تەبوکمان کرد، لەم غەزایەدا وشترە نێرمیەکم دا بەغەزاکارێ لەڕێگەی خودادا سواری بوو، لەباری دڵم دا ئەم هاوکارییەم لەم بابەتەدا باشترین کردەوەی باشم بوو، کەلای‌خودا ببێ بەزەخیرە بۆم.

لەم غەزایەدا پیاوێکم بەکرێ گرت، لەگەڵ پیاوێکی تردا بوو بەشەڕی یەکێکیان دەستی ئەویتریانی برد بەدەماو گازی لێ گرت، ئەویش لەتاوانا دەستی خۆی لەدەمی راپسکاند، یەکێ لەددانە دووینەکانی خست!

کابرای ددانکەوتوو بۆ سکاڵا هات بۆلای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەویش فەرمووی: (وەك نێرە وشتر دەستی برای خۆتان دەکرۆژن،، خوێنت ناکەوێ) (تاج/٣ل-٢٢٦ف —١ ز-٨٧).

١٠٨٩- عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ (رضى الله عنه) قَالَ غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَكَانَ مِنْ أَوْثَقِ أَعْمَالِي فِي نَفْسِي ، فَكَانَ لِي أَجِيرٌ ، فَقَاتَلَ إِنْسَانًا ، فَعَضَّ أَحَدُهُمَا إِصْبَعَ صَاحِبِهِ ، فَانْتَزَعَ إِصْبَعَهُ ، فَأَنْدَرَ ثَنِيَّتَهُ فَسَقَطَتْ ، فَانْطَلَقَ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَهْدَرَ ثَنِيَّتَهُ وَقَالَ «أَفَيَدَعُ إِصْبَعَهُ فِي فِيكَ تَقْضَمُهَا – قَالَ أَحْسِبُهُ قَالَ – كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ»:[١٠٨٩]

واتاو مەبەست لێی لەژمارە (١٠٨٨)دا نووسراوە.

## (٥) باب إثبات القصاص في الأسنان وما في معناها
## ددان تۆڵەی هەیە، هەروا ئەو شتانەی کە وەك ددان وان

١٠٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ كَسَرَتِ الرُّبَيِّعُ – وَهْىَ عَمَّةُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ ، فَطَلَبَ الْقَوْمُ الْقِصَاصَ ، فَأَتَوُا النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَمَرَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بِالْقِصَاصِ . فَقَالَ أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ عَمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ لاَ وَاللَّهِ لاَ تُكْسَرُ سِنُّهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « يَا أَنَسُ كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ » . فَرَضِيَ الْقَوْمُ وَقَبِلُوا الأَرْشَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ »:[١٠٩٠]

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٥٦ = ٢٨٠٥، ٤٠٤٨، ٤٧٨٣ + ٢٨٠٦ صحيح البخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٣٠ = ٤٣٥٠ شيحا = مسلم/١٦٧٥}:

---

[١٠٨٩] لە ژمارە (١٠٨٨)دا تخریج کرا. (بخاری رقم الكتاب/٣٧ رقم الباب/٥).

[١٠٩٠] تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٥٦ = ٢٨٠٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٣٠ = ٤٣٥٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٥). شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١١٩٩.

**ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویی: ئەو خوشکەی مامە ئەنەسم، کەمن بەناوی ئەومامەوە ناو نراوم ئەنەس، کە لەباوکەوە پووری منە، کە ئەو خوشکەی ناوی روبەییع بوو، ددانە دووینەی ژنێکی شکاندبوو، داوایان لێی کرد کە لێی ببورێ، بەڵام کەسوکاری کچە ددان شکاوەکە قاییل نەبوون کە چاوپۆشی لێ بکەن، گوتیان خوێنی ددانە شکاوەکە دەدەین؟ دیسان رازی نەبوون، جا بۆ دادپرسی چوونە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێش گوتیان بەتۆڵە سەندن نەبێ بەهیچی تر رازی نابین، دەبێ ددانی روبەییعیش لەتۆڵەی ددانی کچەکەی ئێمەدا بشکێتەوە، ئیتر پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە تۆڵە بستێنرێو فەرمووی: دەبێ لەبریتی ئەوە ددانی روبەییعیش بشکێنرێ. ئەنەسی کوڕی نەضری براشی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەو کەسەی کەتۆی بەڕاستی کردووە بە پێغەمبەری خۆیو، بەم ئایینە راستو دروستەوە رەوانەی کردووی، پشت بە بەخششو کەرەمی خودا، ددانی ئەم خوشکەم ناشکێنرێ.**

**پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئەنەس! خودا لەقورئانی پیرۆزدا، کە نامەی خۆیەتی دەفەرموێ: {السِّنُّ بِالسِّنِّ} . واتە: ددان لەباتی ددان هەڵ دەکەنرێ، ئەگەر تاوانکار ددانی تاوان لێکراوی هەڵکەندبوو، وەددان لەجیاتی ددان دەشکێنرێ، ئەگەر تاوانبار ددانی تاوانلێکراوی شکاندبوو). کەواتە: تۆڵە سەندن لەمکاتەدا بڕیاری نامەی خودایە، پێویستە هەموومان ملکەچ بین بۆی).**

**جا لەپاش هەوڵو کۆششی ناشتییانە، کەسوکاری ژنە ددان شکاوەکە، بەخوێنی ددانەکە قاییل بوونو، وازیان لەتۆڵە سەندنەوە هێنا.**

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (خودای گەورە بەندەی باشی وای هەیە، ئەگەر ورك لەخودا بگرێو سوێندی لێ بخوات، کە دەبێ فیسارە ئیشم بۆ بکەیت، خودا دڵی ناشکێنێو ئیشەکەی بۆ دەکات، وەك ئەم سوێندەی ئەنەسی کوڕی نەضر خواردی، کە سەرەنجام ددانی خوشکەکەی ناشکێنرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٤ – ج/٤. فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٠٦}.

## (٦) بابُ مَا يُبَاحُ بِهِ دَمُ الْمُسلِمِ
## بەچی ڕشتنی خوێنی مرۆی موسوڵمان ڕەوا دەبێ

١٠٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّى رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ ». {الحديث: ٤٣٥١ = ٤٣٤٣ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٧٦ = ٦٨٧٨. أبو داود. حدود: ٤٣٥٢. ترمذي. ديات: ١٤٠٣. نسائي. تحريم الدماء: ٤٠٣٧. تحفة الأشراف: ٩٥٦٧}:[١٠٩١]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ شایەتمان بهێنێو بڵێ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحمداً رَسُولُ اللّهِ: بەدڵ باوەڕدەکەمو بەزمان دەڵێمو شایەتی دەدەم کە هەرخودا خودایەو بەس، خودای تر نییە، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایش پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خودایە).

---

[١٠٩١] تجريد/٥، ژمارە: ٢٠٧٦ = ٦٨٧٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٢٣ = ٤٣٥١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٧ رقم الباب/٦).

هەركەسێ ئەم شايەتييە بدا، ئيتر خوێنى ئەوكەسە حەرامەو بەهيچ شێوەيێ خوێنى بەكەس رەوانابێ، مەگەر لەيەكێ لەم سێ كاتانەدا نەبێ: بێوەى داوێنپيس، چ ژن بێ، چ پياو، ياكەسێ بەناڕەوا كەسێ بەقەستى بكوژێ، يا لەئايينى خۆى وەرگەڕێو لە كۆمەڵەى موسوڵمانان تەرابێ). {تاج/٣، زنجيرە: ٨٨، ژمارە: ٢٣٣٥}.

## (٧) باب بيان إثم مَنْ سَنَّ القَتْلَ

## تاوانى ئەو كەسەى كە پياو كوشتنى داهێنا

١٠٩٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا لأَنَّهُ كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ ». {الحديث: ٤٣٥٥ = ٤٣٤٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٤٠ = ٣٣٣٥، ٦٨٦٧، ٧٣٢١ فتح البارى. ترمذى. علم: ٢٦٧٣. نسائى. تحريم الدم: ٣٩٩٦. تحفة الأشراف: ٩٥٦٨}:[١٠٩٢]

عەبدوڵڵاى كوڕى مەسعوود (رەزاى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ بەناڕەوا بكوژرێ، بەشێ لەئۆباڵى خوێن رشتنەكەى بە ئەستۆى كوڕە پێشووەكەى ئادەمە، واتە بەملى قابيلى كوڕى ئادەمە، كەهابيلى براى كوشت، چونكە ئەو يەكەم كەس بوو كەپياو كوشتنى داهێنا). وەك خواى گەورە لەقورئانى پيرۆزدا لەسوورەتى مائيدەدا، لەئايەتى سييەمدا دەفەرموێ: {فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ}

---

[١٠٩٢] تجريد/٤، ژمارە: ١٣٤٠ = ٣٣٣٥ بخارى. پوختەى موسليم/٢، ژمارە: ١٠٢٥ = ٤٣٥٥ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/١).

واته: دەروونی پیسی قابیل، کوشتنی هابیلی برایی لەبەرچاوی جوان کرد، وەکوشتی، ئیتر قابیل بەم کردەوە ناشیرین‌و ناپەسەندە بوو بەپیاوێکی زیانباری پیاو کوژی دۆڕاو لەهەردوو جیهاندا). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٢٢٨٧}.

## (٨) باب المُجَازَاةِ بالدِماءِ في الآخِرَةَ وَ أنَهَا أوَّلُ مَا يُقْضى فِيهِ بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ القِيامَةَ

## سزای خوێن ڕژاندن لە دوا ڕۆژدا، لە ڕۆژی قیامەتدا یەکەم شت کە ئادەمیزاد دادگایی دەکرێ لەسەری پرسی خوێنڕشتنە

١٠٩٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ فِـى الـدِّمَاءِ ». {الحديث: ٤٣٥٧ = ٤٣٤٩ فـم = فم = فتح الملهم. تجريد = مختصر صحيح البخارى/٥، رقم: ٢٠٣١ = ٦٥٣٣، ٦٨٦٤. ترمذى. ديات: ١٣٩٦. نسائى. تحريم الدم: ٤٠٠٣}: [١٠٩٣]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا، یەکەم شت کە ئادەمیزاد لەسەری دادگایی دەکرێ، پرسی خوێن ڕشتن‌و مرۆڤ بەناڕەوا کوشتنە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، لاپەڕە: ٤، ژمارە: ٢٢٨٨ ج/٤ + ریاض/٤، لاپەڕە: ١٣٣٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٤٥/٣٨}.

## (٩) باب تغليظ تَحريم الدِماءِ والأعراضِ والأموال

## زۆر ناڕەوایی خوێن‌و ناموس‌و ماڵ

---

[١٠٩٣] مختصر صحيح البخارى/٥، ژمارە: ٢٠٣١ = ٦٥٣٣ بخارى. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٢٢ = ٤٣٥٧ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٤٨).

١٠٩٤- عَنْ أَبِى بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثَةٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ، وَذُو الْحِجَّةِ، وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبٌ، شَهْرُ مُضَرَ الَّذِى بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ»، ثُمَّ قَالَ: أَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: « أَلَيْسَ ذَا الْحِجَّةِ »؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: « فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا »؟ قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: « أَلَيْسَ الْبَلْدَةَ ؟». قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: « فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: « أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ ؟». قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ (قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ) وَأَعْرَاضَكُمْ، حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِى بَلَدِكُمْ هَذَا، فِى شَهْرِكُمْ هَذَا، وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ، فَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، فَلاَ تَرْجِعُنَّ بَعْدِى ضُلاَّلاً يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلَّغُهُ يَكُونُ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ ». ثُمَّ قَالَ: « أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ »؟ {الحديث: ٤٣٥٩ = ٤٣٥١ فم. تجريد/١، رقم: ٦٠ = ٦٧، ١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٧. تحفة الأشراف: ١١٦٨٢} : (١٠٩٤)

ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو حەجەدا، كە لەپاش كۆچ كردی، كە ناوداره بە حەجی ماڵاوایی، لە وتارێكدا فەرمووی: (چەرخ چووەتەوە دۆخی جارانی خۆیو، زەمان هەڵسووڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی، كە خودای گەورە ئاسمانەكانو زەوی دروست كردو شەوو ڕۆژو مانگو ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بووەتەوە بەدوانزە

---

(١٠٩٤) تجرید/١، ژمارە: ٦٠ = ٧٠ + ١٦١٣ = ٤٤٠٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٢١ = ٤٣٥٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٧٧).

مانگ‌و هەموو مانگێ لەدوانزە مانگەی خودا کەوتۆتەوە شوێنی راستەقینەی خۆی‌و (نەسیئ) نەما، وە وەك سەردەمی پێغەمبەرەکان (دروودی خودا لە پێغەمبەری خوداو گشت پێغەمبەرەکانی تر بێ) ئەوەی رەوایە بووەتەوە بەرەواو ئەوەی نارەوایە بووەتەوە بەنارەوا، وە ئەو گۆڕان‌و دەستکاریی شەریعەتە کە لەسەردەمی نەزانیدا کرابوون، هەموو راست کرانەوە، وە ئەو مانگانە چواریان مانگی حەرامن‌و خاوەن رێزو قەدرو نرخن‌و لەبەرئەوە شەڕو شۆڕو هەراو جەنگیان زۆر تیا حەرامە، وە ئەم چوار مانگە سیانیان بەرودوان‌و بەشوێن یەکادێن، کەناو جەژنان‌و نۆمینەو موحەڕەمن، ئەوی تریشیان تەنیایە، کە مانگی رەجەبە کە مەشهوورە بە رەجەبی هۆزی موضەر، لەبەرئەوە کەهۆزی موضەر زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن، کە دەکەوێتە بەینی جومادای دووەم‌و کوڵە مانگەوە).

ئەوجا خۆشەویست فەرمووی: (ئەم مانگە چ مانگێکە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن. فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەیێ خامۆش بوو، تەنانەت خامۆشییەکەی وا درێژەی کێشا زەینمان بۆئەوە چوو کەناوەکەی بگۆڕێ‌و ناوێ تری لێ بنێ، بەڵام فەرمووی: (ئەرێ ئەمە مانگی نۆمینەی حاجیان نییە کە حەجی تیادەکرێ؟) گوتمان: بەڵێ، خۆیەتی، فەرمووی: (ئەی ئەم شارە کوێیە؟). گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن، فەرمووی: جادیسان ماوەیێ تر بێ دەنگ بوو، تەنانەت زەینمان بۆ ئەوە چوو کەناوەکەی بگۆڕێ‌و ناوێکی تری لێ بنێ. فەرمووی: (ئەرێ ئەمە شاری مەککە نییە؟) گوتمان: بەڵێ خۆیەتی. فەرمووی: (ئەی ئەم رۆژە چ رۆژێکە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن، فەرمووی: دیسان ماوەیەکی تر خامۆش بوو، دیسان گومانمان بۆئەوە چوو

کەناوەکەی بگۆڕیۆ ناوێکی تری لێ بنێ. بەڵام فەرمووی: (دیارە کە ئەمە ڕۆژی جەژنی قوربانە کە قوربانی تیادا دەکرێ) گوتمان: بەڵێ ئەوە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دەی باش باش بزانن، کە سەرو ماڵو ناموستان بەیەکتری حەرامە، وەك چۆن شکاندی ڕێزی ئەم ڕۆژەتان حەرامە ئاوا، بەتایبەتی ئەگەر شکاندنی ڕێزی ئەم ڕۆژەتان لەم شارەتانابێو لەم مانگەشتانا بێ). فەرموشی (درودی خودای لەسەر بێ): (وە بەزوییش دەچنەوە بەردیوانی خودای پەروەردگارتان، یەکە یەکە پرسیارتان لێ دەکا، سەبارەت بەکارو کردەوەکانتان، جا نەکەن پاش مەرگی من بگەڕێنەوە سەر حاڵی پێشینتانو گومڕاو سەرلێشێواو ببنەوەو وەك جاری جاران ببنەوە بەهۆزی خۆ خۆرو بەشیر گەردنی یەکتری ببەڕێنن، هۆشیاربن، با ئامادەبوانی ئەم وتارو ڕێو ڕەسمانە خۆیان لەبەریان بکەنو رایان بگەیەنن بەکەسانێ کە ئێستا لێرە نینو نادیارن، چونکە ئومێدە هەندێ کەس لەوانەی کەئەم فەرموودەو فەرمایشتانەیان پێ ڕادەگەیەنرێ، باشتر تێی بگەنو وەری بگرن لەو کەسانەی کە بەگوێی خۆیان دەیانبیستن).

لەپاشا فەرمووی: (دەی ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم راگەیاند). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ١٦٠٩}.

ئیبنو سیرین (کەناوی موحەممەدە) لەپاش ئەم ڕستەوە (فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلَّغُهُ يَكُونُ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ): چونکە ئومێدە هەندێ کەس لەوانەی لە زانایانی گەلی ئیسلامی من کە ئەم فەرموودەو فەرمایشتانەیان پێ ڕادەگەیەنرێو ئەم فەرمایشتانە دەگەنەوە بەوان، باشتر تێیان بگەنو وەریان بگرن لەو کەسانەی کە بەگوێی خۆیان دەیانبیستن!) ئیبنو سیرین – کە تابیعیەو ئەم فەرموودەیە لە ئەبوبەکرەوە دەگێڕێتەوە – لەپاش ئەم

رستەیەوە دەیفەرموو: (پێغەمبەری خودا حەزرەتی موحەممەدی خۆشەویست ڕاستو دروستی فەرمووە، چونکە ئێستا شتی وا ڕوویداوە، کە فەقێ لە مامۆستاکەی باشتر لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تێدەگا).

## (١١) باب دية الجنين وَ وُجُوبُ الدِّيَةِ فِي قَتْلِ الخَطأِ وَ شِبْهِ العَمْدِ عَلَى عَاقِلَةِ الجَانى

## خوێنی کۆرپەلەی ناو سك، لە کوشتنی هەڵەدا خوێندان پێویستە، لە کوشتنی نیمچە قەستیدا خوێن لەسەر کەسوکاری بکوژە

١٠٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِي امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ اقْتَتَلَتَا فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِحَجَرٍ فَأَصَابَ بَطْنَهَا وَهِيَ حَامِلٌ فَقَتَلَتْ وَلَدَهَا الَّذِي فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ مَا فِي بَطْنِهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ فَقَالَ وَلِيُّ الْمَرْأَةِ الَّتِي غَرِمَتْ كَيْفَ أَغْرَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ لَا شَرِبَ وَلَا أَكَلَ وَلَا نَطَقَ وَلَا اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ.(الحديث ٥٧٥٨ أطرافه في: ٥٧٥٩، ٥٧٦٠، ٦٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠):[١٠٩٥]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دوو ژنی هوزەیلی بوو بەشەڕیان، یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریان و خۆیو سکەکەوی کوشت، جاکە بۆ داخوازیی و دادگایی، دادیان بردە لای پێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- بڕیاری دا: کە خوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندەبێ، یا کەنیزەك بێ دەبێ، وە بڕیاریشی دا خوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی سکەکەی

---

[١٠٩٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٨٦ = ٥٧٥٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٣٢ = ٤٣٦٧ شیحا. (بخاری رقم الکتاب/٨٧ رقم الباب/٢٥).

لەسەر خوێنڕەسانی ژنە تاوانبارەکەیە، نەك لەسەر ژنەکە خۆی. وەکەلەپووری ژنە کوژراوەکەیشی دا بەمناڵەکانیو بە خزمەکانی تری، جا حەمەلی کوڕەزای نابیغەی هوزەیلیش گوتی: ئەی پێغەمەری خوا؟ من چی ببژێرم ئەمە کەلەسکی دایکیدا کوژراوە، نە چەشکەی نانو ئاوی کردووە و نە ورتەی لەدەم دەرهاتووە و نەنقەی لێوە هاتووە، شتی وا خوێی نییە!.

پێغەمەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەمە بەم قسە قوتانەیدا، وادەردەکەوێ کەلەدەستەی کوڵەنانیو کاهینانە!). (تاج/٣ ز/٨٤ ل/٢٢٠ ژ/٢).

لە پوختەی موسلیم/٢، ژمارە/١٠٣٢ ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دووژنی هوزەیلی، بوو بەشەڕیان، یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریانو خۆیو سکەکەی کوشت، جا کەبۆ دادخوازیو دادگایی، دادیان بردەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا: کەخوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندەبێ، یا کەنیزەك بێ دەبێ، وە بڕیاریشی دا کەخوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی سکە لەبارچووەکەی لەسەر خوێنڕەسانی ژنە تاوانبارە بکوژەکەیە، نەك لەسەر ژنەکە خۆی، وە کەلەپووری ژنە کوژراوەکەشی دا بەمناڵەکانیو بەخزمەکانی تری، جا حەمەلی کوڕەزای نابیغەی هوزەلیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من چی ببژێرم، ئەم ئاوەلەیە کە لەسکی دایکیدا کوژراوە، نەچەشکەی نانو ئاوی کردووەو، نە ورتەی لەدەم دەرهاتووەو نەنقەی لێوە هاتووە، شتی وا خوێنی نییە!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە بەمقسە قوتانەیدا، وا دەردەکەوێ کە لەدەستەی کوڵە نانیو کاهینانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٢٣٢٢ — ش/د/ت/ن، چ/٤}.

١٠٩٦- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ عَنْ عُمَرَ (رضى الله عنه) أَنَّهُ اسْتَشَارَهُمْ فِي إِمْلَاصِ الْمَرْأَةِ فَقَالَ الْمُغِيرَةُ: قَضَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بِالْغُرَّةِ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ. فَشَهِدَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَضَى بِهِ: [١٠٩٦]

موغەیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی خۆیدا، لەبارەی لەباربردنی سکی ژنی سکپڕەوە، راوێژی بە موسوڵمانان کرد، کە بڕیاری کرداری وا لە یاسانامەی خوادا چییە؟

موغەیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دا: کە خوێنی سکی لەبارچوو دەکاتە سەرێ کۆیلە، ئیتر ئەو سەرە: بەندە بێ دەبێ، یا کەنیزەك بێ دەبێ.

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە گوتی: من خۆم شایەتی ئەم رووداوە بووم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو شێوەیە بڕیاری دا، وەك موغەیرە دەڵێ.

---

[١٠٩٦] بخارى رقم الكتاب/٨٧ رقم الباب/٢٥، مسلم/شيحا: ٤٣٧٣.